# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی سێزدەیەم

## تەفسیری سوورەتی النّحل




عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتی




**نووسینی:** عـــەلی بـــاپیر

**دیزاینی ناوەوە :** زەردەشت کاوانی

چاپـــی یەکـەم ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك

٥٦٧ لاپـــــەڕە

١٧* ٢٤ ســـم

**بابـەت :** ئـاییـنی (تەفسیر)

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەكی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ بِاللَّـهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِـنْ سَـيئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْده اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِلْ فَلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إِلَـهَ إلاّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فـإِنَّ أَصْـدَقَ الحَدِيـث كَلامُ اللَّـه، وَخَـيْرَ الْهَـدِي هَـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُـورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَـة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنـەرە بەڕێـزو خۆشـەویستەكان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - كـە ئـەو تەمەنـەی لە خزمـەت دوایـیـن كتێبی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەكانی لـە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفكریـن و ڕامـان، فێركـردن، كارپێكـردن ... هتـد، بـە باشتـریـن جێگرتـن جێگا دەگـرێ و، خاوەنەكـەی لـە دنیـاو دواڕۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

منیـش كـە - وەك باسـكردنی چاكـەی خـوا (**التحدّث بنعمة اللّـه**) دەیخــەمەڕوو- لـەوەتی فامـم كردۆتــەوە، خــوای بەبەزەیـی و بەخشــەر چاكـەی لەگــەڵ كـردووم و، بــە فەرمایشـتی بــەرزو بـێ وێنـەی خۆیــەوە ســەرگەرمی كـردووم و، بـەر لـە تەمـەنی بیســت ساڵیی یــەوە

---

((١) ئەوە پێی دەگـوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغـەمبــەر ﷺ هــاوەڵانی بەڕێزی فێـردەكرد، پێـش هــەر قســەیەكی گرنـگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازییكردن (خِطْبة)و... هتــدو، ئـەم وتــارە، هەركام لـە: التـرمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابـن ماجـە: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، طبـراني: (٢٤١٤) هێنـاویانەو (مسلم)یش بەشـێكی هێنـاوە.

هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرِّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعْضُهُ بَعْضاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوەو بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی[1] (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

---

(١) ئەوە لەکاتی دەستپێکردنی ئەم تەفسیرەدا، لە ساڵی (٢٠١٠ز) دا.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالی)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى**)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[١]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردار بوونی توانا و بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگات و، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووك و گورج و گۆڵ و دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردن و دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخریج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەت و ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر ساڵح و ساغ و سەلامەت و سەربەرزبێ[٢] لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنج و لاوانە لە کوڕان و کچان، لەنێو گەلەکەماندا، زۆر بکات.

---

((١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

((٢) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش شێلگیرانە لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوامە و، عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ .

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئان و دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو، سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین و، بە گوێرەی سوورەتەکان، بەرگەکانی دیاریی دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکاریيم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەكی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەكی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان كردوە كە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە كۆتایی هەر بەرگێكی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی كەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەكانیانمان بە ڕیز نووسیوە، بەڵام لێرەش وەك جەختكردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەكانمان نووسیوە، نە پێویست دەكات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆكەیەك، كە زۆربەی تەفسیرەكان لەبارەی ئایەتێكەوە، یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێكەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر كات بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتی یەكێك لە تەفسیرەكان هەبێ و بكەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بكەم، چ ڕەفزی بكەم، هەر كات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەكەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەكان لە كۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیكتیفا دەكەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بكەم، چونكە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێكی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتیی خۆمم دەربارەی كۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، كەچی ڕەنگە لە تەفسیرەكانی دیكەش - یەكێكیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە كە من ئەو تەفسیرەم نەكەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

پێویستە ئەوەش بگوترێ كە بۆ شیكردنەوەی وشەكان، بە پلەی یەكەم پشتم بە كتێبە ناودارەكەی (راغب الأصفهاني) (مفردات ألفاظ القرآن) بەستوە، بەڵام هەندێك

جاریش دەگەڕێمەوە بۆ هەندێك سەرچاوەی دیكە بەتایبەت: (مختار الصّحاح)ی (الرازي) و (المعجم الوسيط) و (صفوة البيان لمعاني القرآن)ی (حسنين محمد مخلوف).

# پێشەكی ئەم بەرگە

**الحمدلله الكبير المتعال، والصلاة والسلام و البركات على محمّد الّذي أنعم اللّه عليه بعد النبوّة والرِّسالة، ببلوغ الكمال في كل الأخلاق والخصال، وآله الكرام من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بصدق إلى يوم المآل.**

خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم !

ستایشی شایستە و سوپاسگوزاریی تێرو تەواو بۆ خوای بەرزی مەزن كە بە لوتف و بەزەیی بێسنووری خۆی یارمەتیی داین، ئەم بەرگی سێزدەیەم (١٣)ەش بە چاپ بگەیەنین، هەڵبەتە لە ئەنجامی هاوكاریی و دەستبارگرتنێكی خۆبەخشانە و دڵسۆزانەی برایانێكی لێبڕاوو ماندوونەناسدا، خوای بەخشەر بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو پێزی زیاتر بخاتە كارو تەمەنیانەوە.

ئەم بەرگی سێزدەیەمەش تەرخان كراوە بۆ سوورەتی **(النحل)** و لێكۆڵینەوەیەكی وردو پشوو درێژانەمان لەبارەی ئەم سوورەتە موبارەكەوە كردوە، كە خوای بە بەزەیی بەخشندە ژمارەیەكی زۆری چاكەو نیعمەتەكانی خۆی - زۆرتر لە هەر سوورەتێكی دیكەی قورئان - تێدا خستوونەڕوو، شایانی باسیشە ئەم بەرگە وێڕای تەفسیرو ڕونكردنەوەی چەمك و واتای ئایەتەكان، شازدە (١٦) كورتە باسی جۆراو جۆریشی گرتوونە خۆی، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**یەكەم:** كورتە باسێك لەبارەی حوكمی خواردنی گۆشتی وڵاخە بەهەرزە و ئێستر و كەر.

**دووەم:** كورتە باسێك: مەبەست لە (خوا شتی وا دروست دەكات كە نایزانن) چییە؟

**سێیەم:** كورتە باسێك لەبارەی زەیتونەوە.

**چوارەم:** كورتە باسێك حوكمی گۆشتی دەریاوە.

**پێنجەم:** كورتە باسێك: لەبارەی شیرو ماستەوە.

**شەشەم:** کورتە باسێك لەبارەی خورماوە.

**حەفتەم:** کورتە باسێك لەبارەی درەختی مێوو ترێ وە.

**هەشتەم:** کورتە باسێك لەبارەی هەنگ و هەنگوینەوە.

**نۆیەم:** کورتە باسێك لەبارەی چۆنیەتی پەیدابوونی زانستەوە.

**دەیەم:** کورتە باسێك لەبارەی باڵندان (طير)ەوە.

**یازدەم:** کورتە باسێك: چوار سەرنج لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (النحل:٩٠).

**دوازدەم:** کورتە باسێك لەبارەی گرنگیی وەفاداریی.

**سێزدەم:** کورتە باسێك لەبارەی (إستعاذة)ەوە.

**چواردەم:** کورتە باسێك: پێنج سەرنج بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە، کە ئایەتی (١٠١) مەبەست پێی نەسخ نیە.

**پازدەم:** کورتە باسێك لەبارەی حوکمی زۆر لێکرانەوە لەسەر کوفر و تاوان.

**شازدەم:** کورتە باسێك لەبارەی بنەما گرنگەکانی بانگەواز (الأصول المهمة للدعوة)ەوە.

هیواداریشم ئەم بەرگی سێزدەیەمەش، وەك بەرگەکانی دیکەی ئەم تەفسیرە: لەلایەن عەوداڵانی، قووڵ تێگەیشتنی قورئان و، پاشان چاك کارێك لەگەڵدا کردنی و کارپێکردنی، باش بخوێنێدرێتەوەو فام بکرێ و هەزم بکرێ و... هتد.

لە خوای بەخشی بێسنووریش داواکارین هەردەم هاوکارو هیدایەتدەرو پشتیوانمان بێ و، چاکەو نیعمەتی: تەواوکردنی ئەم تەفسیرەشمان پێ ببەخشێ.

١٣ ی شعبان ١٤٤١ ك

٦ / ٤ / ٢٠٢٠ ز

هەولێر

# دەستپێك

## پێناسەی سوورەتی (النحل) و بابەتەكانی

بەڕێـــزان !

ئەمڕۆ كە ڕۆژی: (٢٠١٧/٦/١٦ز) بەرانبەر: (٢١/رمضان/١٤٣٨ك) لە شاری هەولێر خوا پشتیوان بێ، دەست دەكەین بە تەفسیركردنی سوورەتی (النَّحل)، سەرەتا پێناسەی ئەم سوورەتە موبارەكە دەكەین و، نێوەڕۆكەكەی دەخەینە ڕوو، ئنجا نەخشەی خۆمان بۆ دابەشكردنی بابەتەكانی لە چەند دەرسێكدا دەخەینە ڕوو.

### ١) نـــاوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە، لەلای زانایانی پێشین بە گشتی، هەر بە (**سُورَةُ النَّحل**) ناسراوە، چونكە وشەی (**النحل**) واتە: هەنگ، كە هەم بە كۆ دەگوترێ، هەم بە تاكیش دەگوترێ، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

بەڵام لە (قَتَادَة)وە هاتوە، كە ئەم سوورەتە (**سُورَةُ النِّعَم**) واتە: سوورەتی نیعمەتەكانیشی پێدەگوترێ، سوورەتی چاكەكان، چونكە خوا ﷻ ژمارەیەكی زۆر لە چاكەكانی خۆی لەم سوورەتە موبارەكەدا خستوونە ڕوو، كە وەك سەرژمێرم كردوون، زیاتر لە پەنجا (٥٠) نیعمەتی سەرەكیی لەم سوورەتەدا خراونە ڕوو.

### ٢) شـوێنی دابەزینی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە، سوورەتێكی مەككەییە، لەلای زۆربەی زانایان و، ئەوە لە (**إِبْنُ عَبَّاس**) و (**إِبْنُ الزُّبَيْر**)یشەوە هاتوە، خوا لە خۆیان و بابیشیان ڕازی بێ.

بەڵام گوتراوە: سێ (٣) ئایەتی كۆتایی لە سوورەتی (**النحل**) لە كاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (ئوحود)دا، هاتوونەتە خوار، كە ئەم سێ ئایەتەن: ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا

صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾.

لەو کتێبانەدا کە باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی قورئان دەکەن، ئەوە باس کراوە، کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحوددا، دیمەنی حەمزەی مامی دەبینێ، کە کافرەکان ڕق و بوغزێکی تایبەتییان لە حەمزە هەبووە خوا لێی ڕازی بێ و، جەستەیان شێواندوە! پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوات، کە ئەگەر خوا دەستی بدات و لە جەنگێکی دیکەدا، بەسەر ئەو کافرانەدا زاڵ بێ، جەستەی ژمارەیەکی زۆریان بشێوێنێ، ئنجا هەندێك دەڵێن: فەرموویەتی: بیست (٢٠) و، هەندێك دەڵێن: فەرموویەتی: سی (٣٠)، خوای دادگەریش بەم بۆنەوە ئەم ئایەتانەی ناردنە خوارێ، کە ڕاستە ماناو کورتەی ماناکەیان بەم شێوەیە:

واتە: ئەگەر خەڵکتان سزادا، هەر بارتەقای ئەو سزایە، سزایان بدەنەوە، کە سزای ئێوەی پێدراوە، (واتە: ئەوان چییان لە ئێوە کردوە، ئێوەش هەر ئەوە بکەنەوە)، ئەگەر خۆڕاگریش بن، ئەوە باشترە بۆ خۆڕاگران و، خۆڕابگرەو خۆڕاگرتنیشت تەنیا بە خوایە و، دڵتەنگ مەبە بە هۆی ئەو پیلانەوە کە دەیگێڕن و سەغڵەت مەبە، بێگومان خوا لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە پارێز دەکەن و، لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە چاکەکارن.

ڕایەکی دیکەش هەیە، کە پاڵدراوەتە لای (**قَتَادَة**) و (**جَابِر بْن زَيْد**) دەڵێ: سەرەتای سوورەتی (**النحل**) هەتا ئایەتی ژمارە چل (٤٠) مەککەییە و، لە مەککە دابەزیوە، ئەوی دیکەی تا کۆتایی مەدینەییە و لە مەدینە دابەزیوە.

خاوەنی تەفسیری (**الميزان**)یش (**محمد حسين الطباطبائي**)[1]، ئەو ڕایەی هەڵبژاردوە و، ژمارەیەکی دیکەش لە ڕوونکەرەوانی ماناو مەبەستەکانی ئایەتەکانی قورئان، ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە.

خاوەنی تەفسیری (**التحرير والتنوير**)، (**محمد الطاهر بن عاشور**)، گوتوویەتی: ئەم سوورەتە هەندێکی مەککەییەو هەندێکیشی مەدینەییە، بەڵام دیاریی نەکردوە و، گوتوویەتی: هەندێکی پاش کۆچی ژمارەیەك لە هاوەڵان بۆ (حەبەشە) هاتۆتە خوار، بەپێی ئایەتی: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾.

---

(١) ج ١٢، ص ٢٢٢.

واتـە: دوایـی پـەروەردگارت، ئەوانـەی کـە کۆچیـان کـردوە، دوای ئـەوەی ئەشـکەنجەدراون و، پاشـان تێکۆشـاون و خۆڕاگربـوون، بێگومـان پـەروەردگارت، دوای ئـەوە (دوای ئـەو هەمـوو شـتانەی بەسـەریان هاتـوون)، لێبـوردەی بـە بەزەییـە.

هەروەهـا (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) دەڵـێ: ئـەم سـوورەتە هەندێـکی پـاش سـوورەتی (**الأنعـام**) هاتۆتـە خـوارێ، چونکـە ئایـەتی: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ ﴿١١٨﴾ ﴾الأنعـام، واتـە: لەسـەر جوولەکـەکان ئەوەمـان قەدەغـە کردبـوو، کـە پێشـتر بۆمـان خوێندبوویـەوە، مەبەسـت پێـی ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (**الأنعـام**)ە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾، کـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأنعـام**)دا، بـە تەفصیـل قسـەمان لەبـارەی ئـەو ئایەتـەو، سـەرجەم ئایەتـەکانی سـوورەتەکەوە، کـردوە.

(**محمد الطاهر بن عاشور**) لە (**التحرير والتنوير**)دا[1]، ئەوەی هێناوە.

## ٣) ڕیـزبەنـدیی ئەم سوورەتە لە موصحەف و دابەزین دا:

بـە ڕای زۆرێـك لـە زانایـان، ئـەم سـوورەتە پـاش سـوورەتی (**الأنبياء**) و پێـش سـوورەتی (**ألم السجدة**) دابەزیـوە و، ڕیزبەندیـی لـە هاتنـە خـوارەوەدا حەفتـا و دوو (٧٢)یـە، واتـە: پێـش ئـەم سـوورەتە (٧١) سـوورەتی دیکـە دابەزیـون.

بـەڵام ڕیزبەندیـی لـە (**مصحـف**)دا، شـازدە (١٦)یـە، چونکـە ئاشـکرایە کـە ڕیزکـردنی سـوورەتەکان لـە (**مصحف**)دا، بـە پێـی ڕیزبەندیـی دابەزینیـان نەبـووە، ئەگەرنـا دەبووایـە هەمـوو سـوورەتە مەککەییـەکان لـە پێشـەوە بـن و، سـوورەتە مەدینەییـەکان لـە دواوە بـن، کـە ئێسـتا بـەم شـێوەیە نیـە، سـوورەتی (**الفاتحة**) لـە پێشـەوەیە، کـە هەرچەنـد سـوورەتێکی مەککەییـە، هەندێکیـش دەڵێـن: مەدینەییـە، بـەڵام بێگومـان پێـش وی سـوورەتی دیکـە دابەزیـون، ئنجـا دوایـی وی یەکسـەر سـوورەتی (**البقرة**)یـە، ئنجـا (**آل عمـران و النسـاء و المائـدة**)ن، کە هەموویـان سـوورەتی مەدینەییـن، بەڵکـو سـوورەتی (**المائـدة**) بـە تایبـەت، لـە کۆتایـی تەمـەنی پێغەمبـەر ﷺدا هاتۆتـە خـوار، چونکـە ژمارەیـەك لـە سـزا شـەرعییەکانی تێـدان، ئنجـا دوایـی

---

(١) ج١٤، ص٩١ و ٩٢.

دێتەوە سەر سوورەتی (**الأنعام**) و (**الأعراف**) و، دوایی دێتەوە سەر (**الأنفال والتوبة**)، کەواتە: ڕیزبەندیی سوورەتەکان لە (**مصحف**)دا، جیایە لە ڕیزبەندییان بە پێی دابەزینیان.

ڕای بەندەش لەوبارەیەوە، ئەوەیە پێم وایە: ئەم سوورەتە هەمووی مەککەییە، بە سێ ئایەتەکەی کۆتاییشەوە، چونکە: بەڵێ، دەگونجێ ئەو سێ ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (**النحل**) لەگەڵ ئەو ڕووداوەی جەنگی (ئوحود)دا بگونجێن، بەڵام مەرج نیە، بەو بۆنەیەوە هاتبنە خوار، چونکە ئاشکرایە هەندێ لە زانایان بە هاوەڵانیشەوە خوا لێیان ڕازی بێ، ئایەتێك یان کۆمەڵە ئایەتێك کە گوتوویانە: پەیوەستە بە فڵان ڕووداوەوە، واتە: ئەو ڕووداوەش دەگرێتەوە، ئەگەرنا مەرج نیە لە کاتی ئەو ڕووداوەدا هاتبێتە خوار.

## ٤) نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە لە سورگەی بابەتەکانی قورئانی مەککەیی دا دەخولێتەوە، واتە: ئەو باس و بابەتانەی سوورەتە مەککەییەکان لەبارەیانەوە دەدوێن و، ئەم سوورەتەش سروشتی سوورەتە مەککەییەکانی هەیە بە گشتی، دیارە هەر کام لە سوورەتەکانیش، چ سوورەتە مەککەییەکان و، چ سوورەتە مەدینەییەکان، کەسایەتیی و تایبەتمەندیی خۆی هەیە، ئەم سوورەتەش بە هەمان شێوە و کۆمەڵێك بابەتی تێدان، کە لە سوورەتە مەککەییەکانی دیکەدا بەم شێوەیە نەهاتوون، هەروەها هەندێك بابەتی تێدان، کە تەنیا لێرەدا هاتوون، هەموو سوورەتە مەککەییەکانیش ئەو تایبەتمەندییانەیان هەن، بەڵام چوارچێوەیەکی فراوان هەیە هەموویان کۆدەکاتەوە، کە بریتیە لە باسی: (بووناسیی، ئیمان و عەقیدە، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، ڕەوشت و بەها بەرزو جوانەکان کە مرۆڤ دەبێ خۆییان پێ برازێنێتەوە، خووخدە خراپەکان کە مرۆڤ دەبێ خۆیانی لێ دوور بخاتەوە، بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەگەڵ گەلەکانیاندا، پشتیوانیی کردنی خوا ﷻ لە پێغەمبەران و لە شوێنکەوتووانی بڕوادارییان، دابەزینی سزاو تۆڵەی خوان بۆ گەلە سەرپێچیی کارەکان، دوای ئەوەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بەڵگەیان لەسەر تەواو کردوون و بیانوو بڕاویان کردوون، پاشان باسی سزاو پاداشتی خوا لە دواڕۆژدا، باسی بەهەشت، باسی دۆزەخ). سوورەتە مەککەییەکان لەو چوارچێوەیەدا دەسووڕێنەوە.

## دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ بیست و دوو (٢٢) بابەت

بابەتی یەکەم: پێشەکییەك، کە لە ئایەتی (١ تا ٩) دەگرێتەوە: کە تێیدا باسی چەند بابەتێکی بنەڕەتیی کراوە، کە دواتر دەبن بە پێڕست و پێشەکیی بۆ کۆی بابەتەکانی دیکە، وەك: هاتنی بڕیاری خوا بۆ سزادانی کافرەکان، دابەزاندنی فریشتان بۆ سەر پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی بە هەق و حیکمەت، دروستکردنی مرۆڤ، هێنانە دی ئاژەڵ و وڵاخ، کە بەهرەی جۆراو جۆریان لێ وەردەگیرێ، کە سەرجەم ئاماژە کراوە بە دە (١٠) لە نیعمەت و چاکەکانی خوا ﷻ لەم نۆ (٩) ئایەتە موبارەکەدا.

بابەتی دووەم: خستنەڕووی ژمارەیەك لە چاکەو نیعمەتە سەرەکییەکانی خوا ﷻ، لە ئایەتی (١٠ تا ١٨)، ئەمیش نۆ (٩) ئایەتی گرتۆتەوە، وەك: دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە، ڕواندنی ڕووەك و درەخت و لەوەڕگا، ڕامکردنی شەوو ڕۆژو، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان، هێنانەدی سەرجەم ئەو دروستکراوانەی لە زەویدا دروست دەبن، وەك: گیاو گوڵ و ڕووەك و دارودرەخت و میوەو، دانەوێڵە و... هتد، ئنجا ڕامکردنی دەریا، واتە: مل پێکەچکردنی دەریا، تاکو مرۆڤەکان بەهرەی لێ وەربگرن، چ وەك لێ دەرهێنانی خشڵ، چ وەك لێ دەرهێنانی خواردنێکی تەڕو تازە، کە مەبەست پێی گۆشتی ماسیی و باقی ژیاندارەکانی دیکەی دەریایە، کە بە ڕای زۆربەی زانایان هەموویان حەڵاڵن.

پاشان خوا باسی چەسپاندنی چیاکان دەکات لە زەوی دا، کە وەك لەنگەر وان بۆ زەوی، ئنجا باسی ئەستێرەکان دەکات، هەروەها باسی نیشانەکان دەکات، بۆ ئەوەی خەڵك بە ڕێگاو باناندا بڕوات بەهۆی ئەو نیشانانەوەو، بە ڕێگا بزانن.

بابەتی سێیەم: پێشاندانی چەند هەڵوێست و ڕەفتارێکی چەوتی کافرەکان و، سەرەنجامی شوومیان لەسەر ئەو هەڵوێستانە، چونکە سەرەنجامە شوومەکانیان باجی هەڵوێستە خراپەکانیانە، ئەمیش لە ئایەتی: (١٩ تاکو ٢٩) واتە: یازدە (١١) ئایەتی گرتوونەوە.

بابەتی چوارەم: خستنە ڕووی هەڵوێستی ئەرێنییانەی بڕوادارانی پارێزکارو سەرەنجامی باشیان، ئەمیش (٣) ئایەتی گرتوونەوە: (٣٠ - ٣٢).

بابەتی پێنجەم: خستنە ڕووی سەرەنجامی ترسناکی کافران لە ڕۆژی دوایی دا، ئەمیش ئایەتەکانی: (٣٣ و ٣٤)ی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی شەشەم: گێڕانەوەی قسەی هاوبەش دانەران: کە ئەگەر خوا ویستبای خراپە نەکەن و هاوبەش بۆ خوا دانەنێن و جگە لە خوا نەپەرستن و، ئەو خواردنانەی کە قەدەغەیان کردوون، قەدەغەیان نەکەن، ئەگەر خوا ویستبای، ئەوەیان نەدەکرد، واتە: ئۆباڵەکە دەخەنە ئەستۆی قەدەری خواوە، خواش ﷻ بەرپەرچیان دەداتەوە.

هەروەها نکووڵیی کردنیان لەوەی قیامەت بێ و، سزاو پاداشت هەبێ و لێپرسینەوە هەبێ، بەڵام خوای بەرز بەرپەرچی ئەوەشیان دەداتەوە، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤٠)دا، واتە: شەش (٦) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی حەوتەم: باسی کۆچکردن لە پێناو خوادا، ماڵ و حاڵ و نیشتیمان بەجێهێشتن، ئەمیش دوو ئایەتی بۆ تەرخان کراون، ئایەتەکانی: (٤١ و ٤٢).

بابەتی هەشتەم: باسی یاسای خوایە لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەروەها باسی دابەزاندنی قورئان و، ئەرکی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرانبەر قورئان و، ئەرکی خەڵکیش لەبەرانبەر دوا کتێبی خوادا، ئەمەش ئایەتەکانی: (٤٣ و ٤٤)ی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی نۆیەم: باسی هەڕەشەکردن لە کافرەکان و، خستنەڕووی ملکەچیی سەرجەم دروستکراوەکان بۆ خوا، کە هیچ شتێك نیە لە گەردووندا، لەو دروستکراوانەدا کە خوا خوڵقاندوونی، بە سەرو خوارەوە، بە ئاسمان و زەوییەوە، هیچ شتێك نیە لامل بێ لە یاساکانی خوا، هەمووی بۆ خوا ملکەچە، کڕنووش دەبات، ئەمیش شەش (٦) ئایەتی بۆ تەرخان کراون، ئایەتەکانی: (٤٥ - ٥٠).

بابەتی دەیەم: باسی چەند سیفەتێکی بنەڕەتیی خوا ﷻ، ئەمەش پێنج (٥) ئایەتی بۆ تەرخان کراون، ئایەتەکانی: (٥١ - ٥٥).

بابەتی یازدەیەم: باسی چەند بیروبۆچوونێکی چەوتی کافرەکان و سەرەنجامی شوومیان، ئەمیش ئایەتەکانی: (٥٦ - ٦٤)ی بۆ تەرخان کراون، واتە: نۆ (٩) ئایەت.

بابەتی دوازدەیەم: باسی ژمارەیەکی دیکە لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا، کە دەوری بیست (٢٠) چاکەو نیعمەتن، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (٦٥ - ٨٣)دا، واتە: نۆزدە (١٩) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی سێزدەیەم: باسی چەند دیمەنێکی ڕاچڵەکێنی کافرەکان لە قیامەت دەکات، ئەمیش شەش (٦) ئایەتی بۆ تەرخان کراون: (٨٤ - ٨٩).

بابەتی چواردەیەم: باسی فەرمانکردنی خوا بە دادگەریی و، چاکەکاریی و، بەخشین بە کەسە نزیکەکان، ئەمیش تەنیا ئایەتی ژمارە (٩٠)ی بۆ تەرخان کراوە.

بابەتی پازدەیەم: باسی پابەندیی بە بەڵێن و پەیمانەوەو، خۆپاراستن لە پەیمانشکێنیی و، بێ بەڵێنیی، کە حەوت (٧) ئایەتی بۆ تەرخان کراون، ئایەتەکانی: (٩١ - ٩٧).

بابەتی شازدەیەم: باسی قورئان خوێندن و، چەند بابەتێکی دیکەی پەیوەست بە قورئانەوە، کە هەشت (٨) ئایەتەکانی: (٩٨ - ١٠٥)ی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی حەڤدەیەم: باسی حاڵەتی هەڵگەڕانەوەو، حاڵەتی ناچارکران لەسەر کوفرکردن و، هاوبەش دانان، ئەمیش شەش ئایەتەکانی: (١٠٦ - ١١١)ی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی هەژدەیەم: ئاماژەیەك بە خەڵکی مەککەو، سپڵەییان بەرانبەر بە خواو، چاکەو نیعمەتەکانی خوا، کە ئایەتەکانی: (١١٢ و ١١٣)ی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی نۆزدەیەم: باسی ئەوە کە ئایا چی لە خواردن و خواردنەوەکان حەڵاڵە و، چیش قەدەغەیە؟ هەروەها سزای ئەوانەی کە بژیوە پاك و چاکەکانی خوا، لە بەندەکانی، بە ناهەق قەدەغە دەکەن، کە چوار ئایەتەکانی: (١١٤ - ١١٧)ی بۆ تەرخان کراون.

بابەتی بیستەم: باسی ئەوە کە کاتی خۆی لەسەر جوولەکەکان قەدەغە کرابوو، ئەمەش بیرهێنانەوەی مسوڵمانانە، بۆ ئەوە کە خوا لە سوورەتی (الأنعام)دا، فەرموویەتی، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا و، لە ئایەتەکانی: (١١٨ و ١١٩)دا، باسی ئەوە کراوە.

بابەتی بیست و یەکەم: باسی پێغەمبەر ئیبڕاهیم ﷺ خەلیلی خوا و، سیفەتە سەرەکییەکانی و، باسی مەسەلەی شەممە، کە دیارە ئەمە نەریتێکی جوولەکەکان بووە و، ئەو کاتەش هەبووەو، ئێستاش هەیە، ئنجا پاڵیان داوەتە لای ئیبڕاهیم ﷺ بۆیە خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە - بە بۆنەی باسی ئیبڕاهیمەوە - باسی شەممەش دەکات، کە تایبەتە بە جوولەکەکانەوە و، هیچ پەیوەست نیە بە ئیبڕاهیم ﷺ ەوە، ئەمیش لە ئایەتەکانی: (١٢٠ - ١٢٤)دا باسکراوە.

بابەتی بیست و دووەم و کۆتایی: باسی چۆنیەتیی و شێوازی بانگەواز بۆ لای خوا و، خۆڕاگریی لەسەر ئازارو ئەزیەتی کافرەکان، واتە: خراپ مامەڵەکردنی کافرەکان لەگەڵ کەسێکدا کە بۆ لای خوا بانگیان دەکات، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (١٢٥ - ١٢٨)دا، خراوەتە ڕوو.

### ٥) دابەشکردنی دەرسەکانی ئەم سوورەتە:

بـە پێـی نەخشـەی ئێمـە بـۆ تەفسـیر کـردنی ئـەم سـوورەتە، کـە ئێمـە وەك عـادەتی خۆمـان، - لـەم تەفسیرەدا - لـە سـەرەتاوە نەخشـەی تەفسیرکردنی ئایەتـەکان و، دابەشـکردنی بابەتـەکان بـۆ چەنـد دەرسێك، دادەڕێژین، بـۆ ئـەوەی بەرچاوی خوێنـەران ڕوونـتر بـێ: هـەر لـە سـەرەتاوە ئـەم سـوورەتە بـاسی چـی دەکات ؟

هەڵبەتـە مەرجیش نیـە ئـەو بیسـت و دوو بابەتـەی ئێمـە ئاماژەمـان پێدان، کـە بابـەتی وا هەیە لـە یـەك ئایـەت، یـان لـە دوو ئایەتـدا هاتـوە، یـەك دەرسی بـۆ تەرخـان بکەیـن، بەڵکو نەخشـەی دەرسـەکان جیایـە و، ئێمـە ئـەم (١٢٨) ئایەتەمـان دابـەش کـردوون بـۆ دوازدە (١٢) دەرس، بـەم شێوەیەی خـوارێ:

دەرسی یەکـەم: ئایەتـەکانی: (١ - ٩)، کـە وەك پێشـتر باسـمان کـرد: وەك پێشـەکیی وان بـۆ کـۆی بابەتـەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، کـە لـەو (١٢٨)دا ئایەتـەدا هاتـوون و، دە (١٠) چاکـەی خـوای بەخشەریشـیان تێـدا خراونـە ڕوو.

دەرسی دووەم: لـە ئایەتـەکانی: (١٠ - ٢١)، واتـە: (١٢) ئایـەت دەگرێتـەوە، کـە بریتیـە لـە خسـتنە ڕووی ژمارەیـەك لـە چاکـەو نیعمەتـەکانی خـوا، کـە سـەرجەمیان بیسـت (٢٠) چاکـەو نیعمەتـن.

دەرسی سێیەم: ئایەتـەکانی: (٢٢ - ٣٤)، واتـە: (١٣) ئایـەت، کـە خسـتنە ڕووی هەڵوێسـتی کافرەکانـە لـە بەرانبـەر خـواو، قوڕئانـدا، هەروەهـا هەڵوێسـتی پارێـزکاران، کـە پێچەوانـەی هەڵوێسـتی هاوبـەش بـۆ خوادانـەرو کافرەکانـە.

دەرسی چـوارەم: ئایەتـەکانی: (٣٥ - ٥٠)، واتـە: (١٦) ئایـەت، کـە کۆمەڵێـك بـاس و بابـەتی جـۆراو جـۆری پەیوەسـت بـە ڕاوبۆچـوونی هاوبـەش بـۆ خوادانـەران و کافـرەکان و، بەرپەرچدرانەوەیانــن.

دەرسـی پێنجـەم: ئایەتـەکانی: (٥١ - ٦٤)، واتـە: (١٤) ئایـەت، ئەمانیـش زیاتـر بـاسی تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ خـوا کـردن و، بەرپەرچدرانـەوەی ژمارەیـەك لـە بیروبۆچوونـە هەڵەوپەڵـەکانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـن، لـە ڕۆژگاری دابەزینـی قوڕئانـدا، کـە تـا ئێسـتاش ئەوانـە هـەر بەردەوامـن، لـە مـلاولای دنیـادا.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٦٥ - ٨٣)، واتە: (١٩) ئایەت، کە لەو ئایەتانەدا خوا ﷻ ژمارەیەکی دیکەی زۆر لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، کە سەرجەمیان بیست (٢٠) چاکەو نیعمەتن، واتە: بەو نۆ (٩) ئایەتەوە کە لە پێشەکیی ئەم سووڕەتەدا هاتوە، کە دە (١٠) چاکەو نیعمەتەکانیان تێدا خراونە ڕوو و، بەو دوازدە (١٢) ئایەتەوە، کە لە دەرسی دووەمدا دەیانخەینە ڕوو، کە باسی بیست (٢٠) لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا کراوە و، بە پێی ئەم نۆزدە (١٩) ئایەتەش، زیاتر لە پەنجا (٥٠) چاکەو نیعمەتی خوا خراونە ڕوو.

بۆیە زانایان، بە تایبەت قەتادە کە گوتوویەتی: ئەم سووڕەتە پێی دەگوترێ: (**سورة النعم**) سووڕەتی چاکەکان، نیعمەتەکان، ناهەقی نەبووە.

دەرسی حەوتەم: ئایەتەکانی: (٨٤ - ٨٩)، واتە: (٦) ئایەت، لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی کافرەکان دەکات لە ڕۆژی دوایی دا، کە چییان لێدێ و چی دەچێژن و، چۆن پەشێمانیی دەردەبڕن و دادیشیان نادات !

دەرسی هەشتەم: ئایەتەکانی: (٩٠ - ٩٧)، واتە: (٨) ئایەت، باسی فەرمانکردن بە دادگەریی و، فەرمانکردن بە بردنە سەری بەڵێن و پەیمان و، خۆ پاراستن لە پەیمان شکێنیی و بێ بەڵێنیی.

دەرسی نۆیەم: ئایەتەکانی: (٩٨ - ١٠٥)، واتە: (٨) ئایەت، کە باسی چۆنیەتی قورئان خوێندن و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئانداو، مامەڵەکردنی کافرەکان لەگەڵ قورئاندا و هەڵوێستیان بەرانبەر بە قورئان و بەرپەرچدرانەوەیان، کراوە.

دەرسی دەیەم: ئایەتەکانی: (١٠٦ - ١١١)، واتە: (٦) ئایەت، کە باسی هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام و، باسی ئەوانەشە کە ناچار دەکرێن هەڵگەڕێنەوەو، وشەی کوفرو شیرکیان بە دەمدا دێ، بەڵام ناچارن، کە ئەوانە خوا ﷻ لێیان دەبووریٚ، ئنجا پەیوەست بەم باسەوە: باسی کۆچکردن و بەجێهێشتنی نیشتیمانە، کە چۆن خوا لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا لێبوردەو میهرەبانە.

دەرسی یازدەیەم: ئایەتەکانی: (١١٢ - ١١٩)، واتە: (٨) ئایەت، چەند بابەتێکی جۆراو جۆرن، هەم باسی سپڵەیی و بێ نمەکیی کافرەکانی مەککە بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ و، هەم باسی ئەوە کە خوا چی حەڵاڵ کردوە، لە خواردنەکان و چی حەرام کردوە؟ هەروەها پێشتریش بە نسبەت جوولەکانەوە، خوا چی لێ قەدەغە کردوون ؟

دەرسی دوازدەیەم و کۆتایی: ئایەتەکانی: (١٢٠ - ١٢٨)، واتە: (٩) ئایەت، باسی ئیبراهیم ؏، کە سەرمەشقی ئەهلی ئیمانە، بە پێغەمبەری خاتەمیشەوە ﷺ کە خوا هەر لەو ئایەتانەشدا فەرمانی پێدەکات، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٢٣ ﴾، ئنجا پێغەمبەر ئیبراهیم ؏ کۆمەڵێك خەسڵەت و سیفەتی بەرزی هەبوون، کە خوای پەروەردگار لەم چەند ئایەتەدا هەندێکیان لێ دەخاتە ڕوو، هەڵبەتە هەر بەهۆی ئەو سیفەتانەشەوە بۆتە سەرمەشقی ئەهلی ئیمان لە دوای خۆیەوە.

پاشان باسی شێوازی بانگەوازو، باسی هەڵوێستی بانگەوازکاران بە پێغەمبەری خاتەمیشەوە ﷺ، کە سەرمەشق و پێشڕەویان بووە، لەگەڵ نەیارەکانیاندا، بەتایبەت ئەوانەی بە شێوەی بێ نەزاکەت و ناڕێك مامەڵە دەکەن.

ئەمە پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە بوو و، نەخشەی ئێمە بوو بۆ دابەشکردنی بابەت و دەرسەکانی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــزان !

لـەم دەرسـەدا، دێینـە سـەر خسـتنەڕووی نـۆ (٩) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**النحـل**) و، شیکردنەوەی مانـا و مەبەسـتەکانیان، ئەویـش وەك شـێوازی خۆمـان لـەم تەفسـیرەدا: بـە حـەوت هەنـگاو، کـە هەنـگاوی یەکەمیان پێناسـەی ئـەو کۆمەڵـە ئایەتەیە کـە دەمانەوێ تەفسـیریان بکەین:

ئـەم دەرسـە کـە نـۆ ئایەتـە و، وەك پێشـەکیی وان بـۆ کـۆی بابەتـەکانی سـوورەتی (**النحـل**)، سـەرەتا خـوای کاربەجـێ ڕوو بـە کافـرە هاوبەشـدانەرەکان دەفەرمـوێ: ئـەوە بڕیـاری خـوا هـات، پەلـەی لـێ مەکـەن، کـە دوایـی ڕوونی دەکەینـەوە، مەبەسـت پێـی چییـە ؟

پاشـان خـوا بـاسی پاکیـی و بەرزیـی خـۆی دەکات، لـە بەرانبـەر شیرکی هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـدا.

دوایـی بـاسی نـاردنی وەحیـی دەکات بـە فریشـتەکان دا بـۆ پێغەمبـەران (صەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بێـت) و، ئامانجـی نـاردنی ئـەو وەحییـە دەخاتەڕوو.

ئنجا باسی دروستکردنی گەردوون دەکات، کە بە هەق و حیکمەت دروستی کردوە.

دوایـی بـاسی دروسـتکردنی مـرۆڤ دەکات، کـە لـە تۆویلکەیەکـەوە هێناویەتـە دی و، پاشـان بـووە بـە کەسـێك بتوانـێ قسـە بـکات و، مشـتومڕ بـکات.

دوایـی بـاسی دروسـتکردنی ئـاژەڵان دەکات، هەروەهـا وڵاخـە بـەرزەو ئێسـترو گوێدرێـژ، پاشـان ئامـاژە دەکات بـە سـەرجەم هـۆکارەکانی دیکـەی بـارو سـوارو گواسـتنەوە، کـە خـوا ﷻ پەیدایـان دەکات و لـەو کاتـەدا کـە قورئـان دابەزیـوە، نەیانزانیـون: ﴿ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ ٨ النحـل.

لە کۆتایی دا باسی ئەوە دەکات، کە خوا بۆ ڕێی ڕاست، ڕێنمایی دەکات.

شـایانی باسـە ئـەو نیعمەتانـە کە لێـرەدا ئاماژەیـان پێکـراوە، سـەرجەمیان دە (١٠) نیعمەتن، بەڵکو زیاتریشـن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَـٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَـٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَـٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ۚ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. کارو بڕیاری خوا هات (ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان) پەلەی لێ مەکەن، پاکیی و بەرزیی بۆ وی لەوەی دەیکەنە هاوبەش (بۆ خوا) (١) فریشتان بە فەرمانی خۆی، بە ڕووح (وەحیی)یەوە دادەبەزێنێتە سەر هەر کام لە بەندەکانی (پێغەمبەران) کە بیەوێ، کە ئەی (پێغەمبەران!) (بەهۆی ئەو ڕووحەوە) خەڵك هۆشیار بکەنەوە و بترسێنن، کە جگە لە من (خوا) هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، دەجا پارێزم لێبکەن (٢) ئاسمانەکان و زەوی بە هەق ( و حیکمەت) دروستکردوون، بەرزیی بۆ وی لەوەی دەیکەنە هاوبەش (بۆ خوا) (٣) مرۆڤی لە تۆویلکەیەك وەدیهێناوە، کەچی بۆتە بە مشتومڕکەرێکی ئاشکرا (٤) ئاژەڵەکانیشی بۆ هێناونە دی، (پۆشاك و کەلوپەلێك و لە خوریی و تووك و موویان دروست دەکرێ) مایەی گەرم بوونەوەتانە و، سوود و کەڵکی جۆراوجۆریان لێ وەردەگرن و، لێشیان دەخۆن (٥) کاتێ - ئێواران - لە لەوەڕگا دەیانهێننەوە و - بەیانیان - بەریان هەڵدەدەنە لەوەڕگا، دیمەنێکی جوانی بۆتان هەیە (٦) کەلوپەل و بارە قورسەکانیشتان بۆ شوێنێك هەڵدەگرن، کە بە خۆ ئەزیەتدانی

زۆر نەبا، نەیدەگەیشتنێ، بە دڵنیایی پەروەردگارتان بە پەرۆش و بە بەزەییە ﴿٧﴾ وڵاخە بەرزە و ئێستر و کەرەکانیش بۆ سواربوون و بۆ جوانییتانن و، (خوا لە داهاتوودا) شتی واش دروست دەکات کە ئێستا نایزانن (بۆ هاتووچۆ و سەفەرتان) ﴿٨﴾ خواش ڕێی ڕاست (پێشاندان)ی لەسەرە و هەشیانە (لە ڕێیەکان) چەوت و لادەرە و، ئەگەر (خوا) ویستبای - زۆرتان لێبکات - هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست ﴿٩﴾}

## ڕوونکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( بِٱلرُّوحِ ): {الـرُّوحُ: مَـا بِـهِ حَيـاةُ النَّفْـسِ (يُذَكَّـر وَيُؤَنَّـث)، وَالنَّفْـسُ والنَّفَـسُ وَالقُـرْآنُ وَالوَحِـيُ وَجبرِيـل، وَالـرَّوْحُ: الرَّاحَـةُ، وَالرَّحْمَـةُ، وَنَسِـيمُ الرِّيـحِ}، وشـەی (رُوح) شـتێکە کـە مایـەی ژیـانی مرۆڤـە، کـە لـە زمـانی عەرەبییـدا، هـەم بـە (مُذَکَّـر) دێ، هـەم بـە (مُؤَنَّث)یـش، {(مُذَکـر) و (مُؤَنَّـث)ی مەجازیـی}، هەروەهـا وشـەی (رُوح) بـە مانـای (نَفْس)یـش دێ، بە مانـای هەناسـە (نَفَس)یش دێ، هەروەهـا بـە مانـای (قورئان)یـش دێ و، بـۆ سروش (وحي)یـش بەکارهێـنراوە و، بـۆ (جبريل)یـش بەکارهێـنراوە {وەك نـاو}، ئـەوە بەنسـبەت (رُوح)ەوە، بـەڵام (رَوْح) واتـە: ئاسـوودەیی و (رَاحَـة)، بەزەیـی و، شـنەبای فێنـك، بـەو مانایانـە دێ.

( نُّطْفَـةٍ ): (النُّطْفَـةُ: الْمَـاءُ الصَّـافِي، الجَمْـعُ نِطَـافٌ، والقَطْـرَةُ، وَالْمَنِـيُّ وَالجَمْـعُ نُطَـف)، (نُطْفَـة): بـە ئاوێـكی صـاف دەگوتـرێ، کـە بـە (نِطَـاف) کۆدەکرێتـەوە، هەروەهـا بـە تنۆکـە ئاوێکیـش دەگوتـرێ و، بـە تـۆو (مَنِـي)ش دەگوتـرێ، کـە کۆیەکـەی (نُطَـف)ە.

( خَصِيمٌ ): (الخَصِيـمُ: الكَثِيرُ الْمُخَاصَمَـة خَصَمْتُـهُ: نازَعْتُـهُ، خِصَامَـاً ومُخَاصَمَـةً)، (خَصِيـم) واتـە: زۆر ناکۆکییکـەر، زۆر مشـتومڕکەر، (خَصَمْتُـهُ) واتـە: (نازَعْتُـهُ خِصَامَـاً ومُخَاصَمَـةً)، یـانی: لەگەڵـی ناکـۆك بـووم، مشـتومڕم بـوو، (خصـام ومخاصمـة)ش، یـانی: مشـتومڕو ناکۆکیـی.

( وَٱلْأَنْعَـٰمَ ): (النَّعَـمُ: الإِبِـل، وَالأَنْعَـامُ: الإِبِـلُ وَالبَقَـرُ وَالغَنَـمُ)، واتـە: وشـەی (نَعَـم) تەنیـا حوشـتر دەگرێتـەوە، بـەڵام (أنعـام) حوشـتر و ڕەشـەوڵاغ و مـەڕو بزنیـش دەگرێتـەوە.

( دِفْءٌ ): (الـدِّفْءُ: خِـلَافُ الـبَرْدِ، وَالـدِّفْءُ: إِسْـمٌ لِـمَا يُتَدَفَّـأُ بِـهِ)، وشـەی (دِفء) واتـە: گەرمایی، گەرمبوونـەوە، پێچەوانـەی سـەرمابوونە و، وشـەی (دِفء) نـاوە بـۆ هـەر شـتێ کـە خـۆی پـێ گـەرم بکرێتـەوە، بەتایبـەتی لـە بـەرگ و پۆشـاك.

(تُرِيحُونَ): (المُرَاحُ: حَيْثُ تُرَاحُ الإِبِلُ، الإِرَاحَةُ: فِعْلُ الرَّوَاحِ، وَهُوَ الرُّجُوعُ إِلَى المَعَاطِنِ)، (مُرَاح) واتە: لەوەڕگا، (إِرَاحَة) کردەوەی (رَوَاح)ە، (رَواح) بریتیە لە گەڕانەوە لە دوای لەوەڕ، گەڕانەوە بۆ تەویلە و بۆ ئەو شوێنەی کە وڵاخەکان تێیدا پشوو دەدەن، لە کوردیی دا (پشتیر، تەویلە، ئاغەڵ)ی پێدەڵێن.

(تَسۡرَحُونَ): (السُّروحُ: الإِسَامَةُ، أي: الغُدُوُّ بِهَا إِلَى المَرَاعِي)، وشەی (سَرَحَ، يَسْرَحُ، سروحَاً)، واتە: وڵاخەکانی بەردا بۆ لەوەڕ، ناردنی بۆ لەوەڕ، (الإِسَامَةُ) واتە: لەوەڕاندن، ئەوەیە کە بەیانیان زوو دەیانبەن بۆ لەوەڕگا.

(أَثۡقَالَكُمۡ): (أَثْقَال: جَمْعُ ثَقَل: المَتَاعُ، الشيءِ النَّفِيس، الخَطِير، ثِقْل: هُوَ وَزْن)، وشەی (أَثْقَال) کۆی (ثَقَل)ە، (ثَقَل) واتە: کەلوپەلێك، یان شتێکی بەنرخ و، شتێك کە جێی بایەخ بێ، بەڵام (ثِقْل) واتە: کێش.

(بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِ): (الشِّقُّ: المَشَقَّةُ وَالإِنْكِسَارُ الَّذِي يَلْحَقُ النَّفْسَ وَالبَدَن): (شِقّ) بریتیە لەو زەحمەت و قورسییە و، ئەو تێشکانەی کە بەهۆی ماندووبوونەوە تووشی جەستە و ڕووحی ئینسان دێ، ئینسان کە زۆر شەکەت و ماندوو دەبێت، پێی دەگوترێ: (مَشَقَّة)، (شِق)یش بە مانای زەحمەت و قورسیی دێ.

(وَٱلۡخَيۡلَ): (جَمَاعَةُ الأَفْرَاسِ لاَ وَاحِدَ لَهُ مِنْ لَفْظِهِ، الفَرَس، وَقِيلَ الجَمْعُ أَخْيَال وَخِيُول)، (خیل) واتە: کۆمەڵی ئەسپان، تاکی نیە لە بێژەی خۆی، بەڵام دەگوترێ: (فَرَس)، واتە: یەك ئەسپ، بەڵام (خَيْل) واتە: کۆمەڵە ئەسپێك، گوتراویشە: وشەی (خَيْل) بە (أَخْيَال، خِيول)یش کۆ دەکرێتەوە، هەرچەندە بۆخۆشی هەر کۆیە، کەواتە: (أَخْيال وخِيول) دەبنە کۆی کۆ (جَمْعُ الجَمْع).

(وَٱلۡبِغَالَ): (جَمْعُ بَغْل: المُتَوَلِّدِ مِنْ بَيْنِ الحِمَارِ وَالفَرَس)، (بَغْل) بریتیە لەوەی کە لە نێوان کەر و ئەسپدا پەیدا دەبێ، واتە: ئەسپ و کەر کە پێکەوە جووت دەکرێن، ئەوەی کە لێیان پەیدا دەبێ، پێی دەگوترێ: (بَغْل)، مێیەکەی (بَغْلَة)یە، کە نەزۆکە و نێرەکەشی: بارگین (بـرذون)ە.

(قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ): (القَصْدُ: إِستِقَامَةُ الطَّرِيق)، (قَصْد) واتە: ڕێی ڕاست، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾، واتە: لەسەر خوایە ڕێی ڕاست و، بە ئامانج گەیەنەر، ڕوون بکاتەوە.

( جَآئِرٌ ): (الجَـوْرُ وَالجَائِـرُ)، واتـە: لادەر، سـتەمکار، (جَائِـر: عَـادِلٌ عَـنِ الْمَحَجَّـة) لادەر لـە ڕێـی ڕاسـت، (وَالجَائِـر: هُـوَ الَّـذِي يَمْتَنِـعُ مِـنْ الْتِزَام مَـا يأمـرُ بـهِ الـشَّرْعُ)، (جائـر) ئـەو کەسـەیە کـە لامليـی دەکات لـە پابەندبـوون بـەوەی کـە شـەرع فەرمـانی پێکـردوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ﴾، واتـە: لـە ڕێیـەکان هەیـە ڕێـی لادەرە، یاخـود ڕێیـەکی لارە، هـەر کەسـێ پێیـدا بـڕوا، تـووشی لادان دەبـێ و بـە ئامانـج نـاگات.

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئـەم نـۆ (٩) ئایەتـە موبارەکـە، وەك گوتمـان: وەك پێشـەکی وان بـۆ کـۆی بـاس و بابەتـەکانی سـووڕەتی (النحـل)، خـوا ﷻ سـەرەتا دەفەرمـوێ:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بەناوی خوای بە بەزەیی بە بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە هێنانی ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەست پێی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

٢ - بە پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣ - بە توانا و یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٤ - بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

﴿ أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، لێـرەدا گومـانی تێدانیـە کـە ڕووی دوانـدن لـە کافرەکانـە و، لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـە، لەوانـەی کـە نەیـاری پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـوون، کـە لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا هاتـوە، پەلەیـان کـردوە، وەك هەمـوو ئـەو گـەل و کۆمەڵگایانـەی کـە لـە ڕابـردوودا، پێـش پێغەمبـەری خاتـەم فەوتـاون، هەمیشـە پێغەمبـەرانی خۆیانیـان هەڵپێچـاوە و، پەلەیـان لێکـردوون، کـە سـزای خۆیـان بـۆ بێنـن! ئنجـا خـوا ﷻ لـە وەڵامـی ئـەم هەمـوو پەلەکـردن و تاڵووکـە کردنەیانـدا، لـەوە سـزایان بـۆ بێـت، لـە دنیـادا، یاخـود قیامـەت بـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ ﴾، فەرمـانی خـوا، کارو

بڕیاری خوا هات، ﴿ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ ﴾، پەلەی لێ مەکەن، واتە: پەلە لە خوا مەکەن کە سزایەکە بێنێت، یاخود پەلە لە هاتنی بڕیاری خوا مەکەن، بڕیاری خوا بە سزادانتان، ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، خوا پاکە و بەرزە لەوەی کە ئەوان دەیکەنە هاوبەش بۆ خوا، واتە: خوا زۆر لەوە پاك و بەرزترە، بهێنرێتە ئاست دروستکراوەکانی خۆی و، دروستکراوەکان وەك خوا ﷻ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان وا دەکەن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ڕاگەیاندنی چەند ڕاستییەکی بنەڕەتیی، کە هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە چەند ڕاستییەکی بنەڕەتیین، کە ئایین و بەرنامەی خوا بە بناغەی گرتوون، لە هەمان کاتدا: نیعمەت و چاکەی بەرز و ناوازەی خوای پەروەردگاریشن، دەفەرموێ: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ ﴾، فریشتان بە ڕووحەوە بە فەرمانی خۆی دادەبەزێنێ، بۆ سەر هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ.

گومانی تێدانیە کە وشەی (**روح**) لێرەدا مەبەست پێی وەحییە، وەك خوا ﷻ لە کۆتایی سوورەتی (**الشورى**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ... ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: ئاوا بەم شێوەیە ڕووحێکمان لە ئایینی خۆمان بۆ تۆ دابەزاند، کە مەبەست لە ڕووح: قورئان و وەحیی و پەیامی خوایە، چونکە وەك چۆن ڕووح جەستە دەپارێزێ و، جەستە بەبێ ڕووح ناتوانێ بەردەوامبێ، ژیانی مرۆڤیش بەبێ پەیام و، وەحیی خوا، ناتوانێ بەردەوام بێ، ئەو بەردەوام بوون و ژیانەی کە شایستەی مرۆڤ بێ، بەڵێ، ژیانی ئاژەڵانە، ژیانی دڕندانە، بەردەوام دەبێ، بەڵام ژیانێك کە شایستەی مرۆڤ بێ، ژیانێك کە ڕازاوە بێ بە ئاکارە بەرزەکان، بە بەها بەرزەکان، لە پێش هەموویانەوە، تەنیا خوا بە پەرستراو گرتن و، لەگەڵ خەڵکدا بە چاکە مامەڵەکردن، ئەوە بەردەوام نابێت، مەگەر لە سایەی وەحیی دا.

کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ ﴾، لەسەر هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ، بە دڵنیایی مەبەستی پێ پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، چونکە جگە لە پێغەمبەران، وەحیی بە مانا زاراوەییەکەیان بۆ نەهاتوە، ئیدی کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**القصص**) دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ... ﴿٧﴾ ﴾، زانایان دەڵێن: مەبەست لە وەحیی لێرەدا، ئیلهام و خورپە خستنە نێو دڵە، هەروەها کاتێ کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**النحل**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ... ﴿٦٨﴾ ﴾، پەروەردگارت وەحیی کرد بۆ

هەنگ، واتە: فێریکرد و، بەو شێوەیە خوڵقاندی کە ئەو کارانە ئەنجام بدات، وەك ئەوەی بە پەنهانیی فێری کردبێ و، پەیامێکی تایبەتیی خۆی بۆ ناردبێ.

﴿أَنْ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ﴾، خوا فریشتەکان بە ڕووحەوە، بە فەرمانی خۆی دادەبەزێنێ بۆ سەر هەر کام لە بەندەکانی، کە ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ﴿أَنْ أَنذِرُوٓاْ﴾ بترسێنن! کێ بترسێنن و هۆشیار بکەنەوە؟ خەڵك هۆشیاربکەنەوە، ﴿أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾، کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، ﴿فَٱتَّقُونِ﴾ کەواتە: پارێز لە من بکەن و، خۆتان بپارێزن لەوەی کە من پێم ناخۆشە، خواش ﷻ پێی ناخۆشە: ئەرکەکان بچوێنرێن و قەدەغەکراوەکانیش بشکێنرێن.

ئنجا خوا باسی نیعمەتێکی دیکەی خۆی دەکات، کە بریتیە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾﴾، واتە: ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانیمان بە باطیڵ نەخوڵقاندوون، کەواتە: (حق) پێچەوانەی (باطل)ە، (هەق) واتە: شتی چەسپاو و لەگەڵ واقیع دا گونجاو، بەڵام (باطیڵ) واتە: شتی پووچ و بۆش و بێ بنەما.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾﴾، واتە: ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی نێوانیانیمان بە گاڵتە نە خوڵقاندوون.

دیسان لە سوورەتی (الدخان)یش دا هەمان شت دووبارە دەبێتەوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾﴾، کەواتە: (حَق) پێچەوانەی (باطل) و پێچەوانەی یاریی و گەمەیە، یاریی و گەمە شتێکە هیچ ئامانجێکی لە پشتەوەنیە و، (باطیڵ)یش شتێکی بێ بنەمایە، کەواتە: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بنەمایەکی هەیە، حیکمەت و ئامانجێك لە پشتییەوەیە، ئەویش بریتیە لە چی ؟!

لە سوورەتی (الجاثیة)دا خوا ﷻ - وەك دواییش باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا - زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون،

بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی ئەوەی ئەنجامی داوە (بە پێی کردەوەکانی) سزا، یان پاداشت بدرێتەوە.

کەواتە: ئەوە ئەو هەقەیە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی بۆ هێناونە دی، بەنسبەت ئێمەی مرۆڤەوە، بەڵام ئایا خوا هەر ئەو حیکمەتەی هەیە و، تەنیا ئەو هەقە ڕەچاوکراوە لە دروستکردنی گەردووندا ؟! وەك لە باسێکی سەربەخۆدا لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**) دا گوتوومانە: ناتوانین بڵێین، بەڵێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە هەقێك کە خوا ﷻ بۆ هێنانە دی، گەردوونی بە سەروو خواریەوە، بە ئاسمان و زەوییەوە، بۆ دروست کردوە، ئەوەیە کە مرۆڤ تاقی بکاتەوە و، پاشان بە پێی کردەوەکانی خۆی سزاو پاداشت وەربگرێتەوە.

﴿ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، خوا بەرزە لەوەی ئەوان دەیکەنە هاوبەشی.

ئنجا دێتە سەر خستنەڕووی ڕاستییەکی دی، کە لە هەمان کاتدا نیعمەتێکی زۆر گەورەی خوایە: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، (خوا) ئینسانی لە نوتفەیەك دروستکردوە، (**نُطْفَة**) وەك دوایی باسی دەکەین، واتە: ئاوێکی کەم، یان تنۆکە ئاو، ﴿ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴾، دواتر بووە بە مشتومڕکەرێکی ئاشکرا، یان مشتومڕکەرێکی ڕوونکەرەوە بۆ مەبەستەکانی خۆی.

ئنجا دێتە سەر باسی نیعمەتێکی دیکە، کە چەندان نیعمەتی تێدان: ﴿ وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ﴾، هەروەها (خوا) ئاژەڵەکانیشی خوڵقاندوون و هێناونیە دی، (**أنعام**) بە چوار جۆرە ئاژەڵ دەگوترێ: {حوشتر، ڕەشەوڵاخ (گا و مانگا و گامێش)، مەڕو بزن}، هەموویان بە نێرو مێیانەوە، کە دیارە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأنعام**) لە دوو ئایەتی: (١٤٣ و ١٤٤)دا، باسیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ﴾، هەر چوار جۆری ئاژەڵەکان بە نێرو مێیانەوە دەخاتەڕوو، کە لەوێ بە ڕوونیی باسمانکردوە و، نێرو مێی هەرکامێکیشیان چی پێ دەگوترێ، لەوێ خستوومانەتە ڕوو.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ ﴾:

أ- دەگونجێ ﴿ لكم ﴾ پەیوەست بێتەوە بە ﴿ دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ ﴾، ﴿ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ ﴾ واتە: بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا هەیە، گەرمکردنەوەو، سوود گەلێکی زۆر، ﴿ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ هەروەها لە بەروبووم و گۆشتەکەیان دەخۆن.

ب- دەشگونجێ پەیوەست بێ بە (خَلَقَهَا)وە: ﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَا لَكُمۡ ﴾، خوا ئاژەڵەکانی بۆ ئێوە دروست کردوون، ﴿ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴾، هەردوو واتاکە لێك نزیکن.

(دِفۡءٞ) ئەو شتانەن کە ئینسان پێیان گەرم دەبێتەوە، لە بەرگ و پۆشاك و کەلوپەل و چادرو ڕەشماڵ، کە لە تووك و موو و خوریی ئەو ئاژەڵانە دروست دەکرێن، کە هی حوشتر پێی دەگوترێ: تووك (وَبَرْ) و، هی مەڕ پێی دەگوترێ: خوریی (صُوف) و، هی بزن پێی دەگوترێ: موو (شَعْر)، بەڵام ڕەشەوڵاخ، بایی ئەوەندە تووك و موویان پێوە نیە، کە لێیان بکرێتەوە.

﴿ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ﴾، هەروەها بۆ ئێوە جوانیی هەیە لەو ئاژەڵانەدا، کاتێ دەیانهێننەوە لە لەوەڕگا و، کاتێ کە بەڕێیان دەکەن لە ئاغەڵ و تەویلەکانی خۆیان دەریاندەکەن، بۆ لەوەڕ، ئنجا زانایان گوتوویانە: بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ حِينَ تُرِيحُونَ ﴾ کاتێ دەیانهێننەوە لە لەوەڕ، هێنانەوە لە لەوەڕی پێش خستوە، چونکە ئەو ئاژەڵانە کاتێك دێنەوە بە تێر و پڕی، چالاکی و زەوقێکی دیکەیان هەیە! بەڵام کاتێ کە بەیانیان بە برسیەتیی بەڕێ دەکرێن بۆ لەوەڕگا، سیس و بێ هێزن! ئنجا خواش ﷻ باسی جوانیی دەکات و، جوانییەکەش بە زۆریی لە کاتێ دایە کە ئاژەڵەکان دێنەوە لە لەوەڕگا، ئەوە بارەی مەڕ و بزنە! ئەوە هۆڕەی مانگا و گایە، ئەوە ڕوغائی حوشترە! ئەوە حیلکەی ئەسپ و ماییـنە! واتە: هەم دیمەنەکەیان و هەم دەنگ و سەدایان جوانتر و خۆشترە لە کاتی گەڕانەوەی ئێواراندا، کەسێکیش لە لادێ بووبێ، یان دەوارنشین بووبێ، دەزانێ کە ئاژەڵەکان لەو کاتەدا دیمەنێکی زۆر جوان و دڵ بزوێن و سەرنج ڕاکێشیان هەیە!

هەڵبەتە خواش ﷻ جوانیی ڕەچاوکردوە، لە دروستکراوەکانی خۆیدا و، پێشی خۆشە مرۆڤەکانیش جوانییەکانی کە خوا لە دروستکراوەکانی دا دروستیکردوون، بیانبینن، بۆیە سەرنجیان بۆیان ڕادەکێشێ.

ئنجا خوا سوودێکی دیکەی ئەو ئاژەڵانە دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِ ﴾، هەروەها ئاژەڵەکان کەلوپەلە قورسەکانتان هەڵدەگرن، بۆ وڵاتێك و شوێنێك کە ئەگەر هەر خۆتان بوونایە زۆر بە زەحمەت بەو شوێنانە دەگەیشتن و دەتانتوانی: بار و کۆڵەکانتان بگەیەننە ئەوێ، ﴿ إِنَّ

﴿ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان پەروەردگاری ئێوە، بە پەرۆشە و زۆریش میهرەبانە و بە بەزەییە، (رؤوف) واتە: پەرۆشی ئێوەیەتی، پێی ناخۆشە تووشی ناڕەحەتیی بن و، بە بەزەیی و میهرەبانیشە و پێی خۆشە خێر و چاکەتان تووش بکات.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ﴾، هەروەها (خوا) وڵاخە بەرزەو ئێسترەکان و کەرەکانی دروست کردوون، تاکو سواریان بن و، جوانییشیان تێدایە، ﴿ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، شتی واشتان بۆ دروست دەکات کە نایزانن.

هەڵبەتە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان، کاتێ خۆی گوتوویانە: ﴿ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، مەبەست ئەوەیە کە خوا لە بەهەشتدا دەیخوڵقێنێ، کە ئێستا نایزانین چۆنە! کە بە دڵنیاییەوە ئەوە دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا مادام باسی دنیایە، نەخێر، چەمك و واتایەکی دیکەشی هەیە، کە زانایانی پێشوو ناهەقیان نەبووە نەیزانن، ئەویش ئەوەیە کە خوا ئاماژە دەکات بە هۆیەکانی هاتووچۆی ئاسمانیی و، زەمینیی و، دەریایی و، ژێر دەریایی، کە لەو دوو سێ سەدەیەی دواییدا خوا ﷻ توانای داوە بە مرۆڤ دروستیان بکات، کە دەبینین جۆرەکانی ئۆتۆمۆبێل، کەشتیی، فڕۆکە، پاپۆڕی ژێر دەریایی و، شەمەندەفەر، هەموو ئەو شتانەی کە خوا یارمەتی مرۆڤی داوە، دروستیان بکات، بۆ ئەوەی سەفەر و هاتوچۆی خۆیانی پێ ئەنجام بدات.

لە کۆتاییی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ﴾، ڕوونکردنەوەو پێشاندانی ڕێی ڕاست لەسەر خوایە، زانایان دەڵێن: لێرەدا شتێك قرتێنراوە و بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، یانی: (**وَعَلَى اللَّهِ بَيانُ قَصْدِ السَّبِيلِ**)، لەسەر خوایە کە ڕوونی بکاتەوە ڕێی ڕاست و بە ئامانج گەیەنەر بۆ بەندەکانی، کامەیە؟ ﴿ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ﴾ هەندێ لە ڕێیەکانیش هەن کە لادەرن، ئنجا ﴿ جَآئِرٌ ﴾ بە مانای لادەرە، واتە: (**وَمِنْهَا جَآئِرٌ سائِرُهَا**) ئەوەی کە پێی دا دەڕوا لار و لادەرە (**جَائِر**)ە، بەڵام خوا سیفەتەکەی پاڵ داوەتە لای ڕێیەکان، یانی: هەر کەسێك پێی دا بڕوات، تووشی لادان و دوورکەوتنەوە دەبێت لە هەق، ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ئەگەر (خوا) ویستباشی هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، لێرەدا نابێ (**هَدَاكُم**) بەوە لێکبدرێتەوە، کە مەبەست لە (**هَدَاكُم**) ڕێنمایی کردن و ڕێ پێشاندانە، کە بە داخەوە زۆرێك لە تەفسیرەکان، هەم تەفسیرە عەرەبییەکان، هەم کوردییەکان، ئەوەیان ڕەچاو نەکردوە و، هەر گوتوویانە: ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی ڕێنمایی دەکرد، بەڵام ئەو لێکدانەوەیە هەڵەیە، چونکە خوا ویستوویەتی هەمووان

ڕێنمایی بکات، ویستن بە مانای (المَشِيْئَةُ التشريعية)، خوا هیدایەتی ناردوە بۆ هەمووان، ئەوەی ویستوە و بڕاوەتەوە، ئەدی ئەو هیدایەتەی خوا دەیبەستێتەوە بە ویستی خۆیەوە چییە؟!

واتە: ئەگەر ویستبای هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، ئەمما ڕێی ڕاست بۆ ڕوونکردنەوە، ئەوە خوا ویستوویەتی و کردوویەتی، چونکە پێشێ فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾ لەسەر خوایە ڕێی ڕاست بۆ خەڵك ڕوون بكاتەوە ؟!

کەواتە: ئەوی ویستوە و بڕاوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە بەستوویەتەوە بە ویستی خۆیەوە (وَلَوۡ شَآءَ) ئەگەر ویستبای، بریتیە لە خستنە ڕێی ڕاست، کە بێگومان نەیویستوە هەمووان بخاتە سەر ڕێی ڕاست، ئنجا پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: بۆچی خوا نەیویستوە، هەمووان بخاتە سەر ڕێی ڕاست ؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە:

لەبەرئەوەی نەیویستوە زۆریان لێبکات، بەڵکو ویستوویەتی ئازادیان بکات، ئەگەرنا ئەگەر ویستبای زۆریان لێبکات، وەك فریشتەکان، کە هیچ کامیان لە فەرمانی خوا دەرناچن، وەك ماددەی بێ ژیان، وەك گەردیلەکان و کەهکەشانەکان و، وەك ڕووەك و ئاژەڵ و زیندەوەرەکان، هیچیان لە فەرمانی خوا دەرناچن، دەیتوانی، بەڵام نەیویستوە مرۆڤ ناچار بکات و، بیبەستێتەوە بەو یاسایانەوە کە دایناون، بەڵکو ویستوویەتی دەستی ئاوەڵابێت و کراوە بێ، چونکە ئەگەر وانەبێ، بە کەڵکی تاقیکردنەوە نایەت و، بە کەڵکی جێنشینایەتی خوا نایەت لەسەر زەوی، کەواتە: (وَلَوۡ شَآءَ: يَعْنِي: وَلَوْ شَاءَ مَشِيئَةَ إِجْبارٍ)، واتە: ئەگەر خوا ویستبای زۆرتان لێ بکات، ﴿لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾، یانی: (لأَرشَدَكُمْ أَجمَعِين)، چونکە (أَرْشَدَكُم) واتە: دەیخستنە سەر ڕێی ڕاست، یانی: (لَجَعَلَكُم أَجمَعِين عَلَى الصِّرَاطِ المُستقِيم) هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام خوا ویستوویەتی بۆتانی ڕوون بکاتەوە، بەڵام دوایی خۆتان بە ویستی ئازادانەی خۆتان ڕێی ڕاست بگرنەبەر، یان نەیگرنەبەر، ئنجا کە ئازادیشی کردوون، هەندێکتان ڕێی ڕاستتان گرتوە، بە ویستی ئازادانەی خۆتان و، هەندێکیشتان ڕێی چەوت و لارتان گرتۆتەبەر.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**هاتنی فەرمان و بڕیاری خوا، بۆ سزادانی بێبڕوایان، شتێکی مسۆگەرە:**

ئەو مەسەلەیەمان لە ئایەتی یەکەم هەڵێنجاوە، خوا دەفەرمویٚ: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾، فەرمانی خوا هات، یان بڕیاری خوا هات، (**راغب الأصفهاني**) گوتوویەتی: (**الأَمْرُ: مَصْدَرٌ بِمَعْنَى المَفْعُولِ كَالْوَعْدِ بِمَعْنَى المَوعُودِ، أَي: مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ وَالمُرَادُ بِهِ: تَقْدِيرُهُ وَإِرَادَةُ حصُولِهِ فِي الوَقْتِ المُقَرَّر**)، یانی: وشەی (أَمر) چاوگە، بە مانای (**مفعول**)ە، وەك چۆن (**وَعْد**) بە مانای (**مَوعُود**)ە، واتە: بەڵێن پێدراو، یان بەڵێن دراو، ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ واتە: (**مَأمُورُ اللَّهِ**)، واتە: ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە، کە مەبەست پێی ئەندازەگیریی خوا و ویستی خوایە، بۆ پەیدابوونی شتەکان لە کاتی دیارییکراودا.

بێگومان ڕووی دواندن لە هاوبەش دانەرەکانە، چونکە ئەوان پەلەیان دەکرد، کە سزای خوا بێ و ئەوان پێغەمبەرانیان (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) هەڵدەپێچا، ئەوە سیفەتی ئەوانە.

کەواتە: بێگومان ڕووی دواندن لەوانە، دەشگونجێ بڵێین: ڕووی دواندن لە بڕوادارانە، چونکە زۆرجار ئەوانیش کە کافرەکان هەڵیان پێچاون، بە دڵیاندا هاتوە: دەبێ کەی خوا سزایان بدات؟! یان دەبێ کەی ئێمە سەربخات ؟! ئەوەش دەگونجێ، واتە: ئەوە بڕیاری خوا هات بە سەرکەوتنتان و بە لەبەینبردنی دوژمنانتان و، زەبوون کردنیان، پەلەی لێمەکەن.

بەڵام مانای یەکەم زیاتر دەچێتە دڵەوە، کە ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ، چونکە ئەوان خوا زۆری لێ گێڕاونەوە لە قورئاندا، کە لە هاتنی

سزادا پەلەیانکردوە، هەم لە پێغەمبەری خاتەم (**محمد**) ﷺ و هەم کافرەکانی دیکەش بۆ پێغەمبەرانی دیکە، زۆر هەڵیان پێچاون، پەلەیان کردوە و تاڵووکەیان کردوە کە زوو سزامان بۆ بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن !

٢)- ﴿ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ ﴾ (**الإِسْتِعْجَالُ: طَلَبُ تَعْجِيلِ حصُولِ شَيء**)، (**إِسْتِعْجَال**) بریتیە لە داواکردنی بە پەلە هاتنی شتێك، شتێك بە پەلە پەیدابێ، ئەوەش دوو واتای هەن:

**یەکەم:** (**لاَ تَسْتعْجلوا اللَّهَ بامْرِهِ**)، واتە: پەلە لە خوا مەکەن فەرمانەکەی بێنێ.

**دووەم:** (**لاَ تَتَعَجَّلوا أَمْرَ اللَّه، أَي: لاَ تَستعْجِلُوا بِهِ**)، واتە: پەلە مەکەن بڕیاری خوا بێت و، فەرمان پێکراوی خوا بێت.

٣)- ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، خوا پاکە و، بەرزە، لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی، پیتی (ما) لە وشەی (عَمَّا)دا، چاوگە (**مَا: مَصْدَرِية**)، کەواتە: (عَمَّا يُشۡرِكُونَ) (**يَعْنِي: عَن إِشْرَاكِهِمْ غَيْرَهُ مَعَهُ**)، خوا پاکە و بەرزە لەو هاوبەش بۆ دانانەی کە کافرەکان ئەنجامی دەدەن و جگە لە خۆی دەکەنە هاوبەشی.

ئنجا زۆربەی قورئان خوێنان (**قرّاء**) خوێندوویانەتەوە: ﴿ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، بەڵام (**حَمْزَة وكِسائِي**) خوێندوویانەتەوە: (**عَمَّا تُشْرِكُون**) کە لە هەردووکیاندا ڕووی دواندن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، هەردوو جۆرە خوێندنەوەکان واتایان یەکە، بەڵام یەکیان بە شێوازی نادیار(**غائِب**) و ئەوی دیکەیان بە شێوازی ئامادە (**حاضِر**).

**مەسەلەی دووەم:**

**خـوا فریشـتان بـە وەحییـەوە بـە فەرمـانی خـۆی دادەبەزێنێتـە سـەر هـەر کام لـە بەنـدەکانی، واتـە: پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) کـە خەڵـك بترسـێنن لـە شـیرك و، ئاگاداریـان بکەنـەوە، کـە تەنیـا خـۆی پەرسـتراوی ڕاسـتەو، پێویسـتە پارێـزی لـێ بکـەن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ ﴾، (خوا) فریشتان دادەبەزێنێ بە ڕووحەوە، (ينزل) بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە:

یەك: يُنَزِّلُ المَلَائِكَة.

دوو: يُنْزِلُ المَلَائِكَة.

سێ: تَنَزَّلُ المَلَائِكَة، ئـەو کاتـە (المَلَائِكَـةُ) بـە (رَفْع) دەبـێ و دەبێتـە (فاعـل)ی (تَنَـزَّلُ)، واتـە: فریشـتە دادەبـەزن (بالرُّوحِ) بـە ڕووحـەوە، (رُوح) واتـە: وەحیـی، وەك لـە ئایـەتی پێـش ئایـەتی کۆتایـی سـووڕەتی (الشـورى)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَـٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَـٰنُ وَلَـٰكِن جَعَلْنَـٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتـە: ئـاوا بـەو شـێوەیە کـە سروشـمان بـۆ پێغەمبـەران نـاردوون، ڕووحێکیشـمان بـۆ لای تـۆ سروش کـردوە لـە فەرمـانی خۆمـان (یـان لـە ئایینـی خۆمـان)، کـە پێشـتر نەتـدەزانی نـە کتێـب چییـە! نـە ئیـمان چییـە !.

٢)- ﴿ مِنْ أَمْرِهِۦ ﴾، واتە: لە کاروبارەکانی خواو، لە ئەندازەگیرییەکانی خوا، کە هەر بۆ خۆی دەزانێ و پێیان ئاگادارە.

٣)- ﴿ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ ﴾، لەسەر هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ.

ئەمە بەرپەرچدانەوەی قسەیەكی هاوبەش بۆ خوادانەرانە، كە هەمیشە ڕەخنەیان دەگرت بۆچی ئەم قورئان و پێغەمبەرایەتییە بۆ موحەممەد ﷺ هاتووە ؟! بۆ نموونە: خوا لە سوورەتی (**الزخرف**)دا دەفەرموێ، دەیانگوت: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾﴾، واتە: دەبووایە ئەم قورئانە بۆ سەر یەكێك لە پیاوە گەورەكانی دوو ئاوەدانییەكە دابەزیبووایە، كە مەبەستیان پێیان: (مەككە) و (**طائیف**) بووە، دیارە لە مەككە یەكێكیان ڕەچاوكردوە كە بە پیاوێكی مەزنیان داناوەو، لە تائیفیش بە هەمان شێوە، كە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە كە كامەیان بووە، ئایا ئەوەی مەككە ئەبو جەهلە؟ یان ئەوەی تائیف كامەیانە؟ گرنگ ئەوەیە موحەممەد ﷺ یان پێ شایستەی ئەوە نەبووە، كە خوا لەنێویان دا هەڵیبژێرێ، بۆ پلەی پێغەمبەرایەتیی، هەر بۆیە لە سوورەتی (**الأنعام**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿... ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ... ﴿١٢٤﴾﴾، خوا زاناترە پەیامی خۆی لە كوێ دادەنێ، ئایا لە لای خوا ﷻ كێ دەوڵەمەندتر و قەبەتر و بە دەسەڵاتتر بێ، ئەوە زیاتر شایستەیە، كە بیكاتە نوێنەری خۆی ؟! یان كێ پاكترو چاكترو دڵسۆزترو ڕازاوەتر بێ بە سیفەتە بەرزەكان ؟! بێگومان ئەوەی دووەمیان، چونكە پێوەر لە لای خوا شتێكی دیكەیە !

٤)- ﴿أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾، ڕووح لە ڕێی فریشتەكانیەوە دادەبەزێنێتە سەر هەر كام لە بەندەكانی، كە چی بكەن؟! ﴿أَنْ أَنذِرُوٓا۟﴾ كە ئێوە بترسێنن، وریا بكەنەوە، هۆشیار بكەنەوە، یانی: خەڵك بە گشتی هۆشیار بكەنەوە، ﴿أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾، كە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، هیچ شتێكی دیكە شایستەی ئەوە نیە، وەك پەرستراو مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ.

٥)- ﴿فَٱتَّقُونِ﴾، بۆیە پارێز لە من بكەن، (التَّقْوَى) چییە؟ (**التَّقْوَى: فِعْلُ المَأْمُورِ وَتَرْكُ المَحْظُورِ**)، ئەنجامدانی ئەركە و، خۆ پاراستنە لە حەرام و قەدەغە.

### مەسەلەی سێیەم:

**خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون و، بەرزترە لەوە هاوبەشی هەبن، چونکە جگە لە خۆی، بەس دروستکراوەکانن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون، وەك پێشتریش گوتمان: (لە مانای گشتی دا)، وشەی (**الحَق**) لێرەدا پێچەوانەی وشەکانی: (**العَبَث، واللَّعِب، والباطِل**)ە، کەواتە: (**حَق**) واتە: چەسپاو، حیکمەت، جیددیی، ئامانجێك کە بەجێ بێ.

واتـە: خـوا ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی بـۆ چەسـپاندنی هـەق و بـۆ هێنانـەدی حیکمـەت و ئامانجێـك، کـە ئامانجەکـە پەیوەندیـی بـە دروسـتکراوەکان و مـرۆڤ و جنـدەوە هەیـە، ئەگەرنـا خـوا ﷻ لـەوە بەرزتـرە کـە ئامانجێـك بەهـۆی غەیـری خۆیـەوە بێنێتـە دی، هـەر بۆیـە لەوبارەیـەوە: (ئەشـعەرییەکان و ماتوریدییـەکان و موعتەزیلـەکان) مشـتومڕێکی زۆریـان بـووە، کـە بـە بۆچوونی مـن، بەشـێکی هۆیەکـەی لێـك تێنەگەیشـتن، بـووە، بـۆ وێنـە:

ئەشـعەرییەکان گوتوویانـە: نابـێ بگوتـرێ: خـوا ئامانجێـکی هەیـە لـە دروسـتکراوەکانیدا، چونکـە خـوا پێویسـتیی بـە غەیـری خـۆی نیـە، ئنجـا ئـەوە ڕاسـتە، خـوا پێویسـتیی بـە غەیـری خـۆی نیـە، بـەڵام ئـەوەش بـەو مانایـە نیـە کـە خـوا ئامانجێـکی نیـە! ئامانجێـکی هەیـە، کـە بریتیـە لـە بەزەیـی نوانـدن سـەبارەت بـە بەنـدەکانی، کـە پێویسـتیی پێیـان نیـە، بـەڵام خـوا دەیـەوێ چاکەیـان لەگـەڵ بـکات، بەزەییـان لەگـەڵ بنوێنـێ، پێیـان ببەخشـێ، ئـەوە ئامانجـە بەنسـبەت مرۆڤەکانـەوە، بەنسـبەت دروسـتکراوەکانی خـواوە، بـەڵام ئامانجێـك نیـە کـە سـوودێکی تێـدا هەبـێ بـۆ خـوای پـەروەردگار، بەڵکـو خـوا ﷻ دەیـەوێ چاکـە لەگـەڵ غەیـری خـۆی بـکات.

وەك لـە سـوورەتی (**الدخـان**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ٣٨ مَا خَلَقۡنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ ... ٣٩ ﴾، واتـە: ئاسـمانەکان و زەوییـمان بـە یارییکارانـە و گاڵتـە دروسـت نەکـردوون، بەڵکـو بـەس بـە هـەق دروسـتمان کـردوون.

لە مانا گشتییەکەش دا، ئاماژەمان بە چەند ئایەتێکی دیکەدا و، ئێمە لە زۆر شوێنی دیکەش گوتوومانە: ئەو بابەتەمان لە سوورەتی (**یونس**)دا بە تەفصیلْ باسکردوە، لە ژێر سەر باسێکدا کە خوا گەردوونی بە هەق دروست کردوە.

**٢)**- ﴿ تَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْـرِكُونَ ﴾، واتە: خوا بەرزە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی، یاخود بەرزە لەو شیرکەی کە ئەوان ئەنجامی دەدەن، (عَمَّا ) ئەگەر (مَا: اَلْمَصْدَرِية)بێ، یانی: (**عَن شِرْكِهِم**) خوا بەرزە لە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانانی ئەوان، بەرزترە لەوە کە شایستەی ئەوە بێ، یاخود بەرزترە لەو شتانەی کە ئەوان دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا، ئەویش بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە:

**أ - عَمَّا يُشْرِكُون.**

**ب - عَمَّا تُشْرِكُون.**

ئەگەر تەماشا بکەین لەم نۆ (٩) ئایەتەدا و، دوایی لەو دوازدە (١٢) ئایەتی دیکەشدا، کە بەدوایان دادێن، دەبینین خوا ﷻ بە شێوەیەکی پلەپلەیی باسی چەند ڕاستییەك دەکات، هاوکات وەك پێشتریش گوتمان: چەند چاك و نیعمەتێکی خواشن.

**١)** سەرەتا باسی ئەوە دەکات کە ڕووحێکی بە فریشتەکاندا ناردوە بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بۆ ئەوەی خەڵك بترسێنن و هۆشیار و بێداریان بکەنەوە، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، پارێز لەو بکەن و، هەر ئەو پەرستراوە.

**٢)** دوایی باسی دروستکردنی گەردوون و، ئاسمانەکان و زەوی دەکات.

**٣)** دوایی باسی دروستبوونی مرۆڤ.

**٤)** دوایی باسی دروستکردنی ئاژەڵ.

**٥)** ئنجا باسی وڵاخی بارەبەر دەکات.

**٦)** دوایی لە ئایەتەکانی دواتردا کە لە دەرسی ئایندەدا پێیان دەگەین، واتە: لە ئایەتەکانی (١٠ - ٢١)، باسی دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە، واتە: باران و بەفر و تەرزە دەکات.

**٧)** دوایی باسی دروستکردنی لەوەڕگا و ڕووەك و دار و درەخت، بەهۆی ئەو ئاوەوە و هێنانەدییان.

**٨)** دوایی باسی شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ و ئەستێرەکان دەکات.

**٩)** ئنجا دوایی باسی هەر چییەك کە خوا لە زەوی دا دەیخوڵقێنێ، لە ڕووەك و زیندەوەران و دار و درەخت و... هتد.

**١٠)** ئنجا باسی دەریا و سوودەکانی دەریا.

**١١)** دوایی باسی چیایەکان و ڕووبارەکان و ڕێگا و بانەکان و نیشانەکان و ئەستێرەکان، دەکات.

واتە: خوا ﷻ بە شێوەیەکی ڕیزبەندیی لە گرنگترەوە بۆ گرنگ پێدا چۆتە خوار لە باسکردنی چاکە و نیعمەتەکانی دا.

## مەسەلەی چوارەم:

**خوا مرۆڤی لە تۆویلکە (تنۆکە)یەك دروست کردوە، کەچی دوایی بۆتە مشتومڕکەرێکی ئاشکرا:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، (خوا) ئینسانی دروستکردوە لە (**نُطْفَة**)، کە لە زمانی عەرەبی دا، کە بە ئاوێکی کەم و صاف دەگوترێ، بە کوردیی پێی دەگوترێ: (تنۆکە)، (تنۆکە ئاو)، بەڵام ئەوەی مرۆڤی لێ دروست دەبێ، کە ئێستا زانستی کۆرپەلەناسیی دەریخستوە، دوو زیندەوەرن:

**أ** - یەکێکیان ژیانداری تۆویی (**حَيَوَان منوي**)، کورتەکەی: (حیمن)ە، ئەو زیندەوەرە بچووکەی کە لە نێو ئاوی پیاودا هەیە، کە لە هەر دڵۆپێك لە تۆو (**مني**) پیاودا، ملیۆنان لەو زیندەوەرە بچووکانە هەن.

**ب** - هێلکۆڵە (**بويضة**) کە ئەویش زیندەوەرێکی بچووکە لە ئاوی ئافرەتدا هەیە، دیارە بە زۆریی وایە تەنیا یەك هێلکۆڵە لە ئاوی ئافرەتدا هەیە، لە کاتێکدا کە ئافرەت ئەو ئاوەی دێت، کە ئەویش هەر تۆو (**مني**)ە، ئنجا لەو دووانە ئەو (**نطفة**)یە پێکدێ، ئەو دووانەش هیچیان بە چاو نابینرێن و، بگرە ئەوەشی لێیان پێکدێ، کە (**نطفة**)یە، ئەویش هەر بە چاو نابینرێ، کە ئەویش لە پێشێدا (**نطفة**)یە، دواتر دەبێتە (**علقة**) و دواتر دەبێ بە (**مضغة**)و قۆناغەکانی دیکە دەبڕێ[1].

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (المؤمنون): ١٢--١٤، باسێکی سەربەخۆیان لەبارەی دروستبوونی مرۆڤەوە

٢)- ﴿ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴾، دوایی یەکسەر ئەو مرۆڤە، کە لەو تۆویلکەیە (تنۆکە) دروستبووە، بۆتە مشتومڕکەرێکی ئاشکرا، (خَصِيم): پێشتر گوتمان، یانی: (كَثِيرُ الخِصَام)، (خِصام) واتە: ناکۆکیی و مشتومڕ و قسەکردن و بگرەو بەردە.

دەگونجێ لێرەدا مەبەست ئەوە بێت کە لە (نطفة)یەکەوە کە بە چاو نابینرێ، بۆتە مرۆڤێك کە توانای مشتومڕ و قسەکردن و شەڕە قسەی هەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ ﴾النساء، تۆ مشت ومڕ مەکە، لەسەر خائینان و ناپاکان و، بەرگرییان لێ مەکە، دەشگونجێ (خَصيم) بە واتای مشتومڕکەرێك کە ناکۆکیی دەکات لە دژی خوا.

(مُّبِينٌ)یش دەگونجێ بە مانای (ڕوون)بێ، یانی: مشتومڕکەرێکی ڕوون، یاخود (مُّبِينٌ) واتە: ڕوونکەرەوە، واتە: مەبەستەکانی خۆی چاك ڕوون دەکاتەوەو دەگەیەنێ، کە مانای یەکەمیان (مُبين) لە (أَبانَ)ی (لازم)ەو، هی دووەمیان (مُبين) لە (أَبانَ)ی (مُتَعَدِّي)یەوەیە.



کردوە، هەم ئادەم و حەووا، هەم وەچەکەشیان، هەروەها لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد...)یشدا، باسێکی تێرو تەسەلمان لەوبارەوە کردوە.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خوا ﷻ ئاژەڵەکانی بۆ مرۆڤان هێناونەدی، کە پۆشاکی گەرمکەرەوە، لە پێست و تووك و خوریی و موویان دروست دەکەن و، وێڕای لێخواردنیان، لە گۆشت و بەرهەمەکانیان، سوودگەلی زۆریان لێوەردەگرن و، بار و سواریان پێدەکەن:**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ﴿٦﴾ وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ ﴾، واتە: (خوا) ئاژەڵەکانی بۆ ئێوە هێناونە دی، خوا ﷻ لێرەدا باسی ئاژەڵان دەکات، بەڵام لە ڕاستییدا هەرچی کە لەسەر زەوییە، خوا بۆ مرۆڤانی هێناوەتە دی، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ...﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: هەرچی لەسەر زەوییە، هەمووی بۆ ئێوە هێناوەتە دی، یاخود هەرچی لەسەر زەوییە بۆ هەموواننانی هێناوەتە دی، وشەی: ﴿ جَمِيعٗا ﴾، ئەگەر پەیوەست بێتەوە بە ﴿ خَلَقَ ﴾، واتە: تێکڕای ئەوەی کە لەسەر زەوییە، بۆ ئێوەی دروستکردوە، بەڵام ئەگەر پەیوەست بێتەوە بە ﴿ جَمِيعٗا ﴾، واتە: بۆ تێکڕاتانی هێناوەتە دی، هەردوو واتایەکەش لە یەك کاتدا ڕاستن، بەڵکو خوا ﷻ لە چەند ئایەتێکدا ئەوەی فەرمووە، کە هەرچی لە گەردووندایە، بە سەر و خواریەوە، بۆ بەهرە لێوەرگرتنی مرۆڤەکان، ڕام و دەستەمۆ و ملکەچی کردوە، وەك لە سوورەتی (**لقمان**)دا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗ ...﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنج نادەن! چۆن کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا بۆ ئێوەی ڕام و دەستەمۆ و ملکەچ کردوە و، چاکەکانی خۆی بە ئاشکراو پەنهان بەسەردا ڕشتوون !

هەروەها لە سوورەتی (**الجاثیة**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ ...﴿١٣﴾ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەمووی لەلایەن خواوە بۆ ئێوە ملکەچ و دەستەمۆ کردوە (وایلێکردوە کە بتوانن لێی بەهرەمەندبن).

وشەی (**الأنعام**)، زۆرجاری دیکەش باسمان کردوە: کە چوار جۆر ئاژەڵان دەگرێتەوە: حوشتر، ڕەشەوڵاخ، مەڕ، بزن.

٢- ئنجا دێتە سەر باسی ئەو سوودانەی کە ئێمە لەو چوار جۆرە ئاژەڵە وەریدەگرین، دەفەرموێ: ﴿ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ ﴾، لەو ئاژەڵانەدا، گەرمیی هەیە بۆ ئێوە، گەرمکردنەوە هەیە بۆ ئێوە، (**الدِّفءُ: إِسْم لِمَا يُتَدَفَّأُ بِهِ**)، (**دِفْء**): ناوە بۆ هەر شتێك كە مرۆڤ پێی گەرم بێتەوە، واتە: لە سەرما بیپارێزێ و گەرمی بکاتەوە، کە بەدڵنیاییەوە مەبەست پێست و کەوڵ و خوریی و تووك و مووی ئەو ئاژەڵانەیە، کە بەرگ و پۆشاك و، بەڵكو جاری وا هەیە جێگاو ڕێگاشی لێ دروست دەکرێ و، کەلوپەلی دیکەش لەوانە دروست دەکرێ، زۆر جۆرە کەلوپەلی ماڵ، بە تایبەتی بۆ خەڵكی ڕەوەند و کۆچەریی: ڕەشماڵ، چادر، لباد، تێر، خورجین، جەواڵ، بەڕە، مافور، کەژوو، گوریس و...هتد، ئەو کەلوپەلانەی بەکاردەهێنرێن، وێڕای جۆرەکانی بەرگ و پۆشاك بە هەموو شێوەکانیانەوە، کە لە چەرم و پێستیان، لە کەوڵیان، یان لە تووك و، خورییان و، لە موویان دروست دەکرێن.

٣- ﴿ وَمَنَافِعُ ﴾، یانی: (**فِيهَا مَنافِع**)، سوود گەل، (**مَنافِع**)، کۆی (**مَنفَعَة**)یە، یانی: ئەو ئاژەڵانە، زۆر سوود و کەڵکی دیکەیان لێوەردەگیرێن.

٤- ﴿ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾، هەروەها لێشیان دەخۆن، واتە: لە گۆشتەکەیان دەخۆن و، لە بەرهەمەکەشیان دەخۆن، هەم خودی خۆیان دەخۆن و سەریان دەبڕن، هەم لە بەرهەمەکەشیان دەخۆن.

٥- ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾، هەروەها بۆ ئێوە جوانیی هەیە لەو ئاژەڵانەدا، کاتێك کە دەیانهێننەوە لە لەوەڕ، لە لەوەڕگا دەیانهێننەوە بەرە و ماڵ، ﴿ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾، هەروەها کاتێك کە دەریان دەکەن بۆ لەوەڕ، واتە: چ کاتێك کە ئێواران دەیانهێننەوە بەرەو ماڵ و، چ کاتێك کە بەیانیان دەریان دەکەن بەرەو لەوەڕگا، دیمەنێکی جوان هەیە، بۆ ئێوە لەواندا کە سەرنجی بدەن و دڵتان پێی خۆش بێ.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾، پێشتریش باسمانکرد: بەپێی ڕیزبەندیی مەنتیقیی، ئاژەڵ بەیانیان دەردەکرێن بۆ لەوەڕگا و، ئێواران دەهێنرێنەوە بۆ ئاغەڵ و پشتیر و تەویلەو ئەو شوێنانەی کە تێیاندا پشوو دەدەن، بەڵام خوا ﷻ هێنانەوەی ئاژەڵەکانی لە ئێواراندا، پێشخستوە لە دەرکردنیان لە بەیانیاندا بۆ لەوەڕگا، لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی کاتێك بە تێر و پڕیی دێنەوە لە لەوەڕگا، ئەو ئاژەڵانە زەوق و

نیشاط و جموجۆڵ و هەڵبەزو دابەزێکی دیکەیان هەیە، لە چاو ئەوەی کە بەیانیان بە برسیەتیی، بە پەژموردەیی بەرەو لەوەڕگا بەڕێ دەکرێن، بۆیە خوا ئەوی پێشخستوە.

ئنجا وشەی (**تُرِيحُونَ**)، (**الإِرَاحَةُ: فِعْلُ الرَّوَاحِ**)، (**إِرَاحَة**)، کە لە: (**أَرَاحَ، يُرِيحُ**) هاتوە، واتە: ئەنجامدانی هێنانەوەی وڵاخان، هێنانەوەی ئاژەڵان لە لەوەڕگا، (**الذَّهَابُ إِلى الْمُرَاحِ**)، واتە: ڕۆیشتن بەرەو ئەو شوێنەی کە پشووی لێدەدەن، واتە: بۆ ئاغەڵ و پشتیر و ئەو شوێنانەی ئاژەڵیان تێدەکرێ، ئنجا (**أَرَاحَ نَعَمَهُ: أَعَادَهَا**)، حوشترەکانی (**إِرَاحة**) کردن، واتە: هێنانیەوە لە لەوەڕگا.

بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾، (**السُّرُوحُ: الإِسَامَةُ**)، (**سروح**)، واتە: لەوەڕاندن (**إِسَامَة**)، لەوەڕاندن، (**الغُدُوُّ بِهَا إِلى الْمَرَاعِي**)، ئەوەیە کە بەیانیان زوو ببرێ بەرەو لەوەڕگاکان، (**مَرَاعِي**) کۆی (**مَرْعَى**)یە، ئەو شوێنەی کە ئاژەڵی لێ دەلەوەڕێنرێ، دەگوترێ: (**سَرَحَهَا، سَرْحَاً، وَسُرُوحَاً**) واتە: بردی بۆ لەوەڕ، (**وَسَرَّحَهَا: تَسْرِيحَاً**)، ئەویش بە هەمان شێوە، بەڵام دیارە کە ئەگەر بڵێ: (**سَرَّحَهَا: تَسْرِيحَاً**)، ماناکەی بەهێزترە.

ئنجا وەك گوتمان: دیمەنی ئاژەڵان بە تێر و پڕیی کە لە لەوەڕگا دێنەوە، جوانترە، بۆیە پێش خراوە و، خوای پەروەردگاریش باسی جوانیی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ ﴾، ئنجا ئایا ئەو جوانییە، کەی باشتر و چاکتر بەرجەستە دەبێ؟ بێگومان کاتێك کە ئاژەڵەکان بە تێر و پڕیی، ئێواران لە لەوەڕگا دەگەڕێنەوە، ئنجا بارەی بزن و مەڕ، هۆڕەی ڕەشەوڵاخ، حیلکەی ماین و ئەسپ، زەڕەی گوێدرێژ، هەروەها ڕوغائی حوشتر و، جۆرەکانی دیکەی ئاژەڵان کە هەر کامێکیان دەنگ و سەدایەکی هەیە، کەسێك ژیانی لادێی بینیبێ، یاخود ژیانی خەڵکی ڕەوەندی بینیبێ، کە ئێواران ئەو ئاژەڵانە هەموویان دێنەوە لە لەوەڕگا و، دەنگیان تێکەڵ دەبێ، ئاواز و نەغمەیەکی زۆرخۆشیان هەیە و، دیمەنێکی زۆر جوانیشیان هەیە.

ئنجا کە بە کرداری (**المضارع**) دەیفەرموێ: ﴿ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾، دیمەنەکە بە زیندوویی دەخاتە بەرچاو، کاتێك کە دەیانهێننەوە لە لەوەڕگا و، کاتێك بەڕێیان دەکەن بۆ لەوەڕگا.

٦- ﴿ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ ﴾، هەروەها کەل و پەلەکانتان هەڵدەگرن، (**أَثْقَال**)، کۆی (**ثَقَل**)، (**وَهُوَ مَا يَثْقُلُ عَلَى الناسِ حَمْلُهُ بِانْفُسِهِم**)، (**أَثْقَال**)، ئەو کەلوپەلانەن، کە قورسن خەڵك بە تەنیا هەڵیان بگرن، بە شان و کۆڵی خۆیان هەڵیان بگرن، واتە: بەهۆی ئەو ئاژەڵانەوە، ئەو بار و سوارەشتان هەیە،

دیارە زیاتر حوشتر بۆ ئەوە بەکارهاتوە، بەڵام لە هەندێ شوێن ڕەشەوڵاخیشیان بەکارهێناوە، گامێش و گا و مانگاشیان بەکارهێناون، بۆ هەندێك بار و كۆڵ.

٧- ﴿إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ﴾، بەرەو وڵاتێك بەرەو شوێنێك كە نەتاندەتوانی بیگەنێ، واتە: بۆخۆتان بەبێ بەکارهێنانی ئاژەڵەکان، بەبێئەوەی كە بارەكان بخەنە سەر پشتی ئەوان، نەتاندەتوانی بگەنە ئەو شوێنانەو كەلوپەلەكانتانیانیان بگەیەننێ.

٨- ﴿إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ﴾، مەگەر بە خۆ ئەزیەتدانێکی زۆر، بە ماندوبوونێکی زۆر، (**الشِّقُّ: الْمَشَقَّةُ**)، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (**شَقُّ الْأَنْفُس**)، كە هەردووكیان بە مانای ناڕەحەتیی و قورسیی و زەحمەتیی دێن، واتە: ئێوە بە زەحمەت بەبێ بارەبەر دەگەیشتنە ئەو شوێنانە، وەك گوتمان: مەبەستیش لە بارەبەر، لە ڕیزی چوار جۆرە ئاژەڵەكان دا، حوشترە بە پلەی یەكەم.

٩- لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، بێگومان پەروەردگاری ئێوە زۆر بە پەرۆش و بە بەزەییە، لە فەرهەنگەكانی زماندا، هاتوە: (**الرَّأْفَةُ: أَشَدُّ الرَّحْمَة**)، وشەی (**رَأْفَة**) واتە: زۆر بە بەزەیی، (**الرَّحْمَة**)ش، واتە: بەزەیی.

بەڵام لە هەندێك لە فەرهەنگەكاندا هاتوە كە (**رَؤُوف**)، ئەو سیفەتەیە كە وا لەو كەسە دەكات، كە خاوەنی ئەو سیفەتەیە، بەرانبەرەكەی لە ئازار و لە زیان و لە خراپە دووربخاتەوە.

بەڵام (**رَحیم**) بریتیە لەوەی كە وا لە خاوەنەكەی دەكات، (ئەو كەسەی ئەو سیفەتەی هەیە)، چاكە و خێر بۆ بەرانبەرەكەی بێنێ.

كەواتە: (**رؤوف**)، بۆیە من بە (پەرۆش) تەفسیرم كردوە، خوا بە پەرۆشە لەگەڵتان و بە بەزەییشە، بە پەرۆشە بۆ ئێوە، زیانتان لێ دووربخاتەوە و، بە بەزەییشە لەگەڵ ئێوەدا، كە سوود و قازانجەكانتان بۆ بێنێ.

**مەسەلەی شەشەم:**

**خوا ﷻ وڵاخە بەرزەو ئێستر و کەری بۆ سواریی و، هەروەها بۆ جوانیی بۆ ڕەخساندوون:**

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١- ( وَٱلۡخَيۡلَ )، واتە: وڵاخە بەرزە، کە بە کوردیی (یەکسم)یشی پێدەڵێن، لەبەرئەوەی ڕەشەوڵاخ (دووسم)ە، هەروەها مەڕ و بزنیش، بەڵام کە گوترا: (یەکسم)، واتە: وڵاخە بەرزە، ئەمیش ناوی کۆیە، بەڵام لە بێژەی خۆی، تاکی نیە و هەر دەگوترێ (**خَیْل**)، بۆ تاکەکەی (**فَرَس**) دەگوترێ کە بە (**أفراس**) کۆ دەکرێتەوە، بەڵام (**خَیْل**) بە (**خیُول**)یش جارێکی دیکە کۆدەکرێتەوە.

٢- ﴿ وَٱلۡبِغَالَ ﴾، کۆی (**بَغل**)ە، (**بَغل**)یش تاکەکەی (**بَغْلَة**)یە، کە دیارە ئێستر، لە ماین و کەر پەیدا دەبێ، ئنجا مێیەکەی (**بَغْلَة**) یان (**بَغل**)ی پێدەڵێن و، نێرەکەی بارگینی پێ دەڵێن، بە عەرەبی (**بَرذُون**)، کاتێك کە نێرەکەرێك چاك دەکەن لە ماینێك، واتە: سواری دەبێ، لەگەڵی جووت دەبێ، ئەوەی کە لێیان پەیدادەبێ، ئەگەر مێ بێ، ئێستری پێدەڵێن، کە ئێستر نەزۆکە، هەرچەندە مێییە، بەڵام وەچەی نیە، بێ وەجاخە، بە زاراوەی کوردەواریی خۆمان، نێرەکەیشی بارگینی پێدەڵێن، بە عەرەبی (**بَرذُون**).

٣- ﴿ وَٱلۡحَمِيرَ ﴾، (**حَمیر**)، کۆی (**حِمَار**)ە، (**حِمَار**)، بە (**أَحْمِرة**) و، بە (**حُمُر**)یش کۆدەبێتەوە، ئنجا (**حِمَار**)، بۆ نێر و بۆ مێ بەکاردێ، بەڵام زیاتر بۆ مێ (**أَتان**)یان بەکارهێناوە، دەگوترێ: نێرەکەر و ماکەر.

٤- ﴿ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗ ﴾، بۆ ئەوەی سواریان بن، ئەم سێ جۆرە وڵاخە، هەم وڵاخە بەرزە، هەم ئێستر، هەم کەر، هەم سواریان بن، کە ئەمە ئاماژەیەکە بەوەی کە بەکەڵکی خواردن نایەن.

٥- ﴿ وَزِينَةٗ ﴾، هەروەها بۆ جوانییشە، واتە: حیکمەتێك کە خوا ڕەچاوی کردوە لەو وڵاخانەدا، هەم ئەوەیە کە بۆ بار و سوار بەکاریان بێنن، هەم بۆ جوانییش ڕایان بگرن، دیمەنێکی جوانیان

هەیە، بە تایبەتی وڵاخە بەرزە، کە ئەوەش بە پێی زەوق و سەلیقەیە، هەیە ڕەنگە جوانیی زیاتر لە کەردا ببینێ، هەروەك و یەكێك لە دوو حیزبە گەورەکەی ئەمریکا، یەكێکیان هێمایەکەی کەرە و یەكێکیان هێمایەکەی فیلە.

٦- ﴿وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾، هەروەها (خوا) شتی واش دروست دەکات بۆ بار و سوارتان، کە نایزانن.

ئنجا ئێمە ئەم ڕستەیە لە کورتە باسێکدا ڕوون دەکەینەوە، بەڵام پێش ئەوە کورتە باسێك لەبارەی: (حوکمی خواردنی گۆشتی وڵاخەبەرزە و ئێستر و کەر)ەوە دەخەینە ڕوو:

دوو كورتە باس:

## كورتە باسی یەكەم:

## حوكمی خواردنی گۆشتی وڵاخە بەرزە و ئێستر و كەر

لەوبارەوە زانایان مشتومڕی زۆریان بووە، بە تایبەت ئەم وشەیە كە دەفەرموێ: ﴿لِتَرۡكَبُوهَا﴾، دوای ئەوەی خوا **عزوجل** باسی وڵاخە بەرزە و ئێستر و كەر دەكات، دەفەرموێ: ﴿لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةً﴾، بۆ ئەوەی سواریان بن، هەروەها بۆ جوانییشن.

دەڵێن: كەواتە: خوا ئامانج و حیكمەتێك كە بەهۆی ئەو وڵاخانەوە دێتە دی، دیاریكردوە، كە دووانن:

**١-** یان بۆ سواربوون و بار و سوارن.

**٢-** یان بۆ جوانیی و ڕاگرتنن، كە دیمەنێكی جوانیان هەیە، بەڵام باسی خواردنی نەكردوە، بۆیە لەوبارەوە مشت ومڕیان بووە، با ئاماژە بەم پێنج (٥) دەقە بكەین:

**یەكەم:** {**عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَةِ، وَأَذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ**} (**مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: الْبُخَارِيُّ**: ٤٢١٩، **وَمُسْلِمٌ**: ١٩٤١).

واتە: جابر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا، (واتە: لە جەنگی خەیبەردا)، گۆشتی كەری ماڵیی قەدەغە كرد، بەڵام مۆڵەتی دا بۆ گۆشتی وڵاخە بەرزە، واتە: خواردنی گۆشتی كەری ماڵیی قەدەغە كرد و، مۆڵەتی دا كە گۆشتی وڵاخە بەرزە بخورێ.

بۆچی دەفەرموێ: (**الْحُمُرِ الأَهْلِيَةِ**) ؟، چونكە كەرە كێوییەكان (**الْحُمُر الوَحْشِية**)ش هەن، كەری كێویی كە بەڵەكن، ئەوانە بەس گیا خۆرن و، گۆشتیان دەخورێ، هیچ كام لە زانایان لەوبارەوە مشتومڕیان نەبووە، كە كەری كێویی گۆشتی دەخورێ، بە پێچەوانەی كەری ماڵییەوە، كە بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغە كراوە.

**دووەم:** {**عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ نَحَرْنَا فَرَساً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَكَلْنَاهُ**}، (**أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ**: ٥٥١٢، **وَمُسْلِمٌ**: ١٩٤٢).

واتە: ئەسماء كچی (ئەبوو بەكری صیددیق، خێزانی زوبێری كوڕی عەووام خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەسپێكمان سەربڕی، گۆشتەكەیمان خوارد.

ئەوە بە نسبەت وڵاخە بەرزەوە، کە زۆربەی زانایان ڕایان وایە گۆشتەکەی دەخورێ، بە بەڵگەی ئەو دەقانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە هێنامانن و، هی دیکەش هەن.

ئەوانەش کە پێیان وایە گۆشتی وڵاخە بەرزە ناخورێ، لەبەرئەوە نیە کە گۆشتەکەی ناخورێ، چونکە لەوبارەوە ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ هەن و، مەسەلەکە یەکلایی دەکەنەوە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە دەڵێن: وڵاخەبەرزە - بە تایبەتی ئەسپ و ماین، کە ئەوەی گۆشتی دەخورێ، مەبەست ئەوەیانە - بۆ بار و سوار، پێویستترن، کاتی خۆشی ئەسپ بە تایبەتی بۆ جەنگ، لە شوێنی سەیارە و دەببابەی ئێستا بووە، بۆیە بە پەسەند نەزانراوە کە بخورێن و، لە هەندێك شوێنەواراندا هاتوە کە قەدەغەکراوە گۆشتی ئەسپ و ماین و ئەوانە بخورێ، بەڵام وەك گوترا:

حیکمەتی ئەو ڕێلێگرتنە، ئەوە بووە کە پێویستییان پێبوون، بۆ بار و سوار، هەروەها هۆکارێکی گرنگی جەنگ بووە، ئەو سوپایەی کە ئەسپی زیاتر بووبن، زیاتر ئەگەری ئەوەی هەبووە کە بەسەر بەرانبەرەکەیدا زاڵ بێ، چونکە سوار چاکێ کە سواری ئەسپ دەبێ، زۆر بە خێرایی دێت و دەچێ و، کوێی بوێ بە ئاسانیی دەیگاتێ و، چۆنی بوێ، زەبر دەوەشێنێ و، دەڕوا و تێدەپەڕێ.

(**القُرْطُبي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**الجامع لأَحْكام القُرْآن**)[1]دا، دەڵێ:

**{وَأَمَّا البِغَال فَإِنَّهَا تُلْحَقُ بالحَمِيرِ، إنْ قُلْنا إنَّ الخَيْلَ لاَ تُؤْكَل، فَإِنَّهَا تَكُونُ مُتَوَلِّدَة مِنْ عَيْنَيْنِ لاَ يؤكَلان، وَإِنْ قُلْنا إِنَّ الخَيْل تُؤْكَل، فَإِنَّهَا عَيْنٌ مُتَوَلِّدَة مِنْ مَأكُول وَغَيْرِ مَأْكُول فَغُلِّبَ التَّحْرِيم عَلَى مَا يَلْزَمُ فِي الأُصُول}.**

واتە: لەبارەی ئێسترانەوە، پەیوەست دەکرێن بە کەرانەوە، (واتە: لە ڕووی ئەوەوە کە گۆشتیان ناخورێ، یەك حوکمیان هەیە)، چونکە ئەگەر گوتمان: وڵاخە بەرزە گۆشتی ناخورێ، (ئەسپ و ماین گۆشتیان ناخورێ)، ئەوە ئێستر لە دوو ڕەگەزانەوە هاتوە، کە هەردووکیان گۆشتیان ناخورێ، (کە یەکێکیان گوێدرێژە، ئەویدیکەشیان وڵاخە بەرزەیە، چونکە وەك گوتمان: ئێستر وەچەی نێرەکەر و ماینە کە ماین لە نێرەکەر چاك دەکرێ، واتە: پێکەوە جووت دەبن، ئەوەی کە لێیان پەیدا دەبێ، ئەگەر مێ بێ ئێسترە و، ئەگەر نێر بێ بارگینە)، بەڵام ئەگەر گوتمان: وڵاخە بەرزە گۆشتی دەخورێ، ئەوە ئێستر لە ڕەگەزێکەوە هاتوە کە گۆشتی دەخورێ و، لە ڕەگەزێکیشەوە کە گۆشتی ناخورێ، ئنجا بەپێی بنچینەکانی شەریعەت، ئەگەر شتێك حەڵاڵ و حەڕامی تێدا هەبوو، لایەنە

---

(١) ج ١٠، ص ٦٤.

حەرامەکەی زاڵ دەکرێ بەسەر لایەنە حەڵاڵەکەیدا، (کەواتە: بەو پێیەش بێ دیسان هەر گۆشتی ئێستر ناخورێ).

ئەوەش کە (القُرطُبي) گوتوویەتی: ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، ئەگەر نەڵێم هەر هەموویان.

**سێیەم:** هەر لەو بارەوە کە ئایا وڵاخە بەرزە - کە دەڵێین: وڵاخە بەرزە، واتە: چ نێرەکە کە ئەسپە، چ مێیەکە کە ماینە، هەروەها ئەوەش کە لە ماین و کەر پەیدا دەبێ کە ئێسترە و، بارگینە، هەر چوار جۆرەکە دەگرێتەوە - ئایا زەکاتی لێدەدرێ ؟

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {**لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلاَ فَرَسِهِ صَدَقَةٌ**} (**أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ**: ١٤٦٣، **وَمُسْلِمٌ**: ٩٨٢)، واتە: مسوڵمان لە کۆیلەکەیدا و لە ئەسپەکەیدا زەکاتی لەسەر نیە.

**چوارەم:** لەبارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو وڵاخە بارەبەرانەوە، واتە: گوێدرێژ و ئەسپ و ماین و، ئێستر و، بارگین و، هەموویان، فەرموودەیەك هەیە کە دەبێ بۆ بار و سوار و کاروباری پێویست بەکاربهێنرێن:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لاَ تَتَّخِذُوا ظُهُورَ الدَّوَابِّ كَرَاسِيَ**} (**أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة**: ٢٦٤٨٦)، واتە: پشتی ئەو وڵاخانە مەکەنە کورسیی. (واتە: کە هەر بۆ خۆشیی لەسەریاندا دابنیشن)، بەڵکو مەگەر بۆ بە ڕێدا ڕۆیشتن، لە کاتی پێویستدا، بۆ بارلێنان، مەگەر بۆ ئەوانە بەکاریان بێنن، ئەگەرنا نەچن هەر بۆ خۆشیی لەسەر پشتیان دابنیشن و، ڕاشیان بگرن وەك کورسیی.

**پێنجەم:** هەروەها لەبارەی گرنگی حوشتر و، مەڕ و بزن و، وڵاخەبەرزەوە، کە گرنگن لە ژیانی دنیادا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە:

{**عَنْ حُذَيْفَةَ** رضي الله عنه، **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: **الْغَنَمُ بَرَكَة، وَالإِبِلُ عِزٌّ لأَهْلِهَا، وَالْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيامَةِ**} {**أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَه**: ٢٣٠٥، **وَصَحَّحَهُ الأَلباني في (صحيح الجامع)**: ٢٧٦٠}.

واتە: حوزەیفە رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: مەڕو بزن بەرەکەتن (بۆ خەڵکەکەیان)، حوشتریش مایەی عیززەت و باڵا دەستییە بۆ خەڵکەکەی، وڵاخە بەرزەش خێری بە نێوچاوانەوە هەیە و سوود و بەرژەوەندیی تێدایە، هەتا ڕۆژی قیامەت.

(هەڵبەتە دەبێ بزانین کە وڵاخە بەرزە و حوشتری ئەو کاتە، لە جێی سەیارەی ئێستا بووە، کەسێك کە ئێستا سەیارەی پێبێ، جیایە لەوەی کە پێڕۆ بێ، ئەو کاتەش

ئـەوەی کـە وڵاخـە بـەرزە یـان حوشـتری هەبـووە، یـان بارەبـەری دیکـەی هەبـووە، وەك ئـەوە بـووە، ئێسـتا کەسـێك سـەیارەی پێبـێ، ئـەوەش کـە نەیبووبـا، وەك کەسـێك بـووە کـە ئێسـتا بـە پێیـان بـڕوات و پێڕۆبـێ و کار وبـارەکانی خـۆی لەسـەر پێـی خـۆی بـکات.

## کورتە باسی دووەم:

## مەبەست لە (خوا شتی وا دروست دەکات، کە نایزانن) چییە؟

کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ هەروەهـا خـوا شـتێك دروسـت دەکات، کـە نایزانـن، لـە سـیاقی بـاسی وڵاخـی بارەبـەردا: ﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، وڵاخـە بـەرزەو، ئێسـترو، کـەر، بـۆ ئـەوەی سـواریان بـن و بـۆ جوانییـش و، شـتێك دروسـت دەکات کـە نایزانـن، شـتانێك دروسـت دەکات کـە نایانزانـن.

توێـژەرەوانی قورئـان لەبـارەی ئـەم ئایەتـەوە، کەوتوونـە مشـتومڕێکی زۆرەوە، ناهەقیشـیان نەبـووە، بـۆ وێنـە:

**١/** لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: (**يَخْلُقُ لَكُم فِي الجَنَّة وَسائِلَ أُخْرَى**)، یانی: لە بەهەشتێ دا خوا هۆکاری دیکەی هاتووچۆتان بۆ دەڕەخسێنێ.

یانی هۆکار و ئامڕازی دیکەتان بۆ دەڕەخسێنێ لە بەهەشتدا، کە نازانن چۆنن !

**٢/** هەندێکیان گوتوویانە: ﴿ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، واتە: (**يَخلُقُ مِنْ أَنْوَاعِ الحَشَرَاتِ وَالهَوَامِ**)، لە جۆرەکانی زیندەوەر و، مێش و مەگەز، خوا دروستیان دەکات کە ئێوە نایانزانن.

**٣/** هەندێکیان گوتوویانە: لە بنی دەریا، لە نێو دەریادا، لە هەوادا، لە بنی زەویدا، شتانێکی دیکە دروست دەکات.

هەڵبەتە ناڵێم: ئایەتەکە ئەو واتایانەش ناگەیەنێ.

بـەڵام ئەگـەر ئـەو ڕسـتەیە بـە پێـی سـیاقی ئایەتەکـە، تەماشـای بکەیـن و، ئـەو ڕسـتەیە لـە سـیاقەکەی خـۆی دەرنەهێنیـن، کـە زۆرجـار دەرهێنـانی ڕسـتەیەك لـە سـیاقەکەی خـۆی، لـەو سـیاقەی کـە تێیـدا هاتـوە، لـەو زنجیـرە ئایەتـە کـە لەگەڵیانـدا هاتـوە، ڕسـتەکە مانایـەکی هەڵـە بـە دەسـتەوە دەدات.

ئنجا لێرە کە دەفەرموێ: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، ئەگەر لە سیاقی خۆیدا تەماشای بکەین، خوا باسی هۆکارەکانی بار و سوار و ئامرازەکانی هاتووچۆ و سەفەرکردنمان بۆ دەکات، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، واتە: لەو هۆکارانەی کە بار و سواریان پێدەکەن و، هاتووچۆ و، سەفەریان پێ دەکەن، شتی دیکەتان بۆ دروست دەکات کە نایزانن.

چونکە بە نسبەت ئەو کاتەوە کە قورئان دابەزیوە، هەر لە خەونیشدا نەیانبینیوە کە سەیارە دروست ببێ و، فڕۆکە دروست ببێ و، غەوواصە، دروست ببێ و، شەمەندەفەر دروست ببێ و... هتد، هەموو ئەو جۆرە هۆیانەی هاتووچۆ بە هەموو جۆرەکانیانەوە دروست بین، کە هەر خوا دەزانێ مرۆڤ چی دیکەش دروست دەکات.

ئنجا بە نسبەت ئەو کاتەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، واتە: شتانێکتان بۆ دەخوڵقێنێ لە هۆیەکانی هاتووچۆ، کە ئێوە ئێستا نایانزانن، بە دڵنیاییەوە ئەوان نەیانزانیوە، سەیارەو، شەمەندەفەر و، فڕۆکە و... هتد، پەیدا دەبن و چۆن دەبن! بەڵام ئێستاش کە ئێمە ئەو ئایەتە دەخوێنین، دووبارە خوا پێمان دەفەرموێ: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، شتانێکی دیکەتان بۆ دروست دەکات کە ئێوە نایانزانن، ئێمە ئێستا دەزانین کە سەیارە هەیە و، شەمەندەفەر هەیە و، فڕۆکە و، کەشتیی و، غەواسەو پاپۆڕ و چی و چی، هەن، بەڵام بە دڵنیاییەوە خوا ﷻ توانای ئەوەی داوەتە مرۆڤەکان کە شتی دیکەش دروست بکەن و بێننە دی، بۆ سەفەر و بار و سوار و هاتووچۆی خۆیان کە خەڵکی ئێستا نازانن و لە داهاتوودا ئەو شتانە وەدیدێن.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، شتانێکی وا دێنێتە دی کە ئێوە نایانزانن، بێگومان خوا ڕاستەوخۆ دروستی نەکردوون، بەڵکو مرۆڤەکان ئەو شتانە وەدیدێنن و دروستیان دەکەن و بەرهەمیان دێنن ؟

دەڵێین:

ڕاستە، بەڵام ئەو عەقڵ و هۆشەی کە مرۆڤەکان شتەکانی پێ دادەهێنن و دروست دەکەن، خوا پێی داون، هەروەها خوا کەرەستەکانی پێداون، یانی: هەموو ئەو ئیمکانیەتەی کە خوا بۆی ڕام و دەستەمۆ کردوون، لەگەڵ توانا زاتییەکەی خۆیان، هەمووی دروستکراوی خوایە، کەواتە: پەیداکردن و هێنانەدییەکە، هەرهی خوایە ﷻ، بەڵێ مرۆڤ ڕۆڵی تێدا هەیە، بەڵام مرۆڤەکەش خۆی هەر وەدیهێنراوی خوایە و، کەرەستەکانیش کە ئەو ئامێرو کەلوپەلانەیان لێ دروست دەکات، هەر وەدیهێنراوی خوان.

### مەسەلەی حەوتەم:

**خوا ڕوونکردنەوەی ڕێی ڕاست و بەئامانج گەیەنەری لەسەر خۆی پێویست کردوە و، نەشیویستوە بە زۆر مرۆڤەکان بخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئەگەرنا دەیکرد:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٩﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾، هەروەها لەسەر خوایە، ڕێی ڕاست، ڕێی بە ئامانج گەیەنەر، لێرەدا وەك شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: وشەیەك قرتێنراوە، کە بە سیاق و سەلیقە دیارە، چونکە لە قورئاندا هەر وشەیەك بە عەقڵ و سەلیقە دیاربێ و، سیاقەکە بیگەیەنێ، واتە: زنجیرەی ئایەتەکان بیگەیەنێ، خوا ﷻ قرتاندوویەتی، بۆچی؟

چونکە خوا ﷻ نەك وشەیەك و ڕستەیەك، بەڵکو پیتێکی زیادیشی نەخستۆتە نێو فەرمایشتەکەی خۆیەوە، تاکو هەرچی زیاتر کورتتر بێ، چونکە یەکێك لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی (بلاغة) بریتیە لەوە، کە قسە بە کورتیی بکرێ، وشەکانی کەم بن، بەڵام مانای زۆربن، ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾، یانی: (**وَعَلَى اللَّهِ بَيانُ قَصْد السَّبِيل**)، وشەی (**بَيان**)، یان (**تَبيينُ قَصْد السَّبِل**)، لەسەر خوایە ڕوونکردنەوەی ڕێی بە ئامانج گەیەنەر، ڕێی ڕاست کە مەبەست لە (**السَّبيل**)، ڕێی ڕاستی خوایە، کە لە ئیسلامدا بەرجەستەیە، ئیسلامیش قورئان و سوننەتە.

وشەی (**قَصْد**)، دەڵێ: (**القَصْدُ: إستِقَامَةُ الطَّرِيق**)، بریتیە لە ڕاست بوونی ڕێ، دەگوترێ: (**طَرِيقٌ قَاصِد، أَي: مُستَقِيم**)، ڕێیەکی ڕاست.

هەندێکیشیان گوتوویانە: ﴿قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾، ئەمە چاوگە، بە مانای (**إِسْم فَاعِل**) هاتوە، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ﴾، یانی: (**وَعَلَى اللَّهِ قَاصِدُ السَّبيل**)، واتە: ئەو ڕێیەی کە بە ئامانج گەیەنەرە، کەسێك کە بەو ڕێیەدا بڕوا بە ئامانج دەگات و، دەگاتە ئەو هەوار و مەنزڵەی کە دەیەوێ، ئەو ڕێیە ڕاستەش بێگومان ئیسلامە، ئنجا خوا لەسەر

خۆی پێویست کردوە لە ڕووی میهرەبانیی و لوتف و کەرەمی خۆیەوە، کە ڕێی ڕاست بۆ بەندەکانی ڕوون بکاتەوە.

٢- ﴿ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ﴾، (مِنْهَا)، دیارە دەچێتەوە بۆ (**السبيل**)، وشەی (**السبيل**)یش، لە زمانی عەرەبیدا: هەم بە نێرینە (**مذكر**)، هەم بە مێینە (**مؤنث**)ی مەجازیی هاتوە.

﴿ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ﴾، واتە: لە ڕێیەکان هەیە کە ڕێی لادەرە، واتە: وەك چۆن ڕێی بە ئامانج گەیەنەر هەیە، کە ئیسلامە، ڕێی لادەر و لار و خواریش هەیە، (**أَي مِنَ السَّبيلِ عَادِلٌ عَنِ الحَقِّ فَلاَ يُهْتَدَى بِهِ**)، ڕێی واش هەیە کە لە هەق لایداوە و، بە هۆیەوە مرۆڤ ناگاتە ئامانج.

زانایان گوتوویانە، ﴿ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ﴾، (**أَي: فَهُوَ جَائِرٌ بِسالِكِه، وَوَصْفُهُ بالجَائِرِ عَلَى طَرِيقَةِ المَجَازِ العَقْلِي**)، یانی: ڕێی وا هەیە کە پێڕۆیەکەی، ئەو کەسەی کە پێی دا دەڕوا، لای دەدا، واتە: کەسێك کە ئەو ڕێیە بگرێتەبەر، تووشی لادان و خلیسکانی دەکات، ئەمە بەشێوەی مەجازی عەقلیی بەکار هاتوە، ئەگەرنا ڕێیەکە خۆی لادەر نیە، بەڵام یانی: کەسێك کە پێی دا بڕوات، لای دەدات.

٣- ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ئەگەر خوا ویستبای تێکڕاتانی دەخستە سەر ڕێ، ئەگەر خوا ویستبای یانی چی ؟، (**أَي: لَوْ شَاءَ مَشِيْئَة إِجْبارٍ، وَإِكراهٍ**)، ئەگەر خوا ویستبای بە ویستنی زۆر لێکردن و ناچار کردن، بەڵام بۆچی نەیویستوە ؟

چونکە ئەوە پێچەوانەی حیکمەتی خوایە، لە دروستکردنی مرۆڤدا، کە بۆ تاقیکردنەوە دروست کراوە، مرۆڤیش کاتێك تاقی دەکرێتەوە کە بتوانێ ڕاست بڕوا و چەوت بڕوا، لابدا و، ڕێی ڕاست بگرێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ئەو هیدایەتە مەبەست پێی ڕێنمایی کردن نیە، وەك پێشتریش گوتمان لە مانا گشتییەکەیدا، چونکە خوا بە مەشیئەتی تەکوینیی و تەشریعیی خۆی بە هەردووکیان ویستوویەتی ڕێنماییمان بکات، ئەوەتا پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، ناردوون و کتێبەکانی ناردوونە خوار بۆ ڕێنمایی مرۆڤ.

کەواتە: خوا هەم بە مەشیئەتی قەدەریی و تەکوینیی خۆی و، هەم بە ویستی بەرنامە دانانی خۆی، ویستوویەتی ڕێنماییمان بکات و، هەردوو ویستەکەی بەرجەستە بوون لەوەدا کە خوا هیدایەت و ڕێنوێنیی خۆی ناردوە، کەواتە نابێ ئەوە وا تەفسیر بکرێ: ﴿ وَلَوْ

شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی ڕێنمایی دەکرد، چونکە خوا هەموومانی ڕێنمایی کردوە، نا، بەڵکو یانی: ئەگەر ویستبای بتانخاتە سەر ڕێگای ڕاست، ئەگەر ویستبای بە ئامانجتان بگەیەنێ، هەمووتانی بە ئامانج دەگەیاند و، دەیخستنە سەر ڕێگای ڕاست، ئا ئەوەیان خوا ﷻ نەیویستوە بۆ هەمووان، ئەگەرنا ویستوویەتی ڕێنماییمان بکات، ڕێنماییەکەی ناردوە و، ویستوویەتی و بڕاوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە خوا ﷻ بۆ هەمووانمانی نەویستوە، ئەوەیە کە هەمووان بە ئامانج بگەیەنێ و، بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست، ئەو ڕێیە ڕاستەی کە بە پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بۆی ڕوون کردوونەوە، ئێمە پێشتر لە دەرسەکانی پێشوودا، لە تەفسیری سوورەتەکانی پێشووتردا هێنامان کە خوا ﷻ هەم لە سوورەتی (**الكهف**) و هەم لە سوورەتی (**الملك**) و، هەم لە سوورەتی (**هود**)دا، باسی ئەوەی کردوە، کە مرۆڤەکان بۆ تاقیکردنەوە دروستکراون، بۆیە دەبێ دەرفەتیان هەبێ و، دەستیان ئاوەڵابێ، داخۆ بە ڕێی ڕاستدا دەڕۆن، یان بە ڕێی چەوتدا، دوای ئەوەی کە خوا ڕێی ڕاستی بۆ ڕوون کردوونەوە، وەك لە سوورەتی (**الإنسان**)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئێمە بەرە و ڕاستە ڕێ ڕێنماییمان کردوە، یان سوپاسگوزار دەبێ و ڕێی ڕاستەکەی کە خوا بۆی ڕوون کردۆتەوە، دەیگرێتەبەر، یان سپڵە دەبێ و بێ نمەك و بێ وەفا دەبێ و، ئەو ڕێیە ڕاستەی خوا خستوویەتە بەردەستی، نایگرێتەبەر و پشتی تێ دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان !

ئـەم دەرسـەمان دوازدە (١٢) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٠ - ٢١)، لـەم دوازدە ئایەتـەدا، خـوای میهرەبـان بـاسی ژمارەیـەکی زۆر لـە چاکـەو نیعمەتـەکانی خـۆی کـردوە، کـە سـەرجەم بیسـت، نیعمـەتی بنەڕەتییـن، بگـرە زیاتریشـن.

پاشـان خـوا بـاسی بەدیهێنەرایەتیـی خـۆی کـردوە و، ڕایگەیانـدوە، کـە چاکـەکانی خـوا دەژمێررێـن، بـەڵام سـەرژمێرناکرێن، دەتوانیـن بڵێیـن: یـەك، دوو، سـێ، چـوار، پێنـج، بـەڵام بۆمـان سـەرژمێر ناکرێـن، تاکـو بزانیـن ژمـارە و ئەندازەیـان چەنـدە!

دوایـی خـوا بـاسی زانیاریـی خـۆی بـە پەنهـان و ئاشـکرای مرۆڤـەکان کـردوە، کـە هەمـوو شـتێکیان لەبـارەوە دەزانێ.

لـە کۆتاییشـدا خـوا بـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکانی ڕاگەیانـدوە، کـە ئـەو شـتانەی جگـە لـە خـوا لێیـان دەپاڕێنـەوە و دەیانپەرسـتن، هیـچ شـتێك بەدیناهێنـن و خۆشـیان وەدیهێـنراون و، مـردوون و ناشـزانن کـەی زینـدوو دەکرێنـەوە !

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾ وَأَلۡقَىٰ

فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{خوا ئەو کەسەیە کە لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندوە، لێی دەخۆنەوە و، ڕووەکیشی لێ پەیدا دەبێ، ئاژەڵی تێدا دەلەوەڕێنن ﴿١٠﴾ هەروەها بەو ئاوە کشتوکاڵ و درەختی زەیتوون و، خورماو، ترێ و، لە درەختی هەموو میوەکان بۆتان دەڕوێنێ، بێگومان لەوەدا نیشانەیەك (ی مەزن لەسەر پەروەردگارێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا) هەیە بۆ کۆمەڵێك بیر بکەنەوە ﴿١١﴾ هەروەها شەو و ڕۆژ و خۆر و، مانگی بۆ ملکەچ کردوون و، ئەستێرەکانیش بە فەرمانی وی ڕام کراون، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە (ی بەرچاو) هەن، بۆ کۆمەڵێك بفامن و، ئەوەش کە لە زەمین دا بە ڕەنگی جۆراو جۆرەوە (لە ڕووەك و ژیانداران) هێناویەتە دی، بە دڵنیایی لەوەشدا نیشانەیەك(ی مەزن) هەیە، بۆ کۆمەڵێك ڕاستییەکانیان وە بیر بێنەوە ﴿١٢﴾ هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە دەریای دەستەمۆ کردوە، تاکو گۆشتی تەڕو تازەی (ماسی و ژیاندارانی دیکەی) لێ بخۆن و، خشڵێکی لێ دەربێنن کە بە خۆتانیەوە دەکەن و، کەشتییانیشی تێدا دەبینی قڵیشێنەر(ی ئاوی دەریا)ن، هەروەها تاکو بەهۆی ئەو کەشتییانەوە سەفەر و بازرگانیی بکەن و، لە بەخششی وی داوا بکەن، بەڵکو سوپاسگوزارییش بۆ خوا بکەن ﴿١٤﴾ هەروەها (خوا) چیایە چەسپاوەکانی هاویشتوونە نێو زەوی، تاکو نەتان لەرزێنێ، هەروەها ڕووبار گەلی تێدا داناون و، ڕێیەکانی تێدا پەیدا کردوون بەڵکو پێیاندا بگەنە ئامانج ﴿١٥﴾ هەروەها نیشانە گەلی (لە زەمین)دا داناون، کە بەهۆیانەوە و، بە هۆی ئەستێرانەوە ڕێ دەردەکەن ﴿١٦﴾ ئنجا ئایا کەسێك کە (شتان) وە دی دێنێ، وەك کەسێکە کە (هیچ شتێك) دروست ناکات؟ ئایا بیرتان ناکەوێتەوە! ﴿١٧﴾ ئنجا هەرچەندە چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، (ژمارە و ئەندازەیان نازانن)، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە ﴿١٨﴾ هەروەها خوا

ئـەوەی کـە پـەنهانی دەکـەن و، ئـەوەش کـە ئاشـکرای دەکـەن، دەیزانـێ ﴿١٩﴾ ئەوانـەش کـە لـە جیـاتی خـوا داوایـان لـێ دەکـەن و دەیانپەرسـتن، هیـچ دروسـت ناکـەن و، خۆشـیان دروسـت دەکرێـن ﴿٢٠﴾ مـردوون و زینـدوو نیـن و، هەسـتیش ناکـەن کـەی زینـدوو دەکرێنـەوە ﴿٢١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(شَرَابٌ): (الـشُّرْبُ: تَنـاولُ كُلِّ مَائـعٍ مَـاءً كانَ، أَو غَـيْره، والـشَّرَاب جَمْعُـهُ أَشْرِبَـة)، (شُرْبُ): بریتیـە لـە خواردنـەوەی هـەر شـلەمەنییەك، ئـاو بێـت، یـان جگـە لـە ئـاو، (شراب)یـش بـە (أَشْرِبَـة)، واتـە: خواردنـەوەكان كـۆ دەكرێتـەوە.

(شَجَرٌ): (الشَّـجَرُ: مِـنَ النَّبـاتِ مَـا لَـهُ سـاقٌ: شَـجَرَة، وَشَـجَر)، (شَـجَر): لـە ڕووەكان ئەوەیـە كـە لاسـكی هەبـێ، بنـك و قـەدی هەبـێ، لەسـەری بوەسـتێ، كـە هـەم وشـەی (شـجر)، هـەم وشـەی (شَـجَرَة)ش بـەكاردێ.

(تُسِيمُونَ): (السُّـومُ: أَصْلـهُ الذَّهَـابُ فِي ٱبْتِغَـاءِ الـشَّيءِ، سُـمْتُ الإِبْـلَ فِي المَرْعَـى وَأَسَـمْتُهَا وَسَـوَّمْتُهَا)، (سَـوْم): ڕیشـەكەی بریتیـە لـەوەی كـە تـۆ بـە دوای شـتێكدا بچیـت، دەگوتـرێ: (سُـمْتُ الإِبِـلَ فِي المَرْعَـى)، حوشـترەكەم لـە لـەوەڕگادا لەوەڕانـد، (وَأَسَـمْتُهَا وَسَـوَّمْتُهَا)، هەردووكیان هـەر بـە مانـای لەوەڕاندنـن.

(الزَّرْعَ): (الـزَّرْعُ: الإِنْبـاتُ وَالـزَّرْعُ مَصْـدَرٌ عُـبِّرَ بِـهِ عَـنِ المَـزْرُوعِ)، وشـەی (زَرْع)، بـە مانـای ڕوانـدن دێ، شـینكردن، سـەوز كـردن، كـە چاوگـە و مەبەسـت پێـی شـتێكە كـە چێـنراوە و سـەوز كـراوە.

(وَسَخَّرَ لَكُمُ): (التَّسْـخِير: سِـياقَةٌ إِلَى الغَـرَضِ المُخْتَـصِّ بِـهِ قَهْـرَاً، المُسَـخَّرُ: المُقَيَّـضُ لِلْفِعْـلِ)، (تَسْـخِير): بریتیـە لـەوە كـە شـتێك پـاڵ بنێـی بـەرەو ئـەو ئامانجـەی كـە تایبەتـە پێیـەوە، ناچاری بكـەی بـەرەو ئـەوێ بچـێ، (مُسَـخَّر) واتـە: مـل پـێ كەچكـەر و ڕامكـەر و دەسـتەمۆكەر.

(وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ): (ذَرَأَ اللَّـهُ الخَلْـقَ)، خـوا خەڵـكی هێنایـە دی، (أَي: أَوْجَـدَ أَشْـخَاصَهُمْ)، هێنانیـە دی، (ذَرَأَ الـشيءَ: كَـثَّرَه)، (ذَرَأَ) بـە مانـای زۆركردنیـش دێـت.

(يَذَّكَّرُونَ): (ذَكـر الـشيءَ: حَفِظَـهُ، وَاسـتحْضَرَهُ، وَجَـرَى عَـلَى لِسـانِهِ بَعْـدَ نِسْـيانٍ)، (ذَكـر الـشيءَ)، واتـە: شـتەكەی لەبەركـرد، یـان لـە مێشـكی دا ئامـادەی كـرد، یـان بەسـەر زمانی خۆیـدا

هێنا دوای ئەوەی کە لە بیری چووبۆوە، (يَذَّكَّرُونَ)، واتە: (يَتَذَكَرون)، هەڵبەتە (ت)ەکە لە (ذال)ەکە دغم کراوە، واتە: وە بیریان دێتەوە، دەهێننەوە بیرخۆیان.

(طَرِيًّا): (غَضّاً جَدِيداً)، واتە: تەڕو تازە، گۆشتێکی تەڕو تازە کە کۆن نەبوو بێ، (الإِطراء: مَدْحٌ يُجَدَّدُ ذِكرهُ)، (إطراء) مەدحێکە کە بە جۆرێك کەسێك کەسێکی مەدح کردبێ کە هەموو جارێ ئەو مەدحە باس بکرێتەوە.

(حِلْيَةً): (الحَلْيُ وَالحِلية مَا يُتَزَيَّنُ بهِ، مِنْ مصوغِ المَعْدَنِيّاتِ أَوِ الحِجَارَةِ، وَالجَمْعُ حُلِيٌّ)، (حَلْيٌ وحِلْية): هەردووکیان یانی: شتێك کە خۆی پێ دەڕازێنرێتەوە، لەوەی کە لە کانزایەکان و لە بەرد دروست دەکرێ، واتە: لە زێڕ و زیو، لەو بەردانەی وەك گەوهەر و مرواریی و لە بەردی بە نرخ و ئەڵماس و لەو شتانە، کۆیەکەی (حُلِيٌّ)یە.

(مَوَاخِرَ فِيهِ): (مَخَرَتِ السَّفِيْنَة المَاءَ: شَقّتهُ، بجؤجُئِهَا)، کەشتییەکە ئاوەکەی شەق کرد، واتە: بە لمبۆزەکەی، (جؤجؤ)، پێشەوەی کەشتییە کە بە شێوەیەکی سێگۆشەیی تیژ دروستکراوە، بۆ ئەوەی ئاو ببڕێ، (مَوَاخِرَ) کۆی (ماخِرَة)یە، (أَي: شَآقّة)، شەقکەر بووە بۆ ئاو، قڵیشێنەر.

(وَأَلْقَىٰ): یانی: تێی فڕێدا، فڕێییدا، هاویشتیە نێوی، ئایا بۆچی خوا بۆ چیاکان بە زۆریی هەر ئەو وشەیەی بەکارهێناوە؟ ﴿وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ﴾؟

زانایانی زەویناسیی ئێستا، وایان لێکداوەتەوە، دەڵێن:

١) یان ئەوەیە کە ئەو چیایانە لەو بەرد و پارچانە بوون کە لە ئەستێرەو خڕۆکەکانی دیکەوە هاتوون، بەرەو مەودای کێشکردنی زەوی و هاتوونە سەر زەوی، هەر بۆیەش وا بە زەویشدا قووڵ چوونە خوار، هەر چیایەك چەندی بە دەرەوەیە، دە پازدە (١٠ - ١٥) هێندەی لە نێو زەوی دایە.

٢) یان لەبەر ئەوە بووە کە لە ئەنجامی ئاگرپرژێنەکاندا کە پەیدا بوون، ئاگرپرژێن (بركان)یش بریتیە لەو کانزاو مادده تواوە و زۆر گەرمانەی کە لە ناخی زەویدا هەن، ئنجا زەوی کە دەریان دەقوڵێنێ، بەرزدەبنەوە و، دوایی دێنەوە سەر زەوی، بۆیە وەك لە دەرەوەی خۆی تێی فڕێدرابن.

(رَوَٰسِيَ): (جَمْعُ راسِية مِنَ الرسوّ: وَهُوَ الثَّباتُ وَالرُّسُوخ)، دیارە (رَواسِي)، کۆی (رَاسِية) یە، (رَاسِية) یانی: چەسپاو، لە (رسو)ەوە هاتوە، (رسو)، یانی: (الثَّبات وَالرُسُوخ)، ئنجا (رَواسي)، یانی (الجبالُ الرَّوَاسِي)، چیایە چەسپاوەکان، چیایە مەحکەمەکان، داکوتراوەکان بە زەویدا.

( تَمِيدَ بِكُمْ )، (المَيْدُ: الإِضْطِرَاب)، یانی: لەرزینەوە و هەژان، جووڵان.

( تَعُدُّواْ ): (عَدَّ الدَّرَاهِمَ: حَسَبَهَا وَأَحْصَاهَا)، واتە: درهەمەكانی ژماردن.

( لَا تُحۡصُوهَآ ): (أَحْصَى الشيءَ: عَرَفَ قَدْرَهُ)، (أَحْصَى)، بریتیە لەوەی كە تۆ ژمارە و ئەندازەی ئەو شتە بزانی، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەگەر چاكەكانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناكرێن، واتە: ناتوانن ژمارە و ئەندازەكەیان بزانن.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ دوای ئەوەی كە لە نۆ (٩) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەكەدا، چەند ڕاستییەكی زۆر بنەڕەتیی و مەزنی خستنەڕوو و، ئاماژەی كرد بە كۆمەڵێك - دە (١٠) دانە - لە چاكەو نیعمەتە بنەڕەتییەكانی خۆی، لە ژیانی مرۆڤدا و، لە كۆتایی دا، واتە: كۆتایی نۆ (٩) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (النحل)دا، فەرمووی: خوا لەسەر خۆی پێویست كردوە كە ڕێی ڕاستتان بۆ ڕوون بكاتەوە، بیخاتە بەر چاوتان، هۆشداریشی پێدان كە لە نێو ڕێیەكاندا ڕێی هەڵە و لادەر، یاخود ڕێیەك كە دەبێتە هۆی لادانی كەسێك كە بیگرێتەبەر، ئەو ڕێیانەش هەن و دەبێ لێیان وریابن، هەروەها باسی ئەوەشی كرد كە خوا ئەگەر ویستبای، هەمووتانی دەخستە سەر ڕاستە ڕێ، هەمووتانی ڕاستە ڕێ دەكرد، بەڵێ ویستوویەتی هەمووتان ڕێنمایی بكات و ڕێنمایی كردوون، بەڵام كە بتانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئەوەی نەویستوە، بۆچی؟ چونكە ئەوە پێچەوانەی ئەو حیكمەتەیە كە خوا مرۆڤی بۆ دروستكردوە، كە بریتیە لە تاقیكردنەوە.

دوای ئەوە ئنجا لەم ئایەتانەدا، خوا ﷻ ژمارەیەكی زۆر لە چاكەو نیعمەتە گەورەو بەرجەستەكانی خۆی دەخاتە بەرچاو، كە سەرجەم بیست و چوار (٢٤)ن، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴾، خوا ئەو كەسەیە كە لەسەرێوە ئاوی بۆ دابەزاندوون، ئنجا بۆ ئێوە لەو ئاوەدا، خواردنەوە هەیە و، ڕووەك و لەوەڕگاش هەیە، كە وڵاخەكان و ئاژەڵەكانی خۆتانی تێدا دەلەوەڕێنن، ئەمە سێ لە نیعمەتەكانی خوا:

**یەكەم:** دابەزاندنی ئاو لەسەرێوە، كە بەپێی ڕواڵەت، زەوی هێزی ڕاكێشانی هەیە، بەڵام تۆ تەماشا بكە، خوا ﷻ یاسایەكی وای داناوە، كە ئەو ئاوە بچێتە سەرێ، دوایی بێتەوە خوار، چۆن؟ تیشكی

خۆر لە ئاوی دەریاکان دەدات، دەیکاتە هەڵم، ماددەی خوێ و تاڵ و تفیتییەکەی بەجێ دەمێنێ و، ئاوە شیرین و زوڵاڵەکەشی بە شێوەی هەڵم بەرز دەبێتەوە بۆ سەرێ، دوایی بایەکان دەیهێنن بۆ ئەو شوێنانەی کە ساردن و، لەوێ دەبێتە هەور و، پاشان موتوربە دەبێ و، وەك ئاوێك دادەبەزێتە خوارێ، ئەویش بە سێ شێوە:

أ - بەشێوەی باران (المطر).

ب - بە شێوەی بەفر (الثلج).

ج - بە شێوەی تەرزە، (البرَد).

**دووەم:** نیعمەتێکی دیکە ئەوەیە: ﴿ لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ ﴾، لەو ئاوە شیرین و زوڵاڵە کە لە ئاسمان دێتە خوار، خواردنەوە هەیە بۆ ئێوە، چ خواردنەوەی ڕاستەوخۆ کە ئاوەکە دەخۆنەوە، چ شەربەت و ماستا و و چەندان جۆرە خواردنەوەی دیکەی لێ دروست دەکەن.

**سێیەم:** نیعمەتێکی دیکە:

﴿ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴾، هەر لەو ئاوە ڕووەکێك دەڕوێ، شیناوردێك، سەوزاییەك دەڕوێ، لەوەڕگایەك دەڕوێ، کە ئێوە ئاژەڵەکانی خۆتانی تێدا دەلەوەڕێنن.

**ئنجا ئاماژە دەکات بە پێنج (٥) نیعمەتی دیکە:**

﴿ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، ئنجا بەو ئاوە خوا چەند شتێکتان بۆ دەڕوێنێ:

**یەکەم:** کشتوکاڵ: گەنم و جۆ و جۆرەکانی دیکەی دانەوێڵە و، تەڕەکار، وەك شووتیی و کاڵەك و ترۆزیی و خەیار و تەماتە و باینجان و بامیە، هەروەها سەوزە دەگرێتەوە وەك: کەوەر و تەڕەتیزە و پیاز و سیر و توور و هتد دەگرێتەوە.

**دووەم:** ﴿ وَٱلزَّيۡتُونَ ﴾، هەروەها درەختی زەیتوونیشتان هەر بەو ئاوە بۆ دەڕوێنێ.

**سێیەم:** ﴿ وَٱلنَّخِيلَ ﴾، دیسان درەختی دارخورماتان بۆ دەڕوێنێ.

**چوارەم:** ﴿ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ ﴾، هەروەها دارمێوەکانتان بۆ دەڕوێنێ، کە ترێتان بۆ دەگرن.

**پێنجەم:** ﴿ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، جگە لەم چوار جۆرەش، واتە: جگە لە کشتوکاڵ و زەیتوون و خورما و ترێ، لە هەموو جۆرە میوەیەکی دیکەشتان هەر بەو ئاوە بۆ دەڕوێنێ.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾، بێگومـان لـەوەدا نیشـانەیەکی گـەورە هەیـە، نیشـانەی گـەورە لەسـەر چـی؟ لەسـەر تەنیـا بەدیهێنەرایەتیـی خـوا، تەنیـا پەروەردگارێتیـی خـوا، تەنیـا خاوەنداریێتیـی خـوا، تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـوا بـۆ گـەردوون، بـۆ مـرۆڤ و بـۆ جنـد، بـەڵام نیشـانەیە بـۆ کـێ؟ ﴿لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بـۆ کۆمەڵێـك بیـر بکەنـەوە، ئـەوەی بیـر نەکاتـەوە، بێگومـان لـە هیـچ کام لـەو نیشـانانەی کـە خـوا داینـاون، بەهرەمەنـد نابـێ، ئـەو نیعمەتانـە کـە هـەر کامێکیـان نیشـانەیەکە بـۆ ناسـاندنی خاوەنەکـەی خـۆی، بەدیهێنـەر و پەروەردگارەکـەی خـۆی کـە خوایـە ﷻ.

لـە ئایـەتی پێشـێ دا ئامـاژەی بـە سـێ لـە نیعمەتـەکانی کـرد، لـەم ئایەتەشـدا ئامـاژەی کـرد بـە پێنـج جـۆرە نیعمـەتی دیکـە.

دوایـی ئامـاژە دەکات بـە پێنـج جـۆرە نیعمـەتی دیکـەی خـۆی، دەفەرمـوێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتٌ﴾، هەروەهـا خـوا بـۆی ملکـەچ کـردوون، بـۆی ڕام و دەسـتەمۆ کـردوون:

**یەکەم:** شـەوگار.

**دووەم:** ڕۆژگـار.

**سێیەم:** خــــۆر.

**چوارەم:** مـانگ.

**پێنجەم:** هەروەها ئەستێرەکانیش بە فەرمانی ئەو، بە فەرمانی تەکوینیی و قەدەریی وی ملکەچن، ڕامن، دەستەمۆن، بەو شێوەیە دێن و دەچن، کە خوا بۆی دیاریی کردوون، کە هەمووشی بۆ ئێوەیە: ئێوە هەم لە شەوگار بەهرەمەندن و پشووی تێدا دەدەن، وەك لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾﴾النبأ، واتە: شەوگار خەوتان هۆکاری پشوودانێکە، شەوگارییش پۆشاکێکە داتاندەپۆشێ، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾﴾النبأ، ڕۆژگاریشی بۆ ڕەخساندووین، کە ژیان و گوزەرانتانی تێدا دابین بکەن.

ئنجـا خـۆر کـە لـە ڕۆژگاردا دەبـێ و دنیاتـان بـۆ ڕوونـاك دەکاتـەوە، مانـگ کـە (لە شـەوگاردا) دەبـێ و، وێـڕای زانینـی کاتـەکان، سـەری مانـگ و، بنـی مانـگ و ئەمانـە بەهـۆی ئـەوە کـە مانـگ یـەك شـەو و، دوو شـەو و، سـێ شـەو و، تاکو پـازدە، لـە دوای پانـزدە، دووبـارە بچـووك دەبێتـەوە تاکـو دەبێتـەوە بـە سـێ شـەو و، دوو شـەو و، یـەك شـەو و دوایـی ون دەبـێ، وێـڕای

ئەوەش بۆ ئەوەیە کە شەوگار تاریکەو خۆر بەدەرەوە نیە، دنیا یەکجاریی تاریك نەبێ، ببێتە تاریکە شەوێکی ئەنگوستە چاو، ئەو مانگە ئەندازەیەك ڕووناکییتان پێدەدات، بەڵام ڕێگا لە پشوودان و خەوتان ناگرێ، چونکە کاتی خەو، مرۆڤ پێی خۆشە لە شوێنێك بێ تاریك بێ، خەفە بێ و تیشکی خۆر بەدەرەوە نەبێ و ڕووناکیی لێ نەبێ.

﴿ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمْرِهِۦٓ ﴾، ئەستێرەکانیش بە فەرمانی خوا، بە فەرمانی تەکوینیی خوا، بە ئیرادەی خوا ملکەچن، دەستەمۆن، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك کە بفامن.

ئەوەی پێشێ فەرمووی: ﴿ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، دەبێ بیربکەنەوە، بەڵام بۆ ئەمەیان فەرمووی: ﴿ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، واتە: هەر عەقڵتان پێ بشکێ، ئەگەر زۆریش قووڵ دا نەچن، هەر عەقڵتان هەبێ و بفامن، نیشانەی زۆر لە شەو و ڕۆژ و، مانگ و خۆر و، ئەستێرەکاندا دەبینن و، ئەو نیشانە زۆرانە هەن لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا ﷻ.

ئنجا دێتە سەر باسی نیعمەتێکی دیکەی، چواردەیەم: دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥٓ ﴾، هەروەها ئەوەی کە لە زەویدا بۆی هێناونە دی، ڕەنگی جیا جیایە، ئەوەی خوا لە زەوی دا بۆی هێناوینە دی هەموو شتێك دەگرێتەوە: زیندەوەران دەگرێتەوە، ڕووەك و شیناورد دەگرێتەوە، دار و درەخت دەگرێتەوە، میوەکان دەگرێتەوە، دانەوێڵە، هەمووی دەگرێتەوە، ئەوەی ڕەنگی جیا جیایە، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کۆمەڵێك بیریان بکەوێتەوە، هەر بیریان بکەوێتەوە، ئەو ڕاستییانە کە خوا لەگەڵ فیترەت و سروشتیاندا تێکی هەڵشێلاون، بە بیرخۆیانیان بێننەوە، ئەوەی خوا لەسەر زەوی بە ڕەنگی جیا جیا، شێوازی جیا جیا، دروستی کردوون، دەیکەنە نیشانەو بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا ﷻ.

ئنجا پێنج چاکە و نیعمەتی دیکەی خۆی دەخاتە ڕوو، واتە: پازدە و شازدە و حەڤدە و هەژدە و نۆزدەیەم:

دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ ﴾.

**پازدەیەم:** خوا ئەو کەسەیە کە دەریای ڕامکردوە، ملکەچکردوە، دەستەمۆکردوە، کەواتە: هەر ملکەچبوونی دەریا ئەوە هەر بۆخۆی نیعمەتێکە.

**شازدەیەم:** ﴿لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا﴾، بۆ ئەوەی گۆشتێکی تەڕ و تازەی لێ بخۆن، ئنجا گۆشتی ماسییە، یان ژیاندارانی دیکەیە، هەندێ لە ژیانداران لە گۆشتی ماسی زۆر بە نرختن، وەك: ڕۆبیان و، زۆر جۆرە گۆشتی دیکە کە لە زۆر وڵاتاندا بەکاردەهێنرێن و زانایانی ئیسلام دەڵێن: هەموو ئەو ژیاندارانەی کە لە دەریادان، بەبێ هەڵاواردن هەموویان گۆشتیان دەخورێ، مەگەر لە ڕووی پزیشکییەوە دەربکەوێ کە یەکێکیان گۆشتەکەی زیانی هەیە، ئەو کاتە لە ڕووی پزیشکییەوە ناخورێ، بەڵام دەریا هەرچی ژیانداری تێدایە، هەمووی گۆشتەکەی ڕەوایە.

**حەڤدەیەم:** ﴿وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾، هەروەها خشڵێکی لێ دەردەهێنن کە بە خۆتانیەوە دەکەن، کە بە پلەی یەکەم مەبەست پێی گەوهەر و مرواریین: ﴿ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ۝٢٢﴾ الرحمن، کە دوایی باس دەکەین چۆن دروست دەبن! ﴿تَلْبَسُونَهَا﴾، لەبەری دەکەن، بە خۆتانی وەدەکەن، لێرەدا خوا ﷻ پیاوان و ئافرەتان پێکەوە دەدوێنێ، ئنجا وەك دوایی باسی دەکەین، هەندێك لە زانایانی ئیسلام وایانزانیوە کە خوا ﷻ لێرەدا بە تایبەت مسوڵمانان دەدوێنێ، بۆیە مشتومڕی ئەوەیان کردوە کە ئایا دروستە پیاوان گەوهەر بەخۆیان وەبکەن !! بەڵام خوا ﷻ مرۆڤی بەگشتی دواندوە و ئەو مرۆڤانەش پادشا و حوکمڕان و کەسانی وایان هەبووە، کە گەوهەر بەخۆوە بکەن، لە تاجەکانیان داوە، خوا مرۆڤی دواندوون لەم ئایەتانەدا و بە تەنیا مسوڵمانانی نەدواندوون!

**هەژدەیەم:** ﴿وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ﴾، هەروەها لە دەریادا کەشتییەکانی تێدا دەبینی، قڵیشێنەرن، واتە: بە نووکی خۆیان کە بە عەڕەبی (**جۆجۆ**)ی پێ دەڵێن، بەدەمەکەیان، ئەو ئاوە شەق دەکەن و دەیقڵیشێنن.

بابیهێنینە بەرچاومان: ئەگەر ئاوی دەریا و ڕووبارەکان وەك بەرد و خاك سەخت و پتە و بووایە، کەشتیی و پاپۆڕ و بەلەمەکان، چۆن پێیدا دەڕۆیشتن ؟!

**نۆزدەیەم:** ﴿وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بە سواری ئەو کەشتییانە، ئێوە لە چاکە و بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: بازرگانیی بکەن، سەفەر و بار و سوار بکەن، ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾، بۆ ئەوەش کە سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکەن.

ئنجا پێنج نیعمەتی دیکەش دەخاتە ڕوو، یانی: لە: بیست تاکو بیست و چوارەم:

**بیستەم:** ﴿وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، چیایە چەسپاوەکانی هاویشتوونە نێو زەوی، ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، تاکو ئەو زەوییە ئێوە نەلەرزێنێ. زانایان گوتوویانە: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، ئەو تەعبیرە لە عەڕەبییدا واتە: بۆ ئەوەی نەتان لەرزێنێ، ئنجا هەندێکیان

گوتوویانە: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، یانی: (**كراهة أن تميد بِكم**)، هەندێکیش گوتوویانە، یانی: (**أن لا تميدَ بِكم**)، بۆ نموونە: دەگونجێ: (**أن تأكُل**)، بە: (بۆ ئەوەی تۆ بخۆی)، یان بە: (بۆ ئەوەی تۆ نەخۆی)، مانا بکرێ، واتە: ئەو پیت و وشانە کە دەکەونە پەنای یەك، بەپێی سیاقەکان، بەپێی عورفی زمانی عەرەبی کە عەرەب عادەتیان بووە، مانا بەدەستەوە دەدەن.

مانـای ئـەو دوو ڕستەیەش ئاوایـە: (**كراهـة أَنْ تَمِيـدَ بِكُـم**)، پێـمان ناخۆشـە کـە بتـان لەرزێنێتـەوە، (**لألاّتميـد بكُـم**)، بـۆ ئـەوەی نەتـان لەرزێنێتـەوە.

**بیست و یەکەم:** ﴿وَأَنْهَٰرًا﴾، خوا ڕووبارەکانیشی لە زەویدا داناون، کە ڕووبارەکان پەیوەندییان بە چیاکانەوە هەیە، چونکە سەرچاوەی ڕووبارەکان هەموویان چیاکانن، بەفری چیاکانە، کانی و سەرچاوەکان لە چیاکانەوە هەڵدەقوڵێن و دێنەخوار، ئنجا جۆگەلە و ڕووباریان لێ پێکدێن.

**بیست و دووەم:** ﴿وَسُبُلًا﴾، هەروەها خوا ڕێیەکانیشی بۆ داناون، یانی: زەمینی وا هەڵخستوە بتوانن ڕێیانی تێدا دابنێن، ﴿لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾، بۆ ئەوەی بەڕێیە بزانن، بۆ ئەوەی بە ڕێیەکاندا بگەنە ئەو ئامانج و مەنزڵ و هەوارگانەی کە دەتانەوێن، یاخود ﴿لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾، یانی: خوا ئەوانەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی کە ڕێی ڕاست بگرن و، خاوەنی خۆتان کە خوای پەروەردگارە، بناسن و بپەرستن.

**بیست و سێیەم و بیست و چوارەم:** ﴿وَعَلَٰمَٰتٍ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾، هەروەها خوا نیشانەکانیشی بۆ داناون، (**علامات**)، کۆی (**علامة**)یە، مەبەست ئەو نیشانانەن کە لەسەر زەوی هەن، ئەوە گردێکە، ئەوە ڕووبارێکە، ئەوە دەشتێکە، ئەوە چیایەکە، ئەوە درەختێکە، ئەوە باخێکە، بەهۆی ئەو نیشانانەوە، بەڕێ و بانان دەزانن، ﴿وَبِٱلنَّجْمِ﴾، هەروەها بەهۆی ئەستێرەکانیشەوە، لە دەریا و وشکانیی دا ڕێ دەردەکەن: ﴿هُمْ يَهْتَدُونَ﴾، لێرەدا بە دڵنیاییەوە مەبەست پێی بەڕێ زانینە، واتە: بەهۆی نیشانەکانەوە، بە هەموو جۆرەکانیانەوە و بەهۆی ئەستێرەکانەوە، ئێوە دەتوانن ڕێ و بانان بدۆزنەوە و بە شوێنەکان بزانن و ڕێتان لێ ون نەبێ.

دوایـی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ﴾، ئایـا ئـەوەی کـە شـتان وەدیدێنـێ و لـە نەبـوو پەیدایـان دەکات (کـە مەبەسـت پێـی خوایـە ﷻ)، وەك کەسـێك وایـە کـە پەیـدا نـاکات؟ جـا ئـەو کەسـە، چ مـرۆڤ بێـت، چ دار و بـەرد بێـت، چ بـت و صەنـەم بێـت، کـە وەك دواییـش بـاسی دەکەیـن: وشـەی (**مَـن**)ی بەکارهێنـاوە، (**مَن**)یـش بـۆ خـاوەن هۆشـان (**ذَوي الشـعور**)ە، ئەوانـەی کـە هەسـت و عەقڵیـان هەیـە، بـەڵام بـۆ غەیـری

ئەوانیش بەکاردێ، بەپێی بنەمای: (**تغليب ذوي الشعور على غير ذوي الشعور**)، زاڵکردنی خاوەن هۆشان لەسەر غەیری خاوەن هۆشان.

چونکە بە دڵنیاییەوە بتپەرستەکان و ئەوانەی کە غەیری خوایان پەرستوە، جار جار مرۆڤەکانیشیان پەرستوون، ئنجا چ مرۆڤی زیندوو، چ مرۆڤی مردوو، هەر بەلای کەمەوە ئەو سادین و بتەوانانە (**سدنة**)ی کە خزمەتی بتەکانیان کردوون، زۆرجار هەر بە ناوی بتەکانەوە قسەیان کردوە، کە ملکەچییان بۆ ئەو سادین و بتەوانانە، جۆرێك بووە لە پەرستنیان بۆیان.

﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیر ناکەنەوە، ئایا وەبیرتان نایەتەوە کە نابێ زاتێك کە بەدی دەهێنێ، یەکسان بکرێ لەگەڵ دروستکراوێکدا، کە هیچ شتێکی لەدەست نایەت و ناتوانێ شت وەدی بێنێ ؟!

﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾، ئەگەر چاکەکانی خواش بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، لێرەدا کە وشەی نیعمەتی بە تاك هێناوە، یانی: جینسی نیعمەتەکانی خوا، یاخود: یەك دانە نیعمەتی خواش ئەگەر ورد سەرنجی بدەن، دەبینن: هەر یەك نیعمەتی خواش چەندان نیعمەتی دیکەی تێدا هەن، بۆ وێنە: نانێك کە دەیخۆی، ئەگەر بیری لێبکەیەوە چەندان شت پێکەوە هاوکار بوون، چەندان دروستکراوی خوا، دەست بەکاربوون تاکو ئەو نیعمەتەیان لێ پەیدا بووە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴾، هەروەها خوا دەزانێ ئەوەی کە پەنهانی دەکەن و، ئەوەی کە ئاشکرای دەکەن، هەمووی ئاگالێیە، ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴾، ئەوانەش کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هیچ دروست ناکەن، هیچ شتێك، تەنانەت خۆشیان دروست دەکرێن، ﴿ أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ ﴾، مردوون زیندوو نین، مردوون و خاوەنی ژیان نین، وشەی: ﴿ غَيْرُ أَحْيَآءٍ ﴾، جەختکردنەوەی مردوویێتیی ئەو بت و صەنەمانەیە، یان ئەو پەرستراوانەیە بە گشتی، ﴿ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾، هەروەها هەست ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

کەواتە: شایستەی ئەوەنین بپەرسترێن و، ئەو مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، کە دەبێ لەگەڵ خوادا بکرێ و، پەرستشەکانیان بۆ ئەنجام بدرێن، ئەوە شتێکی بێجێیە، شتێکی پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە، پێش ئەوەی پێچەوانەی شەریعەتی خوای پەروەردگار بێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا ئاوی لە ئاسمانەوە دابەزاندوە بۆ خواردنەوە و، لەوەڕی ئاژەڵ و، کشتوکاڵ و، میوەجات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١١ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١- ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە، وەك زۆرجار گوتوومە: وشەی (مَاء)، بەکارهاتوە، بۆ ئەوەی باران و بەفر و تەرزە بگرێتەوە، ئەگەر هەرکامێکیانی فەرمووبایە، هەر یەکێکیانی دەگرتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ ﴾، واتە: تەنیا خوا ئەوەی کردوە، نەك جگە لەو، کەواتە: هەر ئەویش بپەرستن، نەك جگە لەو بپەرستن.

وشەی (السَّمَآءِ)یش، واتە: سەرێ (**فوق**).

٢- ﴿ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ ﴾، لەو ئاوە کە دایبەزاندوە لە سەرێوە، ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵە، کە لە بنەڕەتدا ئاوی سوێر و تاڵی زەریا و ئۆقیانووسەکان بووە، بەڵام لە ڕێی هەڵماندن (**تَبْخير**)ەوە، کە تیشکی خۆر لێی داوەو کردوویەتی بە هەڵم، دوایی بایەکان هێناویانە (وەك لە چەندان ئایەتی قورئاندا زۆر بە ڕوونیی خوای پەروەردگار ئەوە دەفەرموێ:) بایەکان هێناویانە دوایی بردوویەتی بۆ هەندێ ناوچەی سارد و لەوێ بووە بە هەور و، پاشان ئەو ئاوە کە لە شێوەی باران و بەفر و تەرزە دایە، لێی هاتۆتەخوار، ئنجا لەو ئاوە، خواردنەوە هەیە بۆ ئێوە.

(**الشَّرَابُ: إِسْم للمَشْرُوبِ، وَهُوَ المَائِعُ الَّذِي تَشْتَفُّهُ الشَّفَتَان**)، (**شَرَاب**)، ناوە بۆ خواردنەوە، ئەویش بریتیە لەو شلەمەنییەی کە بە دوو لێوەکان دەخورێتەوە، جا چ ڕاستەوخۆ

بخورێتەوە کە ئاوە، چ شتی دیکەی پێ بگیرێتەوە، وەك: دۆ، ماستا و، شەربەت، جۆرەکانی خواردنەوە، کە زۆر زۆرن.

٣- ﴿ وَمِنۡهُ شَجَرٞ ﴾، هەروەها هەر لەو ئاوەشە ڕووەکێك، (**الشَّجَرُ: النَّباتُ ذِي الساقِ الصَّلْبة**)، ڕووەکێك کە قەد و لاسکێکی پتەوی هەبێ، بەڵکو وەك هەندێك لە شارەزایانی زمان دەڵێن: (**الشَّجَرُ مُطْلَقُ العُشْبِ، وَالكَلأ تَغْلِيباً**)، هەموو جۆرە گژ وگیاو لەوەڕێك دەگرێتەوە، بە زاڵکردنی گژوگیا بەسەر شیناوردی دیکەدا.

٤- ﴿ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴾، ئێوە ئاژەڵەکانی خۆتانی تێدا دەلەوەڕێنن، (**إسامَة**)، یانی: لەوەڕاندن، (**الإِسامَةُ: سامَتِ الماشِية فَهيَ سائِمَة**)، ئاژەڵەکە، چوار پێیەکان لەوەڕان، (**سائِمَة**)، یانی: لەوەڕاو.

٥- ﴿ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ ﴾، هەر بەو ئاوە کشتوکاڵتان بۆی پێ دەڕوێنێ، (**الزَّرْعُ : المَزْرُوع**)، (**زَرْع**) چاوگە، بە مانای (**إسم المفعول**)ە، (مزروع) بە مانای شتێك کە دەڕوێنرێ، سەوز دەبێ، شین دەبێ کە وەك گوتم: وشەی (**زرع**)، زۆر شت دەگرێتەوە، بە گشتی دەگوترێ: کشتوکاڵ، ئنجا ئەو کشتوکاڵە دانەوێڵە دەگرێتەوە، بە هەموو جۆرەکانی، گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و برنج و هەرزن و زوڕات و گەنمەشامیی و،... هتد.

پاشان تەڕەکار دەگرێتەوە، وەك: کاڵەك و شووتیی و ترۆزیی و خەیار و مۆز و ئەو شتانەی دیکە، کە وشەی تەڕەکار دەیانگرێتەوە.

دیسان سەوزە دەگرێتەوە بە هەموو جۆرەکانیەوە، وەك: کەوەر و تەڕەتیزەو پیاز و توور و سیر و تەماتەو بامیەو باینجان و، ئەوانەش هەندێکیان هەر دەیانخەنە ڕیزی میوە و، هەندێکیان دەیانخەنە ڕیزی سەوزەوە، بە هەرحاڵ خوا هەموو جۆرە سەوزەیەك، هەموو جۆرە شینایيەك، سەوزاییەك، ڕووەکێك، بۆ ئێوە بەو ئاوە دەڕوێنێ.

٦- ﴿ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ ﴾، دیسان درەختی زەیتوون دەڕوێنێ بەو ئاوە، هەروەها دارخورمایەکانی پێ دەڕوێنێ، هەروەها دار ترێیەکان کە مێویان پێ دەگوترێ.

٧- ﴿ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، هەروەها لە هەموو جۆرە میوەکانیش، خوا ﷻ بەو ئاوە دەڕوێنێ، ئەویش چۆن؟ ئێستا زانستی ڕووەك ناسیی دەریخستوە کە ڕیشەو بنەمای هەر ڕووەکێك، جا چ سەوزە بێ، چ دار و درەخت بێ، چ دانەوێڵە بێ، تەڕەکار بێ، شتێکە کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (**اليَخْضُور**) و بە ئینگلیزیی پێی دەگوترێ: (**کلروفیل**): (Chlorophele)، پێشی دەگوترێ:

ماددەی سەوز (المَادَّة الخَضْرَاء)، کە خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأنعام)، ئایەتی (٥٩)دا ئاماژەی پێکردوە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِیٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَیْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ ... ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە لە سەرێوە ئاوی ناردۆتە خوار، بەو ئاوە هەموو ڕووەکێکمان پێ ڕواندوە، لەو پنجە ڕووەکە سەوزاییمان دەرهێناوە {(خَضِرًا )، یانی: (یَخْضُور)، کلۆڕۆفیل}، کە لەوە دانەوێڵەی ڕیز بووی پێ دەردێنین، هەروەها لە دارخورماش لە کیف (طَلع)ەکەی هێشووە شۆڕبووەوە و نیزیکەکان....

(د. محمد راتب النابلسي)، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ:

{المادَّة الخَضْرَاء (كلروفيل) مَعْمَلٌ صَامِت، تَأْخُذُ مِنَ الشَّمْسِ أَشِعَّتَهَا، تَستعِينُ بامْلَاحِ الحَدِيد، وَبالمَاءِ الَّذِي يَدخُلُ إلى التُّرْبة، وَبثَاني أَوكْسِيد الكربُون، الَّذِي فِي المَسام، فَهذِهِ الوَرَقَةُ: تَصْنَعُ مَوَاد الجَذْرِ وَمَوَادَّ الساقِ، وَمَوَادَّ الأَغْصَانِ، وَمَوَادَّ الثِّمَارِ، وَكُلُّ الشَّجَرَةِ تُصْنَعُ بسَبَبِ هَذِهِ الوَرَقَةِ الخَضْرَاءِ الَّتِي هِيَ مَعْمَل لَهَا}.

واتە: ئەو ماددە سەوزە (کلۆڕۆفیل)، کارگەیەکی بێ دەنگە، لە خۆر تیشکەکەی وەردەگرێ و، هاوکاریی وەردەگرێ لە خوێیەکانی ئاسن و، ئەو ئاوەی کە دەچێتە نێو گڵ، لەوەش هاوکاریی وەردەگرێ، هەروەها لە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کە دەچێتە نێو کونەکانەوە، (هی ڕووەك) هاوکاریی وەردەگرێ، ئنجا ئەو گەڵایە کە سەوزییەکەیە، هەر ئەوە کە ماددەی ڕەگ و ڕیشەکە دروست دەکات و، ئەو کەرەسەی قەد و لاسکەکە دروست دەکات و، کەرەسەی لقەکان دروست دەکات و، کەرەسەی میوە دروست دەکات، هەروەها تێکڕای درەختەکە لە ئەنجامی ئەو گەڵایەوە کە مادەی کلۆڕۆفیلی تێدایە، (کە کرداری تیشکە پێکهاتن لەوێدا ئەنجام دەدرێ)، لەو گەڵایەوە خۆراك و بژیو بۆ هەموویان دەچێ، کە کارگەیەکە بۆ کۆی درەختەکە.

٨- ﴿ إِنَّ فِی ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانەیەکی مەزن هەیە بۆ کۆمەڵێك کە بیر بکەنەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِی ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، لەبەر ئەوەی ئاوەکە و کۆی ئەو شتانەی پێی دەڕوێن، یەك بابەتە، بۆیە خوا دەفەرموێ: (لَأٓيَةً )، نیشانەیەکی مەزن هەیە، بەڵام بۆ کێ؟ بۆ یەکێك کە بیربکاتەوە، مرۆڤ کە بیر نەکاتەوە، بێگومان سەری لێ دەرناچێ و، تێی ناگات کە چۆن بەو ئاوە، کە یەك ئاوە، بەڵام ئەو هەموو جۆرە

(١) ج٥ ص٧٨.

میوەیە، ئەو هەموو جۆرە دانەوێڵەیە، ئەو هەموو جۆرە سەوزەیە، ئەو هەموو جۆرە شتانە پەیدادەبن، کە هەریەکەی ڕەنگێك، هەریەکەی تامێك، هەریەکەی بۆنێك، هەریەکەی چەندان سوودی لێوەردەگیرێن.

ئنجا ئێمە بە باشی دەزانین کە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بکەین دەربارەی: زەیتوون و، خورما و، ترێ، بەڵام هی خورما و، ترێ، هەڵدەگرین بۆ ئایەتەکانی دواتر، بە تایبەت ئایەتی ژمارە (٦٦) کە دوایی دەیگەینێ.



## کورتە باسێک لەبارەی زەیتوونەوە[1]

### أ/ چەند زانیارییەکی گشتی:

١) زەیتوون درەختێکی تەمەندارە و بەردەوامیش سەوزە و، زەیتوون پێگەیەکی گرنگی هەیە لە نێو درەختە بەردارەکاندا، بەهۆی ئەوەوە کە هەم میوە دەردەکات، هەم دوای گوشرانی میوەکەی، زەیتیشی لێ پەیدا دەبێ.

٢) زەیتوون بەکاردەهێنرێ بۆ خۆراکی مرۆڤ، بە چەندان شێوە.

٣) چەندان ماددەی پزیشکیی لە زەیتوون دروست دەکرێن.

٤) لە ئەنجامی گوشینی میوەکەیدا و، گوشینی نێوکەکانیدا، تلْت و پاشماوەکەی دەکرێ بە ئالْف بۆ ئاژەڵان.

٥) ئەو تەختەیەی کە لە درەختی زەیتوون پەیدا دەبێ، بە باشترین جۆری تەختە بۆ سووتەمەنیی و، بۆ خەڵووز، دادەنرێ.

٦) درەختی زەیتوون دەگونجێ هەزاران ساڵ بژی، تەمەنی زۆر زۆرە، بەڵام تەنیا هەتا دوو سەد (٢٠٠) ساڵیی و، بە پشتەوەش بە باشیی میوە دەردەکات، بەڵام دوایی مەرج نیە بەرەکەی چاك بێ.

٧) درەختی زەیتوون جۆری زۆرن، تەنیا لە سووریا حەفتا جۆر زەیتوون هەیە.

ئەمە بە گشتی دەربارەی زەیتوون.

### ب / سوودە پزیشکیی و خۆراکییەکانی زەیتوون (الفوائد الطِبِّية والغِذَائية لِلزَّيْتون):

ئەو سەرچاوەیە ئاماژەی کردوە بە بیست و یەك (٢١)، جۆرە سوود:

١) دوای ئەوەی کە گەڵای زەیتوون دەکوڵێنرێ، ئاوەکەی بەکاردەهێنرێ بۆ دابەزاندنی فشاری خوێن.

---

(١) شایانی باسە: ئەو زانیارییانەم لە {(الموسوعة العربية) ج ١٠، ص ٤٣٧ - ٤٨٦، ط ١} وەرگرتوون، کە لەوێدا بە تەفصیلْ باسی زەیتوون دەکات لە بەرگی دەیەمدا، دیارە زانیارییەکان ڕاستەوخۆ بە کوردیی دەهێنم و دەقە عەرەبییەکەی ناهێنم:

**٢)** هەروەها ئاوە گوشراوەکەی گەڵایەکانی، بەکاردەهێنرێ بۆ دابەزاندنی ئاستی شەکرە لە خوێندا.

**٣)** هەروەها هەر ئاوە گوشراوەکەی گەڵایەکانی، بەکاردەهێنرێ بۆ کەمکردنەوەی ترشەڵۆکی نێو گەدە، ترشانی گەدە.

**٤)** گوڵی زەیتوون ئەگەر بکوڵێنرێ، ئاوەکەی بەکاردەهێنرێ بۆ چارەسەری سەرئێشە، کە دەبێ لە شتێك بدرێ و دوایی لەسەر شوێنی ئازارەکە دابنرێ.

**٥)** هەروەها گوشراوی زەیتوون بۆ کەمکردنەوەی ئازاری ڕۆماتیزم، بەکاردێ.

**٦)** زەیتوون هەم خۆراکە، هەم دەرمانە، بە تایبەت بۆ گەشەکردنی منداڵان، چونکە زەیتی زەیتوون ڕێژەیەکی هاوسەنگ و گرنگی لە ترشی لینۆلینیك (**اللّينولينيك**)ی تێدایە، هەروەها ترشی ئەلفا لینۆلینیك (**ألفا لينولينيك**)، کە کەمیی ئەو دوو جۆرە ترشە، دەبێتە هۆی دواکەوتنی گەشە، گەشەی منداڵ و، دابەزینی ئاستی بەپێزیی و دابەزینی کارەکانی جگەر، کە جگەر بتوانێ کارەکانی خۆی ئەنجام بدات، پاشان دابەزینی ئاستی عەقڵیی و، هاتنە پاشی پرۆسەکانی هەرسکردنی خواردن، هەروەها کەمیی ئەو دوو ترشە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی بەرگریی لێکردنی نەخۆشییان لە جەستەدا، بە تایبەتی ئەو نەخۆشییانەی لە هەوکردن (إلتهاب)ەکانەوە پەیدادەبن.

**٧ و ٨)** زەیتی زەیتوون ئەندازەیەکی هاوسەنگ لەو ڤیتامینانەی تێدان، کە دژی ئەکسەدەن، (**الأَكْسَدة**)[1]، ئنجا ئەو ڤیتامینانەی کە دژی ئەو ژەنگەن، کە لەسەر دەمارەکانی خوێن پەیدادەبێ، لە زەیتی زەیتووندا هەن، هەروەها (بیتا کارۆتین)ی تێدا هەیە، کە ئەویش جۆرە ڤیتامینێکە سوود دەگەیەنێ بە گەشەکردنی ئێسقان و بەهێزکردنی ئێسقان، پاشان هێنانە خواری ئازارەکانی ڕۆماتیزم و، ئازارەکانی جومگەکان بەهۆی شێلانەوە، واتە: بەو زەیتە بشێلدرێ، بهەنووێ، (بە کوردیی هەنوونی پێ دەڵێن)، کە زەیتەکەی لەسەر دادەنێی بە دەست بیشێلیی، دەیهەنووێ، چونکە زەیتی زەیتوون ئەندازەیەکی زۆر لەو مادە سەرەتاییانەی کە پێویستن بۆ دروستکردنی ئێسقان، تێیدا هەن، وەك کالیسیۆم و ڤیتامین (D).

**٩ و ١٠)** زەیتی زەیتوون و، زەیتوون بە گشتی، بەکاردێ بۆ چارەسەری برینی گەدە و، چارەسەری قەبزیی، ئەوە کە مرۆڤ بە زەحمەت دابنیشێ و، پاشەڕۆکی لێ جیابێتەوە.

---

(١) (لە ئەنجامی جۆرێك لە کارلێك لەگەڵ ئۆکسجیندا، جۆرێك لە ژەنگ لەسەر دەمارەکانی خوێن پەیدا دەبێ)

**١١)** زەیتوون دەبێتە هۆی دەرکردنی ئەو ماددانەی کە لە زراودا هەن، واتە: بە ئاسانیی زراو ڕژێنەکانی خۆی بڕێژێ.

**١٢)** زەیتی زەیتوون و، زەیتوون دەبێتە هۆی ڕێگرتن لە پێکهاتنی بەردەکانی گورچیلە.

**١٣)** هەرسکردنی ڕۆنەکان، چەورییەکان لە لەشدا بەهۆی زەیتی زەیتوونەوە خێرادەبن، هاندەدرێن.

**١٤)** زەیتی زەیتوون، ژەهرە کۆبووەوەکان لە جگەردا دەردەکات، یان وایان لێدەکات کە بێلایەن بن، واتە: زیانیان نەبێ.

**١٥)** هەروەها زەیتی زەیتوون و، زەیتوون، یارمەتی دەدات بۆ دابەزاندنی کۆلسترۆڵی خوێن، چونکە ئەندازەیەکی زۆر لە ترشەڵۆکی (ئۆلیك)ی تێدایە.

**١٦)** زەیتوون ڕێگا دەگرێ لە کەڵەکەبوونی خەپلە خوێنییەکانی (**الصفیحات الدمویة**) و، کۆبوونەوەیان و پارێزگاریی دەکات لەسەر شلێتیی خوێن، کە خوێن خەست نەبێتەوە و، سەرەنجام ڕێگە بگرێ لە ڕوودانی جەڵتەی خوێن، چونکە خەستبوونەوەی خوێن، لە ئەنجامی دا خوێن چاك هاموشۆ ناکات بۆ مێشك و، جەڵتەی دەماغ، یان جەڵتەی دڵ پەیدا دەبێ.

**١٧)** هەروەها زەیتوون پارێزگاریی دەکات لەسەر سپێتیی ددانەکان، هەروەها نەخۆشییەکانی پووك چاك دەکات.

**١٨)** زەیتوون پارێزگاریی دەکات لەسەر نەرم و ناسکیی و جوانیی پێست.

**١٩)** زەیتوون پارێزگاریی دەکات لەسەر نەرمیی مووەکان.

**٢٠)** زەیتی زەیتوون دەبێتە یارمەتیدەر بۆ کەمکردنەوەی دەرکەوتنی نیشانەکانی پیریی، یان خەڵەفان (**الخَرَفْ**)، لەبەرئەوەی چەند ترشێکی چەوریی هاوسەنگی تێدا هەن.

**٢١)** لە کۆتایی دا بڕوا وایە، کە ترشەکانی زەیتوون بە بەرپرسیار دادەنرێن، لە پارێزگاریی لێکردن لە ماددەی بۆ ماوەیی (**المادة الوِراثیة**) (DNA)، کە ماددە پەیداکەرەکانی شێرپەنجە، ڕێگایان لێدەگرێ کە کاربکەنە سەر ئەو ماددە میراتییە، دیارە لە ئەنجامی (DNA)یەوە جینە، بۆماوەییەکان (**الجینات الوِراثیة**)**کان** دەپارێزرێن و پەیدادەبن و لە ڕێی وانیشەوە سیفەتەکان لە باب و دایکەوە بۆ منداڵان دەگوازرێنەوە.

**ج/ تایبەتمەندییەکی گرنگی زەیتوون:**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی زەیتی زەیتوون ئەوەیە کە ئەگەر هەتا دوو سەد (٢٠٠) پلەی گەرمییش بکوڵێنرێ، گەرمبکرێ بۆ ماوەی سێ (٣) سەعاتانیش، تایبەتمەندیی و کاریگەرییە بایۆلۆجییەکانی لە دەست نادات، بەهۆی ئەوەوە کە دەوڵەمەندە بە ترشی (ئولیك) و ئەو ماددانەی کە دژی (ئەکسەدەن)، واتە: دژی ژەنگهێنانی دەمارەکانی خوێنن.

**د/ ئەو ماددە سوود بەخشانەی لە زەیتووندا هەن:**

ئەم جۆرە ماددانە هەموویان لە زەیتووندا هەن، لە هەر سەد (١٠٠) گرام ڕۆنی زەیتوون، ئەم ئەندازانە هەن لەو ماددانە:

١) لە هەر (١٠٠) گرام زەیتی زەیتوون (٢٧) میللی گرام کیبریت هەیە.

٢) (١٤) میللی گرام فۆسفۆر هەیە.

٣) (٤) میللی گرام کلۆر هەیە.

٤) (١٣٨) میللی گرام سۆدیۆم هەیە.

٥) (٢) میللی گرام مەغنزیۆم هەیە.

٦) (١٢٢) میللی گرام کالیسیۆم هەیە.

٧) (٢/٩) میللی گرام ئاسن هەیە.

٨) (٢٨٪) میللی گرام مس هەیە.

٩) (٢٪) میللی گرام مەنغەنیز هەیە.

١٠) (٠،٠٠١١) یازدە میللی گرام یۆد هەیە.

١١) (٥٠ - ٦٠٪) میللی گرام چەورییەکان هەن.

١٢) (٥ - ١٠٪) میللی گرام ماددە شیرینییەکان (سکریات) کاربۆهیدرات، هەیە.

١٣) (٨،٧٪) ماددە ئازووتییەکان هەن.

١٤) (٢٣٪) ئاو هەیە.

١٥) ڤیتامین(A) هەزار (١٠٠٠) یەکەی دەولیی هەیە، لە هەر سەد (١٠٠) گرام دا.

١٦) ڤیتامینەکانی: (Bو Cو Dو E)، (٣ تاکو ٣٠) میللی گرام لە هەرکامێکیان هەیە.

هەڵبەتە وردەکاریی زیاتریش هەیە لەبارەی سوودو کەڵکەکانی زەیتی زەیتوون، بەڵام ئێمە بەوەندە وازی لێ دێنین.

## مەسەلەی دووەم:

**خوا شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ڕام و ملکەچ کردوون و، عاقڵمەندان لەوەدا نیشانان دەبینن، لەسەر تەنیا پەروەردگاریتیی و تەنیا پەرستراویتیی خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتٌۢ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾، خوا شەوگار و ڕۆژگاری بۆ ئێوە ملکەچ کردوون، بۆی دەستەمۆ کردوون، دەڵێ: (**التَّسْخِيرُ سِياقَةُ إِلَى الغَرَضِ المُخْتَصّ بِهِ قَهْرًا**)، (**تَسْخِير**): بریتیە لە لێخوڕینی شتێك و زۆر لێکردنی بەرەو ئەو ئامانجەی کە پێیەوە پەیوەستە، واتە: خوا ﷻ شەوگاری ئاوا لێکردوە و ڕۆژگاریشی ئاوا لێکردوە، دیارە شەوگار تاریکە و، ڕۆژگار ڕووناکە، شەوگار بەهۆی ئەوەوە کە خۆر بەدەرەوە نیە، ڕۆژگار بەهۆی ئەوەوە کە خۆر بە دەرەوەیە، یەکێکیان تاریکەو، ئەوی دیکە ڕووناکە، بەدەست خۆیان نیە، شەوگار دەبێ لە کاتی خۆیدا بێ و ڕۆژگار دەبێ لە کاتی خۆیدا بێ، هەڵبەتە شەو و ڕۆژ لە ئەنجامی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا پەیدادەبن، بە خێرایی سی (٣٠)کم لە خولەکێکدا، یانی: زەوی (٣٠) کم دەبڕێ لە خولەکێکدا بە دەوری خۆیدا لە ئەنجامی ئەوەدا شەو و ڕۆژ پەیدادەبن، ئەو لایەی کە ڕووی لە خۆرە دەبێتە ڕۆژ، ئەو لایەی کە پشتی لە خۆرە، دەبێتە شەو.

٢- ﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾، هەروەها خوا خۆر و مانگیشی بۆ ئێوە دەستەمۆ کردوون، جا جێی سەرسووڕمان ئەوەیە، کە خۆر و مانگ قەبارەکەیان بۆ ئێمە هێندەی یەك دیارە، بە ئەندازەی بێژینگێك دیارە، بەڵام لە ڕاستییدا خۆر ملیۆنێك و سێ سەد هەزار (١٣٠٠٠٠٠) جار هێندەی زەوییە و زەویش چەند بەرانبەری مانگە، بەڵام خوا ﷻ ماوەی دووریی خۆر لە زەوی و ماوەی دووریی مانگ لە زەوی وا داناون بە ئەندازەی یەکدی دیار بن، لە حاڵێکدا کە قەبارەیان زۆر زۆر لە یەك جیایە[1]،

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الرحمن)یش باسێکی گرنگمان لەبارەی فراوانیی ئاسمان و ئەندازە پێکەوە گونجاوەکانی: خۆرو زەوی و مانگ کردوە.
شایانی باسیشە:
تیرەی خۆر چوار سەد (٤٠٠) هێندەی تیرەی مانگە، بەڵام دووریی خۆریش لە زەوییەوە چوار سەد (٤٠٠) هێندەی دووریی مانگە لە زەوییەوە بۆیەش خۆرو مانگ لە چاوی ئێمەدا، هێندەی یەك دیارن!

هەڵبەتە ئێمە لە باسێکی تایبەتدا کە لە سووڕەتی (**یونس**)دا کردوومانە، باسی خۆر و مانگ و زەوی و شەو و ڕۆژ و، ئەستێرەکان و، کاهکەشانەکانمان بە تەفصیل کردوە.

٣- ﴿وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمْرِهِۦٓ﴾، هەروەها ئەستێرەکانیش ملکەچن بە فەرمانی خوا، واتە: بە فەرمانی تەکوینی خوا، بە ویستی خوا ﷻ، بە پێی ئەو یاسایانەی کە خوا ﷻ بۆی داناون، ملکەچن، ئەستێرەکانیش کە هەر کۆمەڵەیەکی زۆریان کەهکەشانێك پێك دێنن و، کەهکەشانەکانیش لە نێو خۆیاندا، دووبارە یەکەی گەورەتر پێکدێنن، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (**یونس**)[1]دا بە تەفصیل باسمان کردوە.

٤- لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾، بێگومان لەوەدا کە باسکرا، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بفامن، هەر بفامن و تۆزێك عەقڵیان هەبێ و، هۆشیان هەبێ، نیشانەی زۆر دەبینن لە: شەوگار و، ڕۆژگار و، خۆر و، مانگ و، ئەستێرەکان و، کەهکەشانەکاندا، کە بە هەموویان هەلومەرجێکیان بۆ مرۆڤ ڕەخساندوە، لەم سەر زەوییە کە بتوانێ ژیانی تێدا بەسەر بەرێ و، بگوزەرێنێ، کە خوای پەروەردگار بە شێوەی کاتیی پێیداوە، تاکو لەو ژیانە کاتییەدا تاقی بکاتەوە، ئنجا کەسانێك هەر عەقڵ و هۆشیان هەبێ، زۆر بەڵگە و نیشانان لەوانەدا دەبینن، لەسەر ئەوە کە هەر خوا بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنە و، هەر ئەویش شایستەی بەندایەتیی بۆ کران و پەرسترانە.

ئەوەی کە جێی سەرنجە، ئەو نیعمەتانەی کە لە ئایەتەکانی: (١٠) و (١١) و (١٣)دا باسکراون، خوا فەرمووی: ﴿لَءَايَةً﴾، چونکە هەموویان یەك جۆرن و لە یەك چوارچێوەدان.

بەڵام ئەم نیعمەتانەی کە لە ئایەتی: (١٢)دا هاتوون، لەبەر ئەوەی زۆر جۆرن: شەوگارە، ڕۆژگارە، خۆرە، مانگە، ئەستێرەکانن، بۆیە وشەی کۆی بۆ بەکارهێناون: ﴿لَءَايَٰتٍ﴾.

بەڵام ئەوانی دیکە: ئاو لەسەرێ دێتە خوار، بۆ خواردنەوە، بۆ لەوەڕ و، کشتوکاڵ و، میوەجات، هەمووی یەك بابەتە و لە یەك چوارچێوە دایە.

هەروەها لە ئایەتی دواتردا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥٓ﴾، چونکە ئەوەی خوا لەسەر زەوی پەیدای دەکات، ئەویش هەمووی یەك بابەتە، هەمووی لە یەك بازنەدایە.

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سووڕەتی (فصلت)یش دا باسێکی باشمان لەبارەی گەردوونەوە کردوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خوا ﷻ ئەوەی کە لە زەویدا دروستی کردوە، لە ڕووەك و ژیانداران، ڕەنگی جۆراو جۆریان هەن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ ﴾، ئەوەی کە لە زەویدا بۆی هێناونەدی، وشەی ﴿ ذَرَأَ ﴾، بە مانای بەدیهێنا (**خَلَقَ**) دێ، (**ذُرية**)، بۆیە پێی دەگوترێ: (**ذُرية**)، چونکە دروستکراوە، بەڵام وێڕای دروستکردن، مانای بڵاوکردنەوەش دەگەیەنێ، ﴿ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ ﴾، واتە: ئەوەی کە لە زەویدا بۆی دروستکردوون و، بڵاویشی کردۆتەوە، وشەی (ما) لێرەدا (**موصولة**)یە، یانی: (الذي خَلَقَهُ لَكُم فِي الأَرض)، هەرچی کە خوا لەسەر زەوی دروستیکردوە، دەیگرێتەوە، لە ژیاندار، لە ڕووەك، لە دار و درەخت، لە میوە، لە سەوزە، لە باڵندە، لە ژیانداری نێو دەریا، لە چیایەکان، لە کانزایەکان، هەرچی خوا ﷻ لەسەر زەوی دروستی کردوە، هەمووی دەگرێتەوە.

٢- ﴿ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ﴾، یانی: لە حاڵێکدا کە ڕەنگەکانیشی جیاجیان، دیارە هەم میوەکان ڕەنگیان جۆرا و جۆرە و هەم چیاییەکان، هەم خەڵك و ژیانداران و ئاژەڵ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**فاطر**)دا ئاماژە دەکات، دەفەرمووێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر.

لێرەدا خوا ﷻ ئاماژە دەکات: بە دار و درەختەکان، میوەکان، بە ژیانداران، بە مرۆڤەکان، بە چیایەکان، ئاماژە بە هەمووی دەکات، دوایی دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴾، بێگومان بەندە زاناکان، باش سام و هەیبەت و ترسی خوایان هەیە، واتە: ئەوانەی کە شارەزان بەوە کە خوا چی دروستکردوە و چۆنی دروستکردوە،

چونکە لەوێدا باسی جیاوازیی ڕەنگەکانی ئەو شتانە دەکات، کە خوا دروستی کردوون، چ ئەوەی بە ئاوی ئاسمان دەڕوێ، لە سەوزەو شیناورد و دانەوێڵەو، دار و درەخت و میوە، چ چیایەکان و، چ ئاژەڵەکان و، چ مرۆڤەکان.

**جیاوازیی ڕەنگی شتەکانیش، چەندان حیکمەتی تێدان، بۆ نموونە:**

**١/** ڕەنگی جۆرا وجۆر بۆخۆی دیمەنێکی جوانی هەیە: چیایەك خەتێکی ڕەشە، خەتێکی سوورە، خەتێکی سپییە، ڕەنگێکی دیکەیە، دیسان ئاژەڵەکان کە ڕەنگیان جیا جیایە، ئنجا دار و درەختەکان و میوەکان کە ڕەنگیان جیا جیایە، درەخت هەمووشی هەر سەوزە، بەڵام سەوزی کاڵ هەیە، سەوزی تۆخ هەیە، هەر لە ڕەنگی سەوزدا، چەندان پلەی سەوز هەیە، هەروەها لە ڕەنگی سووردا، چەندان پلەی سوور هەیە، دیسان لە ڕەنگی سپییدا، چەندان پلەی سپیی هەیە و، لە ڕەنگی ڕەشدا چەندان پلە هەیە، کەواتە: یەکێك لە حیکمەتەکانی ڕەنگەکان بریتیە لە جوانیی لەو ڕەنگاو ڕەنگییەدا.

یەکێکی دیکە بریتیە لە ناسینەوەی شوێنەکان، چیای زەردکی، کێوە ڕەش، ئاسۆس، قەندیل، بەڵێ ناسینەوەی شوێنەکان، یەکێکی دیکە لە حیکمەتی جۆراوجۆریی ڕەنگەکان.

**٢/** حیکمەتێکی دیکە بە تایبەت بۆ میوە، بریتیە لەوەی هەر میوەیەك لە کاتی نەگەیشتنی دا ڕەنگێکی هەیە و، لە کاتی گەیشتنی دا ڕەنگێکی دیکەی هەیە، بۆ نموونە: ڕەنگی توو، لە کاتی نەگەیشتنی دا ڕەنگەکەی سپییە، بەڵام کە دەگات ڕەنگەکەی دەگۆڕێ، زەرد هەیە، ڕەش هەیە، سوور هەیە، هەروەها سێو پێشێ ڕەنگەکەی سەوزە، بەڵام دوایی زەرد دەبێ، سوور دەبێ، هەروەها میوەکانی دی، واتە: بەهۆی جیاوازیی ڕەنگەکەیەوە، دەزانی ئەو جۆرە میوەیە گەیشتوە یان نا ؟! ئنجا ئەمە تایبەتیش نیە بە میوەجاتەوە بەڵکو بەرهەمەکانی دیکەش هەروان، بۆ وێنە: دانەوێڵە بەگشتی بەهۆی ڕەنگییەوە بۆت بەدەردەکەوێ، ئایا پێگەیشتوە و حاڵەتی درەوی هاتوە یان نا ؟!.

**٣/** حیکمەتێکی دیکەشی جیاکردنەوەی جۆری شتەکانە، کە دەتوانی بەهۆی ڕەنگیانەوە جۆرەکانیان لە یەك جیابکەیەوە، بۆ وێنە: ترێ، ترێی سوور هەیە، ترێی سپی هەیە، ترێی ڕەش هەیە، ترێی بۆڵو و ورد هەیە، هەروەها جۆرەکانی هەرمێ و جۆرەکانی سێو و جۆرەکانی خۆخ و جۆرەکانی هەڵوژە و جۆرەکانی توو، هەروەها لە چیا و گردۆلکەکان و، کانیی و ڕووبارەکان و، ئاژەڵ و پەلەورەکان و... هتدیشدا بەهەمان شێوە.

هەڵبەتە خوا ﷻ بە گشتی باسیکردوە و، گرنگ ئەوەیە ڕەنگاو ڕەنگیی دروستکراوەکانی خوا، حیکمەتی زۆری تێدان.

٣- بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە، نیشانەیەکی مەزن هەیە، جێی سەرنج هەیە، بۆ کۆمەڵێك کە بیریان بکەوێتەوە.

(**تَذَكُّر**)، چەند جارێکی دیکەش باسمان کردوە، واتە: هاتنەوە بیر، ئەوەیە شتێك مرۆڤ بیهێنێتەوە بیری خۆی، (**التَذَكُّر دَرَجَةٌ عَالِيةٌ مِنَ التَّفْكِيرِ، فَهُوَ اسْتِحْضَار المَعْلُومَاتِ السابقَةِ، ثُمَّ الإسْتِنْتَاجُ مِنْهَا**)، واتە: (**تَذَكُّر**): پلەیەکی بەرزی بیرکردنەوەیە، چونکە بریتیە لەوە کە ئەو زانیاریيانەی پێشێ هەتبوون، لە مێشکی خۆتدا ئامادەیان بکەی، ئنجا ئەنجامگیرییان لێ بکەی.

### مەسەلەی چوارەم:

**هەروەها خوا ﷻ دەریای ڕام کردوە تاکو گۆشتی تەڕ و تازەی لێ بخۆین و، خشڵی لێ دەربێنین و، بە خۆمانی وەبکەین و، بە کەشتییان بۆ بازرگانیی و هەڵش و وێڵش، سەفەری پێدا بکەین:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا۟ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا۟ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ ﴾، هەروەها خوا ئەو کەسەیە، (ئەو خوایەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، هەموو پێغەمبەرانی خوا، بانگی خەڵکیان کردوە، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ ئەو بکەن و تەنیا ئەو بە پەرستراوی خۆیان بزانن، تەنیا دروشمەکانی خواپەرستیی پێشکەشی وی بکەن و، بەرنامەکانی ژیان تەنیا لەو وەربگرن و، هەر ئەو سەرچاوەی (**شرائع و شعائر**) بێ، ئەو خوایە ئەو کەسەیە) کە دەریای بۆ ملکەچ کردوون، پێشتر گوتمان (**تسخیر**)، ئەوەیە کە شتێك بەرەو ئامانجێك کە تایبەتە پێیەوە پاڵ بدرێت و، پاڵی پێوە بنرێ و، بە ناچاریی بەرەو وێ ببردرێ، واتە: خوا دەریای ملکەچ کردوە، ڕامی کردوە، دەستەمۆی کردوە، ئەو دەریا بێڕەزایە! کە کەسێك سواری کەشتییە گەورەکان بوو بێت و، بە نێو دەریا گەورەکاندا هاتووچۆی کرد بێ، ئنجا تێدەگات دەریا چەند بێ ڕەزایە! چەند گەورەیە! چەند سامناکە، بە تایبەتی کە با هەڵدەکات و، دەبێتە گەردەلوول و شەپۆلی گەورە گەورە دێن.

جاری دیکەش باسم کردوە: ئێمە ساڵی (١٩٩٨ز) بەسواری کەشتی سەفەرێکمان کرد لە ماڵتاوە بۆ (**بنغازی**) لە لیبیا، کۆبوونەوەیەکی فراوان هەبوو لەوێ، کە ڕێیەکە نزیکەی (١٩-٢٠) سەعاتی پێدەچوو، لەسەری گەڕانەوەدا باو گەردەلوولێك لێی داین، خەڵکەکە زۆر ترسا، هەڵبەتە کەشتییەکەمان حەوت قات بوو، دەوری دوو هەزار (٢٠٠٠) نەفەری هەڵدەگرت، کەشتییەکی زەبەلاح بوو، بەڵام لە نێو شەپۆلە گەورەکانی ئەو دەریایەدا، دەریای سپی نێوەڕاست، وەك: کۆلکە دارێکی زۆر بچووك دەهاتە پێش چاو، کە بەلای

پێشەوەدا دەچوو، دەمانگوت: تازە ئەوە نغرۆ دەبێ و هەتا بنی دەریا گیر نابێ، کە هەڵدەستایەوە پاشان شەپۆل دەهات، دەمانگوت: ئەوجا بە پشتەوەیدا غەرق دەبێ، کە دەکەوتە سەر لای ڕاست و لای چەپ، بە هەمان شێوە.

کەواتە: ڕامکردن و مل پێکەچکردنی دەریا، نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، بەڵام ئایا بۆچی خوا دەریای مل پێکەچکردوە و ڕامکردوە ؟!

**٢-** بۆ چەند ئامانجێك كە دوایی باس دەکرێن: ﴿لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا﴾، بۆ ئەوەی گۆشتێکی تەڕ و تازەی لێ بخۆن.

﴿لَحۡمٗا طَرِيّٗا﴾، واتە: گۆشتی تەڕ، گۆشتی تازە، ئنجا ئەوە ئاماژەیە بەوە کە پێویستە ئەو ژیاندارانەی کە لە دەریادان، گۆشتەکەیان بە تازەیی بخورێ و، وا باشترە هەڵنەگیرێ، هەڵبەتە وەك: دوایی باسی دەکەین، ئەگەر هەڵیشبگیرێ، هەر ڕەوایە، مادام لە ڕووی تەندروستییەوە زیانی نەبێ و، لە ڕووی پزیشکییەوە تێکنەچوو بێ، بەڵام باشتر وایە و ئەو ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات کە بە تەڕی و تازەیی بخورێ، لەزەتی زیاترەو سوودی زیاترە.

جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا﴾، هەروەها لە سوورەتی (**فاطر**)یش، لە ئایەتی (١٢) دا دووبارە لەوێش هەر دەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلّٖ تَأۡكُلُونَ لَحۡمٗا طَرِيّٗا...﴿١٢﴾﴾، کە دوایی ئایەتەکە دێنین.

لە هەر کامێکیان، واتە: هەم لە ئاوی شیرین و هەم لە ئاوی سوێردا، گۆشتی تەڕ و تازە دەخۆن، وشەی (**لحم**)ی باسکردوە، نەك بۆ وێنە بفەرموێ: (**سَمَكا طَرِياً**)، یان (**حُوتاً طَرِيا**)، بۆچی ؟

چونکە هەرچی لە دەریا دایە، ژیاندارانی دەریا، هەموویان گۆشتەکەیان دەخورێ، بەڵکو جاری وایە هەندێ لە نەتەوان، لە هەندێ لە وڵاتان، هێندێ لە ژیاندارانی دیکەی دەریا، لە ماسی زۆر مەرغووبترن و، خەڵك زۆر زیاتر بەدوایاندا وێڵ و عەوداڵە، بۆیە خوا ﷻ وشەیەکی بەکارهێناوە هەم ماسی بگرێتەوە، هەم جگە لە ماسی بگرێتەوە.

یەکێك لەو شتانەی کە لە دەریادا هەیە، کە گەورەترین دروستکراوی خوایە لە وشکانیی و لە دەریاشدا، بۆیە ئاماژەیەکی پێ بکەین باشە، بریتیە لە نەهەنگ (حوت):

١/ جۆری گەورەی حوت (١٣٠) تەنە، یانی سەد و سی هەزار (١٣٠٠٠٠) کیلۆ.

٢/ (٥٠) تەن بەس ڕۆن و چەوریی تێدایە.

٣/ (٥٠) تەنیش گۆشتی تێدایە.

٤/ هەناوەکەشی (٣٠) تەنە، کە لە چەورییەکەی (٩٠) بەرمیل زەیتی لێ دەردەهێنرێ، ئنجا ئەوە یەکێکە لەو دروستکراوانەی کە خوا لە دەریادا دروستی کردوون و، لە گۆشتەکەیان بەهرەمەند دەبین.

٣- ﴿وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ﴾، خشڵێکی لێ دەردێنن، ئەو خشڵە زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێی (لؤلؤ)ە، بە کوردیی ئێمە گەوهەری پێ دەڵێین، بەڵام وێڕای ئەوەش مرواریی (مرجان)یش، ئەویش جۆرە بەردێکی بە نرخە، لە دەریا دەردەهێنرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ٢٢﴾الرحمن.

(لؤلؤ) لە نێو گوێچکە ماسییدا، لە نێو قۆزاخەیەکدایە، کە سەرەتا ژیاندارێکی تێدا هەیە، ئەو ژیاندارە کاتێك هەست بە مەترسییەك بكات، پێی وابێ کە دوژمنێك بۆی دێ، ماددەیەکی کلسیی فۆسفۆریی دەردەدا، وەك بەرگریی کردن لە خۆی و، سەرەنجام ئەو ماددەیە کە وەك بەرگریی لەخۆ کردن دەریداوە، دەبێتە ئەو گەوهەرە، کە زۆر زۆریش لە زێڕ و ئەڵماس و لە هەرچی شتی بەنرخە، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا، کە لە مێژووشدا هەروا بووە، بە نرخترە.

٤- ﴿تَلۡبَسُونَهَا﴾، بە خۆتانی وەدەکەن، (اللَّبْسُ: جَعْلُ الثَّوْبِ، وَالعِمَامَةِ، وَالمَصُوغِ عَلَى البَدَنِ)، (لَبْس): بریتیە لەوە کە مرۆڤ پۆشاك، یان مێزەر، یان شتێك کە قاڵ کراوەتەوە، ئنجا زێڕە، زیوە، هەر شتێکی هەیە بخرێتە سەر جەستە، کەواتە: بەخۆوەکردنی گەوهەر و مرواریش، هەر پێی دەگوترێ: پۆشین (لبس).

ئنجا توێژەرەوانی قورئان مشتومڕی زۆریان بووە، لەوەدا کە مادام دروست نیە پیاوان گەوهەر بەخۆوە بکەن، چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تَلۡبَسُونَهَا﴾؟! بۆیە کەوتوونە تەئویل و تەئویل کاریی:

١/ هەندێکیان گوتوویانە: تەنیا ژنەکان بەخۆی وەدەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی ژنەکان بۆ پیاوەکان خۆیان دەڕازێننەوە، بۆیە خوا ﷻ ڕاناوی نێرینەی بەکارهێناوە و دەفەرموێ: ﴿تَلۡبَسُونَهَا﴾!!

٢/ هەندێکیان گوتوویانە: لەبەرئەوەی ژن و پیاو تێکەڵن، بۆیە خوا ﷻ پێکەوەی باسکردوون !

بەڵام من پێموایە: ئێمە نابێ بە گوێرەی فیقهی ئیسلامیی، چەمك و واتا بۆ ئایەتەکان دیاریی بکەین، چونکە خوا ﷻ لێرەدا تەنیا مسوڵمانان نادوێنێ، ئنجا بەپێی فڵان و فیسار مەزهەبیش! بەڵکو خوا بەگشتی مرۆڤەکان دەدوێنێ و هەرچەندە لە نێو مسوڵمانان دا عادەت نەبێ، گەوهەر بەخۆوە بکەن، بەڵام تەنیا زێڕ و ئاوریشم (ذهب وحرير) دەقیان لەسەرە کە نابێ پیاوان بەکاریان بێنین، ئەویش دیارە بەبێ پاساو، بەڵام لەسەر گەوهەر و، مرواریی و، ئەڵماس و، ئەو شتانەی دیکە، دەقێکمان نیە، قەدەغەکرابن.

بەڵێ لێرەدا خوا ﷻ بە گشتی مرۆڤەکان دەدوێنێ، نەك بە تەنیا مسوڵمانان و مسوڵمانانیش بەپێی فڵان مەزهەب! بە گشتی مرۆڤەکان دەدوێنی و چاکەکانی خۆی دەخاتە بەرچاویان، ئنجا ئەگەر لەنێو مسوڵماناندا عادەت نەبێ پیاوان گەوهەر بەخۆوە بکەن، لە شوێنێکی دیکەدا عادەتە، کاتی خۆی تاجی پادشایەکان بە گەوهەر و مرواریی ڕازاوەتەوە و، ئێستاش گەوهەر بەکاردەهێنرێ.

مەبەستم ئەوەیە کە هەندێك جار چەمك و تێگەیشتنی بچووك هەن، کە بەپێی تێگەیشتنی زانایەك، شارەزایەك، لە ژینگەیەکی دیارییکراو، لە کات و شوێنێکی دیارییکراودا سەریان هەڵداوە، نابێ ئەوە مانا و واتای فراوانی ئایەتەکانی پێ بەرتەسك بکرێتەوە.

٥- ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ ﴾، تۆ کەشتییەکان دەبینی کە شەقکەرن، قڵیشێنەرن لە دەریادا، ﴿ مَوَاخِرَ ﴾، کۆی (ماخِرة)یە، وەك پێشتر گوتمان: (مَاخِرَة)، (أي: شَاقَّة)، شەقکەر، قڵیشێنەر، واتە: لەت دەکات، دەبڕێ، کە بێگومان مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەو کەشتییانە بە نووکەکەیان، بە پێشەکەیان ئاوی دەریا بڕ پێ دەدەن و، دەیدڕن و شەقی دەکەن، واتە: تۆ ئەگەر تەماشای کەشتییەکان بکەی، هەمیشە وایان دەبینی کە لە کاتی ڕۆیشتندا، ئاوەکە شەق دەکەن و دەقڵیشێنن.

٦- ﴿ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، بۆیەش خوا ﷻ ئاوی دەریای والێکردوە کە کەشتیی لەسەری بڕوات و، ئەو کەشتییانەشی والێکردوە کە بتوانن ئەو ئاوە دڕ پێ بدەن، تاکو ئێوەی مرۆڤ بە سواریی ئەو کەشتییانە لە بەخششی خوا داوا بکەن، ﴿ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، (أي: للتِجَارَةِ وَالكَسْبِ)، بۆ بازرگانیی و کەسابەت و بۆ هاتوچوون بە سواریی کەشتییەکان لە

دەریادا بێن و بچن، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی **(البقرة)** دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ....﴿١٩٨﴾ ﴾.

کەواتە: **(فَضْل)**، واتە: بەخششی خوا کە مەبەست پێی بازرگانیی کردنە، چونکە لەوێش دەفەرموێ: گوناهتان ناگاتێ کە لە کاتی حەجدا، لە بەخششی پەروەردگارتان داوا بکەن، واتە: کار و کەسابەت و بازرگانیی بکەن.

٧- ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن، واتە: دانبێنن بە چاکەی خوا و نیعمەتەکانی خوادا بەسەر خۆتانەوە و، سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام بدەن.

## حوکمی گۆشتی دەریا

لەبارەی گۆشتی دەریاوە، لە ئایەتی ژمارە (٩٦)ی سووڕەتی (المائدة)دا، خوا ﷻ حوکمە شەرعییەکەیمان جوان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ...﴿٩٦﴾﴾، واتە: نێچیری دەریا و، خواردنی دەریاتان بۆ ڕەوا کراوە، مایەی بەهرە لێوەرگرتنە، هەم بۆ خۆتان و، هەم بۆ کاروان و، خەڵکێك کە سەفەر دەکات.

هەروەها لەبارەی دەریاوە، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کراوە، ئەویش هەر هەمان شتی لەوبارەوە فەرمووە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ إِنا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنا بِهِ عَطِشْنا، أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ)**} (**أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٨٣، وَصَحَّحَهُ الألباني**).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە سواری دەریا دەبین، (واتە: سواری بەلەم و کەشتیی دەبین لە دەریادا)، ئاوێکی کەم لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین، (واتە: ئاوی شیرین)، ئەگەر دەستنوێژی پێ بگرین تینوومان دەبێ، (واتە: ئاومان لێ دەبڕێ)، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەریا ئاوەکەشی پاکەو پاککەرەوەیە و، مردارەبووەکەشی حەڵاڵە.

مردارەوەبوو، واتە: ئەو ژیاندارانەی کە لە دەریادان، هەڵبەتە سەر نابڕدرێن، ئنجا ماسییە، هەرچی هەیە، بەڵام بە مەرجێك بۆگەن نەبوو بێ و نەگۆڕا بێ، چونکە ئەو کات لە ڕووی تەندروستیی و پزیشکییەوە خراپە، دیارە هەر شتێکیش زیانی هەبێ، ئەوە چەمکی وشەی (**خَبائِث**) دەیگرێتەوە و، هەموو ئەو شتانەی پیس و زیان بەخشن، قەدەغەن.

لێرەدا پێویستە ئەو ئایەتەش بهێنینە پێش چاوی خۆمان ئایەتی (١٢) لە سووڕەتی (**فاطر**)، کە هەروەك ئەم ئایەتە خوای پەروەردگار باسی دەریا و گۆشتی دەریا و خشڵی

دەریـا و کەشـتییەکانی دەریـا دەکات، بـەڵام بـە هەندێـك جیاوازییـەوە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِنْ كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾﴾، واتـە: دوو دەریـاکان یەکسـان نیـن، ئەمەیـان ئاوەکـەی زوڵاڵ و شـیرینە و، خواردنەوەکـەی بـە ئاسـانیی بـە گـەرووداد دەچێتـە خـوار، نـۆش دەکـرێ، ئەوەشـیان سـوێر و تاڵـە (ناخورێتـەوە)، (ئـەوی پێشـێ مەبەسـت پێـی ئـاوی شـیرینە، ئنجـا دەریاچـەن، گۆمـن، چـۆم و ڕووبـارن، کانیـی و سـەرچاوەن، هەموویـان دەگرێتەوە)، لە هەر کامێکیشـیان گۆشـتێکی تـەڕ و تـازە دەخـۆن و، خشـڵێکیش دەردێنـن، کـە بـە خۆتـانی وەدەکـەن، کەشـتییەکانیش دەبینـی لەوێـدا ئاویـان شـەقکردوە، تاکـو لـە بەخششـی خـوا داوا بکـەن، (واتـە: بـە سـواریی کەشـتییەکان بازرگانیـی بکـەن)، بـۆ ئـەوەش کـە سوپاسـگوزاریی بکـەن.

## جیاوازییەکانی ئەو دوو ئایەتە و حیکمەتەکەیان:

جگـە لـەوەی کـە خـوا ﷻ لـە ئایـەتی (١٢)ی سـوورەتی (**فاطـر**)دا، بـاسی دوو دەریایـان دەکات کـە ئـاوی شـیرین و ئـاوی سـوێرن و، دوایـی پێناسـەی هـەردووك جـۆرە ئـاوەکان دەکات، دوو جیاوازیـی دیکەشـیان هـەن:

**یەکەم:** لە ئایەتی (١٤)ی سوورەتی (**النحل**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ﴾، واتە: تۆ کەشتییەکان لەوێدا دەبینی قڵیشێنەرن (یانی: ئاوی دەریا دەقڵیشێنن).

بـەڵام لـە سـوورەتی (**فاطـر**)، لـە ئایـەتی (١٢) دا دەفەرمـوێ: ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾، (**الإِسْـكافِي**)، دەڵـێ: حیکمەتەکـەی ئەوەیـە: کـە ئایەتەکـەی سـوورەتی (**النحـل**) ئـاوا دەسـت پێدەکات: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ﴾، بۆیـە سـیفەتی کەشـتییەکان کـە ئاوەکـە شـەق دەکـەن، کـە وشـەی (**تسـخیر**) ڕامکـردن و ملپێکەچکـردن دەیگرێتـەوە، ئـەوە پێشـخراوە، بـەڵام لـە سـوورەتی (**فاطـر**)دا بـاسی دەریـا کـراوە: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ﴾، بۆیـە ئـەوەی کـە لـە سـەرەتای ئایەتەکـەدا هاتـوە، دەبـێ ئـەوە پێشـبخرێ: ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾، بـەڵام لـە سـوورەتی (**النحـل**)دا، ئـەوەی کـە باسـکراوە مـل پێکەچکـردنی دەریایـە، بۆیـە ئـەوە کـە کەشـتییەکان ئاوەکـە شـەق دەکـەن، ئـەوە زیاتـر جێـی مەبەسـتە و دەبـێ پێشـبخرێ.

**دووەم:** هەروەها جیاوازییەکی دیکەش ئەوەیە کە لە سووڕەتی (**النحل**)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: بە سواری کەشتییەکان.

بەڵام لە سووڕەتی (**فاطر**)دا هەر دەفەرمویٚ: ﴿ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، ئەویش حیکمەتەکەی ئەوەیە کە لە ئایەتەکەی سووڕەتی (**النحل**)دا، چەند شتێك هاتوون وەك ئامانج باسکراون:

ئامانجی یەکەم: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا ﴾.

ئامانجی دووەم: ﴿ وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَا ﴾.

ئامانجی سێیەم: ﴿ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ ﴾، کەشتییەکان دەبینی کە ئاوەکەیان شەقکردوە.

ئنجا بۆیە وا گونجاو بووە کە ﴿ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، وەك ئامانجێکی دیکەی چوارەم دیسان (**عطف**) بکرێتەوە، با بدرێتەوە سەر ئەو ئامانجانەی پێشیٚ.

یانی: ئامانجێکی دیکەو حیکمەتێکی دیکەیە کە خوا لە دەریادا ڕەچاوی کردوە، کاتێك کە دەستەمۆ و مل کەچیکردوە، کە بە سواری کەشتییەکان لە بەخششی خوادا داوا بکەن و، بازرگانیی بکەن.

بەڵام ئەوەی سووڕەتی (**فاطر**) داڕشتنەکەی بە شێوەیەکی دیکە هاتوە، بۆیە داواکردنی بەخششی خوا کراوە بە ئامانجی کەشتییەکان کە ئاوی دەریا شەق دەکەن، ئاوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، کەشتییەکان دەبینی ئاوەکەیان شەق کردوە، تاکو لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: لە پێشەوەی ئامانجێکی دیکە بەو شێوەیە باس نەکراوە، تاکو ئەمەش با بدرێتەوە سەر ئەوان و بگێڕرێتەوە سەر ئەوانی پێشیٚ.

## قەبارەی توێکڵی زەوی و دەریاکان

ئەگەر بمانەوێ بزانین قەبارەی دەریا و قەبارەی توێکڵ و ڕووی زەوی بە چیا بەرزەکانیشەوە، چەندە، لە قەدەر قەبارەی زەوی هەمووی؟ بەمجۆرەیە: ئەگەر تۆپێك بێنین تیر(قُطْر)ەکەی (١٠٠ سم) بێ، نیو سانتیمی، تەنیا نیو (١/٢ سم) سانتیمی، هەموو چیایەکان و هەموو خاك و خۆڵی زەوی کە لەسەریەتی، دەگرێتەوە و، نیو (١/٢سم) سانتیمیش ئاوی دەریاکان دەگرێتەوە، یانی: بە هەردووکیان (١ سم)، لە قەبارەی زەوی (١٠٠/١) دەگرنەوە.

کەواتە: دەریاکان چەند قووڵبن و، چیایەکان چەند بەرز بن، قەبارەیان لەچاو قەبارەی زەوی، سەر و نیو سانتیمیان بەردەکەوێ لە (١٠٠ سم)، واتە: بە هەردووکیان یەك لەسەر سەدی قەبارەی زەوین[١].



(١) تفسير النابلسي، ج٥، ص٨٠.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**خـوا چیایـەکانی وەك لەنگـەران هاویشـتوونە نێـو زەوی تاکـو نـە لـەرزێ و، ڕووبـار و ڕێـی زۆری تێـدا دانـاون، هەروەهـا بەهـۆی نیشـانەکانی سـەر زەوی و، ئەسـتێرەکانەوە ڕێ دەردەکـەن و، بـە شـوێنەکان دەزانـن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَامَاتٍ ۚ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١- ﴿وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾، (خوا) چیایە چەسپاوەکانی خستوونە نێو زەوی، هاویشتوونە نێو زەوی، فڕێی داونە نێو زەوی، لێرەدا (**رَوَاسِي**) سیفەتە بۆ مەوصووفێکی قرتێنراو (**مَحْذوف**)، بۆیەش وەسف کراوەکە قرتێنراوە، چونکە زانراوە، واتە: (**وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ الجِبالَ الرَّوَاسِي**)، چیایە چەسپاوەکانی خستوونە نێو زەوی و فڕێداونە نێو زەوی، ئایا بۆچی وشەی فڕێیدا (**أَلْقى**)ی بەکارهێناوە؟ جارێکی دیکەش باسمان کردوە، لەبەرئەوەی یان: أ- چیاکان لەو پارچە خڕۆکەو ئەستێرانە پەیدا بوون کە هاتوونە نێو مەجالی زەوییەوە و، زەوی کێشی کردوون، ب- یان بەهۆی ئاگر پڕژێنەکان (براکین)ەوە پەیدا بوون، کە دەرقوڵیون و ئەو هەموو ئاگر و ئاسنی تواوە بەرز بۆتەوە و، دوایی هاتۆتەوە نێو زەوی، وەك لەسەرێ ڕا فڕێدرابێتەوە نێوی.

ئنجـا ئایـا بۆچـی خـوا ﷻ فەرموویـەتی: چیایـەکانی فڕێداونە نێـو زەوی، ﴿وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾، خـوا چیایـەکانی هاویشـتوونە نێـو زەوی و نەیفەرمووە سـەر زەوی ؟!

چونکـە ئێسـتا زانیـاری جیۆلۆجیـا (زەویناسـیی)، دەریخسـتوە کـە هـەر چیایـەك چەنـدەی بەدەرەوەیـە، دە پـازدە (١٠ - ١٥) هێنـدەی بـە ناخـی زەویـدا چۆتـە خـوارێ، کەواتـە: ڕاسـتە چیایـەکان خراونـە نێـو زەوی، نـەك لەسـەر زەوی دانرابـن، ئـەو تەعبیـرەی قورئـان تـەواو لەگـەڵ واقیعـی چیایـەکان و واقیعـی زەویـدا پێکـەوە گونجـاون.

بەڵام حیکمەتی خوا چی بووە لەوەدا؟ لە بڕگەی داهاتوودا ڕوونی کردۆتەوە:

٢- ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، یانی: (**أَنْ تَضطرِبَ وتَهتزَّ تحتكم**)، بۆ ئەوەی زەوی کە لە ژێرتاندا نەلەرزێ، نەهەژێ، چونکە ئەگەر چیایەکان نەبوونایە، وەك چۆن کەشتی ئەگەر بێت و لەنگەری بۆ دانەنرێ و لەنگەر نەگرێ، کاتێك کە ڕادەوەستێ لە مینادا، شەپۆلەکانی دەریا دەیهێنن و

دەبیەن، بەڵام بەهۆی لەنگەرەکانەوە دەوەستێ، زەویش بەهۆی چیایەکانەوە ئاوا مەحکەم ڕاگیراوە.

هەروەها زانایان دەڵێن: ئەگەر بێت و چیایەکان نەبوونایە، با لەسەر زەوی زۆر زۆر بەهێز دەبوو، بەڵام چیایەکان ئەو بایە دەگرنەوە، هەروەها چیایەکان وایان کردوە کە زەوی زۆر مەحکەم بێ، چونکە توێژاڵی سەرەوەی زەوی، ئەگەر بە ئەندازەی نیو (٠،٥) سانتیمش بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە، زۆر مەحکەم و بەهێزە و وایکردوە، زەوی نەجووڵێ لە بن مرۆڤەکاندا.

٣- ﴿ وَأَنْهَٰرًا ﴾، هەروەها خوا ڕووبارەکانیشی خستوونە نێو زەوی، کە بە زۆری لە قورئاندا چیاییەکان و ڕووبارەکان پێکەوە هاتوون، چونکە چیاییەکان خەزێنەی ئاوی ڕووبارەکانن، دیارە کە لەوێوە سەرچاوەکان، هەڵدەقوڵێن و بەفریش کە دەتوێتەوە، کانی و سەرچاوەکان دەبنە جۆگەلە و، جۆگەلەکان دەبنە ڕووبار و بەرەو خوار دێن.

بۆ وێنە: ڕووباری (ئەمازۆن) کە لە ئەمریکایە، لە هەر چرکەیەکدا، سێ سەد هەزار مەتر سێجا (**مكعّب**) (٣٠٠،٠٠٠م٣) ئاوی هەیە، هەروەها ڕووبارەکانی: نیل و سەیحوون و جەیحوون و دیجلەو فوڕات و ڕووبارەکانی دیکەی دنیاش، هەرکامیان بە قەبارەی خۆی، ئاوی هەیە.

٤- ﴿ وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، هەروەها خوا ڕێیەکانیشی لەسەر زەوی داناون، بۆچی؟ ﴿ لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، بۆ ئەوەی پێیاندا بگەنە ئەو شوێنانەی مەبەستتانن، یاخود لێرەدا مەبەست پێی ڕێی مەعنەوییە، بۆ ئەوەی ڕێ بەرەو خوا بگرنەبەر، بەهۆی ئەو نیعمەتانەوە و، بزانن کە ئەو چاکەو نیعمەتانە، تەنیا بە پەروەردگار و بەدیهێنەرتان دەکرێن.

٥- ﴿ وَعَلَٰمَٰتٍ ﴾، هەروەها خوا نیشانەکانیشی لەسەر زەوی داناون، نیشانەکان یانی: ئەو شتانە و ئەو شوێنانەی کە مرۆڤ بەهۆیانەوە بە ڕێیەکان دەزانێ، ئنجا: گردە، ڕووبارە، چیایە، دەریایە، ئەوانە هەموویان نیشانەن بۆ ئەوەی خەڵك بەڕێیان بزانێ.

٦- ﴿ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴾، هەروەها بەهۆی ئەستێرەکانیشەوە، (یانی: بەهۆی نیشانەکانیشەوە و بەهۆی ئەستێرەکانیشەوە) ئەوان (مرۆڤەکان) ڕێ دەدۆزنەوە، کە بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست پێی ڕێ دۆزینەوەی ماددییە، نەك ڕێ دۆزینەوەی مەعنەویی.

## سووڕانەوەکانی زەوی

پێویستە بزانین کە زەوی چەند سووڕانەوەیەکی هەن، کەچی لەگەڵ ئەو هەموو سووڕانەوانەشدا، ئنجا خوا ﷻ زەوی وا لێکردوە کە لە بنماندا نەیەت و نەچێ و، نەجووڵێ، نە هەژێ و نەلەرزێ، چونکە وەك پێشتر گوتمان: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، زانایان وایان لێکداوەتەوە:

أ / (كراهة أَن تَمِيدَ بِكُم)، پێمان ناخۆشە کە لە ژێرتاندا بجووڵێ.

ب /بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: (لِأَن لاَ تَمِيد بِكُم)، بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنێ، مەبەست ئەوەیە: بۆ ئەوەی زەوی نەجووڵێ، خوا ﷻ چیایە چەسپاوەکانی تێدا داناون و، خستوونیە نێو زەوییەوە.

١- زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و لە هەر خولەکێکدا (٣٠ کم) دەبڕێ.

کەواتە: بۆ ئەوەی بزانین لە کاژێرێکدا چەند دەبڕێ! دەبێ (٣٠)ی جارانی (٦٠) بکرێ، (٣٠ × ٦٠ = ١٨٠٠کلم)، بەڵێ زەوی لە سەعاتێکدا هەزار و هەشتسەد کیلۆمەتر (١,٨٠٠ کم) دەبڕێ، لە خولانەوەی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا، کە دەبێتە هۆی بەدوای یەکدا هاتنی شەو و رۆژ.

٢ - زەوی لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، لە هەر چرکەیەکدا (٣٠ کم) دەبڕێ، کە ئەو کاتە دەبێ، (٣٠)ی جارانی (٦٠) بکرێ، دوایی جارێکی دیکەش جارانی (٦٠) بکرێ، (٣٠ × ٦٠ × ٦٠ = ١٢٨,٠٠٠) سەد و بیست و هەشت هەزار کیلۆمەتر لە یەك سەعاتدا.

٣ - هەروەها زەوی لەگەڵ خۆر و کۆمەڵەکەشی دا بە دەوری خڕۆکەی داڵی ڕاوەستا و (**الكوكب الجاثي**)دا دەسووڕێتەوە و، لە هەر چرکەیەکدا بیست (٢٠) کیلۆمەتر دەبڕێ.

٤ - هەروەها لەگەڵ کاکێشاندا لە هەر چرکەیەکدا بیست و شەش (٢٦ کم) دەبڕێ، مانای وایە بەلای کەمەوە زەوی ئەو چوار سووڕانەوە و جووڵەیەی هەن[1].

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خوا ﷻ وای لێکردوە، ئێمە نەجووڵێنێ و لە بنماندا هێمن و ئارام بێ، وەك لە سوورەتی (النبأ)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾﴾، ئایا زەوییمان بۆ نەکردوونە بێشکە، وەك لانکەیەك چۆن منداڵ تێیدا ڕادەژێ، بەڵام ناشیخاتە خوارێ، زەویش ئەو هەموو جووڵەو سووڕانەوانەشی هەن، بەڵام بێئەوەی ئێوە هەستی پێ بکەن.

---

(١) بڕوانە: مەوسووعەی: ئیمان و ئیلحاد، لاپەڕە: ٢٦٨ – ٢٧١.

## مەسەلەی شەشەم:

**خوا بە پرسیارکردنی نکوولّیلیّکەرانە دەفەرمویّ: ئایا کەسیّك کە بەدیهیّنەرە، وەك کەسیّکە کە هیچ بەدی ناهیّنیّ، ئایا بیرناکەنەوە ؟، ئایا بە وەبیرخۆتانی ناهیّننەوە:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١-** ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ ﴾، ئایا ئەوەی کە وەدیدەهیّنیّ، وەك کەسیّك وایە کە هیچ وەدی ناهیّنیّ، ئایا بیرتان ناکەویّتەوە، واتە: بیرناکەنەوە، شتەکان بخەنەوە بیر خۆتان، بۆ ئەوەی کە زۆر بە ئاسانی جیاوازی بکەن لە نیّوان خوایەك ﷻ کە بەدیهیّنەرە و پەرستراوانیّکی دیکەدا، کە هەرچی بن، نەك هیچ بەدیناهیّنن، بەڵکو خۆشیان بەدیهیّنراون ؟

**(الخَلْقُ: التَّقْدِيرُ المُستقِيم وَيُستعْمَلُ فِي إِبْدَاعِ الشيء مِنْ غَيْرِ أَصْل وَلاَ احتذَاء)**، **(خَلق)**: بریتیە لە ئەندازەگیرییەکی ڕێك و ڕاست، بەڵام بەکاردەهێنرێ لە پەیداکردنی شتێکدا کە هیچ بناغەیەکی نەبوو بێ و تێیدا سەیری شتێکی پێش خۆی نەکرا بێ.

**٢-** کە دەفەرمویّ: ﴿ كَمَن لَّا يَخۡلُقُ ﴾، دەڵێ: **(عِبارَةٌ عَنِ الناطِقِينَ وَلاَ يُعَبَّرُ بِهِ عَنْ غَيْرِ الناطِقِين، إلاَّ إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمْ، وَبَيْنَ غَيْرِهِم)**، وشەی **(مَن)**، بۆ گۆیایان **(ناطقين)**، بەکاردەهێنرێ، واتە: ئەوانەی خاوەنی ئیرادەو عەقڵ و شعوورن و، بۆ ناگۆیایەکان بەکارناهێنرێ، مەگەر پێکەوە کۆکرابنەوە، یانی: لەبەر ئەوەی ئەو شتانەی خەڵك دەیان پەرستێ، کە هەیە جینن دەپەرستێ، هەیە فریشتان دەپەرستێ، هەیە مرۆڤان دەپەرستێ، هەروەها دار و بەرد و، مانگ و خۆر و، ئەستێرەو، هەواو ئارەزوو، ئەوانەش هەموویان دەپەرسترێن.

کەواتە: پەرستراوەکان هەندێکیان خاوەن شعوور و هەستن، هەندێکیشیان کە دار و بەرد و مانگ و خۆر و ئەستێرەن، ئەوە دیارە بێ ژیان و ئیرادەن، ئنجا مادام تێکەڵن، بۆیە دەگونجێ وشەی **(مَن)** کێ یان بۆ بەکاربێ.

**٣-** ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیرتان ناکەویّتەوە، بیرناکەنەوە کە شتەکان بخەنەوە بیرخۆتان، هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: ﴿ كَمَن لَّا يَخۡلُقُ ﴾، بۆ تەغلیبی گۆیاکان **(ناطقين)** نیە، بەسەر

ناگۆیایان (**غير الناطقين**)دا، بەڵكو بۆ موشاكەلەیە، كە خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ﴾، ئایا ئەو كەسەی كە دروست دەكات، وەك ئەو كەسە وایە كە دروست نەكات ؟

منیش پێموایە لە زمانی عەرەبیدا جاری وا هەیە (**مَن**) بۆ ئەوانەش كە خاوەن شعوور و هەست نین بەكاردێ، هەروەك (**ما**)ش، كە زیاتر بۆ ئەوانەی كە خاوەن ئیرادەو هەست نین، بەكاردێ، جاری وا هەیە بۆ خاوەن ئیرادەو هەستیش بەكاردێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الشمس**)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ ﴾، كە دیارە ئەو (**ما**)یانە هەموویان مەبەست پێیان خوایە ﷻ.

**مەسەلەی حەوتەم:**

**هەر کەس بیەوێ چاکەکانی خوا بژمێرێ، بۆی سەرژمێر ناکرێن و، ئەندازەو ژمارەکانیانی بۆ نازانرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٨ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ ﴾، ئەگەر چاکەکانی خوا بژمێرن.

٢- ﴿ لَا تُحْصُوهَآ ﴾، بۆتان سەرژمێر ناکرێن.

٣- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ ﴾، نافەرموێ: (نِعَمَ اللَّـهِ)، یانی: ئەگەر یەك چاکەو نیعمەتی خواش بتانەوێ بیژمێرن، پێکهاتەکانی بژمێرن، هەر بۆتان سەرژمێر ناکرێ، وەك پێشتریش باسمان کردوە، کەسێك کە خواردنێك دەخوات، ئەو خواردنە تاکو هاتۆتە بەردەستی، چەندان لە نیعمەتەکانی خوا هۆکار بوون و ڕۆڵیان تێداگێڕاوە و بوونەتە هۆی پەیدابوونی.

بۆ نموونە: تۆ نانێك دەخۆی، خواردنێکی دیکە دەخۆی، میوەیەك دەخۆی، هەتا ئەو میوەیە پێگەیشتوە، تیشکی خۆر و، ئاوی ئاسمان و، گڵی سەر زەوی و، توخمەکانی هەوا و چەندان بەکتریا و چی و چی و چی، هەموو دەوریان پێکەوە بینیوە، تاکو ئەو میوەیە بەرهەم هاتوە.

یاخود ﴿ نِعْمَةَ ٱللَّهِ ﴾، مەبەست پێی جینسی نیعمەتە، یانی: چاکەکانی خوا ﷻ بۆ ئێوە سەرژمێر ناکرێن، دەتوانی بڵێی: یەك و، دوو و سێ و... هتد، بەڵام ژمارە و ئەندازەکەیانت بۆ نازانرێ.

## مەسەلەی هەشتەم و کۆتایی:

**خوا ﷻ پەنهان و ئاشکرای مرۆڤەکان دەزانێ و، ئەوانەی لە جیاتی خوا دەپەرستێن، هیچ دروست ناکەن و خۆشیان دروستکراون و، مردوون و، زیندوونین و، ناشزانن کەی زیندوو دەکرێنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـًٔا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١- ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴾، هەروەها خوا دەزانێ، چی پەنهان دەکەن و، چییش ئاشکرا دەکەن و، ئاگاداری هەموو شتێکتانە، وریا بن! خوا ﷻ وەك چۆن ڕواڵەت و دەرەوەتان دەبینێ، پەنهان و نێوەوەشتان دەبینێ.

٢- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، ئنجا بت و صەنەمن، شەیتانن، بەشەرن، مانگ و خۆرن، هەرچی هەن، کە لەجیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، کە پاڕانەوەش تایبەتمەندترین حاڵەتی پەرستنە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: **(الدعاء هو العبادة) أخرجه أبو داود: ٩٧٤١، والترمذي: ٩٦٩٢، وابن ماجه: ٨٢٨٣، وصحَّحَهُ الألباني،** واتە: پاڕانەوە بریتیە لە پەرستن، ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، لە خوار خواوە لێیان دەپاڕێنەوە، داوایان لێدەکەن و، شتانێکیان لێ داوا دەکەن، کە تەنیا بە خوا دەکرێن.

٣- ﴿ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـًٔا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾، هیچ شتێك بەدی ناهێنن و خۆشیان بەدیدەهێنرێن.

پێشێ دەفەرموێ: خوا هەرچی پەنهان دەکەن و ئاشکرای دەکەن، دەیزانێ، واتە: تەنیا خوا پەنهان و ئاشکراتان دەزانێ، بەڵام ئەو شتانەی کە جگە لە خوا دەیانپەرستن، ئەوە نازانن.

دوایی دەفەرموێ: ئەوانەی کە لەجیاتی خوا، لە خوار خواوە لێیان دەپاڕێنەوە و چاوەڕوانییتان لێیان هەیە، ﴿ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـًٔا ﴾، هیچ شتێك دروست ناکەن و، توانای بەدیهێنانیان نیە، کەواتە: شایستەی پەرستران نین، پەرستراو دەبێ بەدیهێنەربێ، بتوانێ شت بەدیبێنێ، بتوانێ شت پەیدا بکات لە نەبوونەوە، ئەوەش تەنیا بە خوا دەکرێ

ﷻ، بۆیە هەر خوا شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کرانە، ئنجا ئەو پەرستراوانە نەك هەر هیچ شتێك پەیدا ناکەن، ﴿وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ﴾، خۆشیان دروست کراون، بەدیهێنراون، کاتێك بووە نەبوون و کاتێکیش دەبێ، نابن.

٤- دوایی خوا ﷻ دەفەرمویْ: ﴿أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖ﴾، مردوون و، زیندوو نین، مردووی بێ ژیانن و، خاوەنی ژیان نین.

﴿أَمۡوَٰتٌ﴾، واتە: مردووان کە ژیانیان تێدانەبێ، ﴿غَيۡرُ أَحۡيَآءٖ﴾، ئەمیش هەر یانی: بێ ژیانن، یانی: نازیندوون، ئەمیش جەختکردنەوەی نێوەڕۆکی وشەی پێشێیە کە بریتیە لە ﴿أَمۡوَٰتٌ﴾، واتە: مردوون و هیچ شێوەیەك لە ژیانیشیان تێدانیە، هەڵبەتە لە هەموو زمانەکاندا ئەوە هەیە، جاری وایە وشەیەك دەگوترێ، دوایی وشەیەکی دیکەی کە مانای لێوەی نزیکە، دەگوترێ بۆ تەئکید کردنەوەی ئەو مانا و مەبەستە کە لە وشەی پێشێدا هاتوە.

٥- ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾، هەستیش ناکەن، نازانن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

(لا يَشعُرون: أي لايُدرِكُونَهُ بالحَوَاسّ)، بە هەستەکانیان دەرکی ناکەن، کەی زیندوو دەکرێنەوە، وشەی ﴿أَيَّانَ﴾، (إستفهامٍ عن الزّمان مُرَكَّبٌ مِنْ: أَيّ وآن)، (أي)، یانی: چ شتێك، (آن)، یانی: کات، ﴿أَيَّانَ﴾، یانی: چ کاتێك، کەواتە: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾، هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە، ئەمە لەلاڕا خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ کە ئێوە زیندوو دەکرێنەوە، زیندووبوونەوەتان هەیە، لێپرسینەوە و سزاو پاداشتتان هەیە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾، واتە: ئەو شتانە کە دەپەرسترێن نازانن کەی زیندوو دەکرێنەوە، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە ئەو شتانە کە دەیانپەرستن نازانن پەرستارەکانیان، ئەوانەی کە دەیانپەرستن، بەندایەتییان بۆ دەکەن، کەی زیندوو دەکرێنەوە، ئەگەر مەبەست پێی پەرستراوەکان بێ، نازانن کەی زیندوو دەکرێنەوە، لەبەر ئەوەی وەك گوتمان: ئەوانە وێڕای ئەوەی کە دار و بەردو ڕووەك و مانگ و خۆر و ئەستێرە و ماددەی بێ ژیانیان تێدا هەبووە، جاری واش بووە جینیشیان پەرستوە و، جاری واش بووە فریشتەشیان پەرستوە و، جاری واش بووە مرۆڤیشیان پەرستوە، بۆ وێنە: پێغەمبەرانیان پەرستوە، وەك نەصرانییەکان کە عیسا ﷺ دەپەرستن، یاخود مەبەست لە: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾، واتە: ئەوانەی کە ئەو پەرستراوانە دەپەرستن،

نازانن خۆتان کەی زیندوو دەکرێنەوە، واتە: دەگونجێ ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ﴾، بگەڕێتەوە بۆ ئەوانە کە پەرستشەکان ئەنجام دەدەن و، بۆ پەرستراوەکانیش کە شایستەی پەرستران نین.

بەڕێـــزان !

وەك دیتمان لە ئایەتەکانی: (١٠ و ١١ و ١٢ و ١٣ و ١٤ و ١٥ و ١٦)دا، خوای بەخشەر - وەك لە مانای گشتی دا سەرژمێرمان کردن - بیست و چوار (٢٤) چاکە و نیعمەتی گرنگ و بەرچاوی خۆی خستوونە ڕوو، پاشان زۆر بە ڕوونیی، نالۆژیکیی شیرك و بێبڕوایی و بێ بنەمایی، ڕاگەیاندوە، لە ئایەتەکانی: (١٧ - ٢١) دا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سێزدە (١٣) ئایەت پێکدێ، ئایەتەکانی: (٢٢ - ٣٤)، تەوەری سەرەکیی ئەم سێزدە ئایەتە، باسی هەڵوێستی نەرێنییانەی کافرەکانە لە بەرانبەر یەکتایی خوا ﷻدا و، لە بەرانبەر قورئان دا و، ئەو سەرەنجامە شوومەی کە لەو سۆنگەیەوە دووچاری دەبن، لە دنیاو لە دواڕۆژیش دا.

پاشان خوا ﷻ، ئاماژەیەکی کورتیش بە هەڵوێستی ئەرێنییانەی پارێزکاران دەکات لە بەرانبەر قورئاندا و، ئەو سەرەنجامە باشەی کە لە ئەنجامی ئەوەدا چاوەڕێیانە.

چونکە وەك گوتراوە: (چی بچێنی ئەوەش دەدووریەوە)، پارێزکاران لە دنیادا هەڵوێستی باشیان لە خۆیاندا بەرجەستە کردوە، لە بەرانبەر خوا و قورئاندا، بۆیە سەرەنجام لە دواڕۆژدا سەربەرزو ڕووسوور دەبن، هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکانیش هەڵوێستی خراپیان لێ پشکوتۆتەوە لە بەرانبەر خواو پەیام و بەرنامەکەیدا کە قورئانە، بۆیە ئەوەی کە لە دنیادا چاندوویانە، بێگومان لە دواڕۆژیشدا هەر ئەوە دەدوورنەوە.

﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزْيَ الْيَوْمَ وَالسُّوءَ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٢٧﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ ۚ بَلَىٰ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾

﴿ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡۚ قَالُواْ خَيۡرٗاۗ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۚ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞۚ وَلَنِعۡمَ دَارُ ٱلۡمُتَّقِينَ (٣٠) جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ لَهُمۡ فِيهَا مَا يَشَآءُونَۚ كَذَٰلِكَ يَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلۡمُتَّقِينَ (٣١) ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٣٢) هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ أَمۡرُ رَبِّكَۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ (٣٣) فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٣٤) ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{پەرستراوتان یەك پەرستراوە، ئنجا ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، دڵیان نکوولّییکەرە (لە خوا بەیەکگرتن) و ئەوان خۆبەزلگرن (٢٢) مسۆگەر خوا ئەوە دەزانێ کە پەنهانی دەکەن و، ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن، بێگومان ئەو (خوا) خۆبەزلگرانی خۆشناوێن و، حەز بە چارەیان ناکات (٢٣) ئەگەر پێشیان بگوترێ: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە؟ دەڵێن: ئەفسانەکانی پێشینان (٢٤) (وایان گوت و) سەرەنجام لە ڕۆژی قیامەتدا گوناهەکانی خۆیان بە تەواویی هەڵدەگرن و، لە گوناهەکانی ئەوانەش کە بەبێ زانیاریی گومڕایان دەکەن (هەڵدەگرن)، ئاگاداربن! ئەو کۆڵە قورسەی هەڵیانگرتوە، خراپترین شتە (٢٥) بەدڵنیایی ئەوانەی پێش وانیش پیلانیان گێڕا، بەڵام خوا خانووەکانیانی لە بناغەوە ڕووخاندن و سەربانەکەیان لەسەرێ ڕا بەسەردا ڕما، بە جۆرێك کە بەبیریان دا نەدەهات، سزایان بۆ هات (٢٦) دوایی (خوا) ڕۆژی قیامەتیش ڕیسوایان دەکات و دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەم کە مشتومڕتان لەسەر دەکردن؟ ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، گوتیان: بێگومان ئەمڕۆ ڕیسوایی و حاڵ خراپیی بەسەر بێبڕوایان دا هاتوە (٢٧) ئەوانەی لە حاڵێك دا کە ستەمیان لە خۆیان کردوە، فریشتەکان گیانیان دەکێشن، ئیدی سەرەنجام خۆیان بەدەستەوەدا (گوتیان:) ئێمە هیچ خراپەیەکمان نەکردوە، (پێیان دەگوترێ:) با، بە دڵنیایی خوا ئەوەی دەتانکرد، پێی زانایە (٢٨) کەواتە: بچنە دەروازەکانی دۆزەخەوە، تێیدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، ئەو (دۆزەخ)یش خراپترین جێگای خۆبەزلگرانە (٢٩) بەوانەش گوترا کە پارێزیان دەکرد: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە؟ گوتیان: (بەرنامەیەکی) هەرە

باش، ئەوانەی لەم (ژیانی) دنیایەدا چاكەیان كردوە (پاداشتی) چاكیان هەیە و، مەنزڵگای دواڕۆژیش چاكترە لە ژیانی دنیا و، باشترین شوێنیش مەنزڵگای پارێزكارانە ﴿٣٠﴾ دەچنە باغ و بێستانە بەردەوامەكانەوە، كە ڕووبار بە ژێر (كۆشكەكان)یاندا دەڕۆن، هەرچی بیانەوێ تێیدایە، بەو جۆرە خوا پاداشتی پارێزكاران دەداتەوە ﴿٣١﴾ ئەوانەی پاك و چاكن، فریشتەكان گیانیان دەكێشن، پێیان دەڵێن: سەلامتان لێ بێ، بەهۆی ئەو (كردەوەی چاك)ەوە، كە دەتانكرد بچنە بەهەشتەوە ﴿٣٢﴾ ئایا (بێبڕوایان) جگە لەوەی كە فریشتەیان بێنە لا (بۆ سزادان و گیان كێشان)، یان فەرمان و، بڕیاری پەروەردگارت بێ، (بە بنبڕكردنیان)، چاوەڕێی چی دیكە دەكەن! ئەوانەی پێش وانیش هەروایان كرد، خواش سزای دان و، خوا ستەمیشی لێنەكردن، بەڵكو خۆیان ستەمیان لە خۆیان كرد ﴿٣٣﴾ ئیدی سەرەنجام سزای ئەو خراپانەی كە دەیانكردن، تووشیان بوو و، ئەوەی گاڵتەیان پێ دەكرد، ئابڵووقەی دان ﴿٣٤﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مُّنكِرَةٌ): واتە: نكووڵیی لێكەرن، (**نَكِرتُ وَأَنْكَرتُ كَذَا: ضِدُّ العِرْفَانِ وَهُوَ ضَرْب مِنَ الجَهْلِ، وَرُبَّمَا يُنْكِر الإِنْسَان بِلِسَانِهِ مَا صُورته حَاضِرَة فِي القَلْبِ: الجَحد**)، واتە: (**نَكرتُ وأنكرتُ كذا**)، هەردووكیان بە یەك واتان، واتە: نكووڵییم لەو شتە كرد، یان ئەو شتەم نەناسی، (**نُكران ضِدّ العِرْفَان**)ە، ئەویش جۆرێكە لە نەزانین، بەڵام جاری وایە مرۆڤ بە زمان نكووڵیی لە شتێك دەكات، كە وێنەكەی لە دڵیدا هەیە، واتە: پێی زانایە، بەڵام دانی پێدا ناهێنێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (**جَحْد**)، وەك چۆن ئینكاریی پێدەگوترێ، (**جَحْد**)یشی پێ دەگوترێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا وَلَقَدْ...﴿١٤﴾﴾النمل، واتە: نكووڵییان لێكرد، لە حاڵێكدا كە لە دەروونیاندا لێی دڵنیا بوون كە ڕاستە، كە مەبەست موعجیزەكانی مووسایە ؑ.

(أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ): (**أَسَاطِير: جَمْعُ أُسْطورَة، نَحْو أُرْجُوحَة وأَرَاجِيح، أُثْفِية وأَثَافِي**)، (**أَسَاطِير**) كۆی (**أُسطورَة**)یە، واتە: ئەفسانە، وەك (**أُرجُوحَة**)، كە بە جۆلانە دەگوترێ، بە (**أَرَاجِيح**) كۆدەكرێتەوە و، (**أُثْفِية**)، كە بە سێكوچكە دەگوترێ، كە مەنجەڵی لەسەر دادەنرێ، بە (**أَثَافِي**) كۆدەكرێتەوە، هەندێكیش گوتوویانە: (**أَسَاطِير**)، كۆی (**أَسْطُر**)ە و، (**أَسْطُر**)یش كۆی (**سَطْر**)ە، واتە: ئەو دێڕانەی كە نووسراون، بەڵام ئەوە كە كۆی (**أُسْطورَة**) بێ زیاتر پێدەچێ.

( أَوْزَارَهُمْ ) واتـە: قورسـاییەکانیان، (**جَمْـعُ الـوِزْر: وَهُـوَ الثِّقْـل، وَيُعَـبَّرُ بِـهِ عَـنِ الإِثْـمِ، كَـمَا يُعبَّرُ عَنْهُ بالثِّقْلِ**)، (**وِزْر**)، بـە مانـای (**ثِقْـل**) دێ، بـەڵام بـە (**ثِقْـل**) تەعبیـر دەکـرێ لـە گونـاح، هـەروەك جـاری وایـە بـە گوناهیـش دەگوتـرێ: (**ثِقْـل**)، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ۖ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾، لەبـەر ئـەوەی گونـاح بـاری شـانی مـرۆڤ قـورس دەکات، بۆیـە نـاوی لێنراوە قورسـایی.

( فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ ): واتـە: سـەربانەکە بەسـەریاندا ڕمـا، (**خَـرَّ: سَـقَطَ سُـقُوطاً يُسْـمَعُ مِنْـهُ خَرِيـرٌ، وَهُـوَ صَـوْتُ المَـاءِ، وَالرِّيـحِ وَغَيْرِ ذَلِـكَ، مِـمَّا يَسْـقُطُ مِـنْ عُلُـوٍّ، سَـقْفُ البَيْـتِ: الجَمْـعُ سُـقُف، وَالسَّـقِيْفَةُ كُلُّ مَـكَانٍ لَـهُ سَـقْفٌ**).

(**خَـرَّ**)، واتـە: کەوتنێـك کـە دەنگـی لێوەبـێ، دەنگـی (**خریـر**)، (**خریر**)یـش دەنگـی ئـاو و دەنگـی بایـە کـە دێ: خـوڕەی ئـاو، یـان هـاژەی بـا، واتـە: دەنگێـکی لێـوە بـێ، وژژەی بـێ و، جگـە لـەو دەنگانـەش دەنگـی هـەر شـتێکی دیکـە کـە لـە سـەرێ ڕا بکەوێتـە خـوارێ، کـە بـە کوردیـی دەگوتـرێ: وژژە[1]ی هـات.

(**سَـقْفُ البَيْـت**)، کـە بـە (**سُـقُف**)، کۆدەکرێتـەوە، واتـە: سـەربان، (**سـقيفَة**)ش هـەر شـتێکە کـە سـەری گیرابـێ، کـە دەگوتـرێ: (**سَـقِيفَةُ بَنِـي ساعِدَة**)، دیـارە شـوێنێك بـووە لێـی دانیشـتوون و سـەرەکەی گیـراوە.

( تُشَـٰقُّونَ فِيهِمْ ): واتـە: ئێـوە لەبـارەی وانـەوە مشـتومڕتان دەکـرد، ناکۆکییتـان دەکـرد، شـەڕە قسـەتان دەکـرد، (**الشِّـقَاقُ: الْمُخَالَفَـةُ**)، واتـە: ناکۆکیـی و مشـتومڕ.

( فَأَلْقَوُا السَّلَمَ ): (**السِّـلْمُ والسَّـلَمُ والسَّـلَامُ: الصُّلْـح**)، وشـەی (**سِـلْم، سَـلَم، سَـلَام**)، هەرسـێکیان بـە واتـای صوڵـح و ئاشـتەوایی و تەبایـی دێـن، ﴿ فَأَلْقَوُا السَّلَمَ ﴾، واتـە: ئاشـتەواییان هەڵـدا، ئەمـە وەك چـۆن کەسـێك لـە شـەڕێدا تەسـلیم دەبـێ و، چەکەکـەی فـڕێ دەدات و، دادەنـێ، واتـە: ئەوانیـش ئـاوا ملکەچییـان بـۆ خـوا خسـتەڕوو و وازیـان لـە دژایەتیـی و ناکۆکیـی هێنـا، بـەڵام لـە کاتێکـدا کـە دادیـان نـادا، لـە قیامەتـێ هەردەبـێ تەسـلیم بـن، چـی دەکـەن !

( الْخِزْيَ )، (**خـزِيَ الرَّجُـلُ: لَحِقَـهُ انْكِسـارٌ**)، پیاوەکـە تەریـق بـۆوە، بەخـۆی داشـکایەوە، یـان شـەرمەزاریی تـووش بـوو، (**أَخْـزَاهُ: أَهَانَـهُ وَفَضَحَـهُ وَأَخْجَلَـهُ**)، (**أَخْـزَاهُ**): واتـە: سـووکایەتیی پێکـرد، یـان ئابـڕووی بـرد، یـان تەریقـی کـردەوە، هەرسـێکیان مانـای (**أَخْـزَاهُ**)ن.

---

(١) (وشه‌شه)ش دەگوترێ و (ورشه)ش دەگوترێ.

( مَثْوَى )، (ثَوَى بالْمَكانِ: أَقَامَ وَاستقرَّ)، (ثَوَى بالْمَكانِ)، واتە: لە شوێنەكە نیشتەجێ بوو و تیایدا مایەوە، ( مَثْوَى )ش، یانی: (مكان الثَّواءِ)، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون.

( طَيِّبِينَ )، (الطَّيِّبُ: كُلُّ مَا تَستلِذّهُ الحَوَاسُّ، أَوِ النَّفْسُ وكُلُّ مَا خَلاَ مِنَ الأَذَى)، (طَيبين)، كۆی (طَيِّب)ە و (طَيب)یش هەر شتێكە كە هەستەوەرەكان و نەفس تامی لێ بكات، هەر شتێك كە دوور بێ لە ئازار و، لە خراپە، پێی دەگوترێ: (طيِّب)، كە دەگوترێ: (طيبين) واتە: ئەو كەسانە پاك و چاكن.

هەڵبەتە وشەی (طيب) بەپێی سیاق ماناكەی دەگۆڕێ، واتە: ئەگەر بە خواردن بگوترێ: (طيِّب) واتە: خواردنێكی خۆش، هەروەها بۆنی خۆش پێی دەگوترێ: (طِيب)، ئەگەر بە زەوی بگوترێ: (طيِّب) واتە: زەوییەكی بە پیز، ئەگەر بە مرۆڤ بگوترێ، واتە: مرۆڤێكی پاك و چاك، هەروەها بەپێی سیاقەكە دەگۆڕێ، بە گشتی هەر مانای پاكیی و چاكیی و خۆشیی، دەگەیەنێ، بەڵام بەپێی ئەو مەبەستە كە بۆی بەكارهاتوە، لەو سیاقەدا ماناكەی دەگۆڕێ.

( وَحَاقَ )، واتە: دەوری دا، (حَاقَ بالشيءِ يَحِيقُ حَيْقَاً وَحُيُوقَاً وَحَيْقَانا: أَصَابَهُ وَأَحَاطَ بِهِ، وَحَاقَ بالأَمْرِ: لَزِمَهُ وَوَجَبَ عَلَيْهِ)، (حَاق)، دوو واتای هەن، واتایەكیان واتە: تووشی بوو، دەوریدا، واتایەكی دیكەشیان واتە: پێوەی نووسا، لەسەری پێویست بوو.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ، وەك لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەدا، گوتمـان لـەم سـێزدە (١٣) ئایەتـەدا چەنـد هەڵوێسـت و بیروبۆچوونێـکی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان دەپووکێنێتـەوە و، بەڵگەیـان لەسـەر تـەواو دەکات و، بـاسی سـەرەنجامی شـوومیان دەکات، هـەم لـە دنیـادا و هـەم لـە دوارۆژدا.

ئنجـا وەك بەراوردێـك لەگـەڵ وانـدا، ئاماژەیەکیـش دەکات بـە پارێـزکاران، کـە ئەوانیـش هەڵوێستیان چۆنـە لـە بەرانبـەر خـوا بەیەکگرتنـدا و، لـە بەرانبـەر پەیـام و بەرنامـەی خـوادا و، سـەرەنجامی پڕ خێـر و بەرەکەتیشیان چۆنـە؟ خـوای پـەروەردگار لـەم ئایەتانـەدا بـاسی ئـەوە دەکات.

سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾، پەرسـتراوی ئێـوە یـەك پەرسـتراوە، بەڵـێ زۆر پەرسـتراو هـەن، بـەڵام پەرسـتراوی ساختەو ناڕاسـتن، پەرسـتراوی ئێـوە کـە شایسـتەی پەرسـتران بـێ، هـەر یەکـە، کـە خـوا ﷻیـە، چونکـە تەنیـا ئـەو بەدیهێنـەرە، تەنیـا ئـەو پـەروەردگارە، تەنیـا ئـەو خاوەنـە، تەنیـا ئـەو مشـوورخۆرە، تەنیـا ئـەو دەژیێنـێ و، دەمرێنـێ و، ڕۆزیـی دەدات و، سـەر دەخـات و ژێـر دەخـات و، سـاغ دەکات و نەخـۆش دەکات و، ئـەم گەردوونـە بـە ویسـتی ئـەو دەسووڕێ و، بەپێـی نەخشـەیەك کـە ئـەو دایناوە و بەپێـی یاسایانێك کـە ئـەو تێیـدا دانـاون دەجووڵـێ و دەسـووڕێ و، ئـەو هەمـەکارەی دنیـا و دوارۆژە، کەواتـە: هـەر ئەویـش شایسـتەی پەرسـترانە، ﴿ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ ﴾، ئنجـا ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، دڵەکانیـان نکووڵیلێکـەرن، ﴿ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾، هەروەهـا ئـەوان خۆبەزلگـرن، واتـە: لەبەرئـەوە کـە بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، حیسـابی دیـداری خـوا ناکـەن و، چاوەڕێـی ئـەوە ناکـەن کـە سـزا و پاداشـت بدرێنـەوە، بۆیـە دڵیـان نکووڵیـی دەکات، دڵیـان نکووڵیلێکـەرە لـە یەکتایـی خـوا، لـە تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـوا و خۆشـیان بـە زلدەگـرن.

﴿ لَا جَرَمَ ﴾، واتـە: (حَقًّا)، بەدڵنیایـی، یـان: هیـچ گومـانی تێـدا نیـە، ﴿ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾، هیـچ گومـان لـەوە دانیـە و شـتێکی چەسـپاوە: کـە خـوا دەزانـێ چـی پەنهـان دەکـەن و، چیـش ئاشـکرا دەکـەن، ئەوانـەی کـە جگـە لە خـوا دەپەرسـتن، ﴿ إِنَّهُ

﴿ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ ﴾، بەدڵنیاییی ئەو خۆبەزلگرانی خۆشناوێن، ئەوانیش خۆبەزل دەگرن لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن بۆ خوادا ﷻ، خواش حەز بە چارەیان ناکات.

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە خوا ﷻ پێی خۆشە بەندەکانی وابن کە خۆشی بوێن، لە بنەڕەتدا خوا بەندەکانی بۆیە دروستکردوە، کە چاکەیان لەگەڵدا بکات و پێی خۆشە خۆیان وا لێ بکەن کە خوا خۆشی بوێن، بەڵام ئەگەر خۆیان کارێکی وا بەسەر خۆیان بێنن کە لە جیاتی ئەوەی خۆشەویستی خوا بن، ببنە بوغزێنراوی خوا و خوا حەز بە چارەیان نەکات، ئەوە ئۆباڵی خۆیان بە ئەستۆی خۆیان و، خەتای خۆیانە کە وا لە خۆیان دەکەن.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ﴾، ئنجا باسی ئەو هەڵوێستەیان دەکات، کە ئەگەر پێیان بگوترێ: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە، چ پەیامێك؟ چ بەرنامەیەك؟ ﴿ قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، دەڵێن: ئەفسانەکانی پێشینان، دیارە ئەوانە سەفسەتەیان کردوە، زانیویانە ئەو بەسەرهاتانەی کە خوا لە قورئاندا دەیانگێڕێتەوە هی پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) و هی گەلە پێشووەکانن و، ئەفسانە نین، بەڵام بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵکەکەیان و بۆ فێڵ لێکردنیان و هەڵخەڵەتاندنیان گوتوویانە: ئەدی ئەوە نیە قورئان بە زۆریی بەسەرهاتە، کە ڕاستە قورئان (٣/٢)ی بەسەرهاتە، بەڵام بەسەرهاتی پێشینانە و ئەفسانە نیە، بەڵێ بەسەرهاتی گەلە پێشووەکانە، بەڵام نەك بە شێوەی ئەفسانە، بەڵکو گێڕانەوەی ئەو ڕاستییانەیە کە لە مێژوودا بوون و، خوای پەروەردگار پێیان ئاگادارە و لە ژیانی مرۆڤیشدا هەمیشە ئەو ڕاستییانە دووبارە دەبنەوە.

﴿ لِيَحْمِلُوٓاْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، مادام ئەوە هەڵوێستیانە بەرانبەر بە خوا ﷻ کە دڵیان نکوولیی دەکات لە خوا بەیەکگرتن، لە تەنیا بەندایەتیی کردن بۆ خوا و، ئاواش دوا پەیامی خوا کە دایبەزاندوە بۆ سەر دوا پێغەمبەری خۆی ﷺ، بەوە ناوزەند دەکەن، کە ئەفسانەی پێشینانە، کەواتە: ﴿ لِيَحْمِلُوٓاْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، با لە سزای ئەوەدا قورساییەکانی خۆیان، گوناهەکانی خۆیان بە تەواویی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا هەڵبگرن، ﴿ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، هەروەها لە قورسایی ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن بەبێ زانیاریی، واتە: زانیارییان نیەو پێشیان کەوتوون، یاخود ئەو خەڵکە هەڵدەخەڵەتێنن، کە نەزانین و بێئاگاییان بە فرسەت و هەل دەزانن، یانی: ﴿ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، دەگەڕێتەوە بۆ گومڕاکراوەکان، دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ

گومڕاکەرەکان، وەك دوایی باسی دەکەین، واتە: دەبێ گوناهەکانی خۆیان کە باری قورس و کۆڵی قورسن، بە تەواویی لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵبگرن و، بەشێکیش لە گوناهو تاوانی ئەوانەی کە نەزانانە گومڕایان دەکەن، هەڵبگرن، ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ﴾، ئاگاداربن، ئەها! خراپترین شتە ئەوەی کە هەڵیدەگرن.

مرۆڤ کۆڵێکی بە کۆڵەوەبێ، کۆڵەکەش بریتی بێ لە گوناهو تاوان، بێگومان ئەوە خراپترین کۆڵە پێی بچێتەوە خزمەت خوای پەروەردگار، کەسێك بە کۆڵێ گوناە و تاوانەوە بچێتەوە خزمەت خوا، لە حاڵێکدا کە خوا دروستی کردوە، بۆ ئەوەی بە دەستی پڕ و، سەری بەرز و، ڕووی سوور و، بە هەگبەو تێلەکەی تاعەت و چاکەوە بچێتەوە خزمەتی، بەڵام ئەو بە هەگبەو تێلەکەی گوناهو تاوانەوە، بچێتەوە خزمەتی و، بەڕوو زەردیی و شەرمەزاریی، ئەمە خراپترین کۆڵە لە کۆڵیان ناوە.

ئنجا خوا باسی سەرەنجامی ئەوانە دەکات لە دنیادا و لە دوارۆژیشدا، تاکو بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر و دوای ویش بزانن کە: پێشووەکان کە بێبڕوا بوون و هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، سەرەنجامیان چۆن بووە! هی وانیش هەروا دەبێ، ﴿قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾، ئەوانەی پێش وانیش پیلانیان گێڕا، واتە: لە دژی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) و ئایینی خوا، ﴿فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ﴾، خوا خانووەکانی لە بناغەوە ڕووخاندن، لە بنج و بناغەوە دەریهێنان، ﴿فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ مِن فَوۡقِهِمۡ﴾، سەربانەکە لەسەرڕا بەسەریاندا ڕما، خانووێك بناغەکەی هەڵکەندرێ، بە دڵنیاییەوە سەرێشی دەڕووخێ، ﴿وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾، سزایان بۆ هات لە شوێنێکەوە کە هەستی پێ ناکەن، کە چاوەڕوانییان نەدەکرد، لەوێوە سزایان بۆ هات، ﴿ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُخۡزِيهِمۡ﴾، پاشان لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا سەرشۆڕیان دەکات، شەرمەزار و ڕیسوایان دەکات، ﴿وَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تُشَٰٓقُّونَ فِيهِمۡ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەم کە ئێوە مشتومڕتان تێدا دەکردن، شەڕە قسەتان لەبارەیانەوە دەکرد، لەگەڵ بڕوادارانددا، کوان ئەو هاوبەشانەی من؟ بێگومان خوا ﷻ هاوبەشی نین، واتە: ئەوەی کە لە خەیاڵ و گومان و وەهمی ئێوەدا، هاوبەشی من بوون، کوان لە کوێن؟ هەڵبەتە ئەوان هیچ وەڵامیان نیە، ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ إِنَّ ٱلۡخِزۡيَ ٱلۡيَوۡمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئەوانەی زانیارییان پێدراوە دەڵێن: ئەمڕۆ سەرشۆڕیی و حاڵ خراپیی بەسەر بێبڕوایاندا هاتوە، واتە: سەرشۆڕیی و حاڵ خراپیی ئەمڕۆ، تاپۆ کراوە لەسەر بێ بڕوایان.

ئنجا پێناسەی وانیش دەکات:

﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، دەشـگونجێ ئەمـە ڕسـتەیەکی سـەربەخۆ بێ و، ئـەم مانـای دووەمیـان ڕاسـترە، کـە: ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾، پێناسـە نەبێ بـۆ ئـەوان، چونکـە: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئەوانـەی زانیارییـان پێدراوە، لـەوێ قسـەکەیان تـەواو دەبـێ، کـە گوتیـان: ئەمڕۆ زەبوونیـی و سەرشـۆڕیی و حاڵ خراپیـی و خراپـە دەکەوێتـە سـەر بێبڕوایـان.

ئنجـا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، ئەوانـەی کـە فریشـتەکان گیانیـان دەکێشـن، لـە حاڵێکـدا کـە سـتەمیان لـە خۆیـان کـردوە، ﴿ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ﴾، گـەردن کەچییـان پێشـاندا، ملکەچییـان نوانـد و تەسـلیم بـوون، گوتیـان: ئێمـە هیـچ جـۆرە خراپەیەکمان نەکـردوە !

ئنجا کە نکووڵیی دەکەن لە خراپەکانی خۆیان، دوو ئەگەری هەن:

**یەکەم:** واپێدەچێ کە خراپەکانی خۆیان پێ چاك بوو بێ لە دنیادا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾النمل، واتە: شەیتان کردەوەکانیانی بۆ ڕازاندنەوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴿٨﴾ ﴾فاطر، واتە: ئایا کەسێك کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ جوانکراوە و ڕازێنراوەتەوە و بە جوانیی دەیبینێ! وا دیارە ئەو قەناعەت و فیکرە هەڵەیەی کە لە دنیا بوویانە، بەرانبەر بە کردەوە و ڕێبازو هەڵسوکەوتە خراپەکانی خۆیان، هەر لەگەڵ خۆیانی دەبەن بۆ ئەوێ، بۆیە دەڵێن: ﴿ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ﴾، ئێمە هیچ خراپەیەکمان نەکردوە، ئەم (مِن )، کە چۆتە سەر (سُوٓءٍۭ)، واتە: هەر هیچ، نە کەم، نە زۆر خراپەمان نەکردوە !

**دووەم:** دەزانن کە خراپەیان کردوە، بەڵام لەوێ نکووڵیی دەکەن و پێیان وایە کە نکووڵیی کردن و درۆکردن، دادیان دەدات! ﴿ بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، پێیان دەگوترێ: با خراپەتان کردوە، بێگومان خوا زانایە بەوەی کە کاتی خۆی دەتانکرد.

﴿ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، ئنجـا ئێسـتا بچنە نێـو دەروازەکانی دۆزەخەوە، تێیانـدا بـە هەمیشـەیی دەمێننـەوە، ﴿ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾، بـە دڵنیاییـەوە خراپتریـن شـوێن بـۆ تێـدا حەوانـەوەی خۆبەزلگـران، دۆزەخـە، یـانی: ئەگـەر خۆبەزلگـران، شـوێنێکیان هەبـێ تێیـدا نیشـتەجێ بـن، تەنیـا دۆزەخـە، ئەوێـش خراپتریـن شـوێنی تێـدا نیشـتەجێ بوونـە.

ئنجا دێتە سەر باسی پارێزکاران، وەك بەراوردێك لەگەڵ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەر و کافرانەدا، کە پارێزکاران هەڵوێستیان بەرانبەر پەیامی خوا و بەرانبەر کتێبی دابەزێنراوی خوادا ﷻ چۆنە؟ سەرەنجامیشیان چۆن دەبێ؟ دەفەرموێ: ﴿ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡ ﴾، هەروەها بەوانەی کە پارێزیان کرد بوو گوترا: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە.

پارێزیان کرد بوو، واتە: خۆیان پاراستبوو لە هەموو ئەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشن، کە خوا ﷻ بە گشتی دوو جۆر شتی پێ ناخۆشن:

أ / ئەرکێك کە دایناوە بیچوێنی.

ب / قەدەغەیەك کە دایناوە بیشکێنی.

هەڵبەتە گەورەترین ئەرك کە خوا لەسەر بەندەکانی دایناوە، ئەوەیە کە بیپەرستن و بەندایەتیی بۆ بکەن و هاوبەشی بۆ دانەنێن، ﴿ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ﴿٥٩﴾ ﴾الأعراف، واتە: ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ئەوە گەورەترین و، بەرزترین و، پیرۆزترین ئەرکە کە خوا لەسەر بەندەکانی دایناوە.

خراپترین شتیش کە خوا لێی قەدەغە کردوون، ئەوەیە کە بەندایەتیی بۆ خوا نەکەن، یان لەگەڵ بەندایەتیی کردن بۆ خوادا، هاوبەشانی بۆ پەیدا بکەن، واتە: بەشێك لە بەندایەتیی کە تەنیا دەبێ بۆ خوا بکرێ، بۆ غەیری خواشی ئەنجام بدەن، کە ئەوە شیرکە، شیرکیش خراپترین شتە، ئەوانەی خۆیان پاراستوە، واتە: خۆیان پاراستوە لە چواندنی ئەرکی تەنیا خواپەرستیی و، شکاندنی قەدەغەی هاوبەش بۆ خوا دانان، پێیان دەگوترێ: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە؟ ﴿ قَالُواْ خَيۡرٗاۗ ﴾، گوتیان: باشترین شت، باشترین بەرنامە، باشترین پەیامی دابەزاندوە.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۚ ﴾، ئەوانەی چاکەیان کردوە، لەم ژیانی دنیایەدا، چاکەیان بۆ هەیە، هەر لەم ژیانی دنیایەدا بەرهەمی چاکەکارییەکەی خۆیان وەردەگرنەوە، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ بووناسییەکی ڕێك و ڕاستی هەبێ، لە خۆی حاڵیی بێ کێیە؟ لە کوێوە هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ دەبێ چۆن بژی؟ بۆ کوێ دەچێ؟ هەڵوێستی ڕاست و دروست دەبێ سەبارەت بە دەوروبەری، بە بوونەوەر، بە دروستکراوەکانی خوا، ئنجا بەهۆی ئیمانەوە لەبەر ڕۆشناییدا دەژی بە دڵێکی ئارامەوە و بە پاکیی دەژی و، خۆی لە قەدەغە کراوەکان دەپارێزێ و، هەوڵدەدات

سوود بە خەڵك بگەیەنێت و، بە دڵ و دەروونێكی پاك دەژی و بە زمان و ئەندامانێكی پاكەوە و دەیانپارێزێ لە گوناهو تاوان، بە دڵنیاییەوە: ئا ئەوە بۆ خۆی گەورەترین چاكەیە لە ژیانی مرۆڤدا، كە خوا بیدات بە مرۆڤ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ﴾، ئەوانەی چاكەیان كردوە، هەر لەم ژیانە دنیاییەدا چاكەیان بۆ هەیە، ﴿ وَلَدَارُ ٱلْأٓخِرَةِ خَيْرٌ ﴾، مسۆگەر مەنزڵگای دواڕۆژ باشتریشە، بگرە هەر ئەصڵەن بەراورد ناكرێ لەگەڵ هی دنیادا، بەڵام چاكەكاریی و دینداریی و خواپەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوا كردن، مرۆڤ هەر لە دنیادا لێی بەهرەمەندە پێش دواڕۆژ، ﴿ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، باشترین مەنزڵگاش مەنزڵگای پارێزكارانە، ئەمە لە ڕووی ڕێزمانەوە ئاوایە: (وَلَنِعْمَ الدَّارُ دَارُ المُتَّقِين)، باشترین مەنزڵگا مەنزڵگای پارێزكارانە، كە بەهەشتە.

ئنجا دێتە سەر وەسف كردنی مەنزڵگای پارێزكاران، ﴿ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا ﴾، چەند باغێكی هەمیشەیین، باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزارێكی هەمیشەیین، ﴿ يَدْخُلُونَهَا ﴾، دەچنە نێویان، ﴿ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بەژێر كۆشك و تەلارەكانیاندا دەڕۆن، كە لە نێو ئەو باغ و گوڵ و گوڵزارەدا بنیاتنراون، ﴿ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ﴾، بۆ ئەوان هەیە هەرچی حەزی لێ بكەن، هەرچی بیانەوێ، هەرچی بیانەوێ بە ڕەهایی و بەبێ سنوورداركردن، ﴿ كَذَٰلِكَ يَجْزِي ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە خوا پاداشتی پارێزكاران دەداتەوە.

ئنجا دەگونجێ ئەمە هەر تەواوكەری ئەوەی پێشی بێ، كە وەصفی پارێزكارانە: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ﴾، ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن لە حاڵێكدا كە پاك و چاكن.

دەشگونجێ ئەمە ڕستەیەكی سەربەخۆ بێ، خوا ﷻ باسی ئەوانەمان بۆ دەكات كە لە دنیادا خۆیان پاك و چاك ڕاگرتوە، فریشتەكان كە گیانیان دەكێشن چۆنیان گیان دەكێشن؟

﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ﴾، ئەوانەی كە لە حاڵێكدا پاك و چاكن، فریشتەكان گیانیان دەكێشن، ﴿ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ﴾، پێیان دەڵێن: ئاشتیی، سەلامەتیتان لەسەر بێ، ﴿ ٱدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، بچنە بەهەشتەوە بەهۆی ئەوەوە كە ئەنجامتان دەدا و، دەتانكرد، بەهۆی كردەوە باشەكانتانەوە، كە بێگومان كردەوە باشەكانی مرۆڤەكان، هۆكارن بۆ چوونە بەهەشت، بەڵام نرخی بەهەشت نین، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین، كردەوە باشەكانی مرۆڤەكان هۆكارن بۆ چوونە نێو بەهەشت، بەڵام بارتەقاو بەرانبەری بەهەشت نین، چونكە بەهەشت زۆر لەوە بەرزو باڵاترە، نرخەكەی ئەو كردەوانەبن، بەڵام كردەوەكان هۆكارن.

خـوا ﷻ دوایـی دێتـەوە سـەر بـاسی بـێ بـڕواو هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، دەفەرمـوێ: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ أَمۡرُ رَبِّكَ ﴾، ئایـا چاوەڕێـی چـی دەکـەن، جگـە لـەوەی کـە فریشـتەکان بێنـە لایـان، یـان فەرمـانی پـەروەردگارت بـێ.

یـانی: فریشـتەکان بێـن بـۆ گیـان کێشـانیان، یـان فەرمـانی پـەروەردگارت بـێ بـۆ فەوتاندنیـان و بنبڕکردنیـان، یاخـود بـۆ کۆتایـی پێهاتنـی ئـەم ژیـانی دنیایـەو، پێچرانـەوەی ئـەو قۆناغـەی ژیـانی مـرۆڤ و هاتنـی قۆناغـی دیکـە.

﴿ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، ئەوانـەی پێـش وانیـش هەروایـان کـرد، واتـە: هـەروا لەسـەر خراپـە بـەردەوام بـوون، تاکـو یـان فریشـتەکان گیانیـان کێشـان، لـە کاتی مـردنی ئاسـایی خۆیانـدا، یـان بـە بەڵایـەك، خـوا ﷻ لـە بەینـی بـردن و جـۆ ماڵـی کـردن و، ڕایماڵیـن، وەك خـوا ﷻ بۆمـان بـاسی گەلـی نـووح و، گەلـی عـاد و، گەلـی ثـموود و، گەلـی لـووط و، گەلـی شـوعەیب و، ئـەو گەلانـە دەکات کـە خـوا ﷻ بـە بـەڵا لـە بەینـی بـردوون، ﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، خـواش ستەمی لێنەکـردن، لـەو گەلـە پێشـووانە، کـە ئـاوا لـە بەیـن چـوون، ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، بەڵکـو خۆیـان ستەمیان لـە خۆیـان دەکـرد، ئەگەرنـا خـوا ﷻ لێـی ناوەشـێتەوە و شایسـتەی نیـە سـتەم بـکات، پێویسـتیشی بـە سـتەم نیـە، کەسـێك سـتەم دەکات کـە ئامانجێـکی هەبـێ لـە ڕێـی دادگەرییـەوە بـۆی نەیەتـە دی، بـە ناچاریـی ڕێـی زوڵمـی بـۆ بگرێتەبـەر، بـەڵام خـوا هیـچ ئامانجێـکی نیـە کـە لـە دەرەوەی خۆیـدا بیهێنێتـەدی:

**یەکەم:** خوا پێویستیی بە غەیری خۆی نیە.

**دووەم:** خوا ﷻ لێی ناوەشێتەوە و چاوەڕوانیی لێ ناکرێ ستەم بکات، چونکە زوڵم سیفەتێکی خراپە و ناتەواوییە و، خوای پەروەردگاریش هەرچی سیفەتی بەرزو جوانە هەیەتی، هەرچی ناوی چاك و پەسندە هەیەتی و، دوورە لە هەموو هەڵەو کەم و کوڕییەك.

ئنجـا ئەوانـە کـە سـتەمیان لـە خۆیـان کـرد بـوو، بـەڵای خوایـان بـۆ هـات، ﴿ فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ ﴾، خراپـەکانی کـە ئەنجامیـان دابـوون، تووشـیان بـوون، واتـە: سـزای خراپـەکانی کـە ئەنجامیـان دابـوون، دەرەنجامەکەیانیـان تـووش بـوو، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾، ئـەوەی کـە گاڵتەیـان پێدەکـرد، ئابڵووقـەی دان، دەوری دان، ئـەوەش کـە گاڵتەیـان پێدەکـرد بریتـی بـوو لـە هاتنـی سـزای خـوا، کـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەڕەشـەیان پـێ لـە کافرەکانی ڕۆژگاری خۆیـان دەکـرد، ئـەوە کـە گاڵتەیـان پـێ دەکـرد، هـەر ئەوەندەیـان زانی کـە گەمـارۆی داون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پەرسـتراوی هـەق و ڕاسـت، تەنیـا خوایـە، بـەڵام ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، دڵیـان نکووڵیـی لـە یەکتایـی خـوا دەکات و خـۆ بەزلگـرن، خـواش پەنهـان و ئاشـکرایان دەزانـێ و چـارەی خـۆ بەزلگرانیـشی نـاوێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١- ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾، پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، واتە: بەو بەڵگانەی کە ڕابردن، بەو هەموو شتانە کە باسکران، دەرکەوت کە پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، ئەویش خوایەﷻ، واتە: ئەو شتانەی کە ڕابردن لە ئایەتی یەك (١)ەوە، تاکو ئایەتی ژمارە بیست و یەك (٢١)، کە لە دوو دەرسی پێشوودا شیمان کردنەوە، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوە کە یەك کەس شایستەی پەرستنە، ئەویش خوایە ﷻ، چونکە هەر ئەو بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی هەموو چاکەو نیعمەتەکانە لە ژیانی ئێوەدا، بۆیە هەر ئەویش شایستەیە بەندایەتیی بۆ بکرێ و بپەرسترێ.

**(پەرسـتن)**: واتـە: ئەوپـەڕی خۆشویسـتن، ئەوپـەڕی بـە گەورەگرتـن، ئەوپـەڕی پشـت پـێ بەسـتن، ئەوپـەڕی مـل بـۆ کەچکـردن، ئەوپـەڕی بـە بـەرز گرتـن، ئەوانـە تەنیـا شایسـتەی خـوای پـەروەردگارن، لـە سـوورەتی **(الصافات)**یـش لـە ئایـەتی (٤)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ ﴾، واتـە: بێگومـان پەرسـتراوی ئێـوە یەکـە.

لێرەش دەفەرموێ: ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾، پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە.

ئایا حیکمەتی ئەو جیاوازییە چییە ؟!

چونکە ئەوەی سوورەتی (**الصافات**)، لە سەرەتای سوورەتەکەوەیە لە ئایەتی (٤)دا، بۆیە بە جەختکردنەوەوە فەرموویەتی: (بێگومان پەرستراوی ئێوە یەکێکە)، بەڵام لێرە - لە (**النحل** - ٢٢)دا - خوا لە بیست (٢٠) ئایەتی ڕابردوودا، زۆر باسی سیفەت و کردەوەکانی خۆی کردوە و، باسی نیعمەت و چاکەکانی خۆی کردوە لە ژیانی مرۆڤدا، بۆیە فەرموویەتی: (پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە)، یانی: ئەو پەرستراوەی ئەو شتانەی بۆ کردوون کە باسکران.

٢- ﴿ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، کە دڵیان نکووڵیلێکەرە، واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەر و کافرەکان لە ئەنجامی بێبڕواییاندا بە ڕۆژی دوایی، نکووڵیی دەکەن، نکووڵیی لەچی دەکەن؟ لە تەنیا پەرستراوێتیی خوا، لە خوا بە یەکگرتن (**توحید اللّه**)، (**الإِنْكارُ: الجُحُودُ وَعَدَمُ الإِقْرَار**)، (**إِنْكار**): بریتیە لە پێ لێنەنان و دان پێدانەهێنان و نکووڵیلێکردن.

٣- ﴿ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴾، هەروەها ئەوان خۆ بەزلگرن، ﴿ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴾، (**أَي: أَنَّ الإِستكْبارَ مُتَمَكِّنٌ فِيهِم**)، خۆ بەزلگریی زۆر لەواندا سیفەتێکی ڕۆچوویە، ئەوان خۆ بەزلگرن، واتە: خۆ بەزلگرتن لە بەرانبەر خوا و بەندایەتیی کردن بۆ خوادا و، لە بەرانبەر وەڵامدانەوەی پێغەمبەرانی خوادا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) لەوان دا بۆتە سیفەتێکی ڕۆچووی ڕیشەدار.

٤- ﴿ لَا جَرَمَ ﴾، واتە: (**حَقّاً**)، (**الجُرْمُ: القَطْعُ، قَطْعُ الثَّمَرَةِ عَنِ الشَّجَرِ، لاَ جَرَم: أَي حَقّاً، أو لاَ - لَيْسَ كَمَا تَقُولُونَ - قَطْعَاً**)، وشەی (**جَرْم**) بەوە دەگوترێ: کە میوە لە درەخت بکرێتەوە، واتە: چنینی میوە.

ئنجا ﴿ لَا جَرَمَ ﴾، واتە: (**حَقّاً**)، یانی: ئەو شتە ڕاستە، چەسپاوە.

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ لَا جَرَمَ ﴾، یانی: (لا)یەکە بۆ نەفی هەڵوێستێکی ئەوانە هی پێشێ، یانی: (**لاَ لَيْسَ كَمَا تَقُولُونَ**)، نا وانیە وەك ئێوە دەڵێن، (**جرم**)، یانی: بەدڵنیایی (**قَطْعاً**).

یان: ﴿ لَا جَرَمَ ﴾، یانی: بە دڵنیایی ئەو شتە ئاوایە.

٥- ﴿ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴾، خوا دەزانێ چی پەنهان دەکەن و چی ئاشکرا دەکەن، ئەمە بەپێی سیاق دەزانرێ مەبەست پێی چییە! بۆ بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوا دانەران، واتە: ئەوەی کە پەنهانی دەکەن لە گوناهو تاوان و شیرك، کە لە هەموو گوناهەکان گەورەترە، خوا

ئەوەش دەزانێ و، ئەوەی ئاشکراشی دەکەن، دیارە گوناهو تاوانەکان، لە پێش هەموووشیانەوە کوفر و شیرك و ئیلحاد و نیفاق، کە هەم جۆری پەنهانیان هەیە، کە تەنیا خاوەنەکەیان بۆخۆی دەزانێ و خەڵك هەستیان پێ ناکات و، جۆری ئاشکراشیان هەیە، خوا هەموویان دەزانێ.

٦- ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ﴾، بێگومان ئەو خۆ بەزلگرانی خۆش ناوێن، مانای ئەمە ئاوای لێ دێتەوە: (**إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الكُفَّارَ المُستكبِرِين، أَو المُشْرِكِينَ المُستكبِرِين**)، خوا بێبڕوایانی، یان هاوبەش دانەرانی خۆ بەزلگری خۆش ناوێن.

ئنجا ئەمە: بریتیە لە چەسپاندنی شتێك، چەسپاندنی حوکمێك بە بەڵگەکەیەوە، چونکە: خوا حەز بە چارەی خۆ بەزلگران نەکات و، بشتوانێ سزایان بدات، کەواتە: سزادرانیان مسۆگەرە.

هەروەها ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، کە خوا ﷻ مرۆڤەکانی بۆیە خوڵقاندوون: وابکەن خۆشی بوێن و ڕێزیان لێ بگرێ و، سۆزو بەزەیی خۆی و، کەرەم و بەخشندەیی خۆی لەگەڵیاندا بەکاربێنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ﴾، واتە: خوا ﷻ حەز بە چارەی خۆ بەزلگران ناکات، ئەگەرنا ئەگەر لەبەر خۆ بەزلگرییان نەبوایە، ئەگەر لەبەر کوفر و شیرك و، گوناهو تاوانیان نەبووایە، خوا دەیویست وابن کە خۆشی بوێن، چونکە خوا لە ئەصڵدا بۆیە خوڵقاندوونی، کە بەوجۆرەبن چاکەیان لەگەڵدا بکات، خوا حەزی دەکرد کە وابکەن خۆشویستراو بن، نەك بوغزێنراو، بەڵام خۆیان بەو شێوەیان لەخۆیان کردوە.

مەسەلەی دووەم:

بێبڕوایەکان ئەگەر لەبارەی قورئانەوە بدوێنرێن، دەڵێن: ئەفسانەی پێشینانە! بەڵام سەرەنجام گوناهی خۆیان، بە تەواویی و، هی ئەوانەش کە گومڕایان کردوون، بەشێکیان لە کۆڵ دەنێن و، هەڵدەگرن لە ڕۆژی دواییدا:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْۙ قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم ﴾، هەروەها ئەگەر پێیان گوترا، یانی: بەو بێبڕوا و هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی کە باسکران.

٢- ئەگەر پێیان گوترا و پرسیاریان لێکرا: ﴿ مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡ ﴾، پەروەردگارتان چی دابەزاندوە؟ دەڵێ: {(**ما**) **الإستفْهَامِية**، و (**ذا**) **إِسْمُ الإِشَارَة**)، (ما) بۆ پرسیارەو (ذا) بۆ ئاماژەیە، (**مَاذَا**)، یانی: (**مَا هو الَّذِي أَنْزَلَهُ رَبُّكُمْ**)، پەروەردگارتان، خاوەنتان چی دابەزاندوە؟ ئەوەی کە پەروەردگارتان دایبەزاندوە، چییە ؟

٣- دەڵێن چی؟ ﴿ قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، دەڵێن: ئەفسانەی پێشینانە، کە پێشتر باسمان کرد، (**أساطير**)، کۆی (**أُسطورة**)یە، ئەوەیان بەهێزترە، ئەفسانە بەسەرهاتێکە گێڕدراوەتەوە، بەڵام وەهم و خەیاڵ دروستی کردوە، حەقیقەتی نەبووە لەسەر ئەرزی واقیع، ئەوە پێی دەگوترێ ئەفسانە، واتە: ئەفسانەی پێشینانە.

هەندێکیش گوتوویانە: (**أَساطِير جَمْعُ أَسْطَار، وأَسطر، وَهُوَ جَمْعُ سَطْر**)، (**سَطْر**)، یانی: دێڕ، (**أَسْطَار**) و (**أسطر**)، یانی: دێڕەکان، واتە: ئەو شتانەی کە نووسراونەوە کاتی خۆی لە بەسەرهاتی پێشووان.

٤- ﴿ لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، با لە ڕۆژی دوایی دا، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، گوناهەکانی خۆیان بە تەواویی هەڵبگرن، لە ئەنجامی ئەو قسە و ڕەفتار و، ئەو بیر وبۆچوونانەیاندا، شایستەی ئەوەن کە گوناهەکانیان، قورساییەکانیان، بە تەواویی هەڵبگرن.

(أَوْزَار: جَمْعُ وِزْر، أَي ثِقْل: الذَّنْبُ وَالجُرْمُ الَّذِي يُثْقِلُ فَاعِلَهُ)، ئەو گوناهو تاوانەی کە باری شانی بکەرەکەی قورس دەکات.

٥- ﴿ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم ﴾، هەروەها بەشێك لە گوناهی ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن، واتە: هەمووی نا، بەشێکیان لێ هەڵدەگرن، ئنجا ئایا چۆنیان گومڕا دەکەن ؟

٦- ﴿ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، بەبێ زانیاریی، ئەمە (تَفْظِيعُ التَّضْلِيلِ لاَ تَقْيِيدُهُ)، ئەمە بۆ ئەوەیە کە گومڕاکردنەکە زۆر ناشیرین و ناقۆڵا بخرێتە بەرچاو، بۆ ئەوە نیە کە ئەگەر کەسێك بە زانیارییەوە خەڵك گومڕا بکات، قەیدێ نەکات، بەڵام لەبەرئەوەی بەبێ زانیاریی خەڵك گومڕا دەکەن، شتێکی خراپە! نا، بەڵکو ئەمە زیاتر بۆ ناقۆڵا و، ناشیرین دەرخستنی گومڕاکردنەکەیانە.

﴿ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾: ئەمە دوو واتای هەن:

**١/** (حَالٌ مِنْ ضَمِيرِ النَّصْبِ) فَالضالُّون يحسبُونَ إِضْلاَلَ المُضِلِّين لهم: نُصْحَاً!)، یانی: گومڕایەکان گومڕا کردنی گومڕاکەرەکان بۆیان، بە دڵسۆزیی و پەرۆشییان بۆیان دەزانن !

**٢/** یاخود: ﴿ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، بۆ بکەر (**فاعل**)ەکە دەچێتەوە، واتە: گومڕاکەرەکان ئەو خەڵکەی کە گومڕایان دەکەن، بەبێ زانیاریی گومڕایان دەکەن، واتە: بێئەوەی کە خۆیان بە ڕێی ڕاست بزانن، پێش خەڵك دەکەون بە ڕێی چەوت و لار و هەڵەدا و، بەبێ زانیاری پێش خەڵك دەکەون، یان گومڕاکراوەکان بێ زانیاریین و گومڕاکەرەکان نەزانیی و سادەیی و نەفامییان دەقۆزنەوە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الزخرف**) ئایەتی (٥٤)دا دەربارەی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ﴾، ( فَٱسْتَخَفَّ )، دوو واتای هەیە:

**یەکەم:** سووکی کردن، عەقڵی سوککردن، هەڵیخەڵەتاندن، ئەوانیش بەقسەیان کرد.

**دووەم:** تەماشای کرد سووکەڵەن، عەقڵ سووکن، ئەویش عەقڵ سووکیی ئەوانی ئیستیغلال کرد و گومڕای کردن.

٧- ﴿ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴾، ئاگادار بن! خراپترین شت کە هەڵیانگرتوە، ئەوەیە کە ئەوان هەڵیانگرتوە، کە گوناهەکانی خۆیانە بە تەواویی و، بەشێکیش لە گوناهی ئەوانەی کە نەزانانە گومڕایان دەکەن، نەزانانە بە نسبەت گومڕاکراوەکانەوە، نەزانیی و نەفامیی و بێ ئاگاییان بە هەل و دەرفەت زانیون، یاخود نەزانانە یانی: گومڕاکەرەکان نەزانانە پێش خەڵك دەکەون و خەڵك گومڕا دەکەن.

لە سوورەتی (**العنكبوت**)یشدا هەمان مەبەست هاتوە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣﴾﴾.

واتە: ئەوانەی بێبڕوان بەوانەیان گوت کە بڕوادارن: شوێن ڕێبازی ئێمە بکەون با هەڵەکانتان، گوناهەکانتان بۆ هەڵبگرین، گوناهەکانیشیان لێ هەڵناگرن، هیچ لە گوناهی ئەوان هەڵناگرن و ئەوان درۆ دەکەن، بەڵکو قورساییەکانی خۆیان هەڵدەگرن و وێڕای قورساییەکانی خۆیان، قورسایی ئەوانەش کە گومڕایان کردوون، هەڵدەگرن، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا لێیان دەپرسرێتەوە لەوەی کە بە درۆ دەیلێن.

## وەڵامدانەوەی پرسیارێك :

لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ وَمَا ﴾، دواییش دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ ﴾، ئایا لە نێوانیاندا تێكگیران نیە؟ دەڵێین: نەخێر چونكە ئەوان دەیانگوت: گوناهەكانتان لێ هەڵدەگرین، یانی: گوناهەكانتان لە كۆڵ دەكەینەوە، هەموویان لە كۆڵی دەنێین، خواش دەفەرموێ: ڕاست ناكەن، گوناهەكانیان لە كۆڵ ناكەنەوە و نایخەنە سەر كۆڵی خۆیان، ئایەتەكەی دوای ئەویش دەفەرموێ: گومڕاكەرەكان، گوناهەكانی خۆیان، قورساییەكانی خۆیان هەڵدەگرن و لەگەڵ قورسایی خۆیان و گوناهی خۆیان، گوناهی دیكەش هەڵدەگرن، واتە: هی ئەوانەی كە گومڕایان دەكەن، بەڵام بەبێ ئەوەی كە لە گوناهی ئەوان كەم بێتەوە، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، دەفەرموێ: {**مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنة حَسَنة، فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدَه مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنة سَيِّئَةً، كانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ**}، (**أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٠١٧**).

ئەم فەرمایشتە چەمك و واتای ئایەتە بە پێزەكان زیاتر دەردەخات، دەفەرموێ:

هەر كەسێك لە ئیسلامدا ڕێیەكی باش دابڕێژێ، كردەوەیەكی باش ئەنجام بدات، ئەوە پاداشتی ئەو كردەوە چاكەی هەیە و، پاداشتی هەر كەسێكیش كە لە دوای وی ئیش بەو كردەوە چاكە بكات و بەو ڕێیەدا بڕوات، پاداشتی ئەویشی هەیە، واتە: لە پاداشتی ئەویشدا بەشدارە، بێ ئەوەی كە لە پاداشتی خۆیان كەمبێتەوە، (یانی: ئەوانەی كە دوایی چاكەكە ئەنجام دەدەن، با چاویشیان لەو بێ و بەهۆی ئەوەوە ئەو چاكەیە بكەن، بەڵام ئەوانیش پاداشتی خۆیان بەتەواویی هەیە، بەڵام ئەو كەسەش كە ڕەنگەكەی ڕشتوە و ڕێیە چاكەكەی داناوە، لە پاداشتی ئەواندا بەشدارە و بە قەدەر ئەوان پاداشتی هەیە، بەڵام ئەوانیش پاداشتی خۆیان هەر لە جێی خۆیەتی)، هەروەها هەر كەسێك لە ئیسلامدا ڕێیەكی خراپ دابنێ، كردەوەیەكی خراپ ئەنجام بدات، گوناهی ئەو كردەوە خراپە لەسەر خۆیەتی و، گوناهی هەركەسێكیش كە كار بەو كردەوە خراپە بكات و، بەو ڕێیە خراپەدا بڕوات، بەبێ ئەوەی كە لە گوناهی ئەنجامدەرانی خراپەكە كەم بێتەوە.

ئەم ڕستەیە: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡ ﴾، ئەگەر پێیان گوترا: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە؟ ئەمەی لێوەردەگیرێ كە كاتێ خۆی كافرەكان لەبارەی قورئانەوە لە

پێغەمبەر ﷺیان پرسیوە و لێیان کۆڵیوەتەوە، ئنجا لەوبارەوە، فەرموودەیەك دێنین كە بوخاریی دەیهێنێ لە (أبو ذر)ەوە، دەفەرموێ:

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مِنْ غِفَارٍ فَبَلَغَنا أَنَّ رَجُلاً قَدْ خَرَجَ بِمَكة يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، فَقُلْتُ لأَخِي (أُنَيس) انْطَلِقْ إِلَى هَذَا الرَّجُلِ كَلِّمْهُ وَأْتِنِي بِخَبَرِهِ، فَانْطَلَقَ فَلَقِيَهُ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقُلْتُ: مَا عِنْدَكَ؟ فَقَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ رَجُلاً يأمُرُ بالْخَيْرِ وَيَنْهَى عَنْ الشَّرِّ، فَقُلْتُ لَهُ: لَمْ تَشْفِنِي مِنَ الْخَبَرِ، فَأَخَذْتُ جِرَابا وَعَصَاً، ثُمَّ أَقْبَلْتُ إِلَى مَكة فَجَعَلْتُ لاَ أَعْرِفُهُ وَأَكرهُ أَنْ أَسالَ عَنْهُ، وَأَشْرَبُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ، وَأَكُونُ فِي الْمَسْجِدِ...} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٣٢٨).

واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: من پیاوێك بووم لە هۆزی غیفار، پێمان گەیشت كە پیاوێك لە مەككە پەیدا بووە، پێی وایە كە پێغەمبەرە، بە (ئونەیس)ی برام گوت: بچۆ ئەم پیاوەم بۆ ببینەوە و قسەی لەگەڵدا بكەو هەواڵەكەم بۆ بێنەوە، چو و پێی گەیشت و گەڕایەوە، گوتم: هەواڵی چیت لە لایە؟ گوتی: سوێند بە خوا پیاوێكم بینی فەرمانی بە چاكە دەكرد و بە خەڵكی دەگوت: چاكە بڵێن و، ڕێشیی لێدەگرتن لە خراپە (هەر ئەوەندە)، منیش گوتم: هەواڵەكەت بە تەواویی بۆ نەهێنامەوە، منیش جەواڵێكم هەڵگرت، (دیارە خورجێنێك، توورەگەیەك، شتێك بووە، خۆراكی تێدابووە) و گۆچانێكیشم پێ بوو، دوایی بەرەو مەككە چووم، بەڵام من ئەوم نەدەناسی، (موحەممەدم ﷺ نەدەناسی)، پێشم خۆشنەبوو لە خەڵك بپرسم، بۆیە لە مزگەوت مامەوە و لە ئاوی زەمزەمم دەخواردەوە و، لە مزگەوت دابووم، دوایی درێژەی بەسەرهاتەكەی باس دەكات كە چۆن پێغەمبەری خوای ﷺ ناسیوە و مسوڵمان بووە.

كەواتە: عەرەبەكان لێیان كۆڵیوەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ كێیە؟ چی دەڵێ؟ چۆن دەڵێ؟ قورەیشییەكان ناسیویانە، بەڵام خەڵكی دیكە غەیری قورەیش، هاتوون پەیسەریان كردوە و سۆراغیان كردوە.

### مەسەلەی سێیەم:

کافـرانی پێشـووش پیلانیـان گێـڕا لـە دژی پێغەمبـەران (عَلَیْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) و پەیامـەکانی خـوا، بـەڵام خـوا پیلانەکەیـان لـە بیخـەوە هێنـاو بەسـەریاندا ڕمـا، لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا، خـوا ڕیسـوایان دەکات و، کاتێـك لەبـارەی پەرسـتراوەکانیان لێیـان دەپرسـێ: کـوان؟ لـە کوێـن؟ زانایـان وەڵام دەدەنـەوە: کـە ئەمـڕۆ بێبڕوایـان بـەس ڕیسـوایی و شـەرمەزارییان پێبـڕاوە:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَـٰٓقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١- خوا ﷻ بۆ بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و سەرجەم ڕۆژگارەکانی دیکە، تاکو دنیا کۆتایی دێ، باسی ئەزموونی بێ ئاکامی کافرانی پێش خۆیانیان بۆ دەکات، کە وا مەزانن هەر ئێوە دژایەتیی پێغەمبەری خاتەمتان ﷺ کردوە و، بەرەنگاری پەیامە نوورانییەکەی بوونەتەوە، بەڵکو کافرانی پێش ئێوەش هەر ئەوە عادەتیان بووە، بەڵام تەماشا بکەن سەرەنجامیان چۆن بووە ؟!

﴿ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، بەدڵنیایـی ئەوانـەی پێـش وانیـش پیلانیـان گێـڕا، (مَکْر) بـە مانـای: (فێـڵ، پیـلان، هەڵخەڵەتانـدن، فریـودان) دێ، ئنجـا ئایـا چییـان کـردوە تاکـو خـوا نـاوی لێبنـێ پیـلان ؟! زانایـان دەڵێـن: (عُـدَّ إِضْلاَلُهُـمْ لأَتْباعِهِـمْ مَکراً، إِذ سَـمّوا القُـرْآنَ أَسـاطِيرَ وَهُـمْ يَعْلَمُـونَ أَنَّـهُ لَيْـسَ كَذَلِـكَ !).

بۆیـە کردەوەکەیـان ناونـراوە (مَکـر)، چونکـە هەوڵیانـداوە شـوێنکەوتوەکانیان گومـڕا بکەن، ئەویـش بـەوە کـە وایـان بـۆ وێنـا کـردوون: قورئـان ئەفسـانەی پێشـینانە، کـە زانیویشـیانە وانیـە! ئنجـا ئـەو کردەوەیـان بـە مەکـر و پیـلان و فێـڵ ناوزەنـد کـراوە و هەرواشـە.

٢- ﴿ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ ﴾، خوا خانووەکانیانی لە ڕیشەوە هێنان، (**القَوَاعِدُ: الأُسُسُ والأَسَاطِين الّتِي تُجْعَلُ عُمُداً للبناءِ يُقَامُ عَلَيْهَا السَّقْفُ**)، (**قَوَاعِد**) ئەو بناغە و، کۆڵەکانەن کە دەکرێن بە بناغە و دیوار و سەقفەکە لەسەریان دەوەستێ، ﴿ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ ﴾ واتە: خوا خانووەکانیانی لە بناغەوە ڕووخاندن، کە ئەوە لە شوێنی دیکەشدا هاتوە، خوا لە ئایەتی ژمارە (٢)ی سوورەتی (**الحشر**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْ ﴾، واتە: خوا لە شوێنێکەوە، لەلایەکەوە بۆیان هات، کە بە خەیاڵیاندا نەدەهات و حیسابیان بۆ نەکرد بوو !

ئنجا بێگومان بینایەك بناغەکەی و پایەکانی کە لەسەریان وەستاوە، بڕووخێن، دیارە ئەو بینایەش هەرەس دێنێ، بۆیە دەفەرموێ:

٣- ﴿ فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ مِن فَوۡقِهِمۡ ﴾، یەکسەر لە سەروویانەوە سەربانەکە بەسەریاندا ڕما، (**خَرَّ: سَقَطَ مَعَ صَوْتِ الخرُورِ**)، (**خرور**) بە خوڕەی ئاو دەگوترێ، بە کوردیی پێی دەڵێن: خوڕەی ئاو، هەروەها وشەی (با)، ئنجا شتێك لە سەرەوە بەربدرێتەوە بۆ خوارێ، چۆن وشەی دێ، کاتێ بینایەکەیان بەسەریان دا ڕما، دەنگێکی ئاواشی لێهات.

کە بە دڵنیاییەوە لێرەدا مەبەست کۆڵەکە و پایە و سەربان و دیوار ڕووخان و... هتد، نیە، بەڵکو ئەوە هەمووی وێناکردن (**تصویر**)ە، واتە: وەك چۆن کەسێك خانوویەکی هەبێت، ئنجا تۆ بێنیی بناغەکەی بڕووخێنی، بێگومان دیوار و سەربانەکەی بەسەریدا دەڕمێ! خواش ئاوای بەسەر پیلان و فێڵەکانیان هێنا، کە لە بیخەوە هەڵیکەند !

٤- ﴿ وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، سزاو ئازاریان بۆ هات لەلایەکەوە، کە هەستیان پێ نەدەکرد، واتە: کتوپڕ بەسەریاندا هات! یان لە شوێنێکەوە ئەو بەڵایەیان بەسەرهات، کە ئەسڵەن ئەگەریان بۆ دانەنابوو لەو شوێنەوە سزایان بۆ بێ !

ئەوە بەنسبەت ژیانی دنیایانەوە.

٥- ﴿ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَـٰمَةِ يُخۡزِيهِمۡ ﴾، ئنجا ڕۆژی هەڵسانەوەش خوا ﷻ ڕیسوا و زەبوونیان دەکات، (**الخِزْيُ: الإِهَانَة وَالتَحْقِير**)، (**خزي**) بە کەم تەماشاکردن و ڕیسوا کردنە.

٦- ﴿وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَٰقُّونَ فِيهِمْ﴾، (خوا) پێیان دەفەرموێ: (بێگومان لە ڕێگای فریشتەکانەوە، ئەگەرنا وەك خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿... وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ..﴿٧٧﴾﴾ آل عمران، خوا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات و نە سەرنجیان دەدات، چونکە لەوە کەمترن خوا بیاندوێنێ! بەڵام لە ڕێگای فریشتەکانەوە فریشتەکان ڕادەسپێرێ پێیان دەفەرموێ:) ﴿أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَٰقُّونَ فِيهِمْ﴾، کوان ئەو هاوبەشانەم، کە ئێوە لەواندا مشتومڕتان دەکرد، ناکۆکییتان هەبوو.

(شُرَكَآءِىَ) هاوبەشەکانم، دیارە بەپێی گومانی ئەوان (حَسْبَ ظَنِّهِم)، چونکە خوا هاوبەشی نین، واتە: کوان ئەو هاوبەشانەم کە ئێوە پێتان وابوو هاوبەشی منن ؟! ﴿تُشَٰقُّونَ فِيهِمْ﴾، ئەوە بە دوو جۆر خوێنراوەتەوە:

١/ (تُشَٰقُّونَ فِيهِمْ: أَي تُخَالِفُون وَتُعَانِدُون)، واتە: لەواندا سەرپێچییتان لە پێغەمبەران دەکرد و، کەللە ڕەقییتان دەنواند، دەستتان پێوە دەگرتن و ئەوانتان دەپەرست !.

٢/ هەروەها بەم شێوەیەش خوێنراوەتەوە: (تُشَاقُّونِ[1] فِيْهِم) واتە: دژایەتیی و ناکۆکییتان لەگەڵ من دا دەکرد لەسەر ئەوان! واتە: دژایەتیی و سەرپێچیی خواتان دەکرد، بە قازانجی ئەو پەرستراوانەی بە هاوبەشی خواتان دادەنان !

لێرەدا باسی وەڵامی ئەوان ناکات، بەڵام دەفەرموێ:

٧- ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾، ئەوانەی زانیارییان پێدراوە گوتیان، واتە: ئەوانەی کە شارەزان لە ئایین و بەرنامەی خوا، چونکە لەو مەقامەدا، مەگەر ئەوان وەڵام بدەنەوە، ئەگەر نا ئەوانەی سەراسیمە و سەرگەردانن، وەك گوتراوە: (زاریان دەبێتە تەڵەی تەقیو!) هیچیان بۆ ناگوترێ، بەڵام ئەوانەی زانیارییان پێدراوە گوتیان:

٨- ﴿إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، بێگومان ئەمڕۆ هەرچی زەبوونیی و سەرشۆڕیی و، هەرچی خراپیی هەیە، لەسەر کافرانە، (أَي: كُلُّ مَا يُوجَدُ مِنَ الخِزْيِ، وَالسُّوءِ فَهُوَ عَلَى هَؤلاءِ الكُفَّار)، واتە: هەرچی زەبوونیی و سەرشۆڕیی هەیە لە ڕووی مەعنەوییەوە و، هەرچی خراپیی هەیە لە ڕووی جەستەییەوە، واتە: هەم سزا مەعنەوییەکە کە بریتیە لە زەبوونیی و سەرشۆڕیی، هەم سزا جەستەییەکە کە بریتیە لە حاڵ خراپیی و جەزرەبە و ئەشکەنجە، هەمووی لەسەر بێبڕوایانە.

---

(١) (تُشاقُّونِ) لە ئەسڵ دا (تُشاقُّوني)یەو (ي) کە قرتێنراوە.

٩- ﴿عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، کە لێرەدا (ال)ی سەر (**الكافرين**) کە بۆ ناساندن (**تعريف**)ە، (ال)ی (**عَهْدَ**)ە، بۆ تەعریفی عەهدییە، واتە: ئەو کافرانەی کە لەوەو پێش قسەیان لەسەرکرا، کە لە زمانی کوردیی دا بەرانبەر بەم (**ال**)ە، وشەی (کە)ی ناسراوی دەکەوێتە بەرانبەر، بۆ نموونە: کاتێ دەڵێم: کتێبم بۆ بێنە، نازانرێ کام کتێب دەڵێم، بەڵام کە گوتم: کتێبەکەم بۆ بێنە، واتە: ئەو کتێبەی خۆمان دەزانین، ئەگەر بڵێی (**جِئنِي بالكِتَابَ**) واتە: کتێبەکەم بۆ بێنە، ئەو کتێبەی کە خۆمان دەزانین، بەڵام کە گوتم: (**جِئنِي بكِتَابٍ**)، واتە: کتێبێکم بۆ بێنە، لێرەدا نازانرێ کامەیە، ئەگەر (**ال**)ی چووە سەر دەناسرێ، کە لە کوردییدا دەچێتە بەرانبەر: (کە).

## مەسەلەی چوارەم:

**ئەوانـەی سـتەمیان لـە خۆیـان کـردوە و فریشـتەکان گیانیـان دەکێشـن، لـەو کاتـەدا تەسـلیم دەبـن و، نکووڵیـی لـە خراپەکانیـان دەکـەن، بـەڵام خـوا پێیـان زانایـە و پێیـان دەگوتـرێ: بچنـە دەروازەکانی دۆزەخـەوە، ئـەوێ جێـی خـۆ بەزلگرانـە، یـانی: شـوێنی تێدا حەوانەوەیـان ئەگـەر هەبـێ ئەویـە:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡۖ فَأَلۡقَوُاْ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعۡمَلُ مِن سُوٓءِۭۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾، ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن، لە حاڵێکدا ستەمیان لە خۆیان کردوە، (تَتَوَفَّىٰهُمُ ) بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە:

١/ (**تَتَوفَّاهُم**) ئەمە زۆربەیان وایان خوێندۆتەوە.

٢/ بەڵام (**حَمْزَة وَخَلَف**) بە (**يَتوفَّاهُم**) خوێندوویانەتەوە.

ئەوانـەی فریشـتەکان گیانیـان دەکێشـن، (**وَفَاة**)یـش ئەوەیـە شـتێك بـە تەواویـی وەربگیرێ، واتـە: گیانەکانیـان لـە جەسـتەیان وەردەگـرن، (ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ ) لـە حاڵێکـدا کـە سـتەمیان لـە خۆیـان کـردوە، هەنـدێ لـە مانـا لێکـدەرەوانی قورئـان گوتوویانـە: ئـەم ( ٱلَّذِينَ )ە، (**بَـدَل**) بـۆ (**الكافريـن**) کـە لـە ئایـەتی پێشـوودا هـات، بـەڵام هەرچەنـدە ئـەوە لـە ڕووی زمـانی عەرەبییەوە گونجـاوە، بـەڵام وا ڕاسـتتر دێتـە بەرچـاو، کـە ڕسـتەیەکی سـەربەخۆ بـێ، واتـە: ئەمـە قسـەی (ئەوانـەی زانیارییـان دراوەتـێ)، ﴿ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ﴾نیـە، پێشـتر قسـەکەیان تـەواو بـوو، کـە گوتیـان: ﴿ إِنَّ ٱلۡخِزۡيَ ٱلۡيَوۡمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، بەڵام: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾، ئـەوە وەك لـە زمـانی عـەرەبی دا دەڵـێ: (**جُمْلَـةٌ إِسـتئنافية**)یە، ڕسـتەیەکە کە دەسـت پـێ دەکات، نـەك تەواوکـەری ڕسـتەی پێشـوو بێـت.

٢- ﴿ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ ﴾، ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن لە حاڵێكدا كە ستەمیان لە خۆیان كردوە: ملكەچییان پێشاندا (ملكەچییان فڕێدا)، (الإلقاء) واتە: فڕێدان و هەڵدانی شتێك، بەڵام ئەو وشەیە بۆیە بەكارهاتوە، وەك چۆن كەسێك كە لە بەرانبەر دوژمنێكدا پێی ناوێرێ و، تەسلیم دەبێ، چەكەكەی بۆ فڕێ دەدا، كاتێك بەرانبەرەكەی دەڵێ: چەكەكەت دانێ! ئەوانیش ئاوا تەسلیم و گەردن كەچ دەبن، (**الإِلْقَاءُ: مُستعَارٌ لإِظْهَارِ الذُّلِّ وَشُبِّهَ بِإِلْقَاءِ السَّلَاحِ**)، وشەی: (**الإِلْقَاء**) خوازراوەتەوە بۆ پێشاندانی ملكەچیی و چوێنراوە بە فڕێدانی چەكەوە، لە بەرانبەر كەسێكدا كە ناتوانێ بەرهەڵستیی و بەرەنگاریی بكات، ئنجا كە ملكەچیی پێشان دەدەن دەڵێن:

٣- ﴿ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍ ﴾، هیچ خراپەیەكمان نەدەكرد، واتە: ئێمە لە دنیادا هیچ خراپەیەكمان نەكردوە، كە بێگومان قسەكەیان درۆیە.

ئنجا ئایا كە ئەو درۆیە دەكەن، لە ترسان و لە حەژمەتان ئەو درۆیە دەكەن و، پێیان وایە درۆ لە فریایان دێت؟ یاخود ئەو قەناعەتە هەڵانەی كە پێیان بوون، كە لە دنیادا كردەوەكانی خۆیان و ڕێبازو ڕێچكە پووچەكانی خۆیان و، هەڵوێست و ڕەفتارە ناشەرعیی و پووچەكانی خۆیانیان بە باش زانیون، ئەو قەناعەتەیان هەر پێ دەمێنێت تاكو قیامەتیش و، پێیان وایە كە لەسەر ڕێیەكی ڕاست بوون و، پێیان وایە كە كاری باشیان كردوە ؟!

هەردوو ئەگەرەكە هەن، چونكە خوا ﷻ كە باسی بێ بڕوایان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ ...﴿٢٤﴾ ﴾النمل، واتە: شەیتان كردەوەكانی بۆ جوان كرد بوون، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴿٨﴾ ﴾فاطر، واتە: ئایا كەسێ كە كردەوە خراپەكەی بۆ ڕازێنراوەتەوە و، بە چاكیی بینیوە (كە بێبڕوایانن)، واتە: هەم دەگونجێ بزانن كردەوەكان خراپ بوون، بەڵام درۆ بكەن، هەم دەشگونجێ ئەو قەناعەت و بیروبۆچوونە هەڵانەی كە لە دنیادا بوویانن و، ئامادە نەبوون بێن بیانخەنە پێوەر و تەرازووی شەریعەتەوە، بەڵكو سواری سەری خۆیان بوون و عەقڵ و بۆچوونی خۆیان زۆر پێ ڕاستبووە، بەبێ ئەوەی كە بێنن لە مەحەكی شەریعەت و هەڵسەنگاندنی بدەن، هەندێ كەس هەیە هێندێ قەناعەتی هەڵە و پەڵەی بۆ دروست دەبێ، ئیدی ئاوا لەسەری دەڕوا و لەسەری بەردەوام دەبێ، پێیەوە دەژی و پێشییەوە دەمرێت و، دەشگونجێ پێشیانەوە زیندوو و ببێتەوە !

ئنجا کە دەڵێن: ﴿ مَا كُنَّا نَعۡمَلُ مِن سُوٓءِۭ ﴾، ئەو (مِن)ە، کە چۆتە سەر (سُوٓءِۭ) واتە: هیچ جۆرە خراپەیەکمان نەکردوە، نەك خراپەمان نەکردوە! واتە: هەر کەم و زۆر خراپەمان نەکردوە، ئەوەیە دەڵێ: (ئەگەر مرۆڤ هەر درۆ بکات، درۆیەکی وا بکات کە شایستەی ئەوە بێ پێی بگوترێ: درۆ).

٤- ئنجا وەڵامیان دەدرێتەوە: ﴿ بَلَىٰٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٢٨ ﴾، با، بێگومان خوا زانایە بەوەی دەتانکرد، واتە: بەڵێ خراپەتان کردوە، بێگومان ئەوە وەڵامی فریشتەکانە بۆ ئەوان.

با، ئێوە ڕاست ناکەن کە دەڵێن: هیچ خراپەیەکمان نەکردوە، چونکە بێگومان خوا زانایە و، خوا پەنهان و ئاشکرا دەزانێ و دەزانێ ئێوە چیتان دەکرد.

٥- ﴿ فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ ﴾، ئێستاش بچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخەوە، کە بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، یانی: بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوە.

٦- ﴿ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٢٩ ﴾، بە دڵنیاییەوە خراپترین شوێن، شوێنی خۆبەزلگرانە، (المَثْوَى: المَرْجِع، ثَوَى بالمَكانِ: استقَرَّ وَأَقَامَ)، (مَثْوَى) شوێنی بۆ لاگەڕانەوەیە و ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ تێیدا دەمێنێتەوە.

خوا لە سوورەتی (**الزمر**)دا، دەفەرموێ: ﴿ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٢ ﴾، واتە: پێیان گوترا: بچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخەوە و، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، خراپترین شوێنی تێدا مانەوە، شوێنی تێیدا مانەوەی خۆ بە زلگرانە.

هەروەها لە سوورەتی (**غافر**)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٦ ﴾.

## وەڵامدانەوەی پرسیارێك :

بۆچی لەو دوو شوێنەی دیکەدا هەر گوتراوە: ﴿فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾، بەڵام لە سووڕەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾؟

ئەم (ل)ە هەندێ لە زانایان دەڵێن: (ل)ی سوێند خواردن (لامُ القَسَمَ)ەو، هەندێك دەڵێن: (مُمَهِّدَةٌ لِلْقَسَم) لامی زەمینە خۆشكەرە بۆ سوێند خواردن، گرنگ ئەوەیە جەختكردن و داكۆكیكردن و تۆخكردنەوەی ئەو مەبەستە دەگەیەنێ.

(الخَطِيبُ الإِسْكَافِي) لە كتێبەكەی خۆی (درة التنزيل، وغُرَّة التأويل)دا[1]، باسی ئەو مەسەلەیە دەكات دەڵێ:

{حیكمەتەكەی ئەوەیە كە لە دوو ئایەتەكەی سووڕەتی (الزمر) و (غافر)دا، تەنیا باسی كردەوەكەی خۆیان كراوە، هی ئەو بێبڕوا خۆ بە زلگرانە! بەڵام لێرە لە سووڕەتی (النحل)دا، باسی كردەوەی خراپی خۆیان و باسی گومڕاكردنیشیان بۆ خەڵكیش كراوە، واتە: لێرە باسی: (ضَلَال وَإِضْلَال)یش كراوە، كە هەم خۆیان گومڕان، هەم خەڵكیشیان گومڕا كردوە، بۆیە ئەو (ل)ەی چۆتە سەر، بەڵام لە دوو شوێنەكانی دیكە، تەنیا باسی كردەوەكانی خۆیان كراوە، واتە: لەوێ شەڕ و خراپەكەیان كورت (قاصِرْ)ە و، تەنیا لە خۆیاندا كورت هەڵاتوە، بەڵام لێرە خراپەكانیان تێپەڕ (مُتَعَدِّي)ە، واتە: لە خۆیان بەولاوەتر چووە و، جگە لە خۆشیانی گرتۆتەوە، بۆیە خوا ﷻ لێرە ئەو (ل)ە خستۆتە سەر (بِئْسَ)، (فَلَبِئْسَ)، مسۆگەر لە قورئاندا یەك پیتیش بە بێ حیساب و كیتاب دانەنراوە و لانەبراوە و زیادنەكراوە !

سبحان اللّە! ئینسان تا زیاتر لە قورئان ورد بێتەوە، باشتر تێدەگات فەرمایشتی خوا چەند وردە! چەند پڕ نهێنییە! وەك لە سووڕەتی (شوری)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ﴿١٧﴾﴾، ئەو خوایەی كتێبی دابەزاند بە هەق و تەرازووش، وشەی (المِيزَان) دەگونجێ بە سەر(فتحة) بخوێنرێتەوە، واتە: (وأنزَلَ المِيزان) تەرازووشی لەگەڵ دابەزاندوە، دەشگونجێ (والمِيزانِ) بە ژێر (كسرة) بخوێنرێتەوە[2]، واتە: بە هەق و بە تەرازوو دایبەزاندوە، كە بێگومان قورئان هەم تەرازووشی لە نێو خۆیدا هەیە، هەم بە تەرازووش دابەزێنراوەو، هەر وشەو پیتێكی لە جێی خۆی دایە.

---

(١) ص ١٨٥.

(٢) لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە هەردووك واتایەكان هەڵدەگرێ، بەڵام لە ڕووی خوێندنەوەكان (قراءات)ەوە، تەنیا هی یەكەمیان هاتوە.

### مەسەلەی پێنجەم:

**کاتێك پرسیار لە پارێزکاران دەکرێ: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە؟ دەڵێن: باشترین بەرنامە، خواش دەفەرموێ: پاداشتی چاکەکاران چاکەیە و، مەنزڵگای دواڕۆژیش باشترە بۆ پارێزکارانێك کە فریشتەکان بە پاکیی و چاکیی، گیانیان دەکێشن و سڵاویان لێ دەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا خَيْرًا لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ كَذَٰلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١- ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾، بەوانەی پارێزییان کردوە (پارێزکار بوون و، خۆیان پاراستوە لە هەرچی خوا پێی ناخۆشە! کە چواندنی ئەرکەکان و شکاندنی قەدەغەکانە)، پێیان گوترا: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە، چ پەیامێك و بەرنامەیەکی دابەزاندوە؟!

٢- ﴿قَالُوا خَيْرًا﴾، گوتیان: باشترین شتی دابەزاندوە، (**أَي: أَنْزَلَ خَيْراً مُطْلَقاً**)، (**خَيْراً**) کە (**مَنْصُوب**)ە (**أَي: أَنْزَلَ خَيْراً**)، (**خَيْر**)یش، (**صِيغَة التَفْضِيل**)ە، بە مانای (**أَخْيَرَ**)، وەك چۆن (**شَرّ**)یش (**صِيغَةَ التفضيلَ**) واتە: خراپتر (**أشَرَّ**)، واتە: خوا چاکترین شتی دابەزاندوە، چاکترین بەرنامە و، کتێبی دابەزاندوە بۆ مرۆڤەکان.

جێی سەرنج ئەوەیە کە لێرەدا، پارێزکاران دەڵێن: (**خیراً**)، بەڵام وەڵامی کافر و بێبڕوایەکان بە جۆرێکی دیکەیە: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾﴾النحل، کاتێك پێیان گوترا: پەروەردگارتان چی دابەزاندوە ؟! گوتیان: ئەوە ئەفسانەی پێشینانە! تەماشا بکەن نەیانگوت: (**أَساطيرَ الأَوَّلين**)، واتە: (**أَساطيرُ الأَوَّلينَ**)، بە حاڵەتی (**رفع**) هاتوە، نەك بە حاڵەتی (**نَصْب**)، تاکو ببێتە بەرکار (**مفعول بە**)ی (**أنزل**)، چونکە ئەگەر وایانگوتبایە مانای وابوو، ددان بەوە دادەنێن کە خوا شتی دابەزاندوە! ﴿قَالُوا أَسَاطِيرُ

﴿ٱلۡأَوَّلِينَ﴾، یانی: (هو أَساطِيرُ الأَوَّلِين) واته: خوا داینەبەزاندوە، بەڵکو ئەفسانەی پێشینانه، یانی: ئەگەر بیانگوتبایه: (أَساطيرَ الأَوَّلِين)، یانی: (أَنزلَ أَساطيرَ الأَوَّلِين)، بەلام بە (رفع) هاتوه، کە دەبێتە گوزاره (خبر) بۆ نیهادێکی قرتێنراو (مُبْتَدَإٍ مَحْذُوف)، واته: (هُوَ أَساطيرُ الأَوَّلين) ئەو ئەفسانەی پێشینانه، یانی: خوا داینەبەزاندوە، چونکە ئەگەر دان بەوە دابێنن خوا دایبەزێنێ و لە خواوە بێ، نابێت بە ئەفسانەی پێشینانی لە قەڵەم بدەن.

٣- ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۚ﴾، ئەمە ڕستەیەکی دەستپێکەرە (جملة إستئنافية)یە، یانی: بۆ ئەوانەی لەم ژیانەدا چاکەیان کردوە، چاکە هەیە، واته: لە ژیانی دنیادا چاکە هەیە، (الحَياةُ الطَّيِّبة المَادِية وَالمَعْنَوية)، واته: ژیانی پاك و چاکی دنیایی هەیە، لە ڕووی مەعنەویی و جەستەییەوە، وەك دواتر زیاتر چەمکی ژیانی پاك و چاکی دنیا شی دەکەینەوە.

٤- ﴿وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞۚ﴾، مەنزڵگای دواڕۆژیش باشترە، (باشترە) بەرانبەرەکەی دیاریی نەکردوە، بۆ وێنە: نەیفەرموە: (خَيرٌ مِنَ الدُّنيا)، بۆچی ؟! چونکە باشترە بە ڕەهایی، تەنیا ئەوەندە نیە کە لە ژیانی دنیا باشترە، بەڵکو بە ڕەهایی باشترە، وەك لە بانگدا دەڵێین: (أللهُ أكْبَر) خوا گەورەترە، بەرانبەرەکەی باس ناکەین لە چیی گەورەترە، چونکە خوا لە هەرچی بە تەصەووڕ و مێشکت دا دێت گەورەترە، خوا بە ڕەهایی گەورەترە، نەك بەراوردی پێ بکەی لەگەڵ جگە لە خۆی دا، چونکە جگە لە خۆی تەنها دروستکراوەکانی.

٥- ﴿وَلَنِعۡمَ دَارُ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾، باشترین مەنزڵگاش، مەنزڵگای پارێزکارانە، ئاوای لێدێتەوە: (وَلَنِعْمَ الدَّارُ، دَارُ المُتَّقين، وَلَنِعْمَ دَارُ المُتَّقِين، دَارُ الأَخِرَة)، باشترین مەنزڵگا مەنزڵگای پارێزکارانە، مەنزڵگای دواڕۆژ.

شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: (نِعْمَ: فِعْلُ مَدْحٍ غَيْرُ مُنْصَرِفٍ، وَمَرْفُوعُهُ فَاعِلٌ، دَالٌّ عَلَى جِنْسِ المَمْدُوحِ، وَيُذْكَر بَعْدَهُ مَرْفُوعٌ آخَر، يُسَمَّى المَخْصُوص بالمَدْحِ، وَهُوَ مُبْتَدَأٌ مَحْذُوف الخَبَرِ أَو خَبَرُ مُحْذَوفُ المُبْتَدَأ، فَإِذَا تَقَدَّمَ مَا يَدلُّ عَلَى المَخْصُوصِ بالمَدْحِ، لَمْ يُذْكر بَعْدهُ، كَمَا هُنا، فَإِنَّ تَقَدُّمَ ﴿وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾، دَلَّ عَلَى أَنَّ المَخْصُوصَ بالمَدْحِ هُوَ دَارُ الأَخِرَةَ، وَالمَعْنَى: وَلَنِعمَ دَارُ المُتَّقِين: دَارُ الأَخِرَة)[1]. ئەمە شتێکی باو و زانراوە لە نێو شارەزایانی زمانی عەرەبی دا.

واته: (نِعمَ) کرداری مەدحە، کە لەسەر یەك بار دەمێنێتەوە، واته: (غير منصرف)ە، گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەوەش کە (مرفوع)ی دەکات، مادام (فعل) بێت، شتێك (مرفوع) دەکات، (فاعِل)ێکە کە دەلالەت دەکات لەسەر جینسی ستایشکراو و لە دوای و یەوە،

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٤، ص١٤٣.

شتێك باسدەكرێ كە (مرفوع) دەبێت، كە پێی دەگوترێ: (المَخْصُوص بالمَدْح)، واتە: ئەوەی تایبەت كراوە بۆ پێدا هەڵگوتن، ئنجا ئەوە بە نیهاد (مُبْتَدَأ) دادەنرێت كە گوزارەكەی (خبر)ەكەی قرتێنراوە، یاخود بە (خبر)ێك دادەنرێ، كە (مبتدأ)ەكەی دەقرتێنرێ، بەڵام ئەگەر شتێك پێشتر ڕابردبێ كە دەلالەت بكات لەسەر ئەوەی كە تایبەتكراوە بە مەدحەوە، ئەو كاتە تایبەتكراو بە مەدحەكە، باس ناكرێ.

وەك لێرە كە دەفەرموێ: ﴿وَلَدَارُ ٱلْأَخِرَةِ خَيْرٌ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، كە تایبەتكراو بە مەدح بریتیە لە: (دَارُ الأَخِرة)، ماناكەشی ئاوای لێدێ: (وَلَنِعْمَ دَارُ المُتَّقِين: دَارُ الأَخِـرَة)، باشترین مەنزڵگای پارێزكاران، مەنزڵگای دوا ڕۆژە.

## قسەیەكی كورت و گوشراو لە بارەی بەهەشت و پاداشتی خواوە

بەڕێـــــزان!

هەم لە ئایەتەكانی قورئانداو، هەم لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا ﷺ زۆر باسی ژیانی ڕۆژی دوایی كراوە، بۆ وێنە: ئەو ئایەتە موبارەكەی دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٧﴾ السجدة، واتە: هیچ نەفسێك نازانێ چییان بۆ پەنهان كراوە، لەوەی كە مایەی چاو ڕۆشنیی و خۆشحاڵیی و شادمان بوونیانە، لە پاداشتی كردەوەكانیان.

ئنجا با لەوبارەوە ئاماژە بەم دوو فەرموودەیە بكەین:

١/ {وَاللَّهِ مَا الدُّنْيا فِي الآخِرَةِ، إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ هَذِهِ ،(وَأَشَارَ يَحْيَى بالسَّبابة) فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٢٨٥٨، عَنِ الْمُسْتَوْرِد بْنِ شَدَّاد رضي الله عنه).

واتە: سوێند بە خوا دنیا لە چاو دواڕۆژ، تەنیا وەك ئەوەیە یەكێكتان ئەو پەنجەیەی (ڕاوی: ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانی كرد)، بخاتە نێو ئاوی دەریاوە، با تەماشا بكات بەچییەوە گەڕاوەتەوە؟!

یانی: قامكی چەندە ئاوی پێوە دێت، ئەوەندە تەڕاییە، لە چاو ئاوی دەریا چەندە، ژیانی دنیاش لە چاو دواڕۆژ ئەوەندەیە.

٢/ {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ

﴿أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٧﴾ السجدة} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨١٢٨، وَالبُخَارِيُّ: ٣٠٧٢، وَمُسْلِمٌ: ٢٨٢٤، وَالتِّرمِذِيُّ: ٣١٩٧).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا ﷻ فەرمووی: بۆ بەندە چاکەکانم شتێکم ئامادە کردوە، کە هیچ چاوێك نەیدیوە و، هیچ گوێیەك نەیبیستوە و، بەسەر دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ زیاتر لە چەمکی ئەوەی کە خوا فەرمووی، تێبگەن، ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٧﴾ السجدة، واتە: هیچ نەفسێك نازانێ چییان بۆ پەنهان کراوە، لەوەی کە مایەی شادمانیی و دڵخۆشییانە.

زانایانی کۆرپەلە ناسیی و توێکاریی دەڵێن: منداڵدان، هێندەی هێلکەیەکە، واتە: قەبارەکەی (٧،٥سم٣)یە، بەڵام دوای نۆ مانگ ئەو منداڵدان (**رحم**)ە، دەبێتە (٧٥٠ سم٣)، پێشێ چەند بچووکە ؟! دوایی چەند فراوان دەبێ! واتە: سەد بەرانبەری خۆی! دوایی مرۆڤ دێتە دنیاوە، دوایش کە دنیا بەجێدێڵێ، دەچێتە بەرزەخەوە، دوایی جیهانی بەرزەخیش بەجێدێڵێ و دەچێتە ڕۆژی دوایی، کە دیارە پێ بە پێ، مرۆڤ لە شوێنی تەسکەوە بۆ شوێنی فراوان دەچێت.

٦- ﴿ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ﴾، ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن بە پاکیی و چاکیی، واتە: لە حاڵێکدا کە پاك و چاکن گیانیان دەکێشن، (**الطَّيِّبُ: كُلُّ حَسَنٍ وَجَيِّدٍ مِنْ نَوْعِهِ**)، پێشتریش گوتوومانە: (**طَيِّب**) هەر شتێك کە پاکبێ و چاکبێ و پەسند بێ، لە جۆری خۆی.

پێشتر بۆ بێبڕوایەکان فەرمووی: ﴿ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾، واتە: ئەوانەی کاتێك فریشتەکان گیانیان کێشان ستەمیان لە خۆیان کرد بوو، ستەمکار بوون لە خۆیان، بەڵام بڕواداران پاك و چاکن.

٧- ﴿يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ﴾، فریشتەکان پێیان دەڵێن: سەلامتان لێبێ، (**أَيْ: يَتَوَفَّوْنَهُمْ مُسَلِّمِين عَلَيْهِم**)، بە سڵاو لێکردنەوە گیانیان دەکێشن.

٨- ﴿ٱدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، واتە: پێشیان دەڵێن: بچنە نێو بە هەشتەوە، بەهۆی ئەوەوە کە دەتانکرد، لە سۆنگەی کردەوە باشەکانتانەوە، کە باشترین کردەوەی باش، ئیمان و خوا بە یەکگرتنە، وەك چۆن خراپترین کردەوەی خراپ، کوفر و هاوبەش بۆ خوا دانانە.

دوایـی هەمـوو چاکـەکانی دیکـە لـە ئیمانـەوە پەیـدا دەبـن و، هەمـوو خراپەکانیـش لـە کوفـرەوە پەیـدا دەبـن.

## وەڵامدانەوەی پرسیارێك :

لێـرەدا پرسـیارێك دروسـت دەبـێ: فەرمایشـتێکی پێغەمبـەر ﷺ هەیـە، کـە ڕۆژێ بـە هـاوەڵانی فەرمـووە:

**{(لَـنْ يُدْخِـلَ أَحَـدًا مِنْكُـمْ عَمَلُـهُ الْجَنـةَ)، قَالُـوا: وَلَا أَنْـتَ يـا رَسُـولَ اللّـهِ! قَـالَ: (وَلَا أَنـا إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّـدَنِيَ اللَّـهُ مِنْـهُ بِفَضْـلٍ وَرَحْمَـةٍ، فَسَـدِّدُوا وَقَارِبُـوا)} (أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ: ٧٢١٩، وغـيره، عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﵁).**

واتـە: هیـچ کام لـە ئێـوە کردەوەکـەی نایخاتـە بەهەشـتەوە! گوتیـان: تۆش ئـەی پێغەمبەری خـوا ؟! فەرمـووی: منیـش مەگـەر خـوا بـە بەخشـش و بە بەزەیـی خـۆی دامپۆشـێ! هەوڵبدەن ڕێـی ڕاسـت بگـرن و خۆتـان نزیـك بخەنـەوە لـە خـوا، یاخـود هەوڵبـدەن ڕێـی نێوەڕاسـت بگـرن و، ئەگـەر بـە تەواوییـش نەتوانـن هەمـوو ئەرکـەکان ئەنجـام بـدەن، بـەڵام خۆتـان نزیـك بخەنـەوە لـەوەی کـە ئەرکـەکان بەتەواویـی ئەنجـام بـدەن.

لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەتانکـرد بچنـە بەهەشـت، پێغەمبـەر ﷺیـش دەفەرمـوێ: هیـچ کام لـە ئێـوە کردەوەکـەی نایخاتـە بەهەشـت، تەنانـەت منیـش ؟

وەڵامەکـەی ئاوایـە: کـردەوە هـۆکارە بـۆ چوونـە بەهەشـت، بـەڵام نرخـی بەهەشـت نیـە، کـردەوەی بـاش بارتەقـای ئەوەنیـە پێـی بچینـە بەهەشـت، بەڵکـو خـوا کردوویەتـی بـە هۆکارێـك، بـۆ چوونـە بەهەشـت، بـەڵام بڵێیـن: کـردەوەکانی ئێمـە بەرانبـەری ئـەو نـاز و نیعمەتـە هەمیشـەیی و نەبـڕاوە و بێسـنوورەی خـوای پـەروەردگار بـن ؟! نەخێـر، بارتەقـا و بەرانبـەری نیـن، بـەڵام هۆکارێکـن، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: هـەر کەسـێ ئـەو کـردەوە باشـانە بـکات، بەهـۆی ئـەو کـردەوە باشـانەوە دەچێتـە بـە هەشـت.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**خوا دەفەرموێ: ئایا بێبڕوایان جگە لە هاتنی فریشتان بۆ گیان کێشانیان، یان هاتنی بڕیاری خوا بۆ سزا دانیان، چاوەڕێی چی دیکە دەکەن؟ پێشووانیشیان هەر وایانکرد و سەرەنجام سەریان بە فەتارەت چوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (٣٣) فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ (٣٤) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن ؟! (يَنظُرُونَ) و (**يَنتَظِرون**) لە هەندێ سیاقدا، هەر بە یەك واتا دێن، ئەگەر نا (**يَنظُرُون**) بە مانای (تەماشادەکەن)یش دێ، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، جگە لەوەی فریشتەکان بێن ؟! بێگومان لێرەدا ئەو پرسیارکردنە، پرسیارکردنێکی نکوولێلێکەرانەیە و بە مانای لابردن (**نفي**)ە، (**الإِسْتِفْهَامُ الإِنْكارِيّ في مَعْنَى النَّفِي**) واتە: چاوەڕێی هیچی دیکە ناکەن، جگە لەوەی فریشتەکان بێن! (بێنە لایان)، فریشتە بۆچی دێنە لایان ؟! بۆ ئەوە دێن کە گیانیان بکێشن، مەبەست پێی ئەوەیە، بە پێی سیاق دەزانرێت، ئەگەرنا ئەگەر هاتنی فریشتان بۆ لای چاکەکاران و ئیمانداران بووایە، ئەو کاتە ماناکەی دەگۆڕا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ (٣٠) ﴾ فصلت.

واتە: ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایە و دواییش بەردەوام و خۆڕاگربوون لەسەر ئەوە، فریشتەکان دادەبەزنە سەریان بۆ ئیلهام بۆ کردنیان و دڵخۆشکردنیان و، ترس و خەم و پەژارە ڕەواندنەوەیان.

بەڵام لێرەدا، مادام ئەوانە ئەهلی کوفرن، فریشتە کە دێن بۆ لایان، بۆ شتێك دێن کە بۆ ئەوان خراپە !.

٢- ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ أَمۡرُ رَبِّكَ﴾، چاوەڕێی چیدیکە دەکەن ؟! یان فریشتە بێن بۆ گیان کێشانیان، یاخود فەرمانی پەروەردگارت بێت ؟!

أ/ (مَجيءُ المَلاَئِكَة لِقَبْضِ أَرْوَاحِهِم).

ب/ (أَو مَجِيء عَذَابِ اللّهِ الدُّنيَوِي أَو الأُخْرَوِيّ)، ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ أَمۡرُ رَبِّكَ﴾، دەگونجێ فەرمانی پەروەردگاریان بێت، بۆ سزا دانیان لە دنیادا، یاخود فەرمانی پەروەردگار بێت بە کۆتایی پێهێنانی ئەم ژیانە دنیاییە و هەڵدانەوەی ئەم لاپەڕەیەو، کردنەوەی لاپەڕەیەکی تازە، کە لاپەڕەی ڕۆژی دواییە، جگە لەو دوو حاڵەتە چاوەڕێی چی دیکە دەکەن ؟!

٣- ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾، ئەوانەی پێش ئەوانیش هەر وایانکرد، واتە: بەردەوام بوون لەسەر کوفر و، کەللە ڕەقیی و، لەسەر گاڵتەپێکردنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و لەسەر عەیش و نۆش و ڕابواردنی حەڕام و ناشەرعییانە و دوور لە خواییانە.

٤- ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ﴾، خواش ستەمی لێ نەکردن.

٥- ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد، واتە: کە لەسەر کوفر و بێبڕوایی بەردەوام بوون، خوا بە تۆبزیی ملی نەگرتبوون کە هەر دەبێ کوفر و بێبڕوایی بکەن ؟! بەڵکو بە پێچەوانەوە: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)ی بۆ نارد بوون، کتێبی بۆ دابەزاند بوون، هەڕەشەی لێ کردبوون، دڵخۆشی کردبوون بە پاداشتی خۆی، ترساندبوونی لە سزای خۆی، کەچی ئەوان هەر لەسەر ئەوەی شەیتان بۆی جوان کردبوون و، نەفسیان ئارەزووی دەکرد، هەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوون !

٦- ﴿فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ﴾، سەرەنجام: خراپەی ئەوە کە ئەنجامیان دابوو، تووشیان بوو، لێرەدا دەگونجێ بڵێین:

أ/ ( فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ )، (أَي: جَزَاءُ سَيِّئاتِهِم) سزای کردەوە خراپەکانیان کە ئەنجامیان دابوون، تووشیان بوو.

ب/ ( فَأَصَابَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ )، (أَي: جُعِلَت أَعْمَالُهُم السَّيِّئَة كَأَنَّهَا هِيَ الَّتِي أَصَابَتْهُم لأَنَّهَا سَبَب مَا أَصَابَهُم)، کردەوە خراپەکانیان وا دانراون، کە هەرخۆیان تووشیان بوون، چونکە ئەو سزایەی تووشیان بووە، کردەوە خراپەکانیان هۆکاری بوون.

٧- ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾، ئەوەی کە گاڵتەیان پێ دەکرد، دەوری دان و ئابڵووقەی دان، یانی: (وَأَحَاطَ بِهِم: عِقَابُ استهْزَائِهِم) سزای ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، ئەو پەیامەی کە خوا بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)ی نارد بوو، یانی: سزای ئەو گاڵتە پێکردنەیان گەمارۆی دان، یاخود ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد کە سزای خوایە، دەوری دان !.

ئاوا بەو شێوەیە خوا ﷻ باسی سەرەنجامی ئەوانە دەکات، کە لەگەڵ خوا ﷻ و پەیامەکەی دا ناکۆکن و، دانوویان لەگەڵیدا ناکوڵێ، ئەوانەی کە هەڵویستی نەرێنیی و خراپیان هەیە لە بەرانبەر خوا و پەیامەکەی دا، کە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و کۆتایی دا ناردوویەتی، کە ئاوا تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە دێن، تووشی ئەو چارەنووسە تاڵە دێن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە بە هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، لە باوەشگرتنی پەیامە نوورانییەکەیەوە، سەربەرز و بەختەوەری دنیا و سەرفرازو، ڕوو سووری ڕۆژیی دوایی دەبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شازدە (١٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٣٥ - ٥٠) و، لەو شازدە ئایەتەدا، شەش بابەتی سەرەکیی خراونە ڕوو:

١) بەرپەرچدانەوەی قسەی هاوبەشدانەرەکان، کە ئۆباڵی شیرك و خراپەیان دەخەنە ئەستۆی قەدەر و قەزا و ویستی خواوە ﷻ.

٢) بەرپەرچدانەوەی ئەو قسانەیان، کە خوا مردووان زیندوو ناکاتەوە و، ڕۆژێك نیە بۆ سزا و پاداشت !

٣) باسی پاداشتی گەورەی کۆچکەرانی ڕێی خوا و، ڕاکردوو لە ستەمی کافران.

٤) باسی ئەوە کە خوا تەنیا پیاوانی بە پێغەمبەر ناردوون و، لە پێش موحەممەددا ﷺ پێغەمبەرانی دیکەش هاتوون لە پیاوان و، ئەو ڕیزپەڕ نیە لەو بوارەدا !

٥) هەڕەشەلێکردن و ترساندنی کافرەکان، کە دەگونجێ خوای دادگەر بە سزای جۆراو جۆر بیانگرێ و سزایان بدات.

٦) باسی ملکەچیی تێکڕای ئەوانەی لە گەردوون دان، بە سەر و خواریەوە، بۆ خوای تاکی بێ وێنە.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٣٥ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٣٦ إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٣٧ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٣٨ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ

كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْأٓخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِيٓ إِلَيْهِمْ ۚ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِي تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۩ ﴿٥٠﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەوانەی هاوبەشیان (بۆ خوا) داناوە، گوتیان: ئەگەر خوا ویستبای خۆمان و باب و باپیرانمان، جگە لەوی هیچ شتێکمان نەدەپەرست و، هیچ شتێکیشمان بەبێ (فەرمانی) وی قەدەغە نەدەکرد، ئەوانەی پێش وانیش هەروایان کرد، ئایا پێغەمبەران جگە لە گەیاندنی ڕوون بۆ پەیامی خوا، چی دیکەیان لەسەرە ؟! ﴿٣٥﴾ بە دڵنیاییش لە نێو هەر کۆمەڵێکدا ڕەوانەکراوێکمان ناردوە کە (بە خەڵك ڕابگەیەنێ:) خوا بپەرستن و، خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، ئنجا هەیانبووە خوا ڕاستەڕێیی کردوە و، هەشیان بووە گومڕایی بەسەردا چەسپاوە، دەجا بە زەوی دا بڕۆن سەرنج بدەن! سەرەنجامی بە درۆدانەران (ی پێغەمبەران) چۆن بووا ﴿٣٦﴾ ئەگەر تۆ! (ئەی موحەممەد!) لەسەر ڕاستەڕێ کردنیان سوور بی، بێگومان کەسێك خوا گومڕای بکات (و شایستەی سەرگەردانیی بێ)، ڕاستەڕێی ناکات و، (لە ڕۆژی دواییش دا) هیچ وەسەرخەریان نین ﴿٣٧﴾ (هاوبەشدانەرەکان) سوێندی قورسیشیان بە خوا خوارد، کە ئەوەی دەمرێ خوا زیندووی ناکاتەوە!، با (خوا) بەڵێنی ڕاستی داوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٣٨﴾ (زیندوویان دەکاتەوە) تاکو ئەوەی تێیدا دەکەونە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە، بۆیان ڕوون بکاتەوە و، بۆ ئەوەی ئەوانەی بێبڕوان، بزانن

کە درۆکار بوون ﴿٣٩﴾ قسەمان بۆ شتێك کە بمانەوێ (ببێ) هەر ئەوەیە کە پێی بڵێین: ببە! یەکسەر دەبێ ﴿٤٠﴾ ئەوانەش کە دوای ئەوەی ستەمیان لێکراوە، لە پێناوی خوادا کۆچیان کردوە، لە دنیادا جێگا و ڕێگایەکی باشیان بۆ دەڕەخسێنین و، پاداشتی دواڕۆژیش ئەگەر زانیبایان (لە هی دنیا) گەورەترە، ﴿٤١﴾ (بۆ) ئەوانەی خۆڕگر بوون و پشتیان بە خوا بەستوە ﴿٤٢﴾ لە پێش تۆش دا تەنیا پیاوانمان (بە پێغەمبەر) ڕەوانە کردوون، سروشمان بۆیان دەکرد، ئەگەر نازانن لە شارەزایان (ی کتێبە ئاسمانییەکان بپرسن) ﴿٤٣﴾ (پێغەمبەرانمان) بە بەڵگە ڕۆشنەکان و، بە کتێبانەوە ناردوون و، زیکر (قورئان)یشمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆ لای خەڵکی دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە (چۆن جێبەجێی بکەن؟) و، بەڵکو خۆشیان بیر بکەنەوە ﴿٤٤﴾ ئایا ئەوانەی پیلانە خراپەکان دەگێڕن، دڵنیان لەوەی خوا ڕۆیان بچوێنێتە زەوی (بە زەویدا بیانباتە خوار)، یان لەلایەکەوە کە هەستی پێناکەن، سزا و ئازاریان بۆ بێ؟ ﴿٤٥﴾ یان (سزای خوا) لە کاتی سەفەرو هاتن وچوونیاندا، بیانگرێ و، دەستە وسانکەریش نین بۆ خوا (دەرباز نابن)! یان (ئایا دڵنیان کە) لە کاتی ترس و بیمیان دا بیانگرێ! ﴿٤٦﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارتان بە پەرۆشی بە بەزەییە ﴿٤٧﴾ ئایا سەرنجیان نەداوەتە هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە! کە ملکەچانە سێبەری بەلای ڕاست و چەپدا - کڕنووش بۆ خوا بردووانە - دێ و دەچێ! ﴿٤٨﴾ هەروەها هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، لە ژیاندار و فریشتان، کڕنووش بۆ خوا دەبەن و، ئەوان خۆشیان بە زل ناگرن! (وەك کافران) ﴿٤٩﴾ لە سەروویانەوە لە پەروەردگاریان دەترسن و، هەرچی فەرمانیان پێبکرێ دەیکەن ﴿٥٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ): (البَلاَغُ: التَّبْلِيغ)، (بَلاَغ) واتە: گەیاندن، هەروەها (بَلاَغ) بە مانای کیفایەت و بۆ شتێك کە تەواو و بەس بێ، دێ.

( ٱلطَّٰغُوتَ ): (الطُّغْيانِ: تَجاوُزُ الحَدِّ فِي العِصْيانِ، وَالطَّاغُوتُ عِبارَةٌ عَنْ كُلُّ مُتَعَبِّدٍ وَكُلّ مَعْبُودٍ مِنْ دُونِ اللّهِ، وَيُستعْمَلُ فِي الوَاحِدِ، وَالجَمْعِ، وسُمِّي الساحِرُ وَالكاهِنُ وَالْمَارِدُ مِنَ الجِنِّ، وَالصَّارِفُ عَنْ طَرِيقِ الخَيْرِ، طَاغُوتَاً)، (طُغْيان) بریتیە لە سنوور بەزێنیی لە سەرپێچیی دا و، (طَاغُوت) بریتیە لە هەر بەندایەتیی بۆ کراوێك و هەر پەرستراوێك جگە لە خوا و، بۆ تاك و بۆ کۆش بەکاردێ و، بۆ جادووگەر و فاڵچیی و شەیتانی جینیی و، هەر کەسێك خەڵك لە ڕێی چاکە لابدات، بەکاردێ.

( تَحْرِصْ ): (الحِرْصُ: فَرْطُ الشَّرَهِ وَفَرْطُ الإِرَادَةِ)، (حِرْص) بریتیە لەوەی کە ئینسان زۆر ئارەزووی شتێکی بێت و، زۆر بیەوێ شتێك ئەنجام بدات.

( جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ): (أَي: حَلَفُوا وَاجْتَهَدُوا فِي الحَلِفِ، أَنْ يأْتُوا بِهِ عَلَى أَبْلَغِ مَا فِي وسْعِهِم)، (جَهْدَأَيْمَٰنِهِمْ)، واتە: سوێندیان خوارد و، لە سوێندەکەشیاندا زۆر خۆیان ماندوو کرد، کە بەو شێوەیەی لە توانایاندا هەیە، سوێندەکە بە قورسیی بخۆن، بۆ ئەوەی بەرانبەرەکەیان باوەڕیان پێ بکات.

( لَنُبَوِّئَنَّهُمْ ): (أَصْلُ البَوَاءِ: مُساوَاةُ الأَجْزَاءِ فِي المَكانِ، بَوَّأْتُ لَهُ مَكاناً: سَوَّيْتُهُ)، وشەی (بَوَاء) بە مانای ئەوەیە کە شتێك هەموو بەشەکانی یەکسان بن، (بَوَّأْتُ لَهُ مَكاناً) واتە: شوێنم بۆ ئامادەکرد و مەنزڵگام بۆ دانا.

( وَٱلزُّبُرِ ): (زَبَرْتُ الكِتَابَ: كَتَبْتُهُ كِتَابةً غَلِيْظَةً، وَكُلُّ كِتَاب غَلِيظِ الكِتَابَة: زَبُورٌ)، دەگوترێ: (زَبَرْتُ الكِتَابَ) واتە: نووسینێکی درشتم نووسی، (غَلِيْظَةً) واتە: درشت، پیتەکانی درشتبن و، هەر نووسینێك کە وشەکانی درشتبن و بە گەورەیی بنووسرێ، پێی دەگوترێ: (زَبُور)، کە کۆیەکەی (زُبُر)ە.

( مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ): (المَكر: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يَقْصِدُهُ بِحِيْلَةٍ)، (مَكر) بریتیە لەوەی کەسێك لابدەی لەوەی مەبەستیەتی، بەڵام بە فێڵ لای بدەی.

( يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ ): **(يُغَيِّبُهُمْ فِي الأَرْضِ)** خوا بە زەوییاندا بەرێتە خوار، لە زەویدا ونیان بکات، **(الخَسْفُ: جَعَلَ الأَرْضَ تَغُورُ)**، **(خَسْف)**: بریتییە لە زەوی ڕۆچوواندن.

( تَقَلُّبِهِمْ )، یانی: **(تَنَقُّلِهِم)** لە کاتی هاتن و چوونیان دا.

( تَخَوُّفٍ )، **(تخوَّف مُطَاوِعُ خَوَّفَهُ، فهوَ مُتَخَوِّفٌ)**، **(خَوَّفَهُ)** ترساندی، **(مُتَخَوِّفٌ)** یانی: هەستی بە ترس کرد، **(تَخَوَّفَ عَلَيْهِ شَيْئاً: خَافَهُ)** واتە: لە شتێك لێی ترسا، **(تَخَوَّف الشيءَ: تَنَقَّصَهُ)** لە شتەکەی کەم کردەوە.

( يَتَفَيَّؤُاْ )، **(تفيأ الظِّلُّ: تَقَلَّبَ)** سێبەر کە دێت و دەچێ، بە لای ڕاست و چەپدا، بە هۆی خۆرەوە، کە دەکەوێتە ئەملا و دەکەوێتە ئەولا، ئەوە پێی دەگوترێ: **(تَفيُّؤ)** واتە: هاتن وچوونی سێبەر.

( دَٰخِرُونَ )، واتە: ملکەچ بوون **(دَخَرَ: صَغُرَ، وَذَلَّ وهانَ)** بچووك بوو، زەبوون بوو، بێ دەسەڵات بوو.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لەسـەر خسـتنە ڕووی کۆمەڵێـکی دیکـە، لـە بیـر وڕا و بۆچوونـە پووچـەکانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان و کافـرەکان، پاشـان بەرپەرچدانـەوەی ئـەو بیـر وبۆچوونـە هەڵانەیـان، بـەردەوام دەبێـت، ئەمـە تـەوەری گشـتی ئـەم شـازدە ئایەتەیـە، بـەڵام خـوا ﷻ ڕوونکردنـەوەی چەنـد بابەتێـکی دیکـەش نێواخنـی ئـەم بابەتـە دەکات، پاشـان کافـرەکان دەترسـێنێ و، هەڕەشـەیان لـێ دەکات: دەبـێ چـاوەڕێ بـن، مـادام لەسـەر کوفـر و شـیرك بەردەوامـن، بـە شـێوەیەك کـە چـاوەڕێ ناکـەن و، ئەگـەری بـۆ دانانێـن لەلایەکـەوە کـە چاوەڕێـی ناکـەن لەنـاکاو خـوا سـزایان بـۆ بنێـرێ، دواییـش بـاسی ملکەچیـی تێکـڕای دروسـتکراوەکان دەکات بـۆ خـوا ﷻ لـە سـەرو و خـواری گەردوونـدا، سـەرەتا دەفەرمـوێ:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ ﴾، واتـە: ئەوانـەی هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـا، گوتیـان: ئەگـەر خـوا ویسـتبای، جگـە لـەو هیـچ شـتێکمان نەدەپەرسـت، نـە خۆمـان و نـە بـاب و باپیرانمـان، هیـچ شتێکیشـمان قەدەغـە نەدەکـرد، کـە پێچەوانـەی شـەریعەت و وەحیـی و پەیامـی ئـەو بێـت، واتـە: ئـەوە کـە ئێمـە جگـە لـە خـوا دەپەرسـتین و، ئـەوە کـە ئێمـە کۆمەڵێـك لـەو ڕزق و بژیوانـە کـە خـوا بـە حەڵاڵـی دانـاون، قەدەغەیـان دەکەیـن، ئـەوە بـە ویسـتی خوایـە، هـەر شـتێکیش بـە ویسـتی خـوا بـوو، دیـارە خـوا لێـی ڕازییـە، کەواتـە: خـوا لـەم کردەوانـەی ئێمـە ڕازییـە، هـەم لـە شـیرکەکەمان، هـەم لـە قەدەغـە کردنەکەمـان !!

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، واتـە: ئەوانـەی پێـش وانیـش هـەر وایانکـرد، واتـە: هـەر بـەو شـێوەیە ئۆباڵـی شـیرك و کوفـر و کـردەوە خراپـەکانی خۆیـان دەخسـتە ئەسـتۆی ویسـت و قـەدەری خـوای پـەروەردگارەوە! ﴿ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، واتـە: ئایـا جگـە لـە گەیانـدنی ڕوون و ڕۆشـن، یـان ڕوونکـەرەوە، بـۆ پەیامـی خـوا، چ ئەرکێـکی دیکـە لەسـەر پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ؟! واتـە: تەنیـا ئـەو ئەرکەیـان لەسـەرە، کـە پەیامـی خـوا بـە ڕوونیـی و بـە ڕۆشـنیی بە خەڵـك بگەیەنـن، کاتێ پەیامـی خوایـان پێدەگەیەنـن و، جەوهـەر و نێـوەڕۆکی پەیامـی خـوا، ئەوەیـە کـە تەنیـا خـوا بپەرسـترێ و حـەڵاڵ و حـەڕام دانـان، تەنیـا هـی خوایـە ﷻ، کـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ

وَالسَّلَام) ئەوەیان پێ گەیاندوون، ئەوان ئەرکی خۆیان جێبەجێ کردوە، بەڵام ئەوە ئێوەن کە ئەرکی خۆتان جێبەجێ ناکەن! ئەوەی پێغەمبەران پێیان گوتوون، لێیان وەرناگرن و پێوەی پابەند نابن و، بۆ خۆتان بەلارێیان دا دەڕۆن و ملی کوێرە ڕێیان دەگرن و، بەو ڕێچکانە سەری خۆتان بە فەتارەت دەدەن!

هەڵبەتە ئێمە ئەم بابەتەمان لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا بە تەفصیل باسکردوە، هەروەها بەرپەرچدانەوەی خوا ﷻ بۆ ئەو قسەیەی کافرەکان، لەوێش خوا دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ ﴿١٤٨﴾ ﴾الأنعام، خوا ﷻ لەوێ درێژەی قسەکانیان باس دەکا و، دوایی بەرپەرچیان دەداتەوە.

﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴾، واتە: بەدڵنیایی ئێمە لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوانەکراوێکمان ناردوە، کە پێیان بڵێ: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، خوا بپەرستن و، خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، کە خوا ڕەوانەکراوێکی تێدا نەنێرێ، بەو شێوەیە بە خەڵك نەڵێ، ﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ ﴾، واتە: ئنجا هەیانبووە خوا ڕاستە ڕێی کردوە و، هەشیانبووە کە گومڕایی لەسەر چەسپاوە.

لێرەدا وشەی: (هَدَى ) بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، چونکە خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴾، واتە: لە نێو هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوانەکراوێکمان ناردوە، کە پێیان بڵێ: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، کەواتە: ئەو هیدایەت و ڕێنماییە خوا بۆ هەمووانی خستۆتە ڕوو، بەڵام ئەوانەی کە ڕێنمایی خوایان بۆ خراوەتە ڕوو و، بەڵگەی خوایان لەسەر تەواوکراوە و، پەیامی خوایان پێ ڕاگەیەنراوە بە ڕوونیی، بوونە دوو بەش:

١-﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ ﴾، هەیانە خوا ڕاستە ڕێی کردوە، ئەم (هَدَى ) لێرەدا بە مانای ڕێنمایی کردن و ڕێ پێشاندان نیە، بەڵکو بە مانای خستنە سەر ڕێی ڕاستە، هەیانە خوا خستوویەتە سەر ڕێی ڕاست و ڕاستە ڕێی کردوە.

٢- ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ ﴾، هەشیانە کە گومڕایی لەسەر چەسپاوە، یانی: دوای ئەوەی کە خوا ﷻ لە هەر کۆمەڵگایەکدا پێغەمبەرێکی ناردوە، پێیان ڕاگەیاندوون کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، خۆتان لە طاغووت (واتە: لە پەرستنی غەیری خوا) دوور بگرن، چ وەك پێشکەشکردنی دروشمەکانی خواپەرستیی (**تقديم الشعائر**)، چ وەرگرتنی بەرنامەکانی ژیان

(أَخْذُ الشرَائِع)، خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، هەر کەسێك شتێك لەو شتانەی کە بۆ خوا ئەنجام دەدرێن لە پەرستشەکان، لە دروشمەکان، شتێك لەوانەی بۆ ئەنجام بدریٚ، ئەوە طاغووتە، هەروەها هەرکەسێك ئەو بەرنامە و حەڵاڵ و حەرامانەی کە دەبێت تەنیا لە خوا وەربگیرێن، خۆی بکات بە سەرچاوەی ئەو بەرنامانە و، دیارییکردنی حەرام و حەلاڵ، ئەویش هەر طاغووتە، هەر کەسێ هەردووکیانیشی تێدا بێ، ئەوە مانای تەواوی طاغووتی تێدا چەسپاوە، ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەوەیان بە خەڵکەکە گوتوە:

هەندێکیان کە هیدایەتی خوایان قبووڵ کردوە و، سینەیان پێی گوشاد بووە، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴿٢٢﴾﴾ الزمر، واتە: ئایا کەسێك خوا سینەی گوشاد کردوە بۆ ئیسلام و، بۆ ملکەچیی خوا، کەوتۆتە سەر ڕۆشنایی لە خواوە (وەك کەسێکە کە سینەی لە ئاست هیدایەتی خوادا تەنگ بووە؟)، بەڵێ هەیانە بە ویستی ئازادانەی خۆی ئەو ڕێنماییەی خوا بە پێغەمبەران دا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ناردوویەتی، قبووڵی کردوە و لە ئەنجامی ئەوەشدا، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى ﴿١٧﴾﴾ محمد، واتە: ئەوانەی هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، خوا هیدایەتی بۆ زیاد کردوون و خستوونیە سەر ڕاستە ڕێ، ئا ئەوە مانای ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ﴾ یە، هەیانە خوا خستوونیە سەر ڕاستە ڕێ، چونکە هیدایەتی خوایان وەرگرتوە، بۆی تەسلیم بوون و، قبووڵیان بووە و، خۆشیانویستوە، ﴿وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾، هەشیانە کە گومڕایی لەسەر چەسپاوە، بۆچی؟ چونکە هیدایەتی خوای پشتگوێ خستوە، بەڵکو دژایەتیی کردوە و قبووڵی نەکردوە و ڕەفزی کردوە، بۆیە گومڕایی بەسەردا چەسپاوە.

﴿فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴾، ئنجا بە زەویدا بڕۆن، سەرنج بدەن، سەرەنجامی بە درۆدانەران چۆن بووە !

واتە: ئەوانەی بە ویستی ئازادانەی خۆیان پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، بزانە سەرەنجامیان چۆن بووە، ئەوانەش کە پێغەمبەرانیان بە ڕاست زانیوە، تەسلیمی پەیامەکەیان بوون و، شوێنیان کەوتوون و بەندایەتییان بۆ خوا کردوە، ئەوانەش دیارە سەرەنجام و ئاکامیان خێر بووە.

دوایی بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ﴿إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾، ئەگەر تۆ سووربی لەسەر ئەوەی کە بیانخەیە سەر ڕاستە ڕێ، نەك سوور بی لەسەر ئەوەی پەیامی خوایان پێ بگەیەنی، چونکە پەیامی خوای پێگەیاندوون، (هُدَىٰهُمْ)، واتە: بیانخەیە سەر ڕاستە ڕێ، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ﴾،

بێگومـان خـوا کەسێك ناخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، کـە گومـڕای کـردوە بەهـۆی ئـەوەوە کـە پشـتی لـە پەیـام و ڕێنمایـی خـوا کـردوە! کەسێ کـە پشـتی لـە پەیـام و ڕێنمایـی خـوا کردبـێ و، خـوا گومـڕای کـرد بـێ، دوای ئـەوەی کـە بـە ویسـتی ئازادانـەی خـۆی هیدایـەتی خـوای ڕەفـز کـردوە، ئـەوە بێگومـان یاسـای گومڕابـوون (ضـلال)ی بەسـەردا چەسـپاوە و، یاسـای ڕاسـتە ڕێکـردن (هدایـة) نایگرێتـەوە، ﴿ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾، بێگومـان هیـچ پشـتیوان و سـەرخەر و هاوکاریـان نیـە، واتـە: کـە جگـە لـە خـوا ﷻ چ لـە دنیـادا، چ لـە دواڕۆژدا سـەریان بخـات و پشـتیوانیان بێـت لـە بەرانبـەر سـزای خـوادا.

ئنجـا بـاسی هەڵوێسـتێکی دیکـەی ئـەو بێبـڕوا و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ ﴾، هەروەهـا زۆر بـە داکۆکیـی کـردن و، جەختکردنـەوە، زۆر بـە خـۆ ئـازاردان و تێکۆشـانەوە، سـوێندیان بـە خـوا خـوارد، کـە هـەر کـەس بمـرێ، خـوا هەڵیناسـتێنێتەوە و زینـدووی ناکاتـەوە، ﴿ بَلَىٰ ﴾ بـا (خوا) زینـدووی دەکاتـەوە، ﴿ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا ﴾، بەڵێنـی داوە و بەڵێنەکـەش لەسـەر خوا چەسپاوە، خـوا کـە شـتێکی فەرمـوو، جێبەجێـی دەکات، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بـەڵام زۆربـەی خەڵـکی نازانـن، واتـە: زۆربـەی خەڵـکی نازانـن، کـە ناگونجـێ دنیـا شـاری بـێ خـاوەن بـێ! زۆربـەی خەڵـکی کـە ئەوانـەن گـوێ لـە پێغەمبـەران ناگـرن، ئەوانـەی گـوێ بـۆ پەیـام و سروشی خـوا ناگـرن، ئەوانـەی بوونناسـییەکی هەڵەیـان دەبێـت، ئەوانـە نـە خۆیـان دەناسـن، نەخـوا دەناسـن، نـە گـەردوون و بـوون دەناسـن! زۆربـەی خەڵـکی ئەوانـەن کـە پشـت لـە پەیامـەکانی خـوا دەکـەن و پشـت لـە هیدایـەتی خـوا دەکـەن، زانیارییـان نیـە کـە ناگونجـێ خـوا ﷻ مرۆڤـەکان زینـدوو نەکاتـەوە و، لێیـان نەپێچێتـەوە و لێیـان نەپرسـێتەوە و، سـزا و پاداشـتیان بـۆ دانەنـێ.

پێشـتر خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بـا، خـوا مـردووان زینـدوو دەکاتـەوە، بەڵێنـی داوە و بەڵێنەکـەش هەقـە و چەسـپاندوویەتی، بـەڵام زۆربـەی خەڵـکی نازانـن، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ ﴾، تاکـو ئـەوەی تێیـدا کەوتوونـە ڕاجیایـی و ناکۆکییـەوە، بۆیـان ڕوون بکاتـەوە، ئایـا نابـێ ئـەو کا و دانـە لێـك جیابێتـەوە ؟! هـی واهەیـە هـەر بـە کوفـرەوە و بـە شـیرکەوە دەمـرێ، بـە بیـرو بۆچوونـە پووچـەکانی خۆیـەوە سـەر دەنێتـەوە! نابـێ کاتێـك هەبـێ و ڕۆژێـك و قۆناغێـك هەبـێ لێـی حاڵیـی بکـرێ: کـە تـۆ بـە هەڵـە داچـووی! ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ﴾، هەروەهـا بـۆ ئـەوەش کـە ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، بزانـن کـە درۆیـان کـردوە

(درۆزن بوون)! کە دەیانگوت: زیندوو ناکرێینەوە و وەك بەرزەکیی بانان بۆی دەردەچین، چاك و خراپ و پارێزکاران و تاوانباران سەرەنجامیان هەر وەك یەك دەبێ !

ئنجا خوا ﷻ ئەوەمان بۆ وێنا دەکات کە چەند ئاسانە بۆ خوا، مردووان زیندوو بکاتەوە و، ئەم بازارەی ئێستا بپێچێتەوە (کە بازاڕی دنیایە) و بازاڕێکی دیکە (کە بازاڕی دواڕۆژە) بێنێتە پێش، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، بێگومان قسەی ئێمە بۆ شتێك کە ویستمان پەیدای بکەین، هەر ئەوەندەیە کە پێی بڵێین: ببە، ئەویش یەکسەر دەبێ! کە بێگومان ئەوە وێناکردنی کاریگەریی ویستی بێسنوور و ڕەهای خوایە، لە پەیداکردنی شتەکاندا! ئەگەرنا نەشتێك هەیە پێی بگوترێ: ببە و، نە خوای پەروەردگاریش وا دەفەرموێ، مەبەست ئەوەیە کە وەك چۆن ئەگەر کەسێ بە شتێك بڵێ: ببە، یەکسەر ببێ، چەند خێرایە، کاریگەریی ویستی خواش لە دروستکراوەکاندا، بەو شێوەیە، ئیدی ئەوەی کە زانایان گوتوویانە: شتێك کە نەبێ، کە چۆن ویستی خوا پێوەی پەیوەست دەبێ و، چۆن خوا دەیدوێنێ ؟! ئەو ئیشکالانە هەموو لە کۆڵ دەبنەوە، قەزیەکە هەر ئەوەندەیە کە خوا وێنای خێرایی کاریگەریی ئیرادە و ویست و دەسەڵاتی خۆییمان بۆ دەکات، کە کاتێ کە بیەوێ شتێك پەیدا بکات، یەکسەر پەیدا دەبێ.

ئنجا دێتە سەر باسێکی دیکە، هەر لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەر و کافرە ملهوڕانە، ئاوا بیریان کردۆتەوە و، ئاوا سەختگیرانە پەیوەست بوون بە بیرو بۆچوونە هەڵە و پووچەکانی خۆیانەوە و، بێگومان زۆریش ڕقیان لە ئیمان و خوا بەیەکگرتن و پەیامی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بووە، زۆریش دژایەتیی ئەوانەیان کردوە کە پەیڕەوییان کردوە لە پەیامی پێغەمبەری خاتەم و شوێن ئایین و بەرنامەکەی کەوتوون و، سەرەنجام ئەزیەتیان داون و ناڕەحەتیان کردوون، کە لە ئەنجام دا بەشێکیان ناچار بوون: کۆچ بکەن و ماڵ و حاڵ و نیشتمانی خۆیان بەجێبهێڵن، بەو بۆنەیەوە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ ﴾، ئەوانەش کە کۆچیان کردوە، دوای ئەوەی زوڵمیان لێکرا، لەلایەن ئەو ستەمکارە خۆ سەپێنانەوە، ﴿ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ ﴾، ئێمە لە ژیانی دنیادا جێ و ڕێیەکی باشیان بۆ دابین دەکەین، ﴿ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾، پاداشتی دواڕۆژیش گەورەترە، ئەگەر بزانن، یانی: ئەگەر بزانن چ پاداشتێك چاوەڕێیان دەکات، دەزانن پاداشتی دواڕۆژ زۆر گەورەترە! بە ئەندازەیەك کە بەراورد ناکرێ لەگەڵ هی دنیادا.

﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ﴾، ئەوانـەی کـە خۆڕاگـر بـوون لەسـەر کۆچکـردن و بەجێهێشـتنی نیشـتیمان و، لەسـەر دەسـتگرتن بـە ئاییـن و بەرنامەی خـواوە، ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، بـۆ داهاتـووش پشـتیان بـە پەروەردگاریـان بەسـتوە، بـۆ ئـەو شـتانەی لـە مـەولا دێنـە ڕێیـان، بۆیـە وشـەی (صبر)ی بـە کـرداری ڕابـردوو هێنـاوە، یـانی: ئارامیـان گرتـوە و، دەسـتیان لـە ئاینەکەیـان بەرنـەداوە و نیشـتمانی خۆیـان بەجـێ هێشـتوە، بـەڵام بـۆ لەمـەودوا پشـت بـە پەروەردگاریـان دەبەسـتن، ئەوەیانی کـرداری ئێسـتا هێنـاوە، چونکـە ئـەوە شـتێکی بەردەوامـە، ئـەوەی پێشـێ صەبریـان لەسـەر گرتـوە و بڕاوەتـەوە، بـەڵام بـۆ ئـەوەی کـە دادێ، دەبـێ هەمیشـە پشـت بـە خـوا ببەسـتن، کـە دیـارە (فعل المضارع) تازەبوونـەوە و نوێبوونـەوە و ئێسـتا و داهاتـوو دەگەیەنـێ.

دواتـر خـوا ﷻ دێتـە سـەر خستنەڕووی باسێکی دیکـە کـە هـەر پەیوەسـتە بـەو بابەتـەوە، چونکـە کافـرەکان ڕەخنەیـان لـە پێغەمبـەر ﷺ دەگـرت، کـە لـە زۆر شـوێنی قورئـان دا هاتـوە، ڕەخنەیـان دەگـرت کـە: بۆچـی خـوا فریشـتان نانێـرێ؟! لـە سـووڕەتی (الأنعام) و سـووڕەتەکانی دیکـەش دا باسـمان کـردوە، هەمیشـە ڕەخنەیـان گرتـوە: بۆچـی خـوا ﷻ مرۆڤێـك دەنێـرێ ؟! بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ﴾، لـە پێـش تۆشـدا تەنیـا پیاوانێکـمان نـاردوون، وەك ڕەوانەکراوی خۆمـان، کـە سروشـمان بـۆ کـردوون، بـەس پیاوانمـان نـاردوون لـە مرۆڤـان، واتـە: فریشـتەمان نەنـاردوون، ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، ئەگـەر نازانـن لـە خـاوەن کتێبـە پێشـووەکان بپرسـن، ئەوانـەی شـارەزان لـە کتێبـە ئاسـمانییەکان، پرسـیار لـەوان بکـەن: خـوا چەنـدان پێغەمبەری دیکـەی ناردوون؟! هەمووشـیان بـەس مـرۆڤ بـوون، ڕۆژێ لـە ڕۆژان خـوا فریشـتەیەکی بـە پێغەمبـەر و ڕەوانەکـراو نەنـاردوە، هـەروەك پلـەی پێغەمبەرایەتییـش کورتهەڵاتـوە لەسـەر پیـاوان و، ئافرەتـان لـەو پێگـە و پایـەدا نیـن، لەبـەر کۆمەڵێـك تایبەتمەندیـی کـە ئـەرکی پێغەمبەرایەتیـی دەیانخـوازێ، نـەك لەبـەر ئـەوەی کـە خـوا ﷻ ئافـرەت بـە کـەم دابنـێ، بەڵکـو لەبـەر ئـەوەی ئـەرکی پێغەمبەرایەتیـی، بەڵـێ ڕێزلێنـان (تشریف)ە، بـەڵام زیاتـر ئەرکدارکـردن (تكليف)یشـە، ئەرکێـکی قورسـە و ئـەو ئەرکـە قورسـەشی بـۆ هەنـدێ لـە پیـاوان دانـاوە بـۆ هەمووشـیان نیـە !!

ئنجـا ئـەو پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) کـە هاتـوون، ﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ﴾، ئێمـە کـە سروشـمان بـۆ دەکـردن، هـەم بەڵگـە ڕۆشـن و ئاشـکراکان (بينات)یـان پـێ بـوون، هـەم کتێـب و نـووسراوەکان، (زُبـر)، (زُبُر)یـش کـۆی (زَبُـور)ە و، هـەر ڕسـتە و وشـەیەك بەخەتـی درشـت بنووسرێ، پێـی دەوترێ: (زَبُـور).

واتە: پێغەمبەران هەم بەڵگەی ئاشکرا و ڕوونیان هێناوە، هەم کتێب و بەرنامەشیان هێناوە، ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾، زیکریشمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار، ئەم قورئانە بیرخەرەوە و شەرەف و ڕێز و حورمەتە، تاکو هەم ئەوەی کە بۆ خەڵکی نێردراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە: چۆن کاری پێبکەن ؟! هەم بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بکەنەوە، کە تێبگەن و، زیاتر قەدری بزانن و بۆیان دەربکەوێ: فەرمایشتی خوا چەند جیاوازە لە قسەی مرۆڤەکان !

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دیکە، کە ترساندن و ڕاچڵەکاندنی کافر و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، دەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی کە پیلان و فێڵی خراپیان گێڕا، (**أي مَكروا، المَكْرات السَّيئات**)، ئایا ئەوانە دڵنیان لەوەی کە خوا بە زەوییان دا بباتە خوار، زەوی ڕۆبچێ و ئەوانیش پێیدا بچنە خوار! ﴿أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ﴾، یان ئازار و سزای خوایان بۆ بێ لە لایەکەوە کە هەستی پێناکەن، چ لە دنیادا (سزای دنیایی) کە مەبەست پێی ئەوەیە: بەڵا و گرفتێکیان بەسەر بێ، یاخود دنیایان بەسەردا تێکبچێ! ئەو سزایەی کە لە کاتی ئاخیر زەماندا دێت.

﴿أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ﴾، یان ئایا دڵنیان کە خوا لەکاتی هاتن و چوون و سەفەر و هاموشۆیان دا، بیانگرێ و سزایان بدات، ئەو کاتە ئەوان دەسەوسانکەر نابن بۆ خوا و دەرباز نابن لە دەسەڵاتی خوا !

﴿أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾، یان ئایا دڵنیان کە خوا لە کاتێکدا ئەوان لە حاڵەتی ترس و لەرزدان و هەست بە مەترسیی دەکەن، بیانگرێ و سزایان بدات؟! ( تَخَوُّفٖ ) بە مانای (**تَنَقُّص**)ە، واتە: وردە وردە کەموکوڕیی ڕوویان تێ بکات، تاکو دوایی بە یەکجاریی لە بەینیان دەبات! ﴿فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگارتان یەکجار بە پەرۆش و میهرەبان و بە بەزەییە! زانایان دەڵێن: (**الرَّأْفَةُ: أَشَدُّ الرَّحمة**) واتە: بەزەییەکی زۆر.

بەڵام من وای تێدەگەم کە (**رَؤُوف**) واتە: بە پەرۆش، بۆ ئەوەی زیانەکانیان لێ دوور بخاتەوە و، (**رحِيم**) واتە: بە بەزەیی، بۆ ئەوەی سوودەکانیان بۆ بێنێ.

ئنجا لە کۆتایی دا خوا ﷻ بۆ ئەوەی پێشانی کافران و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی بدا، کە ئەوە هەر ئەوانن ڕێزپەڕ و دەگمەنن و لایان داوە، ئەگەرنا ئەم گەردوونە

بەسەر و خواریەوە، هەرچی تێیدایە، بۆ خوا ملکەچە! کەواتە: ئەوان ڕیزپەڕ بوون و، لایان داوە! دەفەرمووێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴾، ئایا سەرنجیان نەداوەتە هەرچییەك كەخوا دروستی كردوە، ﴿ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴾، سێبەرەكانیان لەلای ڕاست و چەپەوە، بە كڕنووش بردوویی بۆ خوا دێن و دەچن! ﴿ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴾، لە حاڵێكدا بۆ خوا ملكەچ و زەبوون و فەرمانبەرن! ئایا تەماشا ناكەن خوا بە پێی ئەو یاسایەی داینـاوە، كاتێ كە خۆر لەلای ڕاستەوە هەڵدێ، لای چەپیان دەبێتە سێبەر و، كاتێ خۆر دەگاتە نیوەڕاست، سێبەر نامێنێ و، دواتر كە خۆر دەداتە لای چەپ، ئنجا لای ڕاستیان دەبێتە سێبەر، ئەو سێبەرە كە دێت و دەچێ، وەك كڕنووش بردن وایە بۆ خوا ﷻ، بەپێی یاسایەك كە خوا داینـاوە.

ئنجا ئەوە بە نسبەت هەموو ئەو شتانەوە كە دیاردەی ماددیی بەرجەستەن، دوایی باسی ژیانداران و فریشتان دەكات: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، هەروەها هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەیە، لە ژیانداران لە فریشتەكان، كڕنووش بۆ خوا دەبەن و خۆشیان بە زل ناگرن! واتە: وەك ئێوەی بێبڕوا و هاوبەش بۆ خوا دانەرنین، كە خۆتان بەزل دەگرن و كڕنووش بۆ خوا نابەن، كەچی كڕنووش بۆ یەكدی و بۆ دارو بەرد و بۆ هەوا و ئارەزووی خۆتان و، بەزم و بازاڕێكی ئەفسانەیی دەبەن! بەڵام هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەیە لە ژیانداران: (الدَّآبـة: **كُلُّ مَـا يَـدُبُّ عَـلَى الأَرْض**) هەرچی لەسەر زەوی دەڕوات، كە سەرجەم (زیندەوەران و پەلەوەر و ژیانداراني نێو ئاو، سەر زەوی و ئاژەڵ و، مرۆڤ و جند) دەگرێتەوە، ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، فریشتەكانیش، هەموویان تێكڕا كڕنووش بۆ خوا دەبەن.

﴿ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، لە حاڵێكدا كە خۆشیان بە زل ناگرن! ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾، واتە: لە پەروەردگاریان دەترسن لە سەروویانەوە واتە: خوا كە باڵادەستە، یان خوا كە لە سەروویانەوەیە، چونكە خوا لە سەرروویە بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، ﴿ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾، هەر فەرمانێكیان پێ دەكرێ، ئەنجامی دەدەن، واتە: سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناكەن و بە ترس و سام و بیمەوە لەگەڵ پەروەردگاریاندا مامەڵە دەكەن.

هەڵبەتە خوا ﷻ لە زاتی خۆیدا سامڵێكراو لێترسراو نیە، بەڵام بۆیە ئەوان دەترسێن، چونكە مەترسیی ئەوەیان هەیە كە بە شێوەیەك نەبن، لەگەڵ پایە و مەقامی پەروەردگاردا بگونجێ! بۆیە ترسیان هەیە لە كردەوەكانیان، ترس لەوەی شتێكیان كرد بێت، كە شایستە و مەقامی بەرز و بێ وێنەی خوای پەروەردگاریان نەبێ و تووشی سزا ببن.

# مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

**هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، ویستی خوا بە هۆكاری شیرك و تاوانیان دادەنێن، خواش بەوە بەرپەرچیان دەداتەوە كە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) تەنیا ڕاگەیاندنی ڕوونی پەیامی خوایان لەسەر شانە و، هەموو كۆمەڵگایەكیش پێغەمبەری تێدا هاتوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾، ئەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا دانا بوو گوتیان.

لە سوورەتی (**الأنعام**)، ئایەتی (١٤١)دا دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾، واتە: لەمەودوا ئەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە دەڵێن، لە سوورەتی (**الأنعام**)دا دەڵێ: لەمەودوا، لێرەشدا دەفەرموێ: گوتیان، كەواتە: ئەمە لە دوای سوورەتی (**الأنعام**)دا دابەزیوە، لەوێ خوا دەفەرموێ: لەمەودوا وا دەڵێن، لە سوورەتی (**النحل**)یشدا دەفەرموێ: گوتیان، یانی: دوای ئەوەی لە سوورەتی (**الأنعام**)دا هەواڵی پێدا بوو، كە كاتێك دێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان ئەوە دەڵێن، لە سوورەتی (**النحل**)دا هەواڵی ئەوەی پێدا، كە ئەوەیان گوت.

(أَشْرَكُواْ) یانی: هاوبەشیان داناوە، بە تەئكید یانی: هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، ئنجا خوا هاوبەشی نین، بەڵام لە خەیاڵ و وەهمی ئەوان دا، پێیان وابوو كە ئەو شتانە هاوبەشن بۆ خوا، واتە: دەبێ وەك چۆن بەندایەتیی بۆ خوا دەكرێ، بۆ ئەوانیش بكرێ! هاوبەشدانەرەكان چییان گوت ؟

٢- ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾، ئەمە لە سووڕەتی (الأنعام)دا هەیە، بەڵام لێرەدا: ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ﴾، ئەگەر خوا ویستبای، نە ئێمە، نە باب و باپیرانمان، جگە لە خوا هیچ شتێکمان نەدەپەرست و، هیچ شتێکمان قەدەغە نەدەکرد، (لەو شتانەی خوا بە حەڵاڵی داناون).

ئەمە مانایەکەی ئاوایە: (**لَوْ شَاءَ اللَّه عَدَمَ عِبادَتِنا لِغَيْرِهِ، مَا عَبَدْنا غَيْرَهُ، وَلَوْ شَاءَ اللَّه عَدَمَ تَحْرِيمِنا لِلْحَلاَلِ، مَا حَرَّمْنا**)، ئەگەر خوا ویستبای ئێمە جگە لە خوامان نەدەپەرست، (نە خۆمان و نە باب و باپیرانمان)، هەروەها ئەگەر خوا ویستبای، هیچ شتێکمان قەدەغە نەدەکرد (نە خۆمان و نە باب و باپیرانمان).

کەواتە: کە کردوومانە، دیارە خوا ویستوویەتی، کە خواش ویستوویەتی، دیارە خوا لەو کارەی ئێمە ڕازییە! ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام) ئایەتەکانی: (١٤٨- ١٤٩)دا، بە درێژیی باسکردوە و، ئەوەمان خستووەتە ڕوو، کە جیاوازیی هەیە لە نێوان ویست و ڕەزامەندیی (**الإِرَادَة، والرِّضَا**)دا و، بە نسبەت خواوە ﷻ، جیاوازیی خستنە نێوان ویست و ڕەزامەندیی، کلیلی کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیە.

هەروەها لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی)دا و[1]، لە کتێبی: (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی)یشدا، باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە، کە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە لەسەر ڕێچکەی ئیبلیسن، چونکە ئیبلیسیش گوتی: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى ... ﴿٣٩﴾﴾ الحجر، واتە: گوتی: پەروەردگارم! لە سۆنگەی ئەوەوە کە تۆ منت بێمراد و بێئاکام و سەرگەردان کرد !

لە کاتێکدا بۆخۆی کڕنووشی نەبردوە و، سەرپێچیی فەرمانی خوای کردوە! کەچی ویستوویەتی هەڵە و سەرپێچییەکەی خۆی لە ملی ویستی خوا بپێچێ !

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لێرەدا کە دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای، نە ئێمە نە باب و باپیرانمان جگە لە خوا هیچ شتێکمان نەدەپەرست و، هیچ شتێکمان قەدەغە نەدەکرد، بەم قسەیان ویست و ڕەزامەندیی خوایان تێکەڵکردوە، بەڵێ، بە ویستی خوا کردوویانە، بەڵام خوا نارازییە لەوە، ئەگەرنا هیچ شتێ بە بێ ویستی خوا نابێ، هەموو شتەکان کە دەبن بە ویستی خوان، بەڵام هەموویان بە ڕەزامەندیی خوا نین، وەك لە

---

(١) بەرگی پێنجەم (ئیمان بە ڕۆژی دوایی و بە قەزاو قەدەر).

سووڕەتی (الزمر) ئایەتی (٧)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ سَيَقُولُ ﴾، واتە: خوا ڕازی نیە بۆ بەندەکانی، کوفر بکەن، (بەڵێ ئەگەر کافر بن، بە ویستی ئەو کافر دەبن، بەڵام خوا پێی ناخۆشە)، ﴿ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، خوا ئەوەی بۆ ئێوە پێ پەسندە و پێی خۆشە، بەڵام مەرج نیە خوا هەر شتێکی ویست، لێی ڕازی بێ و خۆشی بوێ، ویستی خوا وەك ئاسمان وایە، تۆ هەرچی بیکەی لەبن گومبەزی ئاسمان دا دەیکەی و، ناتوانی لە بن سێبەری ئاسمان بچیە دەر، بەڵام مەرج نیە هەر شتێ کە تۆ بە ویستی خوا دەیکەی، ڕەزامەندیی خوای لەسەر بێ، ڕەزامەندیی خوا لەسەر ئەو شتانەیە کە شەریعەت دیارییکردوون: ئەو شتانەی پێ خۆشن، هەروەها شەریعەت ئەو شتانەشی دیارییکردوون کە خوا پێی ناخۆشن، کەواتە: تۆ بەهۆی ئاوێنەی شەریعەتەوە بۆت دەردەکەوێ ڕەزامەندیی خوا لە کوێیە! ئەگەرنا ویستی خوا بۆ تۆ شتێکی پەنهانە، بەڵام شەریعەتی خوا لەبەر دەستی تۆیە، ئیرادە تەشریعییەکەی خوا لەبەر دەستی تۆدایە، دەزانی خوای پەروەردگار چی بۆ تۆ ویستوە و چی لە تۆ داواکردوە، چی بۆ تۆ پێ چاکە و چی بۆ تۆ پێ خراپە !

٣- خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەوانەی پێش ئەوانیش هەر وایانکرد، واتە: ئەوانەی پێش ئەوانیش کە خوا لە بەینی بردوون و سزای داون، هەر ئاوا بیریان کردۆتەوە، ئاوا بڕو بیانوویان هێناوەتە وە، ئاوا بیانوویان بە ویست و قەدەری خوا گرتوە، کە: ئەوەی ئێمە دەیکەین، مادام ویستی خوای لەسەرە، کەواتە: دیارە خوا لێی ڕازییە! بێ خەبەر لەوە کە ویستی خوا، فراوانە و گشتگیرە، بەڵام ڕەزامەندیی خوا تایبەتە و، ڕەزامەندیی خوا بەهۆی شەریعەت و وەحیی و پەیامی خواوە، کە بە پێغەمبەراندا دەینێرێ، بۆمان دەردەکەوێ، کە ڕەزامەندیی خوا لە کوێیە و تووڕەیی خوا لە کوێیە !

٤- بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾، واتە: ئایا جگە لە گەیاندنی ڕوون و ئاشکرا، هیچ ئەرکێکی دیکە لەسەر پێغەمبەران هەیە ؟! (البَلاَغُ: اسْم مَصْدَرِ الإِبْلاَغ، وَالمُبِين: الوَاضِحُ)، (بَلاَغ) ناوی چاوگی (گەیاندن)ە، (مُبِين)یش، واتە: ڕوون و ئاشکرا، یانی: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) تەنیا گەیاندنی پەیامی خوایان بە ڕوون و ئاشکرایی لەسەرە، ئەوەشیان کردوە، دوایی دەکەوێتەوە سەر خۆتان، لە پەیامی ڕوون و ئاشکرای خوای پەروەردگاریشدا، هەیە کە تەنیا خوا بپەرستن و، دیارییکردنی حەڕام و حەڵاڵ، تەنیا مافی خوای پەروەردگارە، کەواتە: ئەوە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەربگرن و، ئەگەر ئەو ئەرکە کە پێغەمبەران جێبەجێیان کردوە لە نێو ئێوەدا، ئێوە ڕێزتان لەو ئەرکە گرتبایە و پابەندبوونایە بە بەرنامەی خواوە، ئەو

کاتە نە جگە لە خواتان دەپەرست، نە شتێکیشتان قەدەغە دەکرد کە شەریعەتی خوا بە حەڵاڵی داناوە، بە کەیفی خۆتان حەڵاڵ و حەرامتان دیاریی نەدەکرد و، ئەو مافەتان بە خۆتان نەدەدا کە تەنیا مافی خوای پەروەردگارە.

مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە:

پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) تەنیا گەیاندنی پەیامی خوایان لەسەرە، دواتر بەرپرسیاریەتی لەسەر مرۆڤەکانە.

بۆیە دواییش دەفەرموێ:

٥- ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا ﴾، واتە: ئێمە لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوانەکراوێکمان ناردوە و پێغەمبەرێکمان ناردوە، وەك لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: هیچ کۆمەڵگایەك نیە، مەگەر ترسێنەر و وریاکەرەوەیەکی تێدا ڕەوانە کراوە.

ئنجا ئایا خوا ئەو ڕەوانەکراوەی بۆچی ناردوە ؟

٦- ﴿ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾، کە بە خەڵکەکە بڵێ: تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، دوورە پەرێزیی لە **طاغووت** بکە، (**طاغوت**) واتە: هەر پەرستراوێك جگە لە خوا، چونکە: (**الطُّغْيانُ: مُجَاوَزَةُ الحَدِّ فِي العِصْيانِ**)، (**الطُّغْيانُ**) بریتیە لە سنوور دەرچوون لە سەرپێچییکردنی خوادا.

هەڵبەتە خوا بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ)دا - کە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا پێغەمبەرێکی ناردوە - ڕایگەیاندوە: ﴿ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ ﴾، کە خوا بپەرستن، ﴿ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾، دوورە پەرێز بن لە **طاغووت** و خۆتانی لێ دوور بگرن، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ﴿٢٥٦﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێ بێبڕوا بێ بە طاغووت و، بڕوا بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە قوڵفەیەکی زۆر قایم گرتوە کە هەرگیز پسانی بۆ نیە.

(**نَفي**) لابردن، ئنجا (**إثبات**) چەسپاندن، (**تَخلية**) ئنجا (**تَحلية**)، وشەی (**توحيد**)یش هەروایە، (**لا إلهَ إلا اللّه**) هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێ، جگە لە خوا ﷻ، پێشێ دەبێ لابردنی (**نفي**) بێت، ئنجا چەسپاندن (**إثبات**)، جێی خۆی دەگرێ، پێشتر

دەبێ خۆت بژار بکەی لە شیرك و کوفر و لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشن، ئنجا خۆت بڕازێنیەوە بە ئیمان و تەوحید و بەو شتانەی کە خوا پێی چاکن.

٧- ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ﴾، ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە خوا ناردوونی، لە هەر کۆمەڵگایەدا، دوای ئەوەی کە پەیامی خوایان گەیاندوە، ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ﴾، لە خەڵکەکەدا کەسانێك بوون خوا ﷻ خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، ڕاستە ڕێی کردوون، ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ﴾، بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، ڕێنماییەکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە هەمووانیان گەیاندوە بە یەکسانیی، کە پێیان فەرموون: ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ﴾، خوا بپەرستن و لە **طاغووت** دوور بن! ئەوە ڕێنمایی خوا و هیدایەتی خوا گەیشتوە بە هەمووان، بەڵام: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ﴾، ئنجا لە نێو ئەوانەدا کە پەیامی خوایان پێگەیشتوە و هیدایەتی خوایان وەرگرتوە و بۆیان ڕوون بۆتەوە، کەسانێك هەبوون کە شایستەی ئەوە بوون، خوا ڕاستە ڕێیان بکات: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ﴾، ئیدی خوا خستنیە سەر ڕێی ڕاست.

٨- ﴿وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾، هەشیان بوو کە گومڕایی لەسەر چەسپا، گومڕایی بەسەردا چەسپا، نەك خوا گومڕای کرد بێ، بەڵکو خۆی هیدایەتی خوای ڕەفز کردوە و، هەر کەسێکیش ڕێنمایی و هیدایەتی خوا ڕەفز بکات، بێگومان گومڕا دەبێ، ئەوانەی دیکەش ڕێنمایی خوایان قبووڵکرد، هەرکەسێکیش ڕێنمایی خوا قبووڵ بکات، ڕاستە ڕێ دەبێ، هەر کەسێك ئەو بەرچاوڕوونییەی خوا بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)دا دەینیرێ، قبووڵی بکات، دەتوانێ کە ڕێی ڕاستی پێ بگرێ، بەڵام هەر کەسێك ئەو بەرچاو ڕوونییەی خوا بە پێغەمبەراندا دەینیرێ، ڕەفز بکات و پشتگوێی بخات، بێگومان بە دیلی بەرچاو ڕوونیی، بریتیە لە کوێریی و بەرچاو لێڵیی، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴿١٧﴾﴾فصلت، واتە: گەلی (**ثمود**)مان ڕێنمایی کرد بوو، بەڵام کوێرییان بەسەر بەرچاو ڕوونیی و، ڕۆشنایی دا هەڵبژارد، ئنجا کە بۆ خۆیان کوێریی هەڵبژێرن، خوا ﷻ بە تۆبزیی ملیان ناگرێ ؟! چونکە ئەگەر ویستبای وایان بخوڵقێنێ کە سەرپێچیی نەکەن، وەك فریشتەکان، وای دەخوڵقاندن، بەڵام خوا مرۆڤەکانی وا دروستکردوە، کە بتوانن چاکە بکەن و، خراپە بکەن، کوفر بکەن و، ئیمان بێنن، بۆ ئەوەی کە بە کەڵکی جێنشینایەتیی خوا لەسەر زەوی و، بە کەڵکی تاقیکرانەوە، بێن.

٩- ﴿فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟﴾، بە زەویدا بڕۆن و چاو بگێڕن، بە شوێنەوارەکانیاندا، واتە: شوێنەواری گەلە پێشووەکان ببینن، کە پێغەمبەرانیان بۆ چوون (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

١٠- ﴿كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾، (سەرنج بدەن) سەرەنجامی بەدرۆدانەران چۆن بووە ؟! ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، بە زەوی دا بڕۆن، دەگونجێ ڕۆیشتنی جەستەیی بێ، واتە: بە کردەوە و بە جەستە بە زەوی دا بڕۆی، دەشگونجێ مەبەست پێی گەشتی فیکریی تیۆریی و مەعنەویی بێ: (**السَّيْرُ النَّظَرِي أَو الفِكري والمَعْنَوِي**) واتە: سەرنج بدەی، بیر بکەیتەوە لەبەر خۆتەوە، بخوێنیتەوە، کە سەرەنجامی ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، چۆن بووە ؟!

واتە: ئەوانەی بە ئیرادە و ویستی خۆیان پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، تەماشا بکەن سەرەنجامیان چۆن بووە ؟! ئێوەش کە بە ویستی خۆتان پەیامی پێغەمبەران وەرناگرن و، بە دوای شەریعەتی خوا ناکەون، کە بە پێغەمبەران دا ناردوویەتی، ئەوە خۆتانن وا بە خۆتان دەکەن، کەواتە: بۆچی ئۆباڵی گومڕایی و، سەرگەردانیی خۆتان، دەخەنە ویستی خوای پەروەردگارو، قەدەری خواوە ؟!

**مەسەلەی دووەم:**

**خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر تۆ مکوڕی لەسەر خستنە سەر ڕێیان، واتە: لەسەر ڕاستە ڕێ کردنیان، بێگومان خوا کەسانێك کە بڕیاری گومڕایی لەسەر داون، ڕاستەڕێیان ناکات و، لە دوارۆژییشدا هیچ پشتیوان و، سەرخەرێکیان نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ ﴾، ئەگەری تۆ مکوڕی، سووری لەسەر ڕاستە ڕێ کردنیان، هەر دەتەوێ بیانخەیە سەر ڕێی ڕاست، (**الحِرْصُ: فَرْطُ الإِرَادَةِ المُلِحَّةِ فِي تَحْصِيل المُرَادِ بالسَّعي فِي أَسْبابِهِ**)، (**حِرْص**): بریتیە لەوە کە ئینسان بە زۆر بیەوێ شتێ بکات، مکوڕ و سوور بێت لەسەری، بە شێوەیەك هۆکارەکان بێنێتە دی بۆ ئەوەی بگاتە ئەو ئامانجە.

لێرەدا وشەی (**هُدَىٰهُمْ**) واتە: خستنە سەر ڕێی ڕاست، نەك ڕێنمایی کردن، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی کردوون، بەڵام ئایا دوای ئەوەی کە ڕێنمایی کردن و، پەیامی خوای پێگەیاندن و، بەرچاو ڕۆشنیی پێدان، بە دەست پێغەمبەرەﷺ بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست؟! بێگومان نەخێر.

٢- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ﴾، بێگومان خوا کەسێك کە گومڕای کرد بێ، نایخاتە سەر ڕێی ڕاست، واتە: کەسێك کە شایستەی ئەوە بوو بێ، گومڕابێ و، یاسای خوای بەسەردا چەسپا بێ و گومڕا بێ، ئەوە تازە یاسای گومڕاکردنی خوا گرتوویەتەوە و، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خۆی هۆکارەکانی دەستەبەر کردوون، کەسێکیش ئەو یاسای خوایەی بەسەردا چەسپا بێ، یاسای خستنەسەر ڕێی ڕاستی خوای پەروەرگاری بەسەردا ناچەسپێ !

٣- ﴿ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾، هیچ یارمەتیدەرو هاوکارو سەرخەرێکیشیان نیە (لە ڕۆژی دوایی دا)، ئەمە خوا ﷻ لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾الأعراف، واتە: هەر کەسێ خوا گومڕای بکات، هیچ هاوکارێکی نیە بیخاتە سەر ڕێی ڕاست و، لێیان دەگەڕێ، لە سەرکێشیی خۆیاندا سەراسیمە دەبن.

هەروەها لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٦﴾﴾ الزمر، واتە: هەر کەسێك خوا گومڕای بکات، هیچ کەسێك نابێ کە بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، وشەی (**هَاد، هُدَى، هَادِي**) لێرە لە هەموویاندا، واتە: خستنە سەر ڕێی ڕاست، نەك ڕێی پیشاندان، چونکە بێگومان خوا ڕێی پێشانی هەموو کەس داوە، لەسەر زمانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بەڵام ئەوە خۆیانن دوایی ئەو ڕێیە ڕاستەی کە خراوەتە بەرچاویان، دەیگرنەبەر، یان نایگرنەبەر ؟!

لە سوورەتی (**القصص**)یشدا خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ... ﴿٥٦﴾﴾، واتە: تۆ ئەو کەسەی خۆشتدەوێ، ناتوانی بیخەیە سەر ڕێی ڕاست، دەتوانی ڕێنمایی بکەی، بەڵام ناتوانی بیخەیە سەر ڕێی ڕاست، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ، دەتوانێ بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام خوا نەیویستوە بە زۆر خەڵك بخاتە سەر ڕێی ڕاست و ڕاستە ڕێیان بکات، بۆیە ئازادی کردوون و دەستی ئاوەڵا کردوون، ئنجا کە ئازادی کردوون: هەیانە کە ڕێیە ڕاستەکەی خوای پەروەردگاری گرتوە و، هەشیانە کە ئەو ڕێیە ڕاستەی نەگرتوە و خواش سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى دەرفەتی بە هەموویان داوە، چونکە ئەگەر وا نەبێ، تاقیکردنەوەی خوا بۆ مرۆڤ لە ژیانی دنیادا نایەتە دی.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان سوێندی قورسیان بە خوا خوارد، کە خوا ﷻ مردووان زیندوو ناکاتەوە، خواش بەرپەرچیان دەداتەوە کە: با، زیندوویان دەکاتەوە و بەڵێنی حەقی داوە و، دەبێ دادوەرییان لە نێواندا بکرێ و، کافران بزانن کە درۆیان کردوە و خواش هەرچی بوێ بە چاو ترووکانێك دەیکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ ۚ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَـٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾، واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و بێبڕوایەکان سوێندیان بە خوا خوارد بەوپەڕی جەختکردن و تێکۆشانەوە، (**اجْتَهَدُوا فِي القَسَم**) واتە: خۆیان تێدا ماندوو کرد، زۆر هەوڵیان تێداداو، جەختیان کردەوە، کە سوێندەکەیان سوێندێکی قورس و دڵنیاکەر بێ، هەڵبەتە کەسێك سوێندی وا دەخوات، کە یان دڵنیا بێت لە شتێك، یاخود بیەوێت وا بکەوێتە بەرچاو کە دڵنیایە، کە بێگومان هی ئەو کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، ئەوەی دووەمیانە.

واتە: ویستوویانە وا پیشان بدەن، کە زۆر دڵنیان لەوەی کە هەرگیز خوا ﷻ مردووان زیندوو ناکاتەوە، چونکە هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکان خوایان ناسیوە و بڕوایان بە خوا بووە، وەك ئیعتیقاد، نەك وەك ئیمانی شەرعیی، خوایان ناسیوە، بەڵام نکووڵییشیان لە زیندووکرانەوە کردوە، کافرەکان سوێندیان بە خوا خوارد و لە سوێندەکەیاندا زۆر جەختیان کردەوە و داکۆکییان کرد، لەسەر چی ؟!

٢- ﴿لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ﴾، کە ئەوەی کە بمرێ خوا زیندووی ناکاتەوە، بۆیە هەردووکیانی بە (**الفعل المضارع**) هێناوە، تاکو ئەو حاڵەتی زیندووکردنەوە و، حاڵەتی مردنەکە، بخاتە بەرچاو، ﴿لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ﴾، خوا زیندوو ناکاتەوە، ﴿مَن يَمُوتُ﴾، کەسێك کە دەمرێ، یانی: ئەگەر

فەرمووبای: (لَا يَبْعَثُ اللَّهُ المَيِّتَ)، خوا مردوو زیندوو ناكاتەوە، هەر هەمان مانای دەگەیاند، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بە تەعبیرێك فەرموویەتی، كە ئەو حاڵەتی مردنە، وێنا بكرێت لەبەر چاو، كە لە زۆر لە ئایەتەكانی قورئاندا، ئەو بنچینەیە ڕەچاو كراوە.

٣- ﴿بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا﴾، وشەی ﴿بَلَىٰ﴾ لە كوردییدا، واتە: با، هەمیشە لە ڕستەی پێشێدا، ئەگەر شتێك نەفی كرابێ و لابرابێ، لە بەرانبەریدا دەگوترێ: ﴿بَلَىٰ﴾، واتە: با، ئەگەر فەرمووبای (نعم) واتە: ڕاست دەكەن خوا ئەوەی دەمرێ، زیندووی ناكاتەوە، بەڵام ﴿بَلَىٰ﴾، واتە: با، خوا زیندووتان دەكاتەوە و كەسێك بمرێ، دەیژیەنێتەوە، بۆچی؟! ﴿وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا﴾، ﴿وَعۡدًا﴾، چاوگە یانی: (وَعَدَاللَّهُ، وَعْدَاً)، واتە: خوا بە بەڵێندان بەڵێنی داوە و گفتی داوە، ﴿حَقّٗا﴾، بەڵێنی خواش ڕاستە و چەسپاوە.

٤- ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن، چی نازانن ؟! خوای پەنهانزان مەفعوولەكەی قرتاندوە، تاكو زەین بۆ هەر شتێك كە بگونجێ لەگەڵ ئەو سیاق و ئەو مەبەستەدا، بۆی بچێ و، ئێستا چەمك و واتایەكەی زۆر فراوانتر بووە، وەك لەوەی كە دیاریی كردبایە، بۆ وێنە، فەرمووبای:

أ- (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ قُدْرَةَ اللَّه)، ب- (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ حِكْمَةَ اللَّه في الخلق)، ج- (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ أن الحياة ليست عَبَثاً)[1].

ئەو كاتە تەنیا ئەوەی دیارییكراوە دەیگەیاند، بەڵام ئێستا مانایەكەی زۆر فراوانە ئاشكراشە: زۆربەی خەڵكی ئەوانەن كە هاوبەش بۆ خوا دانەرن، ئەوانەن كە بێبڕوان، زۆربەی خەڵكی نازانن، ئەگەر زانیبایان، كەسێك خوا بناسێ دەزانێ: كە دەسەڵاتی خوا، ویستی خوا، زانیاریی خوا، حیكمەتی خوا، هەموو سیفەتەكانی خوا، ڕەها و بێ سنوورن، سنوورێك نیە كە لێی بوەستن، تاكو بڵێی: خوا ئەوەی بۆ دەكرێ و، ئەوەی بۆ ناكرێ، ئنجا ئەوە خوا بەڵێنی داوە و بەڵێنی خواش چەسپاوە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

٥- ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ﴾، هۆكارو پاڵنەرێكی دیكە، بۆ ئەوەی خوا مردووان زیندوو بكاتەوە، ئەوەیە كە ئەوەی تێیدا كەوتوونەتە ڕاجیایی و ناكۆكییەوە، بۆیان ڕوون بكاتەوە، ئەوەی كە

---

(١) واتە:
أ- بەڵام زۆربەی خەڵك توانای خوا نازانن.
ب- بەڵام زۆربەی خەڵك حیكمەتی خوا لە دروستكراوەكانی دا نازانن.
ج- بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن كە ژیان پووچ و هەوەنتە نیە.

تێیدا کەوتوونە ناکۆکیی و مشتومڕەوە، واتە: کافرەکان لەگەڵ بڕواداران و، هاوبەشدانەران لەگەڵ خوا بەیەکگران، دەبێ ئەوەیان بۆ ڕوون بکرێتەوە، ئەو کەسەی کە لەسەر هەق بووە، پێی بگوترێ: تۆ هەقی! ئەوەش کە لەسەر ناهەق بووە، پێی بگوترێ: تۆ ناهەقی، ئنجا ئەوەی کە لەسەر هەق بووە، پاداشتی بدرێتەوە و، ئەوەی دیکەش سزا بدرێ، ئەگەر وانەبێ ئەوە ژیانی دنیا و ژیانی مرۆڤ، بە شتێکی پووچ و بێ ئامانج دێتە بەرچاو، خواش ﷻ بەرزە و دوورە لەوە کە شتێکی پووچ و بێ ئامانج بکات، وەك لە کۆتایی سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ واتە: ئایا ئێوە پێتان وایە بەهەوەنتە بە پووچ و، بە بێ ئامانج ئێوەمان دروستکردوە و بۆ لای ئێمە ناگێڕرێنەوە! ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ﴾، خوای حکومڕانی هەق، بەرزە واتە: بەرزترە لەوەی کە شتێك بکات پووچ بێ و، بێ حیکمەت و ئامانج بێ.

٦- ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ﴾، هەروەها هۆکارێکی دیکە، بۆ ئەوەی خوا مردووان زیندوو بکاتەوە، ئەوەیە کە ئەوانەی بێبڕوا بوون، بزانن کە درۆزن بوون و درۆکار بوون، (يَتَبَيَّنَ لَهُم كَذِبُهُم)، بۆ ئەوەی درۆی خۆیانیان بۆ دەربکەوێ و بزانن کە درۆیان کردوە.

بەڵێ ئەگەر خوا ﷻ مردووان زیندوو نەکاتەوە و ژیان تەنیا لەو چوارچێوەی پێنج و دوو ڕۆژی دنیادا خولاصە بێتەوە و، مرۆڤ هەر ئەوەندە بژی کە لەم سەر زەوییەیە، ئیدی هیچ قۆناغی دیکەی ژیان نەبێ، کەواتە: ئینسان بە قەدەر فیل و کیسەڵێکیش، نەژیا، کە ئەوانە تەمەنیان زۆر لە مرۆڤ زیاترە !! نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو دروستکراوی دیکەی وا هەیە وەك چیایەکان، کە ملیۆنان ساڵە خوا دروستی کردوون، ئەگەر ملیۆنانیش زیاتر نەبن، وەك زانایانی گەردووناس و زانایانی زەویناس دەڵێن، بەڵام ئەمە شتێکی زۆر نامەنتیقییە، چونکە خوا ﷻ - وەك لە واقعیشدا دەیبینین - هەرچی لەسەر زەوییە، بۆ مرۆڤی دروستکردوە و، هەمووی بۆ مرۆڤ ملکەچ و دەستەمۆ کراوە و لێی بەهرەمەندە.

کەواتە: ناگونجێ مرۆڤ لە زۆرێك لەو شتانە، تەمەنی کەمتری پێ ڕەوا بینرابێ، لە حاڵێکدا کە حکومڕانی هەموو شتەکانە و هەموو شتەکان لەبەر دەستی وی دان و لە خزمەتی دان، کەچی بۆخۆی تەمەنی لە زۆریان کەمتر بێ ؟! ئەوە شتێکی نامەنتیقییە، کەواتە: ژیانی مرۆڤ نابێ تەنیا ئەو ژیانە زەوییەی بێ، بەڵکو ئەمە بەس قۆناغێکە و قۆناغی دیکەی بەدوادا دێن.

کەواتە: بەلایەنی کەمەوە سێ پاڵنەر هەن، بۆ ئەوەی خوا مردووان زیندوو بکاتەوە، بە پێی ئەم ئایەتانە:

**یەكەم:** خوا بەڵێنی داوە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن، ئەمەش دەرخەری ئەوەیە كە هۆكاریی بێبڕواییان لەبەر نەزانینیانە.

**دووەم:** بۆ ئەوەی كە خوا ناكۆكییەكانیان بۆ دەربخات، ئەوەی كە تێیدا كەوتوونە ڕاجیاییەوە، بۆیان دەربخات و دادوەرییان لە نێواندا بكات.

**سێیەم:** بۆ ئەوەی بێبڕوایەكان بزانن كە ئەوان درۆزن بوون و، بە هەڵەدا چووبوون.

كەواتە: زیندووكرانەوە و لێپرسینەوە، سێ پاڵنەری هەن، ئنجا هیچ ڕێگریشی نین، ئنجا هەر شتێك پاڵنەر هەبێ بۆ پەیدابوونی و، ڕێگر نەبێ لەبەردەم پەیدابوونی دا، بە تەئكید پەیدا دەبێ.

ئنجا ئایا بۆچی هیچ ڕێگرێك نیە ؟!

٧- ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، واتە: قسەی ئێمە بۆ شتێك، كە ئەو شتەمان ویست پەیدای بكەین، هەر ئەوەیە كە پێی بڵێین: ببە، یەكسەر دەبێ.

﴿أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، ئەمە بە: (كُنْ فَيَكُونَ)ەش خوێنراوەتەوە، ئەگەر بڵێین: ببە، دەبێ، یاخود پێی بڵێین: ببە، یەكسەر پەیدا بووە.

كەواتە: خوا ﷻ سێ پاڵنەری سەرەكیی دەخاتە ڕوو بۆ ئەوە، كە مردووان زیندوو بكاتەوە، ئنجا هیچ پەرچێكیش نیە لەبەردەم ئەوەدا كە خوا مردووان زیندوو بكاتەوە، چونكە تاكە پەرچێك كە هەبێ، ئەوەیە كە خوا نەتوانێ، خوای پەروەردگاریش هەر شتێكی بوێ بە چاوتروكانێك دروستی دەكات، كەواتە: پاڵنەر هەیە بۆ زیندووكردنەوەی مردووان و، پەرچیش نیە لەبەردەمیدا، كەواتە دێتە دی.

ئایا مەبەست لە وشەی: (كُن) چییە ؟

(المراد ب (كن) تَوَجُّه القُدْرَة إِلَى إِيجَاد المَقْدُور) كە خوا دەفەرموێ: قسەمان بۆ شتێك كە ویستمان، (ویستمان پەیدای بكەین) ئەوەیە پێی بڵێین: ببە، یەكسەر دەبێ، یان یەكسەر بووە، بێگومان مەبەست لە: (كە پێی بڵێین: ببە، دەبێ)، ڕووكردنە ویستی خوایە بۆ پەیداكردنی شتێك كە لە ژێر ڕكێفی دایە.

لـە سـوورەتی (یـس)دا بـە تەعبیرێـکی دیکـە هێناویـەتی دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢﴾، واتــە: فەرمـانی خـوا کاتێـك کـە شـتێکی ویسـت، ئەوەیـە کـە پێـی بفەرمـوێ: ببـە، دەبـێ، کـە بێگومـان فەرمـوودە و فەرمـانی خـوا، هەمـووی مەبەسـت پێـی تەعبیرکردنـە، لـە ڕووکردنـە ویسـتی خـوا، ڕوو بکاتـە ئـەو شـتە و بـە ویسـت و دەسـەڵاتی بێسـنوری ڕەهـای خـۆی ئـەو شـتە پەیـدا بـکات.

(**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) جـوان ئـەو بابەتـە تەعبیـر دەکات و دەڵـێ: (**وَهَـذَا تَقْرِيـب لِلنـاسِ بِمَـا يَعْقِلُـونَ، وَلَيْـسَ هُـوَ خِطَابـاً لِلمَعْـدُوم، وَلاَ أَنَّ لِلمَعْـدُومِ سَـمْعَاً يَعْقِـلُ بـِهِ الـكَلاَمَ فَيَمْتَثِـلُ لِلآمِـرِ**).

واتــە: ئـەم تەعبیـرە نزیـك خسـتنەوەیە لـە خەڵـکی بـە شـێوەیەك کـە تێبگـەن، ئەگەرنـا ئـەوە دوانـدنی نەبـوو (**معـدوم**) نیـە، شـتێك کـە نەبـێ بدوێـنرێ، هەروەهـا ئـەوەش نیـە شـتێك کـە نەبـێ، بیسـتنی هەبـێ و لـەو قسـەیە تێبگـات کـە ئاڕاسـتەی دەکـرێ و سـەرەنجام فەرمانبـەر ببـێ.

وەك زانایـان لەوبـارەوە زۆر مشـتومڕیان کـردوە، لـە نێـوان ئەشـعەریی و ماتۆریدییەکانـدا لـە لایـەك، لـە لایـەکی دیکـەوە: موعتەزیلـەکان و ئەوانـەی دیکـە، کـە لەگەڵیانـدا ناکـۆك بوون!

کـە ڕاسـتییەکەی هـەر ئەوەیـە: خـوا ﷻ ویسـتوویەتی ئـەوە لـە ئێمـە حاڵیـی بـکات، کـە زۆر ئاسـانە بـۆ خـوا، مـردووان زینـدوو بکاتـەوە، وەك چـۆن کەسـێك بـە شـتێك بڵـێ: ببـە، یەکسـەر پەیدابـێ، ئـەوە چەنـد ئاسـانە؟! بـۆ خـوای پەروەردگاریـش ئەوەنـدە ئاسـانە و، هـەر کاتێـك ویسـتی شـتێك پەیـدا بـکات، یەکسـەر پەیـدای دەکات، چونکـە هیـچ شـتێك لـەوە خێراتـر نیـە تـۆ بـە شـتێك بڵێـی: ببـە، یەکسـەر پەیـدا بێـت، بەپێـی عەقڵـی ئێمـە ئـەوە بـە خێراتریـن پڕۆسـەی پەیداکـردنی شـتەکان تێدەگەیـن، بۆیـە خـوا ﷻ ئـەو ڕووتێکـردنی ئیـرادە و دەسـەڵاتی خـۆی بـۆ شـتەکان کـە پەیدایـان بـکات، بۆمـان دەخاتـە ئـەو قاڵبـە تەعبیرییـەوە، کـە بـۆ ئێمـە ئەمـە ئاسـانترین و، بـە سـێناییترین حاڵـەتی پەیداکـردنی شـتێکە، ئێمـە لـەوە تێدەگەیـن و خـوای کارزانیـش بەپێـی عەقڵـی ئێمـە، دەماندوێنـێ.

## مەسەلەی چوارەم:

**خـوا عزوجـل ڕایدەگەیەنـێ کـە ئـەو کەسـانەی پـاش سـتەم لێکـران و چەوسـێنرانەوە لـە ڕێـی خـوادا کـۆچ دەکـەن، لـە دنیـادا دەرووی خێریـان لـێ دەکاتـەوە و، پاداشـتی دواڕۆژیشیان، ئەگـەر بزانـن گەورەتـرە، بـە مەرجێـك خۆڕاگـر و پشـت بـە خـوا بەسـتووبن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

**١-** کە دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ ﴾، واتە: ئەوانەی لە پێناوی خوادا کۆچیان کردوە، (**المَهَاجَرَة: مُتَارَكَة الدِّيار لأجل مرضاه اللَّه**)، (**مهاجرة**) وازلێهێنانی ماڵ و حاڵ و نیشتیمانە، لە پێناو ڕەزامەندیی خوادا، واتە: بۆ مەبەستێکی دیکە ماڵ و حاڵیان بەجێ نەهێشتوە، بۆ وێنە: شوێنەکەی خۆیان پێ خۆش نەبێ، بچنە شوێنێکی خۆشتر، یاخود ئامانج و مەبەستێکی تایبەتییان هەبێ لەو شوێنەی کە بۆی دەچن، بچن جێبەجێی بکەن، بۆ وێنە: ئافرەتێك هەبێ حەزی لێبکەن، یاخود کەسابەتێك هەبێ لەوێ ئەنجامی بدەن، یاخود خزمێکیان لەوێ هەبێ پێکەوە کۆببنەوە، ئەو ئامانجانەیان نیە، بەڵکو تەنها بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوایە.

ئنجا ئەو کۆچکردنەش:

**٢-** ﴿ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا ﴾، واتە: دوای ئەوەی ستەمیان لێکراوە، ئاشکرایە لەلایەن کێوە؟ (**مِنْ قِبَلِ الكُفَّار**) بەڵام خوا بە (بکەر نادیار) (**مَجْهول الفاعل**) دەیهێنێ، تاکو ئاماژە بێ بەو ستەمەی کە لێیان کراوە، کە شتێکی زۆر زۆر ناقۆڵا و ناشیرینە.

وشـەی (**ظُلْم**)یـش هەمـوو جـۆرەکانی دەسـتدرێژیی و ئەزیەتـدان و، ئەشـکەنجەدان و، ناڕەحەتکـردن و، بێزارکـردنی ماددیـی و مەعنەویـی دەگرێتـەوە، واتـە: ئـەو کۆچکردنەیـان لەخـۆوە نەبـووە، بەڵکـو دوای سـتەم لێکراویـی و ئـازار و ئەشـکەنجەدان بـووە، لەلایـەن ئەوانـەوە کـە هـەر لـەوان دەوەشـێتەوە، ئیمانـداران ئەزیـەت و ئەشـکەنجە بـدەن، کـە بریتین لـە ئەهـلی کوفـر و ئەهـلی شـیرك.

ئنجا ئایا ئەوانە خوا چییان بۆ دەکات ؟!

٣- ﴿لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ﴾، واتە: لە ژیانی دنیادا جێ و ڕێیەکی باشیان بۆ پەیدا دەکەین، (التبوئة: الإِسْكانُ، إِذْ يُضَادُّ الهِجْرَةَ: الإِسْكانُ)، (التبوِئَة)، (بَواء) یانی: یەکسانیی، ئنجا (بَوَّءَهُ) واتە: شوێنی بۆ خۆشکرد، (التَّبْوِئَة) لێرەدا بە مانای نیشتەجێ کردن دێ، چونکە پێچەوانەی کۆچکردن نیشتەجێ کردنە، کەسێ لەسەر ماڵ و حاڵ و نیشتیمانی هەڵدەقەنرێ، پێویستترین شت بۆی، ئەوەیە کە جێ و ڕێ و شوێنێکی هەبێ، تێیدا نیشتەجێ بێت، باری هەر لەسەر پشتی کەرێ نەبێ و، کۆڵی هەر لەسەر پشتی نەبێ، شوێنێك هەبێ تێیدا سوکنایی بۆ بێت و تێیدا ئارام بگرێ.

بەڵـێ بۆیـە خـوا ﷻ ئـەوەی باسـکردوە، چونکـە بـۆ بابـای کۆچکـردوو، بـۆ بابـای ئـاوارە و دەربـەدەر، پێـش هەمـوو شـتێك جێـی و ڕێ و مـاڵ و حاڵـە پێویسـتە، بۆیـە بـاسی شـتی دیکـەی نەکـردوە و بێگومـان نیشـتەجێکردن، شـتەکانی دیکـەشی بـەدوا دێـن، وەك خـواردن و خـۆراك و بـەرگ و پۆشـاك و دابینکـرانی پێداویسـتییەکان.

٤- ﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُ﴾، واتە: پاداشتی دوارۆژیش گەورەترە، بە دڵنیایی پاداشتی دوارۆژ ڕەزامەندیی خوایە و بەهەشتی خوایە.

٥- ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾، ئەگەر زانیبایان یانی: ئەگەر بڕواداران ئەوە بزانن، هەڵبەتە بڕواداران بە کورتیی دەزانن کە بەهەشت خۆشترە لە دنیا، بەڵام بێگومان جگە لەوەی کە خوا بە وەحیی پێیان ڕادەگەیەنێ، وردەکارییەکانی نازانن، بۆیە ئەگەر زانیبایان وەك خۆی بەهەشتیان ناسیبایە، وەڵامی ئەگەر ( لَوۡ ) قرتێنراو (**محذوف**)ە، یانی: ئەگەر زانیبایان زۆر زۆر دڵخۆش دەبوون، یاخود ئەگەر زانیبایان هیچ ئاویان لە کۆچکردن و، ئاوارە بوون نەدەخواردەوە، لە پێناوی خوادا.

واتایـەکی دیکـەی ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾، ئەگـەر بێبڕوایەکانیـش زانیبایـان بەهەشـت چەنـد خۆشـە (**لَفَعَلُوا مَا فَعَلَهُ المُؤْمِنُون**) ئەوانیـش ئەوەیـان دەکـرد کـە بـڕواداران کردوویانە، کـە بریتیە لـە ئیـمان هێنـان و بەندایەتیـی ئەنجامـدان بـۆ خـوا و پابەندیـی بـە شـەریعەتی خـواوە.

ئنجـا دوایـی پێناسـەی ئەوانەمـان بـۆ دەکات کـە کـۆچ دەکـەن لـە پێنـاوی خـوادا، دەفەرمـوێ:

٦- ﴿ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ﴾، واتە: ئەوانەی کە خۆیان ڕاگرتوە، خۆڕاگر بوون، لەسەر چی خۆڕاگر بوون ؟! لەسەر سەختییەکان، لەسەر کۆسپ و تەگەرەکان کە دێنە ڕێیان لەبەردەم کۆچکردن و نیشتمان بەجێهێشتندا، کە پێش هەموو شتێك:

١- خۆشەویستیی نیشتمان و ماڵ و حاڵە.

٢- ئنجا خۆشەویستیی کەسوکارە.

٣- هەروەها خۆشە ویستیی ئەو بەرژەوەندییانەیە کە لەوێن، توانیویانە خۆڕابگرن و چاوپۆشیی لەوانە هەموویان بکەن، دیسان ئەو مەترسییانەی کە دێنە ڕێیان، بەنسبەت ئەو شوێنەی کە بۆی دەچن: ئایا

١) دەبێ شوێنیان دەستبکەوێ و لەوێ جێی حەوانەوەیان هەبێ؟

٢) دەبێ کارو کەسابەتیان هەبێ ؟

٣) دەبێ بژیویان بۆ دابین بکرێ ؟

٤) دەبێ ماڵ و منداڵیان چی لێبێ ؟

لەسەر هەموو ئەوانە خۆیان ڕاگرتوە.

٧- ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾، واتە: تەنها پشتیشیان بە پەروەردگاریان دەبەستن.

وشەی (**صبروا**) بە کرداری ڕابردوو هاتوە، چونکە کۆچکردنەکە تێپەڕیوە، کارێك بووە پێی هەڵساون و تێپەڕیوە، بەڵام پشت بە خوا بەستنەکە بە کرداری (**مضارع**) هاتوە کە ئێستا و داهاتوو دەگەیەنێ، چونکە بۆ لەمەودوا کە دێ، پێویستییان بە پشت بە خوا بەستن هەیە، بۆ تەحەممولکردنی ئەو ئازار و ناڕەحەتییانەی کە دێنە ڕێیان، وەك زۆرجار گوتوومانە: کاتێك (**جارّ و مجرور**) پێش (**فعل و فاعل**)دەکەون، ئەمە کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ: ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾، وەك: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝﴾، واتە: هەر تۆ دەپەرستین و یارمەتیی بەس لە تۆ دەخوازین، لێرەشدا یانی: پشتیان بەس بە پەروەردگاریان دەبەستن.

هەڵبەتە ئەم ئایەتە ئاماژەیە بە کۆچی مسوڵمانان، بە پلەی یەکەم بۆ (حەبەشە)، چونکە دووجاران کۆچکردنی مسوڵمانان ئەنجامدرا بۆ حەبەشە، جارێك بە ژمارەیەکی کەم چوون، جارێکی دیکە بە ژمارەیەکی زیاتر چوون، وەك لە (**السیرة النبویة**)دا باسکراوە[1]، دەشگونجێت ئاماژەش بێت بە کۆچکردنی مسوڵمانان بۆ (**یثرب**)، کە دوایی ناوی لێنرا

(١) التحریر والتنویر ج١٤، ص١٥٦.

مەدینە، هەرچەندە ئەوە لە دوا دوای قۆناغی مەککەدا بوو، بۆیە زیاتر وا پێدەچێت ئاماژەبێ بە کۆچکردنی مسوڵمانان بۆ حەبەشە کە دووجاران ئەنجامدراوە و، هەندێکیان وەك جەعفەری کوڕی ئەبوو طاڵیب و ژمارەیەك، تاکو گرتنی خەیبەر هەر لەوێ بوون، هەتا لەو ڕۆژەدا کە گەڕانەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**لا أدرى بأيِّما أُسَرّ بفَتحِ خَيْبَرَ أو بقُدُومِ جَعْفَر**) واتە: نازانم بە کامیان دڵخۆش بم، یان دڵخۆشتربم، بە گرتنی خەیبەر، یان بە هاتنی جەعفەر!

(خەیبەر) چەند قەڵایەکی جوولەکەکانی لێبووە، ئەو جوولەکانە خەنجەرێکی ژەهراوی بوون، هەمیشە لە پشتەوەڕا لە مسوڵمان دەدران و، هەر دوژمنێکی مسوڵمانان پەیدا بووبایە، ئەوانە کەین و بەینیان لەگەڵ دا دەکرد، ئیدی سەرەنجام سزای غەدر و پەیمان شکێنیی خۆیان وەرگرت و، شوێنەکەیان گیرا، ئنجا لەو ڕۆژەدا جەعفەری کوڕی ئەبی طاڵیبیش خوا لێی ڕازیبێ، لەگەڵ ژمارەیەك لەو مسوڵمانانەی کە لە حەبەشە بوون چەند ساڵ بوو لەوێ بوون، پێکەوە هاتنەوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نازانم بە کامیان دڵخۆشبم: بە هاتنەوەی جەعفەر و هاوەڵەکانی، یاخود بە گرتنی خەیبەر و ئەو قەڵایانەی کە جوولەکەکان تێیاندا بوون[1].



(١) لە تەفسیری سوورەتی (الفتح)دا، بەدرێژیی باسی جەنگی خەیبەرمان کردوە لەبەر ڕۆشنایی (السيرة النبوية لابن هشام)دا، ئەو جەنگەش لە ساڵی حەوتەمی کۆچیی دا بووە، دوای پێکهاتنی حودەیبییە (صلح الحديبية) لە ساڵی شەشەمی کۆچیی دا.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خـوا ﷻ پێـش موحەممـەد ﷺ تەنیـا پیـاوانی بـە پێغەمبـەر نـاردوون و، ئەوانیـش بـە موعجیـزەو کتێبـەوە هاتـوون و، هـەر کـەس لـە زانایـانی کتێبـە پێشـووەکان بپرسـێ، لـەوە دڵنیا دەبێ کـە خـوا ﷻ تەنیا پیاوانی وەك پێغەمبـەر ڕەوان کـردوون، ئەوانیـش بـە بەرنامـەوە و بـە موعجیـزەو بەڵگـەوە هاتـوون:**

خـوا فەرموویـەتی: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١- کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا﴾، واتە: لە پێش تۆدا بەس پیاوانمان ڕەوان کردوون، یانی: ڕەوانمان کردوون وەك پێغەمبەر ﷺ، کە پەیامی خوا بگەیەنن.

بێگومـان ئەمـە وەڵامـی کافـر و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـە، کـە هەمیشـە بیانووێـکی حـازر بەدەسـتیان ئـەوە بـووە: بۆچـی خـوا فریشـتان نانێـرێ ؟! وەك لە سـوورەتی (الأنعـام)دا، - کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـردوە - و ژمارەیـەك لـە سـوورەتەکانی قوڕئاندا، ئـەوە دووبـارە بۆتەوە، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (الإسراء) و لـە سـوورەتی (الكهف) دا، کافـرەکان یەکێـك لـە بیانـووە بەهێزەکانیـان ئـەوە بـووە، کـە: بۆچـی خـوا فریشـتەیەکی نەنـاردوە، وەك نوێنـەری خـۆی، وەك گەیەنـەری پەیـام و بەرنامـەی خـۆی، خـوای پەروەردگاریـش لـە هەمـوو شـوێنەکاندا وەڵامـی داوەتـەوە، بـۆ وێنـە:

لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ٩﴾، واتـە: ئەگـەر ئـەو پێغەمبەرەمـان کـە دەینێریـن، کردبامـان بـە فریشـتە، ئەگـەر فریشـتەمان ناردبووایـە، دەبـوو کردبامـان بـە پیاوێـك، واتـە: دەبـوو هێنابامانە سـەر شـکڵی پیاوێـك (مـرۆڤ)، ئەگەرنـا مـرۆڤ ناتوانێـت فریشـتەکان ببینـێ، فریشـتەکان و جنـدەکان لەگەڵمانـن، بـەڵام ئێمـە نایانبینیـن، ئـەو ماددەیـەی کـە ئـەوان لێـی دروسـتبوون،

لە سەرووی هەستەکانی ئێمەوەیە و ئێمە ناتوانین بیانبینین، بۆ نموونە: دەربارەی (جینن) خوا لە سوورەتی (الأعراف) دا - ٢٧ - دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴾، واتە: (ئیبلیس) خۆی و، کۆمەڵەکەی دەتانبینن لە شوێنێکەوە، بە شێوەیەك کە ئێوە ناتوانن ئەوان ببینن.

بە نسبەت فریشتەکانیشەوە بە هەمان شێوە، خوا دەفەرموێ: ئەگەر بە نوێنەری خۆمانمان فریشتەیەکیشمان ناردبایە، هەردەبوو کردبامان بە پیاوێك و هێنابامانە سەر شکڵی مرۆڤێکی پیاو، ﴿ وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: ئەو کاتەش لێمان تێکەڵ دەکردن ئەوەی لە خۆیانی تێکەڵ دەکەن.

(لَبَسَ، يَلبِسُ) واتە: (خَلَطَ، يَخلِطُ)، واتە: تێکەڵی کرد، تێکەڵی دەکات، کە ئەمە جیایە لە (لَبِسَ، يلْبَسُ)، واتە: پۆشی، دەیپۆشێ، (هەژار) لە تەفسیرە کوردییەکەی خۆیدا - وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا ئاماژەمان پێداوە - لە تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا بە هەڵەدا چووە، کە وایزانیوە (لَبِسَ - يلبَسُ) یە، گوتوویەتی: پێمان دەپۆشین کە ئەوەی بۆخۆیان دەیپۆشن! بەڵام نا، چونکە ئەمە (لَبَسَ، يَلبِسُ)یە یانی: (خَلَطَ، يَخْلِط) واتە: لێمان تێکەڵ دەکردن ئەوەی لەخۆیانیان تێکەڵ کردوە، واتە: ئەو کاتە ئەو فریشتەیەی کە چۆتە سەر شکڵی پیاوێك، گوتبای: من پێغەمبەری خوام و، فریشتەشم! دەیانگوت: نەخێر، تۆ فریشتە نی، تۆش پیاوێکی وەك ئێمە، چۆنیان زانیبایە فریشتەیە ؟! لێیان تێکەڵ دەبوو !

٢- ﴿ نُوحِىٓ إِلَيْهِمْ ﴾، واتە: سروشیان بۆ دەکەین، نیگایان بۆ دەنێرین، پەیامی پەنهانیان بۆ دەنێرین، ئەمە خوێندنەوەی (حفص)ە، بەڵام هەموو قورئان خوێنەکانی دیکە، ئاوایان خوێندوەتەوە: (يُوحى إِلَيْهِم) واتە: سروشیان بۆ دەکرێ، پەیامیان بۆ دەنێردرێ، سەرچاوەکەشی دیارە لە خواوە ﷻ بۆیان دێ.

٣- ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: لە ئەهلی زیکر بپرسن، ئەگەر نازانن، ئەهلی زیکر، واتە: ئەوانەی کە زیکری خوایان لەبەردەستە، (ذِكر) بە کتێب و بەرنامەی خوا دەگوترێ، کە ڕاستییەکان دەخاتەوە بیر مرۆڤ، یاخود شەرەف و ناو و ناوبانگە بۆ مرۆڤ، ئەگەر بڕوای پێ بێنێ، بۆیە: (فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ: أي أَهْل الكِتَابِ) واتە: لە خاوەن کتێبەکان بپرسن.

یاخود زیکر لێرەدا بە مانای قورئانە، واتە: لە ئەهلی قورئان بپرسن، ئەوانەی لە قورئان شارەزان، لە زانایان بپرسن، ﴿ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، ئەگەر نازانن، لێیان بپرسن پێتان دەڵێن: کە ڕاستە خوا لە ڕابردووشدا تەنیا لە نێو مرۆڤاندا پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوون،

هەر لە ئادەمەوە تاکو خاتەم صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر هەموو پێغەمبەرانی خوا بێ، هەموویان مرۆڤ بوون و، لە نێو مرۆڤانیشدا پیاو بوون و ئافرەت نەبوون.

٤- ﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ﴾، واتە: بە بەڵگە ئاشکراکان و بە کتێبەکانیشەوە.

(بَيّنات) کۆی (بَيِّنة)یە، کە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرای وایە ئیقناعکەر و ئیلزامکەر بێ بۆ بەرانبەر.

(زُبُر) کۆی (زَبُور)ە، (زَبَرَ الكِتَاب) واتە: نووسیەوە، بەڵام بە خەتێکی درشت، یاخود بە وشەیەکی درشت و گەورە، هەر چۆن بێت (زُبُر) کۆی (زَبُور)ە، کە بە مانای (كِتَاب) دێ، واتە: شتێك کە نووسرابێتەوە.

کەواتە: هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەم بەڵگە و موعجیزەیان پێ بووە و بۆ چەسپاندن (إِثْبَاتِ)ی دەعوای پێغەمبەرایەتیی خۆیان، هەم کتێب و بەرنامەشیان پێ بووە.

**ئەمە سێ ڕاستیی گرنگی لێ وەردەگیرێن:**

**ڕاستیی یەکەم:** لە پێش تۆشدا هەر پیاوانی (مرۆڤ) پێغەمبەر بوون و، فریشتەکان پێغەمبەر نەبوون!

**ڕاستیی دووەم:** ئافرەتان بەشیان لە پێغەمبەرایەتیی دا نەبووە، لەبەر ئەوە نا کە خوا ﷻ لایەنگیریی بەلای پیاواندا کرد بێ! چونکە خوا ﷻ بۆخۆی نە نێرە و، نە مێیە: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾ ﴾الإخلاص، واتە: بڵێ ئەو خوایە، تاکە، خوایە، جێی نیاز و بێنیازە، کەسی لێ نەبووە و لە کەسیش نەبووە، هیچ کەسیش هاوتای نیە.

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ... ﴿١١﴾ ﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیە.

﴿ وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: هەرچی شتە هەمووی جووتی هەیە، لە ماددەی بێ ژیانەوە، لە گەردیلەوە کە بارگەی سارد و گەرمی هەیە، ئەلیکترۆن و پرۆتۆن، هەتا ڕووەك و هەموو دروستکراوەکانی خوا، هەمووی جووتە، ئاسمان و زەوی، دنیا و دوارۆژ، بەهەشت و دۆزەخ، سەرما و گەرما، سەرو و خوار، گەورە و بچووك، هەمووی جووتە، تەنیا خوا ﷻ تاکە.

کەواتە: لەبەر ئەوە نەبووە کە خوا ﷻ ڕەگەزی پیاوان بە باشتر دابنێ و، بەرزی بکاتەوە بەسەر ڕەگەزی ئافرەتاندا، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەرکی پێغەمبەرایەتیی ئەرکێکی قورس و

گرانە و، خوا ﷻ ڕەچاوی باری پێکهاتەی جەستەیی و دەروونیی ئافرەتی کردوە و، ئەو ئەرکە سروشتییانەی کە دەبێ ئەنجامیان بدات و، بەخۆی نەبێت ئەنجام نادرێن، وەك ئەرکی دایکایەتیی و ئەرکی منداڵ هەبوون لە سك داو، منداڵ بەخێوکردن، لەگەڵ هەندێ تایبەتمەندیی دیکە، وەك: نەرم و ناسکیی جەستەی و دەنگیی و، زاڵبوونی عاتیفە و سۆزی و... هتد، ئەوانە هەموو وایانکردوە کە ئەو ئەرکە قورسە بە ئافرەتان نەسپێردرێ، لەبەر ئەوە کە خوا ﷻ یەکێ لە سیفەتەکانی بریتیە لە کاربەجێیی، خوا کاری بێجێ ناکات، ئەگەر کەسێ توانای هەڵگرتنی ئەرکێکی نەبێ و پێی بسپێردرێ، مانای وایە، ئەوە شتێکی بێجێیە، ئەوەش لە خوا ناوەشێتەوە، بەڵام جگە لە وەحیی بۆ هاتن و ئەرکی پێغەمبەرایەتیی، هەموو پلەکانی دیکە ئافرەتان بڕیویانن، کە بەرزترینیان پلەی (صِدیقیة)یە خوای پەروەردگار دەربارەی مەریەم دایکی عیسا لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ كَثِيرٌ.. ﴿٧٥﴾ ﴾، واتە: دایکی عیسا ﷺ (صدیقة) بووە، واتە: زۆر بڕوایەکی پتەوی هەبووە، یاخود زۆر زۆر ڕاست و ساغ بووە لەگەڵ خۆی و خوا و خەڵکدا.

**ڕاستیی سێیەم:** کتێبە پێشووەکان دەگونجێ بەهرەیان لێوەربگیرێ، بەپێی ئەم ئایەتە موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، دەگونجێ بۆ هەندێ بەرچاو ڕوونیی بەهرە وەربگرین لە کتێبە پێشووەکان، وەك لە سوورەتی (**یونس**)یشدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: ئەگەر تۆ لە دوو دڵییدای لەوەدا کە بۆ تۆمان ناردۆتە خوار، لەوانە بپرسە کە لە پێش تۆدا کتێبیان پێدراوە، بێگومان لەلایەن پەروەردگاتەوە هەقت بۆ هاتوە، ئنجا تۆ لە دوو دڵان مەبە.

بەڵام بێگومان دەبێ بە وریایی بەهرە لە کتێبی پێشووەکان وەربگیرێ، بۆیە لە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هاتوە دەفەرموێ: {**لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلا تُكَذِّبُوهُمْ**}[1]، واتە: بە خاوەن کتێبەکان مەڵێن ڕاست دەکەن، بە درۆشیان دامەنێن.

چونکە ئەگەر بڵێن ڕاست دەکەن و شتێکیان گوتبێ: وانەبووبێ، ئەوە گوناهبار دەبن، بشڵێن: درۆ دەکەن، شتێکیان گوتبێ: وابێ، دیسان گوناهبار دەبن.

کەواتە: لێیانگەڕێن وەك فەرموویەتی: {**حَدِّثُوا عَنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ**} (**أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٣٦٦٢**)، واتە: قسە لە وەچەی ئیسرائیلەوە بگێڕنەوە (وەك زانایان وایان کردوە) هیچ

---

(١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ بِالْعِبْرَانِيَّةِ وَيُفَسِّرُونَهَا بِالْعَرَبِيَّةِ لأَهْلِ الإِسْلامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ، وَقُولُوا: آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا، الآيَةَ} أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٤٢١٥.

سەغڵەتییتان لەسەر نیە، بەڵام تەسلیمی هەموو قسەکانیان مەبن، هەروەها هەموو قسەکانیشیان ڕەفز مەکەن، بەڵکو دەبێ قسەکانی ئەوان لە مەحەکی قوڕئان بدرێن، پاشان لە مەحەکی عەقڵ و عیلم و زانست و واقعییش بدرێن، ئەوجار وەربگیرێن.

## مەسەلەی شەشەم:

**خوا زیکری بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ناردوە، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکاتەوە، چۆن جێبەجێ دەکرێ؟ هەروەها دەبێ خۆشیان بیر بکەنەوە، بۆیان ڕوون بکاتەوە، واتە: خودی قوڕئانەکەیان بۆ بخوێنێتەوە و، بە ڕوونیی پێیان بگەیەنێ، هەروەها چۆنیەتی جێبەجێ کردنەکەشیان بۆ باس بکات و، خۆشیان بیر بکەنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ  ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ ﴾، واتە: زیکریشمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە.

(**الذِّكر: الكَلاَم الَّذِي مِنْ شَأْنه أَن يُذْكر أَي: يُتْلَى وَيُكَرَّر، وَالقُرْآنُ كِتَاب وَبَيِّنة مَعَاً!**)، (**ذِكر**) فەرموودەیەکە کە بگونجێ باس بکرێ، یانی: بخوێنرێتەوە و دووبارە بکرێتەوە، ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ ﴾، هەڵبەتە (زیکر)یش، قوڕئانە و، هەم شوێنی (زبور) دەگرێتەوە، هەم شوێنی (**بَيِّنات**)یش، چونکە قوڕئان لە یەك کاتدا هەم کتێبە، هەم بەڵگە و موعجیزەشە، بۆیە هی پێغەمبەرانی پێشوو، فەرموویەتی: بە بەڵگە گەل و کتێبانەوە هاتوون، ﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ﴾، بەڵام بۆ موحەممەد ﷺ تەنیا باسی زیکری کردوە: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ ﴾، واتە: بیرخەرەوە و (**ذکر**)مان بۆ تۆ دابەزاندوە، چونکە پێویستییت بە بەڵگەی دیکە نیە، لەسەر پێغەمبەرایەتییت، جگە لە قوڕئان، کە قوڕئان گەورەترین بەڵگە و موعجیزەی موحەممەدە ﷺ بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییەکەی، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ موعجیزەی دیکەی بوون، بەڵام ئەو موعجیزانەی دیکەی بەکارنەهێناون بۆ سەلماندنی ئەوە کە پێغەمبەری خوایە، بەڵکو بۆ مەبەستی دیکە، لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ هەندێ شتی یاسادڕ (**خارق العادة**) پەیدا بوون، وەك لە کتێبەکانی سوننەت و سیرەدا هاتوون.

٢- ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾، واتە: ئەو زیکرو کتێبەمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵك دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە.

ئەمە دوو واتای هەن:

**یەکەم:** تەنیا خوێندنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ قورئان بەو شێوەیەی کە لە جبریلی وەرگرتوە، ئەوە هەر بۆخۆی ڕوونکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ قورئان: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾، واتە: بۆیان بخوێنیەوە، بە شێوەیەکی وا کە مانا و واتایەکەی ڕوون و ڕۆشن بێ، چونکە چۆنیەتی قسەکردن و چۆنیەتی خوێندنەوەی دەقێك، زۆر کاریگەریی هەیە لەسەر ئەوەی چاك بفامرێ، یاخود بە پێچەوانەوە نەفامرێ، جاری وا هەیە قسەیەك کە دەکرێ، ئەگەر خاوەنەکەی زۆر ڕەوانبێژ (**بليغ**) و زمان پاراو (**فصيح**) بێ، هەر بە قسەکردنەکە، دەقی قسەکە کە دەکرێ و دەخوێنرێتەوە، بەرانبەرەکە لێی تێدەگات، بەبێ ئەوەی کە شەرح و ڕوونکردنەوەی لەسەر بدات.

**دووەم:** واتایەکی دیکەی: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾، واتە: بۆیان ڕوون بکەیەوە ئەوەی کە بۆیان دابەزێنراوە، کە چۆن کاری پێ بکرێ و، چۆن جێبەجێ بکرێ ؟

بەڵام بۆچی دەبێ بەو دوو واتایە لێکی بدەینەوە ؟!

چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خوا ﷻ ئەو ئەرکەی پێ سپاردبایە کە قورئان هەموو ڕوون بکاتەوە، ئێمە ئێستا تەفسیری پێغەمبەرمان ﷺ دەبوو بۆ قورئان (**التفسير النَّبَوِي للقرآن الكريم**) کە ئێمە ئەوەمان لەبەر دەستدا نیە، بەڵام چیمان هەیە ؟! (**التَّطبيق النَّبَوِي للقرآن الكريم**) جێبەجێکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ قورئانی بەڕێز، ئەوەمان لەبەردەستە، کە دیارە ئەو ئەرکەی بە پێغەمبەر ﷺ سپێردراوە، ئەو ئەرکەی کە خوا پێی سپاردوە، ئەوەیە کە قورئان جێبەجێ بکات لەسەر ئەرزی واقیع و، ئەوەشی کردوە، بەڵام ئەگەر ئەوەی پێ سپاردبایە کە قورئان هەمووی تەفسیر بکات، بۆی تەفسیر دەکردین، بەڵام جگە لە چەند ئایەتێکی کەم بۆ هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، کە ئیشکالێکیان بۆ پەیدا بووە لەسەر چەمك و واتایان، پێغەمبەر ﷺ هیچ سوورەتێکی بە تەواویی لە قورئان تەفسیر نەکردوە، دابنیشێ بفەرموێ: ئەم سوورەتە ئەوە ماناکەیەتی، بەڵکو قورئان بۆخۆی ڕۆشنە، خوا ﷻ لە چەند شوێنان ئەوەی فەرمووە، بۆ وێنە:

**أ/** لە سەرەتای سوورەتی (**الحجر**)دا کە دەفەرموێ: ﴿الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ۝١﴾.

**ب/** لە سەرەتای سوورەتی (**النمل**)دا دەفەرموێ: ﴿طسٓ ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ۝١﴾.

هەروەها لە چەند شوێنی دیکەش دا هاتوە، کەواتە: ئەوەی کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، هەم وەك خوێنراوە (**قرآن**) ڕوون و ئاشکرایە، هەم وەك نووسراو (**کتاب**) ڕوون و ئاشکرایە، هەم قورئانی (**مبین**)ە، هەم کیتابی (**مبین**)ە، یانی: هەم بە حاڵەتی خوێنراوەیی ڕوون و ڕۆشنە، هەم بە حاڵەتی نووسراوەیی.

## وەڵامی پرسیارێك :

ئەگەر یەکێك بڵێ: ئەدی باشە بۆچی ئێستا تۆ قورئان تەفسیر دەکەی، مادام ڕۆشنە؟!

دەڵێین: قورئان ڕۆشنە بۆ خەڵکی خۆی، بۆ کەسانێك کە شارەزای زمانی عەرەبی بن و، بۆ کەسانێك کە هاودەم و هاوڕازی قورئان بن، واتە: نەك بۆ خەڵك بە گشتی، تەنها بۆ ئەهلی خۆی ڕۆشنە، یانی: پێویستیی بە پێغەمبەری خوا نیە ﷺ، هەمووی ڕۆشن بکاتەوە، ئەو شوێنانەی کە پێویست بوو بن، ئەو ڕۆشنی کردوونەوە، بەڵێ بە تەئکید قورئان بە گشتی بۆخۆی ڕۆشنە، بەڵام چۆنیەتی جێبەجێکردنەکەی بۆ ئێمە، پێویستیی بە ڕوونکردنەوە هەیە و، پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی کردوە.

لێرەدا خوا ﷻ بەنسبەت دابەزاندنی قورئان بۆ پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ ﴾، بەڵام بە نسبەت خەڵکەوە، دەفەرموێ: ﴿ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ﴾.

(وَأَنزَلۡنَآ) یانی: ڕاستەوخۆ بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزیوە و یەکسەریش لێی تێگەیشتوە، بەڵام بۆ خەڵك (لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ) ئەوەی بۆ خەڵك هاتوە، لە ماوەی (٢٣) ساڵی تەمەنی تۆدا، لە میانی ژیان و سیرەی تۆدا، قورئان بۆ خەڵك دابەزێنراوە، تۆش دەبێ پلە پلە و وردە وردە بۆیان ڕوون بکەیەوە.

٣- ﴿ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، واتە: بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بکەنەوە، واتە هەر بیرکردنەوەی خۆشیان پێویستە بۆ ئەوەی چاك لە قورئان بەهرەمەند بن، یانی: خوا ئەو کتێبە، ئەو قورئانە، ئەو فەرمایشتەی خۆی ناردوە بۆ خەڵك، تاکو بیخوێننەوە و لێی تێبگەن و، بیری لێبکەنەوە و تێیڕامێنن.

## مەسەلەی حەوتەم:

ئەوانەی خەریکی پیلانگێڕانن، نابێ دڵنیابن کە خوا بە جۆرێك لە جۆرەکان سزایان نادات، بۆ وێنە: بە زەویدا بچنە خوار، واتە: خوا بە زەویی دا بیانباتە خوار و زەوی ڕۆبچێ، بێئەوەی هەست پێ بکەن، یان بەبێئەوەی هەست پێبکەن ئازار و سزایان بۆ بێ، یان لە کاتی هاتن و چووندا، بەڵایەکیان بۆ بێ، یاخود لە کاتی ترس و بیمدا، بەڵای ناگەهانیان بۆ بێ:

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، واتە: ئایا ئەوانەی پیلانان دەگێڕن دڵنیان، (**مَكروا السَّيِئات: أَي مَكروا المَكْراتِ السَّيِّئات**) واتە: پیلانە خراپەکانیان گێڕاون، چونکە (ٱلسَّيِّـَٔاتِ ) وەصفە بۆ وەصفکراوێکی قرتێنراو، (**صِفَةٌ لِمَوصُوفٍ مَحْذُوف**) کە بە پێی سیاق و سەلیقە دەزانرێ.

بۆیەش (**المَكْـرات**) ڕاناوی مێینەی بۆ بەکارهێنراوە: ﴿ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، تاکو مانای خەسڵەت بگەیەنێ، وەك (**الغَـدْرَة**) بۆ غەدر (**هَـذِهِ غَـدْرَةُ فُلَانٍ**) غەدر، واتە: پەیمان شکێنیی.

لە چی دڵنیابوون ؟

٢- ﴿ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ ﴾، واتە: ئایا دڵنیان لەوەی کە خوا بە زەوییاندا بەرێتە خوار، یان زەوییان لەبندا ڕۆبچوێنێ، (**الخَسْفُ التَّغييبُ فِي الأَرْض**) (**خَسْف**) یانی: ونکردن لە زەویدا، دەگوترێ: (**إِنْخَسَفَ**): **غَارَ، يَغُورُ، غَوْرَاً**) ڕۆچوو (**خَسَفَ: اللَّهُ بِهِ الأَرضَ: غَيَّبَهُ فِيهَا**) خوا لە زەویدا ونی کرد، (**خَسَفَ هُوَ فِي الأَرضِ**) واتە: بە زەویدا چووە خوار، (**خُسِفَ بِهِ**) واتە: بە زەویدا ڕۆچوێنرا، یانی: لە زەویدا ونکرا و پەنهانکرا و و خرایە ناخی زەوییەوە، ئایا لەوە دڵنیان خوا بە ناخی زەوییاندا بباتە خوار!

٣- ﴿ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، واتە: یاخود ئایا دڵنیان لەوە کە سزا و ئازاریان بۆ بێ، بەبێئەوەی هەستی پێبکەن، چەندان جۆرە نەخۆشیی و، بەڵا و، گرفتاریی هەیە.

٤- ﴿ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ ﴾، واتە: یان ئایا دڵنیان لەوە کە لە کاتی هاتن و، چوون و، هەڵسوڕ و داسووڕیاندا، بیانگرێ! (**التَّقَلُّبُ: السَّعِيُ فِي شؤُونِ الحَياة**)، (**تقلُّب**): هەوڵدانە لە کاروبارەکانی ژیاندا، ئایا دڵنیان کە لە کاتی هاتن و چوون و هەڵسوکەوتیاندا، خوا بیانگرێ، (**الأَخْذُ: مُستعَارٌ للإِهْلاَك**)، وشەی: (**أَخْذ**) یانی: گرتن، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ فەوتاندن.

٥- ﴿ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴾، واتە: ئەگەر خوا لە کاتی هاتن و چوون و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیاندا بیانگرێ و سزایان بدا و بیانفەوتێنێ، ئەوان دەستەوستانکەر نین، دەگوترێ: (**أَعْجَزَهُ: أَي: جَعَلَهُ عَاجِزاً**)، واتە: بەرانبەرەکەی دەستە پاچەکرد و بێ توانای کرد، هەروەها دەگوترێ: (**أَعْجَزَهُ، أَي: فَاتَهُ وَسَبَقَهُ**)، لە دەستی دەرباز بوو، ڕۆیشت و بۆی نەگیرا.

٦- ﴿ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ ﴾، واتە:

١/ ئایا دڵنیان کە لە کاتێکدا دەترسێن لە حاڵەتی ترسان و دڵەڕاوکەدا، خوا بیانگرێ و سزایان بدات.

یاخود وشەی (**تَخَوّفُ**) بە مانای (**تَنَقُّص**)ە، واتە: کە خوا لە حاڵێکدا بیانگرێ کە بەهۆی نەخۆشیی و، هەژاریی و، نەداریی و، بەڵا و گرفتارییەوە، وردە وردە لە کەمیی دەدەن، پێش ئەوەی بە یەکجاریی لەبەینیان بەرێ.

٢/ یاخود لە حاڵێکدا لە کەمییان داوە، بڕە بڕە و، وردە وردە، ئنجا دوایە خوا یەکسەر بنەبڕیان بکات، دڵنیان لەوەی کە خوا لەو حاڵەتانەدا سزایان بدات !!

٧- ﴿ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴾، واتە: بێگومان پەروەردگاری ئێوە زۆر بەپەرۆشە و، زۆریش بە بەزەییە، وەك زۆرجار گوتوومانە وشەی (**رَؤوف**) واتە: (بە پەرۆش) کە زیان و خراپە لە بەندەکانی دوور بخاتەوە، (رَّحِيمٌ) واتە: (بە بەزەیی) تاکو چاکە و سوودەکانیان بۆ بێنێ.

### مەسەلەی هەشتەم:

خـوا سـەرنجمان ڕادەكێشـێ كـە سـەرجەم دروسـتكراوەكانی خـوا، سـێبەرەكانیان بـەلای ڕاسـت و چەپـدا دەگۆڕێـن و، ملكەچانـە كڕنـووش بـۆ خـوا دەبـەن، هەروەهـا هەرچـی لـە ئاسـمانەكان و زەویدایـە لـە ژیانـدار و فریشـتان، كڕنـووش بـۆ خـوا دەبـەن و، خۆیـان لـە ئاسـتیدا بـە زل ناگـرن و لێـی دەترسـێن و فەرمانبەریـی بـۆ دەكـەن:

خـوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَـٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۩ ﴿٥٠﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴾، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە هەر شتێك كە خوا دروستی كردوە، وشەی (يَرَى) بۆخۆی بۆ بەركار (**مفعول**) تێپەڕ (**تَعَدِّي**) دەكات، (**يَرَاهُ، رَأَى القَمَرَ، يَرَى القَمَرَ**) مانگەكەی بینی، مانگەكە دەبینێ، بۆیە وشەی (**رَأَى**) ئەگەر تەعەددای پێكرا بۆ بەركار (**مفعول**) بە (**إِلى**) (**اقْتَضَى مَعْنَى النَّظَرِ المؤَدِّي إِلى الإِعْتِبار**)، ئەوە مانایەك دەخوازێ كە بریتیە لە تەماشاكردنێك كە پەندی لێ وەربگیرێ، وەك لە سووڕەتی (**الفرقان**)دا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ... ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجت نەداوەتە پەروەردگارت، چۆن سێبەری درێژكردۆتەوە، واتە: تاكو پەندی لێوەربگری، سەرنجێكی لێبدەی كە دەرس و پەندی لێوەربگری.

٢- ﴿ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَـٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ ﴾، واتە: سێبەرەكەیان بە لای ڕاست و بە لای چەپەكانیاندا دەجووڵێ، (**التَفَيُّوء: تَفَعُّلُ مِنْ: فَاءَ الظِّلُّ فَيْئاً: عَادَ**)، (**فَاء: يَعْنِي: عَادَ**)، (**التَفَيُّوء**)، (**تَفَعُّل**)ە، لە (**فَاءَ الظِلُّ، أَي: عَادَ الظِلُّ، رَجَعَ الظِلُّ**) سێبەرەكە گەڕایەوە.

(**أَبُـو عَمْـرو**) و (**يَعْقُـوب**) كـە دوو قوڕئـان خوێنـن، لـە حەوتـەكان، خوێندوویانەتـەوە: (**تَتَفَيَّأُ**) كـە هـەر یـەك واتایـان هەیـە، بـەڵام یەكیـان ڕانـاوی نێرینـەی خسـتۆتە سـەری و یەكێكیـان ڕانـاوی مێینـە، ئنجـا: (**التفيُؤ: التَنَقُّلُ مِنْ جِهَاتٍ**)، بریتیـە لـە گواسـتنەوە و جـێ گۆڕكـێ كـردن لـە لایەكانـەوە.

هەڵبەتە لێرەدا، مەبەست تەنیا لای ڕاست و چەپ نیە، بەڵکو مەبەست هەموو لایەکانن، بەڵام ئەگەر ئینسان بەرەو قیبلە بوەستێ، کاتێك کە خۆرهەڵدێ، سێبەر دەکەوێتە لای ڕاستی و، ئەگەر ئاوابێ، دەکەوێتە لای چەپی، هەروەها ئەگەر بەرەو قیبلە ڕابوەستێ، لە کاتی خۆرئاوابووندا، خۆرەکە دەکەوێتە لای چەپی و، سێبەرەکە لەلای ڕاست دەدات.

زانایان ئەوەیان باسکردوە کە بۆچی لای ڕاستی بە تاك هێناوە و، لای چەپی بە کۆ هێناوە؟ کە ڕەنگە لە عادەتی زمانی عەرەبی وابێ و، بە زۆریی لەو حاڵەتانەدا بەو شێوەیە بەکاربێ، زانایان زۆر قسەیان لێکردوە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە.

٣- ﴿ سُجَّدًا لِّلَّهِ ﴾، واتە: کڕنووش بردووانە بۆ خوا، واتە: سێبەرەکان کڕنووش بۆ خوا دەبەن، بۆچی بە کۆی هێناوە ؟! (**سُجَّداً**) کۆی (**ساجِد**)ە، چونکە (**ظِلاَل**)یش کۆی (**ظِلّ**)ە، (**ظِلاَل**) واتە: سێبەرەکان و (**ظِل**) سێبەرە، مادام سێبەرەکان کۆن، بە کۆش کڕنووش بۆ خوا دەبەن.

٤- ﴿ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴾، واتە: ئەوان ملکەچن لەو کاتەدا، (**الدَّاخِر: الخَاضِع الذَّلِيل**) واتە: ملکەچێکی زەبوون، (**دَخَرَ، يَدخَرُ، دُخُوراً**) و (**دَخِرَ، يَدْخَرُ، دَخَراً: صَغُرَ وَذَلَّ**) بە هەردوو حاڵەتەکەی هەر بە مانای بچوك بوو، زەبوون بوو، ملکەچ بوو، دێ.

٥ و ٦- ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە لە ژیاندار و فریشتان، (دَآبَّةٍ) یانی: هەموو جۆرە ئاژەڵ و زیندەوەر و ژیاندارەکان و، (**الملائكة**)ش فریشتەکان هەموویان، واتە: هەرچی کە لە ئاسمان و زەویدایە، لە ژیانداران و لە فریشتان، کڕنووش بۆ خوا دەبەن.

٧- ﴿ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، واتە: خۆشیان بە زل ناگرن، واتە: بە پێچەوانەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و خۆ بەزلگرەکانەوە، ئەوانە خۆ بەزل ناگرن، بەڵکو لە بەرانبەر خوادا ملکەچن و، داماون و خۆیان بە بچووك پیشان دەدەن، کە هەر بچووکیشن، بەدیهێنراو لە بەرانبەر بەدیهێنەردا هەر بچووکە، چونکە بوونەکەی ئەو پێیداوە و، ئەویش بەردەوامی دەکات و، هەر کاتێکی ویستی لە بەینی دەبات.

٨- ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾، واتە: لە پەروەردگاریانەوە دەترسێن لە سەروویانەوە.

لە سەروویانەوە:

أ/ یانی: (**فَوْقِيَّةً تَليقُ بِهِ**) لە سەروو بوونێك، کە شایستەیە بۆ خوا.

ب/ یاخود (فَوْقِية تَصرُّفٍ وتَسَلُّطٍ) واتە: لە ڕووی مەعنەوییەوە، خوا لە سەروویانەوە باڵادەستە.

٩- ﴿ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴾، واتە: هەرچی فەرمانیان پێ بکرێ، ئەنجامی دەدەن، یانی: سەرپێچیی و لاملیی لەواندا نیە.

هەڵبەتە لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوا ﷻ ئەو ڕاستییەی بەیان کردوە، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ١٥ ﴾، واتە: هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەبات، بە پێخۆشبوون و بە پێناخۆشبوون، چار و ناچار، هەروەها سێبەرەکانیشیان بە بەیانیان و ئێواران کڕنووش بۆ خوا دەبەن.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ١٨ ﴾، واتە: ئایا سەرنج نادەی کە هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەبات، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و، چیاییەکان و دار و درەخت و ژیانداران و، زۆرێك لە خەڵکیش و، زۆرێکیش سزای خوایان لەسەر پێویست بووە و، هەر کەسێکیش خوا سووکی بکات، هیچ ڕێز بۆ پەیداکەرێکی نابێ.

ئایا دروستکراوەکان بەچی سووك دەبن؟ بێگومان بە لادانیان لە فەرمانی خوا، کەواتە: هەر کەسێك دەیەوێ لەلای خوا ڕێز و حورمەتی هەبێ، با بەینی لەگەڵ خوادا چاك بێ و، بەندەی چاك بێ و بۆ خوا و ملکەچبێ، بۆ خاوەنی خۆی ملکەچ بێ، کە بەتەئکید ئەوە سەربەرزیەتی لە دنیا و دوارۆژدا، کە مەبەست پێی جند و مرۆڤەکانە، ئەگەرنا دروستکراوەکانی دیکە، هیچیان ناتوانن سەرپێچیی خوا بکەن و، هیچیان ناتوانن لەو ڕێیەی کە خوا بۆی داناون، لابدەن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان چـواردە (١٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەكانی: (٥١ - ٦٤)، تـەوەری سـەرەكیی ئـەم چـواردە ئایەتـەش، خـوا بەیەككگرتـن و یەكتایـی خوایـە، لـە پەرسـتران دا و، بەرپەرچدانـەوەی هەنـدێ بیـر و بۆچـوون و هەڵوێسـتی هەڵـە و پووچـی هاوبەشـدانـەران و بێبڕوایەكانـە، لـە مامەڵەیـان لەگـەڵ خـوای بـەرز و مـەزن و بـێ وێنـە و هاوەڵـدا.

لـە كۆتایـی دا خـوا ئـەو ڕاستییە مەزنـە ڕادەگەیەنـێ: كـە تەنیـا بـۆ ئـەوە كتێـب (قورئـان)ی بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دابەزانـدوە، تاكـو ئـەوەی خەڵـك تێیـدا كەوتوونە كێشـە و ڕاجیاییـەوە، واتـە: بێبڕوا و هاوبـەش بـۆ خوادانەرانـەكان، لەگـەڵ بڕوادارانـدا، ئەوەیـان بـۆ ڕوون بكاتـەوە و، تاكـو بشـبێتە ڕێپیشـاندەر و ڕێنمایـی و، مایـەی بەزەیـی خـوا بـۆ بـڕواداران.

﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِمَا لَا يَعۡلَمُونَ نَصِيبٗا مِّمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡۗ تَٱللَّهِ لَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَفۡتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ ٱلۡبَنَٰتِ سُبۡحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوۡءِۖ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكۡرَهُونَ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۖ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ

فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها خوا فەرمووی: با دوو پەرستراوتان نەبن، تەنیا یەك پەرستراو (ی ڕاست) هەیە (کە خوایە)، دەجا با هەر ترس و لەرزتان بەرانبەر من هەبێ ﴿٥١﴾ هەروەها ئەو (خوا) خاوەنی هەرچییەکە کە لە ئاسمان و زەوی دایە و، ملکەچیی بەردەوام هەر بۆ وییە، ئایا پارێز لە جگە لە خوا دەکەن؟ ﴿٥٢﴾ هەر چاکە و خۆشییەکیشتان هەیە هەر لە خواوەیە، ئنجا هەر کات زیان و ناڕەحەتییەکیشتان تووش بوو، بەس پەنا بۆ وی دەبەن و، لەبەری دەکڕووزێنەوە ﴿٥٣﴾ ئنجا هەر کات گرفت و ناڕەحەتییەکەی لێ لابردن، یەکسەر کۆمەڵێکتان هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن ﴿٥٤﴾ با سپڵەیی بکەن بەرانبەر بەوەی پێمان داون و، ڕابوێرن لەمە ودوا دەزانن (چەند بەهەڵە داچوو بوون) ﴿٥٥﴾ بەشێکیش لەوەی پێمان داون، بۆ شتانێك دادەنێن کە (بە پەرستراویان گرتوون و)، زانیارییان پێیان نیە، بە خوا لەو درۆ هەڵبەستنەتان لێتان دەپرسێتەوە ﴿٥٦﴾ هەروەها (ئەو هاوبەشدانەرانە) کچان بۆ خوا دادەنێن - پاکیی بۆ وی - بۆ خۆشیان ئەوەی ئارەزوویانە (دایدەنێن کە کوڕانن) ﴿٥٧﴾ هەر کاتێکیش یەکێکیان موژدەی مێینەی پێدرا، بە پێش خواردنەوەوە ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێ ﴿٥٨﴾ بەهۆی ئەو موژدە خراپەوە کە پێیدراوە، خۆی لە خەڵکەکەی دەشارێتەوە (سەراسیمەیە) ئایا بە ڕیسوایی بیهێڵێتەوە، یان ژێر خۆڵی بکات؟ ئاگاداربن! ئەوە خراپترین بڕیارە دەیدەن ﴿٥٩﴾ ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، حاڵ و سیفەتی خراپیان هەیە و، خواش سیفەت و حاڵی هەرە بەرزی هەیە و، ئەو زاڵی کارزانە ﴿٦٠﴾ ئەگەر خوا بەو ستەم و خراپەیەی هەیانە، خەڵکی سزادابایە، ژیانداری لەسەر (زەمین) نەدەهێشت، بەڵام بۆ کاتێکی دیارییکراو دوایان دەخات، ئنجا هەر کات کاتی لەبەینچوونیان هات، نە کاتێکی کەم دوادەکەوێ، نە پێش دەکەوێ ﴿٦١﴾ هەروەها (هاوبەش دانەرەکان) ئەوەی خۆیان حەزی پێ ناکەن، بۆ خوای دادەنێن و، بە زمانی بەدرۆشیانەوە دەڵێن: خۆیان باشترین سەرەنجام و پاداشتیان هەیە، بە دڵنیایی ئاگریان هەیە و ئەوان پێشیش دەخرێن (بۆ نێو دۆزەخ) ﴿٦٢﴾ بە خوا

پێش تۆ پێغەمبەرانێکمان بۆ چەند کۆمەڵگایەك ناردن، بەڵام شەیتان کردەوەکانیانی بۆ ڕازاندنەوە، ئنجا ئێستا ئەو دۆست و مشوورخۆریانە و، ئازارێکی بە ئێشیشیان هەیە ﴿٦٣﴾ کتێبیشمان تەنیا بۆ ئەوە دابەزاندۆتە سەر تۆ، کە ئەوەی تێیدا کەوتوونەتە کێشەو مشتومڕەوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە، بۆ ئەوەش کە ڕێنمایی و بەزەیی بێ بۆ کۆمەڵی بڕواداران ﴿٦٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( فَٱرۡهَبُونِ ): (الرَّهْبة وَالرُّهْب وَالرَّهَب: مَخَافَةٌ مَعَ تَحَرُّزٍ وَاضْطِرَابٍ) واتە: (رَهْبة، رُهْب، رَهَب)، هەر سێکیان بە مانای ترسانن لەگەڵ خۆ وریا بوون و، لەگەڵ هاوسەنگیی لێ تێکچووندا.

( وَاصِبًا ): (الوَصَبُ: السُّقْمُ اللازِم، الوَاصِبُ: اللازِمُ، الدَّائِم) واتە: (وَصَب) بە نەخۆشییەکی بەردەوام دەگوترێ، (واصب) واتە: شتێك پەیوەست و بەردەوام دەبێ.

( تَجۡـَٔرُونَ ): (جَأَرَ: رَفَعَ صَوْتَهُ، جَأَرَ إِلى اللَّهِ: تَضَرَّعَ وَاستغَاثَ) (جَأَرَ) واتە: دەنگی بەرز کردەوە، بەڵام (جَأَرَ إلى اللَّهِ) واتە: کڕووزایەوە و، هاواری لە خوا بەست.

( تَفۡتَرُونَ ): واتە: هەڵی دەبەستن، (إفْتَرَى الكَذِبَ: إِخْتَلَقَهُ، إفْتَرَى القَوْلَ: إِخْتَلَقَهُ) واتە: درۆیەکەی هەڵبەست، یاخود قسەکەی هەڵبەست، ئنجا دوایی (إفْتَرَى) هەر بۆ خۆی لە جیاتی درۆ بەکار هاتوە، ئەگەرنا ئەصڵی وشەی (إفْتَرَى)، یانی: هەڵیبەست.

( ظَلَّ ): (فَعَلَهُ نَهاراً، وَظَلَّ يَفْعَلُ كَذَا: دَامَ عَلَى فِعلِهِ)، (ظَلَّ)، واتە: ئەو کارەی بە ڕۆژێ ئەنجامدا، هەروەها وشەی (ظَلَّ)، بۆ بەردەوامییش هاتوە: (ظَلَّ يَفْعَلُ كَذَا) واتە: بەردەوام بوو لەسەر فڵان کارەی خۆی.

(كَظِيمٌ): واتە: خەفەتبارێکی پێش خۆرەوە، (الكاظِمُ: المُمْسِكُ عَلَى مَا فِي نَفْسِهِ عِنْدَ الغَضَبِ، كَظَمَ السِّقَاءَ: مَلأَهُ وَسَدَّ فَاهُ)، (كاظِم) واتە: کەسێکە تووڕە بوو بێت و، بەڵام ڕق و تووڕەییەکەی خۆی بگرێت، دەگوترێ: (كَظَمَ السِّقَاءَ) واتە: مەشکەکەی پڕ کردوە و زارەکەشی بەستوە، (سِقَاءَ) واتە: مەشکە و کوندە و ئەوەی ئاوی تێدەکرێ، یانی: ﴿ كَظِيمٌ ﴾ کەسێکە وەك چۆن کوندە و مەشکە پڕدەکرێ لە ئاو یان دۆ، دوایی زارەکەی دەبەسترێ، ئەویش پڕ

بووە لە ڕق و تووڕەیی، بەڵام خۆی گرتوە و ڕق و توڕەییەکەی دەرنابڕێ، لە کوردییدا دەڵێن: (پیشان دەخواتەوە).

( يَتَوَارَىٰ ): (تَوَارَى: إستتَرَ، وَرَّى الشيءَ: أَخْفَاهُ)، (وَرَّى الشيءَ) واتە: شتەکەی پەنهان کرد، (تَوَارَى) واتە: خۆی پەنهانکرد، ﴿ يَتَوَارَىٰ ﴾، واتە: خۆی لە خەڵکەکە پەنهان دەکات و ڕووی نیە بچێتە نێو خەڵکەوە، لەبەر ئەوەی کچی بووە.

( هُونٍ ): (هانَ فُلانٌ يَهُونُ هُوناً وَهَوَاناً وَمَهانَةً: ذَلَّ)، (هان) بە مانای ملکەچ بوو، زەبوون بوو، ڕیسوا بوو، (الهُونُ: الخِزْيُ) واتە: زەبوونیی و ڕیسوایی و سەرشۆڕیی.

( يَدُسُّهُۥ ): (يُخْفِيهِ)، دەیشارێتەوە، (الدَّسِيْسَةُ: النَّمِيْمَةُ، مَا أُضْمِرَ مِنَ العَدَاوَةِ)، (دَسِيْسَة) واتە: قسە هێنان و بردن، یاخود دژایەتییەك كە لە دڵدا پەنهان كرابێ.

( مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ): (المَثَلُ والمِثْلُ: الشِّبْهُ وَالنَّظِيرُ، وَصْفُ الشيء)، (مَثَل، ومِثْل)، یانی: شتێك كە بە شتێك دەچێ، واتە: هاوتا و وێكچوو، ﴿ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ﴾، لێرەدا یانی: وەصف و حاڵی خراپ.

( لَا جَرَمَ ): یانی: بێگومان بە چەسپاویی و، بە دڵنیایی.

( مُّفْرَطُونَ )، دەگوترێ: (فَرَطَ: إِذَا تَقَدَّمَ تَقَدُّماً بالمَقْصِد، وَمِنْهُ الفَارِطُ إلى المَاءِ فَارِط وَفَرَطْ، (أَنا فَرَطُكُمْ عَلَى الحَوْضِ)[1]، وَالإِفْرَاطُ: الإِسْرَافُ فِي التقَدُّمِ وَالتَّفْرِيطُ: التَّقْصِيرُ فِيهِ، (مُّفْرَطُونَ): أَي مُقَدَّمُونَ إلى النار).

(فَرَطَ) واتە: پێشكەوت، بەرە و ئامانج پێشكەوت، دەگوترێ: (الفَارِطُ إلى الْمَاءِ)، (فَارِطِ، وَفَرَطْ) كەسێكە لە پێش كاروانێك و، كۆمەڵێكەوە دەچێتە سەر ئاوەكە، پێی دەگوترێ: (فَارِط، فَرَط) بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَنا فَرَطُكُمْ عَلَى الحَوْضِ} واتە: من لە پێش ئێوەدا دەچمە سەر حەوز، كە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

(إِفْرَاط) بریتیە لە زێدەڕۆیی كردن لە پێشكەوتندا و، (تَفْرِيط) بریتیە لە كەمتەرخەمیی لە چوونە پێشدا. (مُّفْرَطُونَ) یانی: (مُقَدَّمُونَ إلى النار) پێشدەخرێن، هەندێكیان (مُّفْرَطُونَ) یان بە (مَنْسِيُّون)، (مُتْرَكُون) واتە: لەبیركراوان، یاخود: پشتگوێ خراوان، بەوە مانایان كردوە.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٨٨٣٠، وَالبُخَارِيُّ: ٦٢١٧، وَمُسْلِمٌ: ٢٢٨٩، وَابْنُ حِبَّانَ: ٦٤٤٥، عَنْ جندب ﷺ.

# مانای گشتی ئایەتەکان

وەك گوتمان: ئەو چوارده (١٤) ئایەتە تەوەری سەرەكییان، بریتیە لە تەنیا خواپەرستیی و، تەنیا شایستەیی خوا ﷻ، بۆ بەندایەتیی بۆ كران و پەرستران، ئەوە تەوەرە سەرەكییەكەیەتی، هەروەها بەرپەرچدانەوەی بیرۆكەی شیرك بە هەموو جۆرەكانیەوە و، هەندێ بیر وبۆچوون و هەڵوێست و ڕەفتاری پووچی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانیشی نێواخن كراوە، چونكە وەك گوتراوە: (**وبأضْدَادِهـا تَتبَيَّنُ الأَشْياءُ**) واتە: شتەكان بەهۆی دژ و پێچەوانەكانیانەوە زیاتر ئاشكرا دەبن، ئەگەر بتەوێ بیرۆكەی یەكتاپەرستیی و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا كردن و، تەنیا خواپەرستیی، چاك ئاشكرا بێ، باسی پێچەوانە و دژەكەشی بكە، كە بریتیە لە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان (شِرك).

لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێم: كە ئێمە لە كۆتایی سوورەتی (**یوسف**)دا، باسێكی خەست و خۆڵ و، تێر و تەسەلمان لە قەدەر ئەم تەفسیرە، دەربارەی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان، كردوە، ئنجا كە باسی هاوبەش بۆ خوا دانان دەكەین، ناڕاستەوخۆ باسی خوا بەیەكگرتن و تەنیا خوا پەرستییش دەكرێ، لەوێ بە تەفصیل لەوبارەوە قسەم كردوە، هەروەها كاتی خۆشی لە تەفسیری سوورەتی (**النساء**)یشدا، لە چەند شوێنێكدا باسمان كردوە، بەڵام باسی تێر و تەسەلمان لە كۆتایی سوورەتی (**یوسف**)دا لەوبارەوە كردوە.

ئێستاش با بێینە سەر تەفسیری ئەم ئایەتانە، كە ئێمە بە گشتی و بە خێرایی مانا گشتییەكەی دەكەین:

﴿ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ ﴾، (و) لێرەدا گێڕەرەوە (**عاطفة**)یە و دوای ئەوەی ئایەتەكانی پێشێ ڕابردن، ئەم(و)ە ئەو قسەیە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوێ، عەطفی دەكاتەوە و بای دەداتەوە سەر ئەو مەبەستانەی پێشێ، واتە: خوا فەرمووی: با دوو پەرستراوتان نەبن، دوو پەرستراوان مەگرن، ﴿ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾، واتە: بە دڵنیایی پەرستراوی ڕاستەقینە، تەنیا یەك پەرستراوە، (ئەویش خوایە)، ﴿ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾، واتە: با تەنیا ترس و سامتان بەرانبەر من هەبا، ئەوە - وەك دوای باسی دەكەین - دەگونجێ مەبەست پێی بەرپەرچدانەوەی بیرۆكەی مەجووسییەكان بێ، كە بڕوایان بە دوو پەرستراوان هەیە: (یەزدان و ئەهریمەن)، دەشگونجێ هەر مەبەست پێی بەرپەرچدانەوەی بیرۆكەی شیرك

بێ بە گشتی، چونکە ئەگەر هەڵە بێ دوو پەرستراو بپەرسترێن، زۆر پەرستراو، زیاتر هەڵەیە بپەرسترێن.

﴿ وَلَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی ئەوە، ﴿ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًا ﴾، واتە: ملکەچیی بەردەوام و نەگۆڕیش تەنیا بۆ ئەوە.

لێرەدا وشەی: ﴿ ٱلدِّينُ ﴾، بە مانای ملکەچیی و، گەردنکەچیی و فەرمانبەریی دێ، ﴿ وَاصِبًا ﴾، واتە: بەردەوام و نەگۆڕ، کە لەسەر یەك حاڵ بێ و، شتێك لەسەر یەك حاڵ بمێنێتەوە، ﴿ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴾، واتە: ئایا پارێز لە جگە لە خوا دەکەن ؟! هەر خوا شایستەی ئەو پارێزەیە.

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾، هەر چاکەیەك و خۆشییەك لە ئێوەدا هەیە لە خواوەیە، ﴿ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴾، واتە: دواییش ئەگەر زیانێکتان تووش بوو، هەر پەنا دەبەنە بەر وی، تەنیا لەبەر وی دەکڕووزێنەوە و، دەپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی ئەو زیان و ناڕەحەتییەتان لێ دووربخاتەوە.

﴿ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴾، واتە: دواییش هەر کات ئەو زیانەی کە تووشتان بووە، لێی لابردن و، دووریخستەوە، کۆمەڵێك لە ئێوە هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن، واتە: دەگەڕێنەوە سەر حاڵی پێشییان، یاخود لاچوونی ئەو زیان و ناڕەحەتییە، بە هی غەیری خوا دەزانن و، بە چاکەی غەیری خوا ﷻ لە قەڵەمی دەدەن.

﴿ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ ﴾، واتە: دەبا سپڵەیی بکەن بەرانبەر بەوەی کە پێمان داون، ﴿ فَتَمَتَّعُواْ ﴾، واتە: ڕابوێرن و بگوزەرێنن، ﴿ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، واتە: لەمە ودوا دەزانن، دەزانن چەندە بە هەڵەدا چوون، هەندێك ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ ﴾، واتە: با کوفر بکەن، بەوەی پێمان داون لە پێغەمبەرایەتیی و، لە بەرنامە و لە وەحیی و پێی بێبڕوا بن، بەڵام بەپێی سیاقی ئایەتەکان، کە باسی ناز و نیعمەتەکانی خوایە، واتە: با سپڵە بن و، بێوەفا و بێ ئەمەگ بن بەرانبەر بەو چاکانەی پێمان داون و، با ڕابوێرن و ماوەیەکی کەم، لەمەودوا دەزانن.

پێشێ بە شێوەی نادیار (غائب) هێناویەتی: ﴿ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ ﴾، دوایی یەکسەر گۆڕیویەتی بە حاڵەتی دواندن (**خطاب**)ی ڕووبەڕوو: ﴿ فَتَمَتَّعُواْ ﴾، واتە: ڕابوێرن و، چێژ

وەربگرن، لەو دەرفەتە کەمەی ژیانەی دنیا، ﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، لەمە ودوا دەزانن و بۆتان دەردەکەوێت کە چەندە بە هەڵەدا چوون.

ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی دیکەی هاوبەش بۆ خوا دانەران: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ ﴾، واتە: بۆ شتانێك کە نایانزانن، واتە: نایانزانن کە پەرستراو بن، زانیارییان نیە بەوەی کە پەرستراون، پشکێك لەوەی کە پێمانداون، بۆ وانی دادەنێن، واتە: ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕن، یاخود خێر و خێراتیان بۆ دەکەن، مەسرەفیان لێ دەکەن، بەشێك لەوەی کە پێمانداون بۆ وانی تەرخان دەکەن، کە زانیارییشیان پێیان نیە، کە پشکیان لە پەرستراوێتیی دا هەبێ.

یاخود ﴿ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: بۆ شتانێك کە زانیارییان نیە، کە بت و صەنەمەکانن و، هەموو ئەو پەرستراوانەن کە مرۆڤەکان دەیانپەرستن، بێگومان زانیارییان نیە، تاکو ئەوانەی شوێنیان دەکەون و دەیانپەرستن، بەهرەمەندیان بکەن.

﴿ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴾، واتە: بە خوا لێتان دەپرسرێتەوە لەوە کە بە درۆ هەڵیدەبەستن، ئەو درۆیانەی هەڵیاندەبەستن، کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، ئەوە درۆیەکە و هەڵدەبەسترێ، ئێوە لەسەر ئەو درۆ هەڵبەستنە، لێتان دەپرسرێتەوە، کە لێشتان پرسرایەوە، مانای وایە سزا دەدرێن.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات، دەفەرمووێ: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ ﴾، واتە: هەروەها کچان بۆ خوا دادەنێن، ﴿ سُبْحَانَهُ ﴾، واتە: پاکیی و بەرزیی و دووریی بۆ خوا، لەوە کە ڕۆڵەی هەبێ، ﴿ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴾، واتە: خۆشیان ئەوەی کە ئارەزووی دەکەن، - بە خەیاڵی خۆیان - ئەوەش هی خۆیانە، کە بریتیە لە کوڕان، واتە: بۆ خۆیان هەڵوێستیان ئاوایە، بە کچان ڕازی نین کەچی دەڵێن: فریشتەکان کچی خوان!

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾، واتە: ئەگەر یەکێکیان موژدەی مێینەی پێ بدرێ و بگوترێ: مێینەتان بووە، کچتان بووە، ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێ و لەبەر خۆیەوە خەفەتبار و پیشخۆرەوەیە.

﴿ يَتَوَارَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ﴾، واتە: خۆی لە خەڵکەکەی دەشارێتەوە لەبەر خراپیی ئەو موژدەیە، یان لەبەر ئەو موژدە خراپەی کە پێی دراوە، ﴿ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ﴾، واتە: ئایا بە ڕیسوایی و شەرمەزاریی ئەو کچە بگرێ ؟

بۆیە فەرموویەتی: ﴿ أَيُمْسِكُهُۥ ﴾، هەرچەندە ڕاناوەکەی بۆ کچان دەچێتەوە، یانی: ئەو شتەی کە موژدەی بەوی پێدراوە، ئایا ئەو کچە بیهێڵێتەوە بە ڕیسوایی و زەبوونیی و شەرمەزاریی، ﴿ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ﴾، واتە: یاخود بیخاتە بن خاك و لە ژێر گڵ دا بیشارێتەوە و، زیندە بە چاڵی بکات، ﴿ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾، واتە: ئاگاداربن! ئەوە خراپترین جۆرە بڕیارە کە دەیدەن، خراپترین حوکمە کە بەسەر ئەو منداڵەدا دەیدەن، کە خوا ﷻ پێی داون، لەجیاتی ئەوەی کە سوپاسی خوا بکەن و، سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام بدەن، بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.

﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ﴾، واتە: بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، سیفەت و حاڵی هەرە خراپ هەیە، ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾، بۆ خواش سیفەت و حاڵی هەرە بەرز هەیە، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئەو (خوا)یش زاڵی کارزانە.

﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾، واتە: ئەگەر خوا بەهۆی ستەمەوە، خەڵکی گرتبایە و سزای دابان، یەك زیندەوەر و ژیانداری لەسەر زەوی نەدەهێشت، ڕاناوی (ها)ی سەر (عليها)، بۆ زەوی دەچێتەوە لەبەر ئەوەی دیارە ژیاندارەکان لەسەر کوێ دەژین، ژیاندار و مرۆڤەکان لەسەر زەوی دەژین.

کەواتە: قسە لەبارەی خەڵکی سەر زەوییەوەیە، هەرچەندە باسی زەوی نەکراوە، بەڵام دیارە ڕاناوەکە بۆ وی دەچێتەوە، ﴿ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، بەڵام (خوا) دوایان دەخات بۆ کاتێکی دیاریکراو، کە ڕۆژی دواییە، یاخود مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، واتە پێچرانەوەی ئەم ژیانە دنیایە، ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ ﴾، واتە: ئنجا وەختێك کاتی دیاریکراویان هات، کاتی بۆ تەرخانکراویان هات، کە تێیدا بمرن، یاخود ئەم ژیانە دنیاییە کۆتایی بێت و ئاخیر زەمان بێت، ﴿ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾، نە کاتێکی کەم دوادەکەون و، نە کاتێکی کەم پێش دەکەون.

وشـەی: ﴿ سَاعَةً ﴾، ئـەو چەمـك و واتایـەی نیـە کـە ئێسـتا ئێمـە دەیزانیـن، واتـە: بەشێك لـە بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعات، کـە شـەو و ڕۆژ لـە بیسـت و چـوار بـەش پێکدێ، بەڵکـو (سَاعَةً)، یـانی: کاتێـکی کـەم، یـانی: نـە کاتێـکی کـەم دوادەخرێـن و، نـە کاتێـکی کـەم پێـش دەخرێـن.

﴿ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكۡرَهُونَ ﴾، واتـە: هەروەهـا ئەوانـە شـتێك کـە حـەزی پـێ ناکـەن و، پێیـان ناخۆشـە، بـۆ خـوای دادەنێـن، ﴿ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، واتـە: بـە زمـانی بـە درۆ دەڵێـن، یاخـود: زمانەکانیـان وەسـفی درۆ دەکـەن: ﴿ أَنَّ لَهُمُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾ کـە پاداشـتی هـەرە چـاك، یـان سـیفەتی هـەرە بـەرز و چـاك و، بـەشی هـەرە بـاش هـی ئەوانـە! ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان ئاگریـان بـۆ هەیـە و، بێگومـان ئـەوان پێـش دەخرێـن، واتـە: پێـش دەخرێـن بـەرەو دۆزەخ، یاخـود: ﴿ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴾، یـانی: پشـتگوێ دەخرێـن لـە ئاگـردا و لەبیـر دەکرێـن، (لەبیـر دەکرێـن) یـانی: وا مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکـرێ، هێنـدە لـە دۆزەخـدا دەمێننـەوە وەك: لەبیرچووبنـەوە، ئەگەرنـا خـوا ﷻ هیـچ شـتێك فەرامـۆش نـاکات و، هەمـوو شـتێکی هەمیشـە لەبەرچـاوە.

﴿ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ ﴾، واتـە: بـە خـوا لـە پێـش تـۆدا پێغەمبەرانێکمان ڕەوان کـرد بـۆ چەنـد کۆمەڵگایـەك، ﴿ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، شـەیتان کـردەوەکانی خۆیـانی بـۆ جـوان کـردن و بـۆی ڕازاندنـەوە، ﴿ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، ئێسـتا ئەمـڕۆ ئـەو دۆسـت و مشـوورخۆری وانـە، ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئێسـتاش ئـەو کافرانـە سـزا و ئازارێـکی بەئێشـیان بـۆ هەیـە.

یاخـود ﴿ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، واتـە: ئـەو شـەیتانەی کاتی خـۆی کـردەوە خراپـەکانی بـۆ گەلـە پێشـووەکان ڕازاندنـەوە، ئێسـتا لـە قیامەتـدا ئـەو سەرپەرشـتیار و مشـوورخۆریانە، ئنجـا کەسـێك شـەیتان مشـوورخۆر و سەرپەرشـتیاری بـێ، دەبـێ حاڵـی چـۆن بـێ !

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ ﴾، واتـە: هەروەهـا کتێبـمان دانەبەزاندۆتـە سـەر تـۆ، مەگـەر تاکـو، ئـەوەی کـە تێیـدا کەوتوونـە ڕاجیایـی و کێشـە و مشـتومڕەوە، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، ﴿ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾، هەروەهـا ڕێنماییـە و مایـەی بەزەیـی خوایـە بـۆ کۆمەڵێـك کـە بـڕوا بێنـن، واتـە: ئێمـە قورئانمـان بـۆ هێنانـە دی ئـەو ئامانجانـە بـۆ لای تـۆ دابەزانـدوە، بـۆ ئـەوەی

کە هەموو ئەو شتانەی ڕاجیاییان تێیاندا دەبێ، لە بوارەکانی: بووناسیی و، ئیمان و عەقیدە و، پەرستشەکان و، حەڵاڵ و حەڕام و، ڕەوشت و ئاکار و، ئابووریی و ژیان و گوزەران و، حوکم و سیاسەت و، جەنگ و ئاشتیی... هتددا، هەموو ئەوانەیان بۆ ڕوون بکەیەوە، بۆچی؟! چونکە بەبێ بەرچاوڕوونیی وەحیی، مرۆڤەکان ناتوانن ژیانێکی ڕاست و تەندروست و خوا پەسند لەسەر زەوی بگوزەرێنن، ئنجا ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردوە، تاکو هەموو ئەو شتانەی تێیاندا دەکەونە ڕاجیاییەوە، پێویستە نوقتەیان تێدا بخرێتە سەر پیت، بۆیان ڕوونبکەیەوە، ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، هەروەها ڕێنمایی و ڕێ پێشاندەرە و مایەی دابەزاندنی بەزەیی خوای پەروەردگاریشە بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن، ئەو شتانەی کە تێیاندا دەکەونە ڕاجیایی، بەگشتی بۆ خەڵکیان ڕوونبکەیەوە و، بەتایبەتییش بۆ بڕواداران ببێتە مایەی ڕێپێشاندان و، دەستەبەرکردن و دابینکردنی بەزەیی خوای پەروەردگار بۆیان.



## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی خوا بۆ یەکتایی خۆی، لە پەرستراویتیی دا، بینا لەسەر خاوەندارێتیی تەنیای بۆ گەردوون و، بۆ سەرجەم نیعمەتەکان و، لابردنی بەڵا و گرفتارییەکان، کەچی هاوبەش بۆ دانرانی لەلایەن هاوبەشدانەرەکانەوە، کە بێگومان لەسەر ئەوە سزا دەدرێن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١- ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ﴾، واتە: خوا فەرمووی: دوو پەرستراوان دامەنێن، ﴿إِلَٰهَيۡنِ﴾، یانی: دوو پەرستراو، ﴿ٱثۡنَيۡنِ﴾یش، یانی: دووان، ئنجا ئەمە سێ واتای هەن کە وشەی: ﴿إِلَٰهَيۡنِ﴾، بە (إثنين) داکۆکیی لێکراوە:

١/ خوا ﷻ لێرەدا وشەی: ﴿ٱثۡنَيۡنِ﴾ی، کردوە بە جەختکەرەوە (**مؤكِّد**)ی واتای ﴿إِلَٰهَيۡنِ﴾، یانی: بە تایبەت مەبەست پێی دوو پەرستراو دانانە، نەك تەنیا مەبەست ئەوە بێ کە لە پەرستراوێك زیاتر دامەنێن، ئنجا ئەگەر دوو بن، ئەگەر سێ بن، ئەگەر زیاتر بن.

خوای پەروەردگار زۆری مەبەستە کە بەرپەرچی بیرۆکەی دوانەتیی (**ثنوية**) بداتەوە، زانایان دەڵێن: (**هـذه إشَارَةٌ إلى المَجُوسِيَّة التي تَأَثَّرت بها بَعْضُ قَبائِلِ العَرَب**)، ئەمە ئاماژەیە بە ئایینی مەجووسییەت، کە هەندێك لە هۆزەکانی عەڕەب (بەڵکو زۆر لە گەلان و نەتەوەکان) پێیان کارتێکراو بوون، ئەوان دەیانگوت: دوو پەرستراو هەن، (یەزدان) و (ئەهرومەن)، دیارە ئێمە هەر بە (ئەهریمەن)مان بیستوە لە زمانی فارسیی و کوردییدا، بەڵام لە زمانی عەڕەبیدا گوتراوە: (**أَهرُمُن**) کە وەك ئەفسانەیەك دەڵێ: یەزدان (هەر

خوا بەدیهێنەرە و پەروەردگارە)، ڕۆژێك بیری کردەوە لە خراپە، یەکسەر لەو بیرکردنەوە خراپەی وی (أهرُمُن) پەیدا بوو، واتە: (ئەهریمەن) کە دەگوترێ: پەرستراوی شەڕ و خراپە، ئیدی ئێستا پەرستراوی چاکە، ڕەمزەکەی ڕووناکییە و، پەرستراوی خراپە، کە ئەهریمەنە ڕەمزەکەی بریتیە لە تاریکیی.

**٢/** وشەی (**إِثنين**) بە دوای (**إلهين**)دا تەنیا بۆ جەختکردنەوەیە وەك خوا لە سوورەتی (**البقرة**)دا (١٩٦) فەرموویەتی: ﴿ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ﴾، ئەوە دە (١٠)ی تەواون.

**٣ /** منیش وای تێدەگەم کە خوا ﷻ بەڵێ، بە تەئكید بەرپەرچی دووانەتیی (**ثنوية**) دەداتەوە و ڕەفزی دوو پەرستراوێتیی دەکات، بەڵام لێرەدا یانی: تەنانەت دوو پەرستراویش دامەنێن و با هەر یەك پەرستراو بێ، چونکە هەر ئەو شایستەی پەرستنە کە خوایە، چ جای دووان زیاتریش بن، وەك عەرەبەکان سێ سەد و شەست (٣٦٠) بتیان لە کەعبەدا هەبوو.

**٢-** ﴿ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾، بێگومان ئەو تەنیا یەك پەرستراوە، واتە: پەرستراوی ڕاستەقینە یەك پەرستراوە کە خوایە ﷻ.

وشەی ﴿ إِلَٰهٌ ﴾یش:

**أ /** یان لە (**أَلَهَ**)ەوە، هاتوە (**أَلَهَ**) یانی: (**عَبَدَ**) واتە: پەرستی، (**أَلَهَ فُلاَنٌ يأْلُهُ إِلَهة، أَي: عَبَدَ يَعْبُدُ عِبادَةً**)، کەواتە: ﴿ إِلَٰهٌ ﴾، کەسێکە کە دەپەرسترێ.

**ب/** یان لە (**أَلِهَ**)ەوە، هاتوە (**أَي: تَحَيَّرَ**) واتە: سەرسام بوو، یانی: ﴿ إِلَٰهٌ ﴾، کەسێکە کە مرۆڤەکان لە پەیبردن و چۆنیەتیی چیەتییدا، تووشی سەرسامیی و سەراسیمەیی دەبن.

**ج/** یاخود لە (**لاَهَ**)ەوە، هاتوە (**لاَهَ، أَي: احْتَجَبَ، لاَهَ يَلُوهُ لِياهاً، احْتَجَبَ يَحْتَجِبُ احْتِجَاباً**) لەبەر ئەوەی خوا پەنهانە و نابینرێ.

**د/** یاخود لە (**وَلِهَ**)ەوە، هاتوە کە ئەویش ئەسڵەکەی (**وِلاَه**)ە، (**لِكَوْنِ المَخْلُوق وَالِهاً نَحْوَهُ**) لەبەر ئەوەی خوا ﷻ هەموو دروستکراوێك موشتاق و تامەزرۆیە بۆی[1].

**٣-** ﴿ فَإِيَّٰيَ فَٱرْهَبُونِ ﴾، واتە: تەنیا ترس و سامتان بەرانبەر بە من هەبێ، (**الرَّهْبة والرُّهب: خَوْفٌ مَعَ اضْطِرَاب**)، وەك پێشتر باسمان کرد، (**رَهْبة و رُهْب**) بریتیە لە ترسێك لەگەڵ لەرزین و ڕاچڵەکین و هاوسەنگیی تێك چووندا.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، للراغب، ص ٨٢، ٨٣.

٤- ﴿ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، واته: هەرچی له ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هی ئەوە، هیچ کەسێکی دیکە خاوەنی هیچ شتێك نیە، بەڵکو هەموویان خاوەندارن هیچ شتێك نیە، خاوەنی ڕاستەقینە بێ، بەڵکو هەمووی خاوەنداره و، خاوەنەکەشی خوایە.

٥- ﴿ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًا ﴾، واته: خوا ملکەچیی بەردەوامی بۆ هەیە، له لایەنی دروستکراوەکانیەوە، (الدِّينُ: الطَّاعَة) ملکەچیی و فەرمانبەریی بۆ کران، (وَاصِبا: أَي ثَابتاً دَائِماً)، واته: بەردەوام و چەسپاو.

٦- ﴿ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴾، واته: ئایا پارێز له جگه له خوا دەکەن، تەنیا خوا شایستەی پارێز لێکرانە، پارێزکردنیش له خوا ئەوەیە کە ئەو ئەرکانەی دیارییکردوون، جێبەجێ بکرێن و، ئەو قەدەغانەی دیارییکردوون، دوورییان لێبکرێ و نەشکێنرێن.

٧- ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾، واته: هەرچی چاکە و خێرو خۆشییەك له ئێوەدا هەیە، له ژیانتاندا، له جەستەتاندا، له دەوروبەرتاندا هەیە، هەمووی له خواوەیە، هەڵبەتە چاکەکانی خواش ناژمێردرێن، چونکە شتی زۆر بچووك هەیە، بەڵام کاریگەریی زۆر گەورەی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا، بۆ وێنە:

زانایانی شارەزای جەستەی مرۆڤ و پزیشکەکان دەڵێن: - مێشك (مُخّ)، کە (دماغ) یشی پێ دەڵێن - لە خوار مێشکەوە مێشکۆڵە (المُخَيْخ) هەیە، کێشەکەی (١٤٠) گرامە، کێشێکی زۆر کەمی هەیە، بەڵام ئەو مێشکۆڵەیە چەقی هاوسەنگیی و جووجوڵی هەموو ئەندامەکانە لە جەستەدا، بۆ وێنە:

کاتێك ئینسان چاو دەبڕێتە شتێك، یان دەست دەجووڵێنێ، یان دەڕوات، یان شتێك هەڵدەگرێ، ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بە ئەو مێشکۆڵەوە هەیە و لەوێوە ڕێنمایی دەنێررێ و ئەگەر ئەوێ تێکبچێ، مرۆڤ تەنانەت ناتوانێ ڕابوەستێ یان بڕوات، هەندێك کەس کە ئەو مێشکۆڵەیان شتێکی بەهێزی بەردەکەوێ، جموجوڵی ئاساییان بۆ ناکرێ، بۆ وێنە: ئەگەر بیانەوێ خۆیان بخورێنن، ناتوانن، ڕەنگە کەسێك بیەوێت دەست بۆ لووتی بەرێ، لەجیاتی لووتی، دەست بۆ شوێنێکی دیکەی بەرێ، مەبەستم ئەوەیە: شتی زۆر بچووك هەیە لە مرۆڤدا، بەڵام کاریگەریی زۆر گەورەی هەیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: هەرچی نیعمەتە لە ئێوەدا بە بچووك و گەورەوە، هەمووی لە خواوەیە.

٨- ﴿ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴾، (ثم: للتَّرتِيب الرتبي) (ثم) بۆ ڕیزبەندیی پلەپلەییە، واته: هەرچی چاکەیە لەوەوەیە، ئنجا ئەگەر هەر زیانێکتان تووش بوو هەر پەنا بۆ لای وی

دەبەن و، هەر لەو دەکڕووزێنەوە و بۆ لای وی دەلاڵێنە و دەپاڕێنەوە، (**الجُؤار: الصُّراخُ وَالتَضَرُّع**) (**جؤار**) بریتیە لە هاوار تێبەستن و کڕووزانەوە و لالانەوە.

٩- ﴿ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾، واتە: دواییش هەر کات خوا زیانەکەی لێ لابردن و، دووری خستەوە، کۆمەڵێك لە ئێوە هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن، دیسان (ثُمَّ)، (**للترتيب الرتبي**)، بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، واتە: دوای ئەوەی خوا ئازارتان لێ لادەبات، کەچی هێندێکتان هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن، یانی: لەسەر هاوبەش بۆ خوادانانی پێشێیان بەردەوام دەبن، یاخود لەو هەڵوێستەیاندا، لابردنی ئەو ئازار و ناڕەحەتییە دەگێڕنەوە بۆ جگە لە خوا ﷻ.

١٠- ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَـٰهُمْ ﴾، واتە: با بەو نیعمەتانەی پێماندان، سپڵە و بێوەفا و بێ ئەمەگیی بکەن، (**الكُفْرُ هُنا كُفْرَان النِّعْمَة**) (**كفر**) لێرەدا بریتیە لە ناسوپاسیی و سپڵەیی لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا.

١١- ﴿ فَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: ئنجا بگوزەرێن و ڕابوێرن، (فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ) لەمەودوا بۆتان دەردەکەوێ، (**التَمَتُّعُ: الإِنْتِفَاعُ بالْمَتَاع**) واتە: بریتیە لە بەهرە وەرگرتن لە شتێك کە جێی بەهرە لێوەرگرتنە.

﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: لەمەودوا دەزانن کە سزای سپڵەییتان چۆنە؟ دەزانن چەند شتێکی خراپتان کردوە، کە ئاوا بەو شێوەیە سپڵە دەبن.

(**الخَطِيبُ الإِسْكافِي**)، خاوەنی (**دُرَّةُ التَّنْزِيل وَغُرَّةُ التَّأْوِيل**)[1] لە کتێبەکەیدا، دەڵێ: خوا ﷻ ئەم ڕستەیەی لە سێ شوێن لە قورئاندا هێناوە:

**١)** لێرە لە سوورەتی (**النحل**) - ٥٥ - دا.

**٢)** لە سوورەتی (**الروم**) - ٣٤ - دا، دەفەرموێ: ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَـٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾.

**٣)** لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا، دیسان ئەم ڕستەیە لەوێشدا هاتوە.

بەڵام لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا دەفەرموێ: ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَـٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

---

(١) ص١٨٦.

ئنجا با سەرنج بدەین حیکمەتی ئەو جیاوازییە چییە؟

**أ/** حیکمەتی جیاوازییەکە ئەوەیە کە: لە سووڕەتی (**النحل**)دا خوا ﷻ هەموو سیاقەکەی بە شێوەی دواندن (**خطاب**) هێناوە، هەر لە سەرەتاوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ هەمووی بە شێوەی دواندنی ڕووبەڕوو هاتوە، بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾، ئەوە هەر لەو سیاقی دواندنی ڕووبەڕوو دایە، واتە: ڕابوێرن لەمەودوا بۆتان دەردەکەوێ.

**ب/** لە سووڕەتی (**الروم**)یشدا کە دەفەرموێ: ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ لەوێش بەهەمان شێوە، سیاقەکە وادەخوازێ کە ڕوو بکاتە دوێنراوەکان و ڕووبەڕوو بیاندوێنێ.

**ج/** بەڵام لە سووڕەتی (**العنكبوت**)دا بە شێوەی نادیار قسە کراوە، کە دەفەرموێ: ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: با بەرانبەر بەوەی پێمان داون، سپڵە و ناسوپاس بن و بیگوزەرێنن، لەمەودوا بۆیان دەردەکەوێ.

یانی: لە هەر شوێنێکیاندا بەپێی ئەو کەش و هەوایەی کە ئایەتەکانی تێدا هاتوونە خوار، خوا ﷻ شێوازەکەی داناوە، هەڵبەتە دەگونجێ زۆر وردەکاریی دیکەش لەوبارەوە باس بکرێن، بەڵام ئێمە بەوەندە وازی لێدێنین.

**مەسەلەی دووەم:**

**هاوبەشدانەرەکان لەوەی خوا پێیداون بەشێکی بۆ پەرستراوەکانیان دادەنێن و، کچان بۆ خوا دادەنێن، کەچی خۆیان کوڕ نەبێ نایانەوێ! بێگومان ئەوان خراپترین وەسف و حاڵەتیان هەیە، خواش باشترین وەسف و حاڵی هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ ۗ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١- ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ ﴾، واتە: بۆ شتانێك كە نایانزانن بەشێك لەوەی پێمانداون بۆیان دادەنێن، واتە: قوربانیی و خێرو خێرات و مەسرەفیان لێ دەكەن و شتیان بۆ دادەنێن، وەك عادەتی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان لە ڕابردووداو لە ئێستاشدا هەر وایە.

كە دەفەرموێ: ﴿ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ ﴾.

أ) واتە: بۆ شتانێك كە نایانزانن كە پەرستراون و زانیارییان نیە بە پەرستراوییان.

ب) واتایەکی دیکەی: ﴿ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ ﴾، واتە: ئەوانەی كە بەپەرستراویان داناون، ئەو پەرستراوانە، عیلم و شارەزاییان نیە و نازانن.

هەردووك واتاكەشی هەر ڕاستن: هەم ئەوانەی كە دەیانپەرستن، زانیارییان بەوە نیە كە پەرستراوبن، هەم ئەو شتانەی كە دەپەرسترێن، زانیارییان نیە، نە بە خۆیان و، نە بەوانەی كە دەیانپەرستن، نە بە پێداویستییەكانیان، تاكو مشووریان لێ بخۆن و بەكەڵكیان بێن.

٢- ﴿ تَاللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴾، واتە: بە خوا بێگومان لێتان دەپرسرێتەوە لەوەی کە هەڵتان دەبەست، (**الإفتراء: إِخْتِلاَقُ الكَذِبِ**)، (**إفتراء**) بریتیە لە درۆ هەڵبەستن، خوا سوێند دەخوا کە لێتان دەپرسێتەوە، ئنجا کە لێیان پرسرایەوە، بێگومان لە ئەنجامی لێپرسرانەوەدا سزاش دەدرێن، واتە: سزاش دەدرێن لەسەر ئەوەو، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن.

٣- ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ ﴾، واتە: کچان بۆ خوا دادەنێن، وەك لە سوورەتی (**الأنعام**)دا لە ئایەتی (١٠٠)دا کە پێشتریش تەفسیرمان کردوە، لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا، دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، واتە: کوڕان و کچانیان بۆ خوا هەڵبەستن بەبێ زانیاریی، دەیانگوت: جندەکان کوڕی خوان و، فریشتەکانیش کچانی خوان، کە خواش ﷻ بەرزە و بێ وێنە و بێ هاوەڵ و هاوتایە.

٤- بۆیە دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ ﴾، واتە: پاکیی بۆ خوا، (**السَّبْحُ: الْمَرُّ السَّرِيعُ فِي الْمَاءِ أَو فِي الْهَوَاءِ، وَالتَّسْبِيحُ: تَنْزِيهُ اللَّهِ وَإِبْعَادُهُ عَنِ الشَّرِّ**)، (**سَبح**) بە ڕۆیشتنی خێرا دەگوترێ بەنێو ئاوێدا، یاخود بەنێو هەوادا، {وەك (**سِباحَة**) واتە ڕۆیشتن بەنێو ئاودا، مەلەوانیی، ﴿ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾یس، واتە: هەموویان لە سوڕگەیەك دا، لە فەزادا مەلە دەکەن و، دێن و دەچن}، وشەی (**تسبیح**) بریتیە لە بە پاکگرتنی خوا و دوورخستنەوەی خوا لە هەر شتێك کە خراپ بێ، لە هەر کەم و کوڕییەك و لە هەر لەکە و پەڵەیەك، پاکیی بۆ خوا، ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ ﴾، واتە: (**أُسَبِّحُهُ تَسْبِيحاً**)، واتە: خوا بە پاك دەگرم، بە بە پاکگرتن، لەوە کە کچی هەبن، یان کوڕی هەبن.

٥- ﴿ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴾، واتە: خۆشیان هەرچی ئارەزوویانە بە گومان و خەیاڵی خۆیان بۆ ئەوانە، (**الشهوَةُ: نُزُوعُ النَّفْسِ إِلى مَا تُرِيدُهُ**) (**شهوة**) واتە: ئارەزوو چوونی نەفس بەرەو شتێك کە حەزی لێدەکات، بە کوردیی دەڵێین: ئارەزوو، هەر شتێك کە ئارەزوویانە و دڵیان لێیەتی بۆ خۆیانە، کە کوڕەکانن.

٦- ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾، واتە: بەڵام ئەگەر یەکێك لەوانە موژدەی پێبدرێ بە مێینە، ئەوە بەردەوام ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێ و، لەبەرخۆی پیش دەخواتەوە، واتە: سینەی پڕبووە لە خەفەت و مەراق، دەم و چاویشی ڕەش داگەڕاوە لە خەفەتان.

٧- ﴿ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ﴾، واتە: خۆی لە خەڵکەکە پەنهان دەکا، لەبەر ئەو موژدە خراپەی کە پێی دراوە، ئەو موژدە خراپە چیە ؟! ئەوەیە کە کچتان پەیدا بووە، فلانکەس، ئیدی تازە ڕووی مەجلیسانی نیە و دەبێ خۆی بشارێتەوە !

٨- ﴿ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ ﴾، واتە: ئایا بە سەرشۆڕیی و زەبوونیی بیهێڵێتەوە، ئەو نەفەرەی کە موژدەی لەسەری پێدراوە؟ یانی: (أَيُمسِكُ هَذَا المُبَشَّرَ بِهِ) کە کچە، بەڵام ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ ئەو موژدە، ئایا پێدراوە بیهێڵێتەوە: ﴿ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ ﴾، یاخود لە گڵ دا پەنهانی بکات و ژێر گڵی بخات و، زیندە بە چاڵی بکات؟!

٩- ﴿ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴾، واتە: ئاگاداربن! ئەوە خراپترین شتە کە ئەوان بڕیاری لەسەر دەدەن، یاخود ئەو بڕیارەی ئەوان خراپترین بڕیار و بیرکردنەوەیە.

١٠- ﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوۡءِۖ ﴾، واتە: بۆ ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوای نیە وێنە و سیفەت و حاڵی هەرە خراپ هەیە، (المَثَلُ: الحَالَةُ العَجِيبة فِي الحُسْنِ وَالقُبْحِ) واتە: (مَثَل) بریتیە لە حاڵەتێکی سەیر لە چاکیی یان ناشیرینی و ناقۆڵاییدا، واتە: سیفەتی خراپ و حاڵی خراپ ئەگەر هەبێ، بۆ ئەوانەیە کە بڕوایان بە ڕۆژی دوای نیە، واتە: هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ لە جیاتی بفەرموێ: (للمشركين) دەیەوێ پێمان بفەرموێ: وێڕای هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن، ئەو سیفەتە خراپەشیان هەیە کە بریتیە لە بڕوا نەبوون بە ڕۆژی دوایی.

١١- ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ ﴾، واتە: خواش سیفەت و وێنەی هەرە بەرزی هەیە، زانایان گوتوویانە: (المُفَضَّل عَلَيْهِ مَحْذُوفٌ لِقَصْدِ العموم) لێرەدا خوا نەیفەرموە: سیفەتی هەرە بەرز بەسەر کێ دا؟ سیفەتی هەرە بەرز بەسەر هەموو شتێکدا، چونکە هەر شتێك هەیە جگە لە خۆی، هەمووی دروستکراویەتی، ئنجا بۆ ئەوەی مانا و چەمکەکەی گشتی بێ و بگشتێنرێ، بۆیە بەسەردا هەڵبژێرراو (مُفَضَّل عليه)ەکە قرتێنراوە.

١٢- ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، واتە: هەر خواش زاڵی کاربەجێیە.

(السَّوءُ: مَصْدَرٌ، وهو ما إِذَا عُمِلَ مَعَهُ مَا يكره) واتە: (ٱلسَّوۡءِ) چاوگە بریتیە لەوەی کە کەسێك شتێکی لەگەڵدا بکرێ و پێی ناخۆش بێ، (سُوء)یش ناوە.

لە سوورەتی (النجم) لە ئایەتەکانی: (٤٥ و ٤٦)دا خوا باسی دروستکردنی مرۆڤ دەکات، کە ئیعجازێکی عیلمییان تێدایە، دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: هەروەها خوا جووتی دروستکرد نێر و مێ، لە نوتفەیەك کە دەڕژێنرێ، واتە: دەڕژێنرێتە نێو ڕەحم و منداڵدانی ئافرەتەوە.

خوا فەرموویەتی: ﴿ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴾، واتە: لە تۆویلکەیەك، لە نوتفەیەك، کە مەبەست پێی ئاوی پیاوە، ئەگەرنا ئاوی ئافرەت هەر لە نێو خۆیدایە، بەڵام ئاوی پیاوە

کە دەڕژێنرێتە نێو منداڵدانەوە و، لە خۆی جیادەبێتەوە، بەس ئاوی ئافرەت هەر لەنێو خۆیدایە، مەگەر لە کاتی نەپیتێنران.

کەواتە: ئەوەی کە دەبێتە هۆی نێربوونی، یاخود مێ بوونی، کۆرپەلە، ئاوی پیاوە نەك ئاوی ئافرەت، کە ئنجا پێکهێنەری نوتفە (نطفة) لە نێو ئاوی پیاودا، پێی دەگوترێ: زیندەوەری مەنەویی (الحَيْوَان المَنَوِي)، بە کورتیی (حیمن) هی نێو ئاوی ئافرەتیش کە پێی دەگوترێ: هێلکۆکە (بويضة) ئنجا تەنیا ئاوی پیاو لە نێوکەکانیدا هۆکارەکانی مێینە بوون و نێرینە بوون هەڵدەگرێ.

هی نێرینە لەسەر شێوەی پیتی (Y)ی و هی مێینە لەسەر شێوەی پیتی (X)، بەڵام هی ئافرەت هەمووی هەر (XX)ە، ئنجا ئەگەر هی پیاو ئەوەیان بێ کە لەسەر شێوەی پیتی (Y)یە، لەگەڵ ئەوەی ئافرەتدا دەبێتە کوڕ بە فەرمانی خوا، بەڵام ئەگەر ئاوەکەی پیاو، ئەوەیان بێ کە لەسەر شێوەی پیتی (X)ە، بێگومان (X + X) دەبێتە (XX) واتە: کۆرپەلەکە دەبێتە مێینە، کە ئەمە ئێستا وەك نوێترین ڕاستیی زانستیی دەرکەوتوە.

(الطبري) لە قەتادەوە دەیهێنێ دەڵێ: (**هَذَا صَنِيع مُشْرِكِي العَرَب أَخْبَرَهُم اللَّهُ تعالى بِخُبْث صَنِيعِهِم، فَأَمَّا المُؤْمِنُ فَهُوَ حَقِيقٌ أَنْ يَرْضَى بِمَا قَسَّمَ اللَّهُ لَهُ، وَقَضَاءُ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ قَضَاءِ المَرْءِ لِنَفْسِهِ، وَلعَمْرِي مَا يَدْرِي أَنَّهُ خَيْر، لَرُبَّ جَارِيَة خَيْرٌ لأَهْلِها مِنْ غُلاَمٍ، وَإِنَّمَا أَخْبَرَكُم اللَّه بِصَنِيعِهِم لِتَجْتَنِبُوهُ وَتَنْتَهُوا عَنْهُ، فَكَانَ أَحَدُهُمْ يَغْذُو كَلْبَهُ وَيَئِدُ ابنتَهُ**)[1].

واتە: قەتادە گوتوویەتی: ئەمە کردەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی عەرەبە، خوای بەرز هەواڵیان پێدەدا، کە کردەوەیەکی خراپ و، ڕەفتارێکی خراپیان دەکرد، بەڵام بڕوادار شایستەیە کە ئەوەی خوا بۆی داناوە، پێی ڕازی بێ و، بڕیاری خوا بۆ ئەو باشترە، لە بڕیاری مرۆڤ بۆ خۆی، بە خوا جاری وا هەیە، کچێك بۆ کەسوکارەکەی زۆر باشترە لە کوڕێك، بەڵام خوا هەواڵی پێداون بە کردەوەیەکی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، تاکو خۆتانی لێ دوور بگرن و، واز لەوە بێنن کە یەکێك لەوان دەچوو خواردنی دەدا بە سەگەکەی، بەڵام کچەکەی خۆی زیندە بە چاڵ دەکرد !

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيامَةِ أَنا وَهُوَ وَضَمَّ أَصَابِعَه**} (**أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٦٣١، وَالتِّرمِذِيُّ: ١٩٠٤**).

---

(١) ج١٤، ص١٢٨.

واتە: هەر کەسێك دوو کچان بەخێو بکات تاکو باڵغ دەبن، ڕۆژی دوایی ئەو و من پێکەوە دێین و، پەنجەکانی پێکەوە جووت کردن.

## بەسەرهاتێك :

گێڕدراوەتەوە، کە جارێك ئافرەتێك، کە هاوسەرەکەی ناوی (**أبو حمزة**) بووە، کچیان دەبێ (**أبو حمزة**)ش تەرکی ماڵێ دەکات و ناچێتەوە ماڵ لەبەرئەوەی کچیان بووە !

ئنجا کاتێك کچەکە وردە وردە گەورە دەبێ، لەسەر قۆنداغ لادەچێ، ژنەکە هەڵیدەپەڕێنێ و، یاریی لەگەڵ دەکات و، لەبەرخۆیەوە ئەم شیعرە دەڵێ:

مَا لأَبِي حَمْزَةَ لا يأتِينا  يَظَلُّ فِي البَيْتِ الَّذِي يَلِينا

غَضْبانَ أَنْ لاَ نَلِدَ البَنِينا  وَاللَّـهِ مَا ذَلِكَ بأيْدِينا

وَإِنَّمَا نُعْطِي مَا أُعْطِينا

واتە: ئەبو حەمزە چییەتی نایەتەوە بۆ لامان و لەو ماڵەی دیکە دەبێ کە لە نزیکمانە؟! {دەبێ دوو ماڵی بووبن، یان ماڵێك کە خزمی بووە}، لەسەر ئەوە لێمان تووڕەیە کە کوڕمان نابن، بەڵام سوێند بە خوا ئەوە بە دەستی ئێمە نیە، بەڵکو ئێمە هەر ئەوە دەبەخشین کە پێماندەدرێ، (واتە: خەتای خۆمان نیە).

پێشتر ڕوونمان کردەوە کە لە ڕووی زانستیشەوە هۆکاری نێر بوون، یاخود مێ بوونی کۆرپەلە، تۆوی پیاوە نەك هی ئافرەتە.

## مەسەلەی سێیەم:

ئەگەر خوا ﷻ بەهۆی ستەم و خراپەوە لە دنیادا سزای خەڵکی دابایە، ئەوە زیندەوەری لەسەر زەوی نەدەهێشت! بەڵام بۆ کاتێکی دیاریکراو کە پاش و پێش ناکات، دوایان دەخات:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَابَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَابَّةٍ ﴾، واتە: ئەگەر خوا خەڵکی بەهۆی ستەمیانەوە بگرتایە، {واتە: ئەگەر سزای دابانایە}، ژیاندار، زیندەوەری لەسەر زەوی نەدەهێشت.

(ها)ی سەر (عَلَيْهَا) دیارە ڕاناوی مێینەیە و، بەتەئکید بۆ زەوی دەچێتەوە، هەرچەندە باسی زەویش نەکراوە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوە بەپێی سیاق و سەلیقە دیارە.

وشەی: (ظُلْم)، زۆرجار گوتوومانە: (الظُّلْمُ وَضْعُ الشيءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ، الظُّلْمُ الإِعْتِدَاءُ عَلَى الحَقِّ، الظُّلْمُ الشِّرْكُ وَالكُفْر، الظُّلْمُ مُطْلَقِ الذَّنْبِ)، بە هەموو ئەو واتایانە: (ظُلم) بەکارهاتووە، بە مانای:

١/ دانانی شتێك لە شوێنێکی نەشیاودا.

٢/ دەستدرێژیی کردنە سەر مافی ئەوانی دیکە.

٣/ شیرك.

٤/ کوفر.

٥/ موتڵەقی گوناهکردن.

کەواتە: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَابَّةٍ ﴾، واتە: ئەگەر خوا خەڵکی گرتبایە، واتە: سزای دابانایە، بەهۆی ستەمەکەیانەوە، کە وەك گوترا: دەگونجێ ئەو

ستەمە مەبەست پێی کوفر، یان شیرك، یان دەستدرێژیی بۆ سەر مافی ئەوانی دیکە، یان شتی بێجێ، یان گوناهکردن بێ، ئەگەر خوا بەهۆی ستەمەکەیانەوە سزای دابانایە، هیچ زیندەوەرێکی لەسەر زەوی نەدەهێشت، لێرەدا (لَو: حَرْفُ امْتِناعٍ لامْتِناع)، بۆیە مانای: ﴿ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾، ئاوای لێ دێتەوە: (لو يؤاخذ اللّه الناس بظلمهم، لأفْنى جميع الدواب التي في الأرض، وبِما أنَّ الدواب لَمْ تُفْنَ، فَالمُؤَاخَذَة لَمْ تَحْصُلْ)، خوا دەفەرموێ: ئەگەر خوا بەهۆی ستەمەوە خەڵکی سزا دابایە، زیندەوەری لەسەر زەوی نەدەهێشت، بەڵام زیندەوەر لەسەر زەوی هەر ماون، کەواتە: سزادانەکە نەهاتۆتەدی.

واتە: خوا خەڵکی بەهۆی ستەمەکەیانەوە، سزا نەداون، بەهۆی گوناهەکانیانەوە سزای نەداون، واتە: هی هەموویان، ئەگەرنا شایستەی ئەوە بوون، کە سەر زەوییان لێ پاك بکرێتەوە.

٢- ﴿ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، واتە: بەڵام دوایان دەخات بۆ کاتێکی ناوبرا و، (الأَجَل: المُدَّةُ المُعَيَّنَة لِفعْلٍ مَا) (أجل) یانی: کاتێك کە دیارییکراوە بۆ کردارێك.

(مُّسَمًّى) واتە: ناوبراو، (المُسَمَّى: المُعَيَّنْ، لأنَّ التسْمِية تَعيِينُ الشيء وَتَمْييزُهُ، وَتَسْمِية الآجَالِ تَحْدِيدُها)، (مُسَمَّى) واتە: دیارییکراو، چونکە شتێکت کە ناونا، دیاریی دەکەی و، جیای دەکەیەوە لە غەیری خۆی و، ناوهێنانی ئەجەلەکان، واتە: دیارییکردنی ئەو کاتانەی کە دیارییکراون بۆ ئەو کارانە.

٣- ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ ﴾، واتە: هەر کاتێك کە کاتە دیارییکراوەکەیان هات.

٤- ﴿ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴾، واتە: نە کاتێکی کەم پێش دەکەون و نە کاتێکی کەم دوا دەکەون، ئنجا (يَسۡتَقۡدِمُونَ) و (يَسۡتَـٔۡخِرُونَ) هەردووکیان ئەو (س)ە، بۆ زیاتر تۆخکردنەوەی ماناکەیانە، ئەگەرنا لە ئەسڵ دا ئاوایە: (لاَ يَتَقَدَّمُون، وَلاَيَتَأَخَّرُون) واتە: نە پێش دەکەون.

شایانی باسە ئەم مەسەلەیە لە چەند شوێنێکی قورئان دا هاتوە، بۆ وێنە:

١) لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةًۖ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤ ﴾، واتە: بۆ هەر کۆمەڵگایەك کاتێکی دیارییکراو هەیە، واتە: بۆ سزادان و لەبەینچوونی هەر کۆمەڵگایەك کاتێکی دیارییکراو هەیە.

٢) لە سوورەتی (**یونس**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ ....لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَلَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ۝٤٩ ﴾. کە هەمان مانای ئایەتی پێشووی هەیە.

٣) لە سوورەتی (**النحل**)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ۝٦١ ﴾.

٤) لە سوورەتی (**فاطر**)یش دا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا ۝٤٥ ﴾.

هیچ گومانیشی تێدا نیە، کە ئەو هەموو دووبارەبوونەوەی ئەو مەسەلەیە بەڵگەی زۆر گرنگ بوونیەتی.

ئێستاش با چەند سەرنجێك لە هەردووك ئایەتەکەی (**النحل** ) و (**فاطر**) بدەین:

## چوار وردە سەرنجی گرنگ لەو دوو ئایەتە بەپێزە

لە سوورەتی: (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾.

### سەرنجی یەکەم:

بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا، لە جیاتی (بِظُلْمِهِم)، (بِمَا كَسَبُواْ) بەکارهاتووە، لە جیاتی بفەرموێ: (مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا)، دەفەرموێ: (مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا)، واتە: لەسەر پشتی، کە بە تەئکید مەبەست پێی پشتی زەوییە، ئنجا ئایا هۆکاری ئەو جیاوازییە چییە ؟!

(الخطيب الإسكافي) خاوەنی: (دُرَّةُ التَّنْزِيل وَغُرَّة التَّأْوِيل) لەبارەی هۆکاری ئەو جیاوازییەوە[1]، دەڵێ:

لە سوورەتی: (النحل)دا لە دە (١٠) ئایەتی پێشەوەیدا، واتە: لە (١٠) دە ئایەتی پێش ئەم ڕستەیە: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾دا، چەند جۆرێك ستەم ڕابردوون، کە خوا باسی کردوون:

**یەك:** دوو پەرستراو پەیداکردن (إتخاذ إلهين اثنين).

**دوو:** هاوبەشکردنی بتەکان لە پەرستندا: (إشراك الأصنام في العبادة).

**سێ:** دانانی بەشێك لە ڕزق و ڕۆزییەکان کە خوا بۆی داناون بۆ پەرستراوەکانیان (جَعْلُ نَصيب لهم مِمَّا رَزَقَهُم اللَّه).

**چوار:** زیندە بەچاڵکردنی کچان (وَأْدُ البنات).

ئەو زوڵمانە پێشتر باسکراون، بۆیە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم ﴾، یانی: لە شێوەی ئەو زوڵمانە کە ڕابردوون، ئەگەر خوا بەهۆی ئەوانەوە خەڵکی سزادابایە، زیندەوەری لەسەر زەوی نەدەهێشت.

---

(١) ص ١٨٧، ١٨٨.

### سەرنجی دووەم:

یەكێك بۆی هەیە بڵێ باسی زەوی نەكراوە، بۆچی خوا ﷻ ڕاناوەكەی بۆ وی بردۆتەوە ﴿مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا﴾؟

دەگوترێ: لە نێو عەرەب و میللەتانی دیكەشدا ئەو كلتووورە هەیە، كە لە كاتی قسەكردندا پێویست ناكات باسی زەوی بكرێ، بۆیە عەرەب دەڵێن: (**مَا فَوْقَهَا أَصْدَقُ مِنْ فُلاَنٍ، وَلاَ تَحْتَهَا أَكْذَبَ مِنْ فُلاَنٍ**) واتە: لەسەر پشتی لە فڵان كەس ڕاستگۆتر نیەو لە ژێری دا لە فڵان كەس درۆزنتر نیە، كە دەڵێ: (**مَا فَوْقَهَا وَلاَ تَحْتَهَا، أَي: فَوْقَ الأَرْضِ وَتَحْتَ السَّماء**).

### سەرنجی سێیەم:

بۆچی لە سوورەتی (**فاطر**)دا، وشەی (بِمَا كَسَبُواْ) بەكارهاتووەو، لە سوورەتی: (**النحل**)دا، وشەی (**ظهرها**) نەهاتووە ؟!

وەڵام: لە سوورەتی: (**فاطر**)دا، تەنیا شتی گشتی لە چاكەو خراپە كە خەڵك تێكڕا تێیان دا بەشدارن، باسكراون و، ئەو زوڵم و ستەم و خراپەكارییانەی لە سوورەتی (**النحل**)دا كەوتوونە پێش ڕستەی: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم﴾، لە سوورەتی: (**فاطر**)دا نەكەوتوونە پێشی، یانی: خوا بە گشتی قسەی كردوە لە خەڵكی مسوڵمان و نامسوڵمان، ئیماندار و بێ ئیمان، بۆیەش خوا ﷻ وشەی: (بِمَا كَسَبُواْ)ی بەكارهێناوە، كە (كَسَبُواْ)، واتە: وە دەستیان هێناوە، هەم بۆ چاكە و، هەم بۆ خراپە دەبێ، بەڵام ئەوەی سوورەتی (**النحل**) ئەو كردەوانەی كە پێشتر باسكراون، هەموویان زوڵم و خراپە و، گوناهن و باسی هاوبەش بۆ خوا دانەران و كافرەكانە، بۆیە وشەی زوڵم بۆ ئەوێ گونجاوە، بەڵام وشەی (**كسب**) بۆ سوورەتی (**فاطر**) گونجاوە، كە بەگشتی خوا قسەی دەربارەی بەندەكانی كردوە، نەك بەتایبەتی دەربارەی كافرەكان.

### سەرنجی چوارەم:

بۆیەش لە ئایەتەكەی سوورەتی: (**النحل**)دا، وشەی (**ظهر**) نەهاتووە، چونكە لە دوای وشەی (**الناس**) پیتی (**ظ**) هاتووە: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم﴾، كە لەوێدا لە وشەی

(بِظُلْمِهِم)دا پیتی: (ظ) هاتوە، بۆیە وشەی (ظهر) نەهاتوە، بۆ ئەوە دوو جاران پیتی (ظ) دووبارە نەبێتەوە، بۆچی ؟!

چونکە: پیتی (ظ) لە زمانی عەرەبیدا کەم بەکاردێ، هەر بۆیەش لەم سوورەتی (**النحل**) دا، تەنیا لە حەوت وشەدا ئەو پیتە هاتوە، کە وشەکانی: (**ظُلْم، نَظَر، ظِلّ، ظَلَّ، ظَهْر، عَظِيم، وَعْظ**)، تەنیا لەو حەوت (٧) وشانەدا هاتوە، دیارە بە دووبارە کردنەوەوە، واتە: هەندێکیان زیاتر لە جارێك دووبارە بوونەتەوە، بەڵام لە غەیری ئەو حەوت وشەیەدا، پیتی: (ظ) نەهاتوە !

**سبحان اللّه!** حیسابی پیتێکیش کراوە لە فەرمایشتی بەرز و بێ وێنەی خوادا، کە پیتێکیش زیاد لە پێویستی خۆی لە وشەیەك یان لە ڕستەیەكدا نەیەت، هەروەها هیچ وشەیەك بەبێ پێویستیی و پاساوی بەجێ، بەکار نەیەت!

### مەسەلەی چوارەم:

**خوا ﷻ ڕەخنە لە کافرەکان دەگرێ، کە شتی خراپ بۆ خوا و، بە درۆش شتی چاك بۆ خۆیان دادەنێن، لەسەر ئەوەش بۆ ئاگری دۆزەخ پێش دەخرێن، یاخود لە ئاگری دۆزەخدا پشتگوێ دەخرێن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ ﴾، واتە: شتێك كە خۆشیان ناوێ و ڕقیان لێی هەڵدەستێ و ئارەزوویان بۆی نیە، بۆ خوای دادەنێن.

هەڵبەتە لێرەدا، هەموو توێژەر و لێكۆڵەرەوانی ماناكانی قورئان، گوتوویانە: مەبەست لێرەدا ئەوەیە كە كچان بۆ خوا دادەنێن و، دواییش باس دەكەین كە كوڕان بۆخۆیان دادەنێن.

بەڵام من پێموایە: ئەمە چەمكەكەی گشتییە، واتە: ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، كە بێگومان هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، غەیری خوای هێناوەتە ئاستی خوا، بۆیەش بەو شێوەیەی كە شایستەیە مامەڵە لەگەڵ خوادا ناكات، واتە: شتێك كە پێیان چاك نیە بۆ خوای دادەنێن، ئنجا ئەمە مەرج نیە تەنیا لە مەسەلەی كچ و كوڕاندا بێ، بەڵكو ئەو كەسەی كە خێر دەكات، لە خێر و صەدەقەكەیدا تەماشا دەكات كامەی بەكەڵك نەهاتبێ، ئەوی دەبەخشێ و، دڵی لەبەر ماڵە چاكەكەی نابێتەوە و دەیهێڵێتەوە، بەڵام ئەوەی كە بەكەڵك نایەت و نەخۆشییەكی هەیە، یان بە هەر حاڵ زۆر دڵی پێوەی نیە، ئەوە دەبەخشێ: لە جل و بەرگدا، لە دانەوێڵەدا، یان ئەوانەی زەكات دەدەن، لە ئاژەڵدا، یان لە ماڵی بازرگانییدا، یان كەسێك مەرج نیە تەنها بۆ زەكات بێ، هەر بەگشتیی كە هاوكاریی كەسێك، یان چاكەیەك دەكات و، شتێك دەبەخشێ، بەلای كەمەوە دەبێ لەهی چاك چاك ببەخشێ و، لە هی خراپیش خراپ، نەك تێبگەڕێ كامەی بەكەڵك نایەت، ئەوە ببەخشێ، ئەوە لە مەسەلەی بەخشین دا.

لــە بوارێــکی دیکەشــدا ئەمــە دێتــە پێــش: هەیــە کاتــە زێڕینــەکانی، ئــەو کاتانــەی کــە بەکەڵــك دێــن، بــۆ دابینکــردنی بەرژەوەندییــەکانی خــۆی، یــان بــۆ لــەززەت و خۆشــییەکانی خــۆی تەرخــان دەکات، بــەڵام ئــەو کاتــەی دەمێنێتــەوە، لــە دابینکــردنی بەرژەوەندییــەکانی، واتــە: لــە کاتی نەویســتراودا، ئەرکــەکانی خــوا جێبەجــێ دەکات، بــۆ وێنــە: کار و کەســابەت و چــی و چــی دەکات، بــەڵام دوایــی لــە کاتی زایەبــوو (فِي الوقــت الضائــع)دا، دەچــێ ئەرکــە شــەرعییەکانی جێبەجــێ دەکات! هەروەهــا دەگونجــێ ئەمــە زۆر وێنــەی لەســەر بهێنرێنــەوە.

٢- ﴿ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾، واتە: زمانیان وەصفی درۆ دەكات، كە كامە شتی چاكە ئەوە بۆ ئەوانە، (**الحُسْنَى: أَي الحَالَةُ الحُسْنَى، الخَصْلَةُ الحُسْنَى**)، ئێمە دواتر ئەم ڕستەیە زیاتر شیدەكەینەوە، چونكە جارێكی دیكە لە سووڕەتی: (**النحل**)دا هاتوە و لەوێش قسەی لێدەكەینەوە، ﴿ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ ﴾، واتە: زمانیان وەصفی درۆ دەكات، لە كوردییدا ڕەنگە ڕستەیەك كە بەرانبەر ئەوە بێ، ئەوە بێ كە دەڵێ: بە زمانی بە درۆ، واتە: بە زمانێك كە هەمیشە بە درۆ ڕاهاتوە، ﴿ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ ﴾، واتە: درۆ ناناسرێ، هەتا زمانی ئەوان وەصفی نەكات، زمانی ئەوان ئەوەندە فێری درۆ بووە و ئەوەندە درۆی كردوە، كە درۆكردن هەر لەوان دەوەشێتەوە، ئەگەر بتەوێ لە درۆ تێبگەی، گوێ لەوان بگرە !

٣- ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ ﴾، واتە: بێگومان ئەوان ئاگریان هەیە، یاخود مشتومڕ هەڵناگرێ كە ئەوان ئاگریان هەیە، یاخود شتێكی چەسپاوە كە ئەوان ئاگریان هەیە، چونكە وشەی: (**لاَ جَرَم**) بە مانای (**قَطْعاً، أَوْ أَكِيْداً، أَوْ حَقّاً، أَوْ لاَ شَكَّ**)، بە هەموو ئەو واتایانە هاتوە، كە پێشتر ئەو وشەیەمان لە تەفسیری سووڕەتی (**هود**)دا شیكردۆتەوە.

٤- ﴿ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴾، ئەمە بە دوو جۆر مانا كراوە:

**١/** واتە: بێگومانیش ئەوان پێش خراون، (**مُفْرَطون أَي: مُعَجَّلون إِلى النارِ كالفَرَطِ وَهُوَ المُقَدَّمُ إِلى المَاء**)، (**فَرَطْ**): كەسێكە كە كاروانێك خەڵكێك لە پێش خۆیانەوە دەینێرن بۆ ئاو، بۆ سەر كانی و سەرچاوە، ئنجا (**فَرَطْ**)، واتە: پێشكەوتوو، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴾، واتە: ئەوانە پێش خراون و پێش دەخرێن بەرەو ئاگر، واتە: بەپەلە بەرێ دەكرێن، یان لەپێش گوناهبارانی دیكەوە دەچنە نێو دۆزەخەوە.

**٢/** واتایەكی دیكەی: (**مُفْرَطون أَي: مَتْرُوكُونَ وَمَنْسِيُّون**)، (**الطبري**) ئەم واتایەی هەڵبژاردوە، لە تەفسیرەكەی خۆیدا، یانی: بەجێدەهێڵدرێن لە ئاگردا، پشتگوێ دەخرێن، بۆچی؟! (**طبري**) دەڵێ: چونكە ئەگەر بگوترێ: (**مُقَدَّمُونَ إِلى النار**)، پێشخران بۆ شتی چاكەیە، بۆ شتێكە كە ئەو

کەسە بەرژەوەندیی تێیدا هەبێ، بەڵام بۆ شتێك کە بە زیانی بێ و، بۆی خراپ بێ، ئەو وشەیە بەکارناهێنرێ (**مُقَدَّمون**).

بەڵام من پێموایە وانیە، چونکە جاری وایە خوا ﷻ بە جۆرێك لە توانج و گاڵتە پێکردنەوە هێناویەتی، بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۝١٢﴾ محمد، یان ﴿وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۝١٥١﴾ آل عمران، شوێنی پشوودانیان ئاگرە، شوێنی حەوانەوەیان ئاگرە، کە بێگومان ئاگری دۆزەخ شوێنی حەوانەوەو شوێنی ئارامگرتن و ئیسراحەت تێداکردن نیە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە: ئەگەر شوێنێك هەبێ تێیدا ئارام بگرن و تێیدا بحەوێنەوە، ئەوە هەر ئاگرە.

یان کە دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ۝٢٤﴾ الإنشقاق، واتە: موژدەیان پێبدە، بەئازارێکی بەئێش، ئاشکرایە موژدە پێدان بۆ شتی چاکە، بەڵام یانی: ئەوان هیچ شتێکی چاکیان بۆ نیە، ئەگەر شتێکی چاك هەبێ بۆ ئەوان، ئاگرە! کەواتە: لێرەش ﴿مُّفْرَطُونَ﴾، واتە: پێش دەخرێن، بەڵێ پێشخستن بۆ چاکەیە، بەڵام بۆ ئەوان، واتە: ئەگەر شتێکی چاك هەبێ و، ئەوان بەپەلە بۆی بەرێ بکرێن، هەر ئاگری دۆزەخە.

ئنجا ﴿مُّفْرَطُونَ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**مُفَرِّطون**)، (**وأنهم مُفَرِّطون**) واتە: ئەوان کەمتەرخەم بوون، لە ئەنجامی کەمتەرخەمییەکەیاندا، ئەوە سەرەنجام و چارەنووسیانە.

(**الزمخشري**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا: (**الكشاف**)، بەڵام لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١١٦)ی ئەم سوورەتە (**النحل**)دا، کە لەوێشدا ئەم تەعبیرە دووبارە بۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ۝١١٦﴾.

دەڵێ: (**هَذَا مِنْ فَصِيحِ الكَلَامِ، وَبَلِيغِهِ، جَعَلَ القَوْلَ كَأَنَّهُ عَيْنُ الكَذِبِ، فَإِذَا نَطَقَتْ بِهِ أَلْسِنَتُهُم، فَقَدْ صَوَّرَت الكَذِبَ بِصُورَتِهِ كَقَوْلِهِم: وَجهُها يَصِفُ الجَمَالَ، وَعَيْنُها تَصِفُ السِّحْر**).

واتە: ئەم ڕستەیە لە زمان پاراویی قسە و، ڕەوانبێژییەتی، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ﴾، قسەکەی وا وەسف کردوە، کە: خودی درۆیە، ئنجا کاتێك کە زمانەکانیان ئەو وشەیە دەبێژێ و لە زمانیان دێتە دەرێ، ئەوە: زمانیان ئەو وشەیە وێنا دەکات، بە وێنە ڕاستەقینەکەی خۆی، وەك ئەم تەعبیرانە هاتوون: عەرەب دەڵێن: (**وجهُها يصف الجمال**)، واتە: دەم و چاو و ڕووی ئەو ئافرەتە،

وەصفی جوانیی دەکات، واتە: ئەگەر دەتەوێ جوانیی ببینی، تەماشای ئەو بکە، یان دەگوترێ: (**عَيْنُها تصف السِّحر**)، واتە: چاوی ئەو وەصفی جادوو دەکات، واتە: ئەگەر بتەوێ بزانی جادوو چۆنە؟ تەماشای چاوی ئەو بکە!

ئەمە ئەگەر ویستبیان شتێك زۆر وەصف و مەدح بكەن، ئەو تەعبیرەیان بەكارهێناوە.

کەواتە: ﴿تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ﴾، واتە: ئەگەر تۆ بتەوێ و بزانی درۆ چییە؟ گوێ لەوان بگرە و، زمانی ئەوان بێنە قسە، ئنجا دەزانی درۆ چییە، زمانی ئەوان وەصفی درۆ دەكات.

## مەسەلەی پێنجەم:

خـوای بـەرزی مـەزن سـوێند بـە خـۆی دەخـوات: کـە پێشـتریش لـە کۆمەڵگایەکانـدا پێغەمبـەرانی نـاردوون، بـەڵام شـەیتان کردەوەکانیانی بـۆ ڕازاندوونـەوە و بۆتە دۆسـتیان و، ئامانجی گـەورەی دابەزانـدنی قورئانیـش ئەوەیـە: کـە پێغەمبـەر ﷺ مەسـەلە مشـتومڕ هەڵگـرەکان و، مەسـەلە ناکۆکیـی لەسـەرەکان، ڕوون بکاتـەوە و، ڕێنمایـی و بەزەییـش بـێ بـۆ کۆمەڵـی بـڕواداران، کۆمەڵێـك کـە بـڕوا بێنـن:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ ﴾، واتە: بە خوا لە گەلان و کۆمەڵگاکانی پێش تۆشدا پێغەمبەرانمان ڕەوان کردوون.

هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: (تاللَّـهِ، يَعْنِـي: تاللَّـهِ قَسَـمي)، واتـە: سـوێند بـە خـوا، سـوێندی منـە، کـە لـە کۆمەڵـگاکان و کۆمەڵـەکانی پێـش تۆشـدا ئـەی موحەممـەد ﷺ! ڕەوانمـان کـرد بـوو، کێـی ڕەوان کـرد بـوو؟! پێغەمبـەرانی ڕەوانـە کـرد بـوو، واتـە: تـۆ تاکـە پێغەمبـەر نیـت، بەڵـێ: کۆتـا پێغەمبـەری ﷺ بـەڵام لەپێـش تۆشـدا پێغەمبـەرانی دیکـە، بـۆ کۆمەڵـگاکان ڕەوان کـرا بـوون.

٢- ﴿ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، واتە: شـــەیتان کردەوەکانیانی بۆ ڕازاندنەوە، ئەو کردەوانەی شەیتان دەیانڕازێنێتەوە هەر دیـــارە چین !! پێویست ناکات خـوا ﷻ جۆر و چۆنیەتییەکەیان بەیان بکات، چونکە کردەوەیەك شـــەیتان بیڕازێنێتەوە، بێگومان کردەوەی خراپە، ئنجا مەبەست پێی: کوفرە شیرکە، نیفاقە، گوناهە، تاوانە، ستەمە، لادانە، هەمووی دەگرێتەوە.

٣- ﴿ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە لە دنیادا کردەوە خراپەکانی بۆ ڕازاندبوونەوە و ئەوانیش شەیدا و عەودالّیی کردەوەی خراپ بووبوون و ئەنجامیاندا بوو، ئێستا شەیتان دۆست و پشتیوانیانە و نزیکیانە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾، (ٱلْيَوْمَ) واتە: لە ژیانی دنیادا، یان ئێستا لە ڕۆژی دواییدا؟ هەردووکیان دەگرێتەوە.

﴿ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾، وشەی (وَلِي) چەند واتایەکی هەن، بەلّام لێرەدا بە مانای مشوورخۆر و سەرپەرشتیار و نزیك و دۆست، دێ، واتە: ئەمڕۆ ئەگەر دۆست و نزیك و مشوورخۆر و پشتیوانێکیان هەبێ، بریتییە لە شەیتان، ئەو شەیتانەی کە بە قسەیان کردوە، ئەو کۆمەلّگا پێشووانە کە شەیتان کردەوە خراپەکانی بۆ ڕازاندبوونەوە، ئێستا کە ڕابردوون و، ڕووحەکانیان لە دۆزەخدان، ئێستا دۆست و پشتیوانیان، مەگەر شەیتان بێ، ئەگەرنا کەسی دیکە نیە.

یاخود: ﴿ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾، واتە: ئەو کافرانەی ڕۆژگاری تۆ، کە هاوەلّ و ڕەفیقەکانیان لە پێش تۆدا پێغەمبەرانیان بۆ چوون و، شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندنەوە و شوێنی شەیتان کەوتن، ئەو کافرانەی ڕۆژگاری تۆش، هەر ئەو شەیتانەی کە کاتی خۆی کردەوەی خراپی بۆ گەلەکانی پێشوو، ڕازاندبوونەوە، هەر ئەو دۆستی ئەو کافرانەی ڕۆژگاری تۆشە، ئەگەر مەبەست گەلە پێشووەکان بێ، دەبێ بلّێی: شەیتان دۆست و پشتیوانیانەو، ئێستا تووشی دۆزەخ و سزای خوا بوون.

بەلّام ئەگەر مەبەست کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و، هی دوای پێغەمبەریش بێ ﷺ، تا دنیا بە کۆتا دێ، واتە: هەر کەسێك ئەهلی کوفر و تاوان و خراپە بێ، دۆست و پشتیوانەکەی بریتییە لە شەیتان، وشەی (**یوم**)یش بە مانای کات دێ، بە ڕەهایی (**مُطْلَق الزَّمَان**).

٤- ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، واتە: سزا و ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، لە دنیادا شەیتان سەرپەرشتیار و دۆستیانەو، کە دەچنە مەنزلّگای دواڕۆژیش، سزا و ئازارێکی بەئێشیان هەیە.

٥- ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ﴾واتە: کتێبمان دانەبەزاندۆتە سەر تۆ، مەگەر بۆ ئەوە کە ئەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە.

٦- ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، واتە: هەروەها ڕێنمایی و بەزەییشە بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن، کەواتە: دوا کتێبی خوا کە بۆ پێغەمبەری خاتەمی خۆی موحەممەد ﷺی ناردوە، لێرەدا دوو ئامانجی سەرەکیی تێدا ڕەچاو کراون:

**یەکەم:** ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییانەی کە خەڵك لەبارەیانەو دەکەونە ڕاجیایی و مشتومڕەوە، قورئان ئەو ڕاستییانە ڕوون بکاتەوە، چ پەیوەندییان بە بووناسییەوە هەبێ، چ بە ئیمان عەقیدەوە، چ بە پەرستشەکانەوە، یان بە ڕەوشت و ئاکارەوە، یان بە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە، یان ئابووریی و ژیان و گوزەران و حوکم و سیاسەت و، جەنگ و ئاشتیی و...هتدەوە، هەبێ، قورئان هاتوە ڕاستییەکان بۆ خەڵك ڕوون بکاتەوە، ئەوانەی کە پەکیان لەسەر وەحیی کەوتوە، ڕوونیان بکاتەوە، ئەگەرنا قورئان ئەو ڕاستییانەی کە لەمەودای عەقلی بەشەردان، پەیوەندییان بە هەر لایەنێکەوە هەبێ، خوا ﷻ لێیان گەڕاوە، چونکە لە مەودای عەقڵدان و عەقڵ دەتوانێ دەرکیان بکات و، دەتوانێ خۆی تێیان بگات، بەڵام ئەو ڕاستییانەی کە پەکیان لەسەر وەحیی کەوتوە، دەبێ خوا ﷻ نوقتەیان تێدا بخاتە سەر پیت، ئەم کتێبەو، هەموو کتێبەکانی دیکە خوای پەروەردگاریش، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییانە هاتوون، ئەوە ئامانجی یەکەمی دابەزێنرانی کتێبی خوایە.

**دووەم:** بۆ ئەوە ببێتە ڕێنمایی و، ڕێ پێشاندەر و بەرچاو ڕوونکەرەوە بۆ خەڵك، پاشان بۆشیان ببێتە مایەی بەزەیی و میهرەبانیی خوا ﷻ کە بەتەئکید ئەوانەش ئەو کەسانەن کە بڕوادێنن.

کەواتە: ئەم قورئانە، وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەڵێن و لاف لێدەدەن، ئەفسانەی پێشینان نیە، بەڵکو ڕوونکردنەوەی کێشە مشتومڕ لەسەرەکانە و، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییانەیە کە خەڵك پێویستیی پێیان هەیە، بۆیان ڕوون بکرێنەوە، پاشان ڕێنمایی و ڕێ پێشاندەرەو، هۆکاری دابەزینی بەزەیی و لوتف و کەرەمی خوایە، بەڵام بۆ کێ ؟!

٧- ﴿لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن، ئنجا خوا نەیفەرموە: (للمؤمنين)، یان نەیفەرموە: (للذين آمنوا) بەڵکو دەفەرموێ: ﴿لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، وشەی (قوم)یشی بەکارهێناوە، واتە: ئەوانە کۆمەڵێکن ئەوانەی بڕوادێنن، (**أي: هُمْ جَمَاعَةٌ أَصْبَحَ الإِيْمَانُ كالسجية الرَّاسِخَةِ المُقَوِّمَةِ لِوجُودِهم الجَمَاعِي**)، واتە: کۆمەڵێکن، کە ئیمان بۆتە ڕەوشت و ئاکارێکی ڕۆچوو و، ڕاگریی بوونی کۆمەڵایەتییان، (واتە: ئیمان بۆتە تار وپۆی بوونیان) و، کاتێك تۆ تەماشای ئەوان دەکەی، ئیمانیان تێدا بەرجەستە بووە.

ئنجا بە کرداری (**مضارع**)یش هێناویەتی: دەفەرموێ: ﴿لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بۆئەوەی ئێستا و داهاتووش بگرێتەوە، بۆ کەسانێك كە بڕوا دێنن، هەروەها تازەبوونەوەش دەگەیەنێ و، وێناکردن (**تصوير**)یش، کاتێك تەماشایان دەکەی، ئیمان دێنن، ئیمان هێنانەکەیان بە بەرجەستەکراویی دەبینی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان !

ئـەم دەرسـەمان نـۆزدە (١٩) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٦٥ - ٨٣)، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم نـۆزدە ئایەتـەش، بریتیـە لـە: خسـتنە ڕووی ژمارەیـەکی دیکـە، لـە چاکـە و نیعمەتـەکانی خـوای بەخشـەر، کـە وەك سـەرژمێرم کـردوون، سـەرجەم لـە بیسـت (٢٠) چاکـە و نیعمـەت، زیاتـرن و، دەتوانیـن بـە خێرایـی ئاماژەیـەکی کورتیـان پـێ بکەیـن:

١/ دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە.

٢/ زیندووکردنەوەی زەوی پاش مردنی، بەهۆی ئاوی ئاسمانەوە.

٣/ شیری ئاژەڵان، کە لە نێوان خواردنی هەرسکراو و خوێندا، ئەو شیرە وەك خواردنەوەیەکی زوڵاڵ، کە بەبێ گرفت لە گەروو دەچێتە خوار، دروست دەبێ.

٤/ بەروبوومی دارخورما و مێو.

٥/ هەنگوینی هەنگ، کە شیفای تێدایە.

٦و٧/ دروستکرانی مرۆڤەکان و، مرێنرانیان.

٨/ زێدە کردنی بژیوی هەندێك لە خەڵك، بەسەر هەندێکی دیکەدا.

٩/ هێنانەدی هاوسەران بۆ مرۆڤەکان، واتە: ژن بۆ پیاو و، پیاو بۆ ژن، چونکە هەر کامێکیان بۆ یەکدی پەیداکراون.

١٠/ پێ بەخشینی کوڕان و نەوان.

١١/ پێدانی ڕۆزییە چاك و بەسوودەکان.

١٢/ پێدانی زانیاریی و شارەزایی بەهۆی بیستن و دیتن و عەقڵەوە.

١٣/ ڕامکردنی باڵندان و پەلەوەران، کە چۆن ڕادەوەستن لە هەوادا و، دەفڕن.

١٤/ خانووبەرەکان مایەی سوکنایی و ئیسڕاحەت و ئارام تێداگرتنن.

**١٥/** لە پێست و کەوڵی ئاژەڵان، خانوو و چادری سووك و زەنگەڵ، دروست دەکرێن.

**١٦/** لە خوریی و تووك و مووی ئاژەڵان، جۆرەکانی کەلوپەل و شمەك دروست دەکرێن.

**١٧/** ڕەخساندنی سێبەرەکان، لە دروستکراوەکانی خوا.

**١٨/** ڕەخساندنی ئەشکەوت و، پەناگایان لە چیا و چۆڵان.

**١٩/** ڕەخساندنی پۆشاکی پارێزەر لە گەرما و سەرما.

**٢٠/** ڕەخساندنی زرێ و کەلوپەلی پارێزەر لە جەنگ و زەبری دوژمنان.

بەڵام وێڕای خستنە ڕووی ئەم هەموو نیعمەتانە، باسی چەند بابەتێکی دیکەش کراوە، بە تایبەت، بابەتی: ڕاستیی و بەڵگەداریی خوا بەیەکگرتن، یانی: (**صِدْق وَحَقَّانِيَة التَّوْحِيد**) و، پووچیی شیرك و کوفر (**بُطلاَن الشِّرْكِ وَالكُفْر**)، هەروەها بابەتی: هاتنی ئاخیر زەمان، واتە: کاتی کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییە (**الساعة**).

لە کۆتاییش دا باسی ئەرکی سەرەکیی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کراوەو، سپڵەیی هاوبەش دانەرەکان بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، خراوەتەڕوو، کە لە هەموویان چاکتر، ئەو هیدایەت و ڕێنماییەیە، کە بە کۆتا پێغەمبەری خۆی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵادا ﷺ ناردوویەتی.

﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ ۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن

دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ رِزۡقٗا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضۡرِبُواْ
لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدٗا مَّمۡلُوكٗا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ
شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرّٗا وَجَهۡرًاۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَۚ ٱلۡحَمۡدُ
لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ
عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ
بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا
كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ
أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ
﴿٧٨﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ
لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٧٩﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا
تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا
إِلَىٰ حِينٖ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا
وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ
عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ
ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها خوا لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوار، یەکسەر زەوی، دوای مردنی، پێ ژیاندۆتەوە، بێگومان لەوەدا نیشانەیەك (ی گەورە) هەیە (لەسەر پەروەردگاریتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا) بۆ کۆمەڵێك ببیستن ﴿٦٥﴾ هەروەها لە ئاژەڵاندا پەندێك (ی مەزن) تان بۆ هەیەو، شیرێکی پاڵفتەتان پێ دەنۆشین، کە لە نێوان ڕیخ و خوێندا پەیدا دەبێ، خۆشنۆش و زوڵاڵە بۆ خۆرەوانی ﴿٦٦﴾ مەی و بژیوێکی باشیش لە بەروبوومی دارخورما و مێو دروست دەکەن، بێگومان لەوەدا نیشانەیەك (ی مەزن) هەیە بۆ کۆمەڵێك بفامن ﴿٦٧﴾ هەروەها پەروەردگارت سروشی بۆ هەنگ کرد ( و فێری کرد) کە لە چیایان و لە درەختان و لەو شوێنانەدا کە (خەڵك) دروستیان دەکەن، (جێگا و ڕێگای خۆت دابین بکە) ﴿٦٨﴾ پاشان (دوای دروستکردنی شوێن) لە (شیلەی) هەموو میوەکان بخۆ (بمژە)، ئنجا ڕێیە هەموارکراوەکانی پەروەردگارت بگرە، (سەرەنجام) خواردنەوەیەکی ڕەنگ جۆراو جۆر لە سکی دێتە دەرێ، چارەسەری (بۆ زۆرێك لە نەخۆشییەکانی) خەڵکی تێدایە، بێگومان لەوەدا نیشانەیەك (ی گەورە) هەیە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە ﴿٦٩﴾ هەروەها خوا دروستی کردوون و، دوایی دەتانمرێنێ و، هی واتان هەیە دەگێڕدرێتەوە بۆ خراپترین تەمەن (پیرییەکی کەنەفت) تاکو دوای هەبوونی زانیاریی، هیچ نەزانێ و (هیچی لەبیر نەمێنێ)، بە دڵنیایی خوا زانای توانایە ﴿٧٠﴾ هەروەها خوا بژیوی هەندێکتانی لە هی هەندێکتان پتر کردوە، ئنجا ئەوانەی کە پتریان پێدراوە، گێڕەرەوەی بژیوەکەیان نین بۆ ئەوانەی لەبەر دەستیانن، کە سەرەنجام تێیدا یەکسان بن، ئایا ئەو هاوبەش دانەرانە نکووڵیی لە چاکەی خوا دەکەن؟ ﴿٧١﴾ هەروەها لە خۆتان هاوسەرانی بۆ ڕەخساندوون و، لە هاوسەرەکانیشتان کوڕ و نەوەی پێداون و، لە بژیوە چاك و خۆشەکانی پێداون، ئنجا ئایا ئەو هاوبەش دانەرانە بڕوا بە شتی پووچ دێنن و، بەرانبەر بە چاکەی خوا سپڵەیی دەکەن! ﴿٧٢﴾ هەروەها ئەو (هاوبەشدانەر)انە شتانێك دەپەرستن کە لە ئاسمانەکان و زەمیندا، هیچ شتێکیان لە بژیو بەدەست نیە و ناشتوانن، (وە دەستی بێنن) ﴿٧٣﴾ دەجا وێنان بۆ خوا مەهێننەوە، بێگومان خوا (هەموو شتێك) دەزانێ و ئێوە نازانن ﴿٧٤﴾ خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە: کۆیلەیەکی خاوەندار، کە توانای هیچ شتێکی نیە و، کەسێك کە بژیوێکی باشمان پێداوە، ئنجا بە پەنهانیی و بە ئاشکرا لێی دەبەخشێ،

ئایا یەکسانن ؟! ستایش بۆ خوا، بەڵکو زۆربەیان نازانن (٧٥) هەروەها خوا وێنەیەکی (دیکەی) هێناوەتەوە: دوو پیاو، یەکێکیان لاڵەو توانای بەسەر هیچ شتێکدا نیە و، بارە بەسەر سەرپەرشتیارەکەیەوە، بۆ هەر لایەکی بنێرێ، هیچ چاکەی لەدەست نایەت، ئایا ئەو کەسە لەگەڵ کەسێکدا یەکسانە، کە فەرمان بە دادگەریی دەکات و لەسەر ڕێگایەکی ڕاستیشە؟ (٧٦) هەروەها خوا پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی لەلایە و، کاری ئاخیر زەمانیش (هێندە خێرایە) وەك چاوترووکانە، یان نزیکتر (و خێراتریشە)، بە دڵنیایی خوا بەسەر هەموو شتێکدا توانایە (٧٧) هەروەها خوا (کاتێك) ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێنا، هیچ شتێکتان نەدەزانی و، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانی پێدان، بەڵکو سوپاسگوزاریی (بۆ خوا) بکەن (٧٨) ئایا تەماشای باڵندانیان نەکردوە: ڕامکراوانە لە هەوای ئاسمانێ دا (دێن و دەچن)، بێجگە لە خوا کەس ڕایانناگرێ (بە هەواوە)، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن (٧٩) هەروەها خوا خانووەکانتانی بۆ کردوونە شوێنی نیشتەجێبوون و، تێدا سرەوتن و، لە پێستی ئاژەڵانیش جێگای تێدا سرەوتنی بۆ ڕەخساندوون (چادر و خێوەت)، کە بۆ کاتی گەشت و گەڕان و کاتی نیشتەجێبوونتان پێتان سووك و زەنگەڵ بێ، هەروەها لە خوریی و موو و تووکیان، کەلوپەل و پێداویستیی بۆ ڕەخساندوون تاکو کاتێك (ی کەم) (٨٠) هەروەها خوا لەو شتانەی دروستی کردوون، سێبەری بۆ ڕەخساندوون و، لە چیایەکان حەشارگە ( و ئەشکەوتەکانی) بۆ ڕەخساندوون و، پۆشاکێکی بۆ ڕەخساندوون، کە لە گەرما ( و سەرما) بتانپارێزێ و، پۆشاکێکیش کە لە (کاتی) زەبری جەنگ کردندا دەتانپارێزێ (بۆی ڕەخساندوون)، بەو شێوەیە (خوا) چاکەی خۆیتان بەسەرەوە تەواو دەکات، بەڵکو ملکەچ بن (بۆ خوا) (٨١) ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنی ڕوونت لەسەرە (٨٢) (هاوبەشدانەرەکان) چاکەی خوا دەناسن، کەچی دوایی نکوولیی لێدەکەن و زۆربەیان سپڵەن (٨٣) }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( لَعِبۡرَةً ): واتە: پەند، دەرس، (أَصْلُ العَبْرِ: تَجَاوزٌ مِنْ حَالٍ إلى حَال، وَالإعْتِبارُ وَالعِبْرَةُ: الحَالَةِ الَّتِي يُتَوَصَّلُ بهَا مِنْ مَعْرِفَةِ المُشَاهَدِ إلى مَا لَيْسَ بِمُشَاهَدٍ) واتە: وشەی (عِبرَة) لە (عَبْر)ەوە هاتوە، (عَبْر)یش بریتیە لە پەڕینەوە و چوون لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە، (إعْتِبار، عِبْرَة)ش حاڵەتێکە کە بەهۆیەوە لە شتێکی بینراو، دەگەی بە شتێکی نەبینراو، واتە: لە شتێکی زانراو، دەگەی بە شتێکی نەزانراو.

( فَرۡثٍ ): (مَا فِي الكرشِ، الفَرْثُ وَالفُرَاثة وَالجَمْعُ: فُرُوث: بَقَايا الطَّعَامِ فِي الكرشِ)، (فَرْث) ئەوەیە کە لە گەدەدا هەیە، بە نسبەت ئاژەڵەوە، ئەوەی کە لە گەدەیدا هەیە پێی دەگوترێ: (فَرْث، فُرَاثة) کە بە (فُرُوث) کۆدەکرێتەوە، پاشەڕۆکی ئەو خواردنەی کە ئاژەڵ دەیخوات، گیا و گوڵ و خۆراکێك و ئالفێك کە دەیخوات، دوای ئەوەی سوودی لێ دەبینێ دەبێتە خوێن، کە هەندێکی دەبێتە شیر، ئەوی دیکە پێی دەگوترێ: (فَرْث)، دوای ئەوەی کە لێی جیادەبێتەوە، ئنجا هەر ئاژەڵە و بە پێی خۆی، پێی دەگوترێ: قشپل، ڕیخ، شیاکە، تەرس... هتد.

( خَالِصًا ): واتە: ساغ، ساغبووەوە، (الخَالِصُ: كالصَّافِي، لَكِنَّهُ زَالَ عَنْهُ شَوْبُهُ، بَعْدَ أَنْ كانَ فِيهِ، وَالصَّافِي مَا لَمْ يَكُن فِيهِ شَوْبٌ) واتە: (خَالِص) و (صَافِي) وەك یەكن، بەڵام (خالص) ئەوەیە کە شتێکی تێکەڵ بوو بێ و لێی جیابووبێتەوە و ساغ بووبێتەوە، بەڵام (صَافِي) ئەوەیە کە هەر لە بنەڕەتدا هیچی لەگەڵ تێکەڵ نەبووە، بۆ خۆی ساغ و صاف بووە.

( سَآئِغًا ): واتە: بە ئاسانیی چووە خوار لە گەروو، دەگوترێ: (سَاغَ الشَّرَاب فِي الحَلْقِ: سَهُلَ انْحِدَارُهُ)، (ساغ) واتە: بە ئاسانیی لە گەروو چووە خوار، بە ئاسانیی نۆشکراو.

(سَكَرًا ): (السَّكر: إسْمٌ لِمَا يَكُونُ مِنْهُ السُّكر، وَهُوَ حَالَةٌ تعْرِض بَيْنَ المَرْءِ وَعَقْلِهِ)، واتە: (سَكر) ناوە بۆ ئەوەی کە ماددەی سەرخۆشیی لێ دروست دەکرێ، سەرخۆش بوونیش حاڵەتێکە دەکەوێتە نێوان مرۆڤ و عەقڵەوە، واتە: حاڵەتێکە کە عەقڵی ناهێڵێ.

( وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ ): واتە: پەروەردگارت سروشی کرد بۆ هەنگ، نیگای بۆ کرد، پەیامی تایبەتی بۆ نارد، (أَصْلُ الوَحِي: الإشَارَة السَّرِيْعَة)، وەك زۆرجار باسمان کردوە: وشەی (وَحِي) لە ڕیشەدا بە ئاماژەی خێرا دەگوترێ، لێرەدا یانی: ئەو جۆرە فێرکردنە

تایبەتییەی خوا ﷻ بۆ هەنگ، کە دوایی باسی دەکەین، خوا بە وشەی (**وَحِي**) تەعبیری لێکردوە، هەڵبەتە وشەی (**وَحِي**) لە قورئاندا هەم بە مانای ئاماژە هاتوە، هەم بە مانای ئەو وەحییەی کە خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی دەنێرێ، هەم بە مانای ئیلهام هاتوە، هەم بە مانای وەسوەسەی شەیتانەکانیش هاتوە، وەك خوا لە سووڕەتی (**الأنعام**) ئایەتی (١١٢)دا، دەفەرموێ: ﴿ شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ﴾، ئنجا خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو ئەوانە، بریتیە لە گەیاندنی پەیامێکی پەنهان بە شێوەیەکی خێرا، بە خێرایی پەیامێکی پەنهان بگەیەنرێ، پێی دەگوترێ: (**وَحِي**).

( وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ): بریتیە لەوەی کە مرۆڤەکان دروستی دەکەن، (**العَرْش فِي الأَصْل شَيءٌ مُسَقَّف**) واتە: عەرش شتێکە کە سەربان و سەقفی هەبێ، واتە: ئەوەی کە بۆ هەنگ دروستی دەکەن، (پووره هەنگ)، لە هەندێ شوێن (خەڵیف)ی هەروەها (کەندو و)ی پێدەڵێن و، لە هەندێ شوێن (صندوق)ی پێدەڵێن، ئەوەی بۆی دروست دەکەن و، هەنگەکە دەچێ لەوێدا دەیکاتە ماڵ و شوێنی نیشتەجێبونی خۆی و، گەرای تێدا دادەنێ و هەنگوینشی تێدا دروست دەکات.

( ذُلُلٗاۚ ): (**ذَلَّتِ الدَابـة ذِلاًّ، وَهِيَ ذَلُولٌ أَي: لَيْست بِصَعْبة**) دیاره (**ذُلُلاً**) کۆی (**ذَلُول**)ە، دەگوترێ: (**ذَلَّتِ الدابة ذِلاًّ، وَهِيَ ذَلُول**)، واتە: وەڵاخەکە ڕام بوو، دەستەمۆ بوو، ملکەچ بوو، واتە: چەمووش نیە و، جەنە ناگرێ و مامەڵە لەگەڵیدا قورس نیە.

خوا ﷻ لێرەدا وەسفی ڕێیەکان بە (ذُلُلٗاۚ ) دەکات، ﴿ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ ﴾، ڕێیەکانی پەروەردگار کە خوا فێریی کردووی بیانگرەبەر، ڕێیەکانت بۆ هەموار و تەخت و ئاچوغ کراون، وەك دوایی باس دەکەین، کە چۆن هەنگ بەو هەموو ڕێیانەدا دەڕوا و، ڕێی زۆر دەبڕێ و، زۆر دوور دەکەوێتەوە و، دەشگەڕێتەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ڕێیەکانم بۆ هەموار و تەخت و ئاچووخ کردووی.

( أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ )، (**الـرَّذْلُ وَالـرُّذَالُ: المَرْغُـوبُ عَنْـهُ لِرَدَائَتِـهِ**)، وشەی (**رَذْل**) و (**رُذَال**) شتێکە کە لەبەر خراپییان نەویسترێ، یان ئارەزووی بۆ نەچێ، ﴿ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ ﴾، واتە: تەمەنێکی نەویسترا و، یان خراپترین تەمەن، ئەویش ئەو کاتەیە کە مرۆڤ تێیدا پیر و پەککەوتە دەبێ و، پێویستیی بە غەیری خۆی دەبێ و، ئەو شتانەی کە زانیونی لە بیری دەچنەوە.

( يَجۡحَدُونَ )، (**الجُحُودُ: نَفيُ مَا فِي القَلْبِ إِثْباتُهُ، وَإِثْبات مَا فِي القَلْبِ نَفيهُ**)، (**جُحُود**) واتە: پێ لێنەنان و، دانپێدانەهێنان و نکوولیلێکردن، (**جُحُود**) بریتیە لەوەی کە شتێك لە

دڵدا هەبێت و، بیزانی، بەڵام نەفی بكەی و دانی پێدانەهێنی، یاخود شتێك لە دڵدا بڕوات پێی نەبێ، كەچی ئیسپاتی بكەی، واتە: نكووڵیی لێكردن بە هەبوون و نەبوون.

(وَحَفَدَةً)، (حَفَدَةَ جَمْعُ حَافِد: المُتَحَرِّكُ المُتَبَرِّعُ بالخِدْمَة: أو أَوْلَادُ الأَوْلَاد) (حَفَدَة) كۆی (حَافِد)، (حَافِد) كەسێكە كە بە خێرایی دەجووڵێ و، خزمەتی یەكێكی دیكە دەكات بەبێ بەرانبەر، هەروەها بە نەوەش دەگوترێ واتە: كوڕی كوڕ، یان منداڵی منداڵ، جا چ منداڵی كچ بێ، چ منداڵی كوڕ بێ، بە كۆ پێیان دەگوترێ: (حَفَدَة).

(ٱلْأَمْثَالَ)، (جَمْعُ مَثَل: المُمَاثِل، شِبْه: مشابه)، (أمثال) دەگونجێ كۆی (مَثَل) بێ، واتە: وێنە هێنانەوە، دەشگونجێ كە هەر كۆی (مَثَل)[1] بێ، بەڵام بە مانای (مُمَاثِل) با، واتە: وێنە، وێچوو، لێرەدا لەم سیاقەدا زیاتر مەبەست پێی ئەفوەیە، واتە: هاوتایەكان، شتانێك كە پێتان وایە هاوتای خوان و، هاوكوفی خوان، بۆ خوایان بە وێنە مەهێننەوە، دەشگونجێ هەر مەبەست پێی وێنە هێنانەوە بێ.

(أَبْكَمُ)، (المَوصُوفُ بالبُكْمِ، وَهُوَ الخَرَسُ فِي أَصْلِ الخِلْقَةِ)، (أَبْكَم)، كەسێكە كە حاڵەتی (بُكْم)ی هەبێ، یانی: كە لە زگی دایكی هاتۆتە دەرێ، لاڵ بووە، نەك دوایی، پێشێ بیستبێ و نوتق و بیستنی بوو بێت و، دوایی لاچوو بێت، بە كوردیی دەڵێن: لاڵی زگماك.

(كَلٌّ): (كَلَّ: ضَعُفَ ، كُلُولاً وَكَلَالَةً، كَلَّ السَّيْفُ: لَمْ يَقْطَع، الكَلُّ: مَنْ يَكُونُ عِبْئاً عَلَى غَيْرِهِ)، وشەی (كَلّ)، واتە: (ضَعُفَ) یانی: بێهێز بوو، (كَلَّ: كُلُولاً وَكَلَالَةً)، (كَلَّ السَّيْفُ) شمشێرەكە نەیبڕێ، بە كوردیش هەر دەڵێین: كول، تیغی كول، وا پێدەچێ ئەوانە لە یەكدییەوە هاتبن، (كَلّ): (مَنْ يَكُونُ عِبْئاً عَلَى غَيْرِهِ)، بە كەسێك دەگوترێ: بار بێ بەسەر غەیری خۆیەوە، كۆڵ و بار بێ، هیچ شتێكی لە دەست نەیەت و، بۆ هەموو شتێك چاوەڕوانی خەڵكی بێ.

(كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ): واتە: چاو ترووكان، (اللَّمْحَةُ: النَّظْرَةُ العجْلَى، اللَّمْحُ: لَمَعَانُ البَرْقِ)، (لَمْحَة) ڕوانینێكی خێرایە و، (لَمْح) بە تیشكدانەوەی برووسكەش دەگوترێ، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر خێرایە.

(جَوِّ ٱلسَّمَآءِ): (الجَوُّ: الهَوَاء)، واتە: ئەو هەوایەی كە لە ئاسمانییە، لەسەرێیە.

---

(١) هەروەها (مِثْل)یش هەر بە (أمثال) كۆ دەكرێتەوەو، هەمان مانای دوووەمی (مَثَل)یشی هەیە.

( سَكَنًا ): (السُّكُونُ: ثُبُوتُ الشيءِ بَعْدَ تَحرُّك، وَيُستعْمَلُ فِي الإِستِيْطَان)، (سُكون) بریتیە لە چەسپانی شتێك، دوای ئەوەی كە جووڵاوەو، بۆ نیشتەجێ بوونیش بەكاردێت.

( تَسْتَخِفُّونَهَا ): (تَجِدُونَهَا خَفِيْفَةً)، واتە: سووك دێتە بەردەستان، وەك كوردەواریی دەڵێن: سووك و زەنگەڵە، ئەو چادر و ڕەشماڵ و شتانەی كە لە پێست و تووك و كەوڵ و مووی ئاژەڵان دروست دەكرێن، سووك و زەنگەڵەن، لەچاو خانووی دیكە كە ناگوازرێتەوە.

( ظَعْنِكُمْ ): (ظَعَن: شَخَصَ، الظَّعِينة: الهَوْدَج إذَا كانَ فِيهِ المَرْأة)، ﴿يَوْمَ ظَعْنِكُمْ﴾، یانی: ڕۆژی سەفەركردنتان، (ظَعَنَ: شَخَصَ)، واتە: بە سەفەر چوو، (الظَّعِينة)، بە عەرەبی بە ئافرەتێك دەڵێن: كە لە هەودەج دایە، (هَوْدَج)یش خانوویەك بووە، لە چەرم و پێست دروستیان كردوەو، لەسەر پشتی حوشتریان داناوە، ئافرەت چۆتە نێو ئەو خانووە بچووكەی سەر پشتی حوشتر، (ظَعِينة)ش ئافرەتێكە لە هەودەج دابێ و، جاریێ واش هەیە كە بە بێ ئەوەی كە لە هەودەجیش دابێ، لەو خانووە بچووكەی سەر پشتی حوشتردا، هەر پێی دەگوترێ: (ظَعِينة).

( أَثَاثًا )، (الأَثَاثُ: مَتَاعُ البَيْتِ مِنْ أَثَّ، أي: كَثُرَ وَتَكاثَفَ)، (أَثَاث) كەلوپەل و شمەكی ماڵ، پێداویستییەكانی نێو ماڵ، وەك: هەموو ئەو شتانەی كە كاتی خۆی لە پێست و لە چەرمی ئاژەڵ و تووك و، موو و، خوری ئاژەڵان، دروستیان كردوون، وەك: بەڕە و فەڕش و لباد و تێر و خورجێن و جەواڵ، گوریس و كەژوو و قەیاسە...، هەروەها كەلوپەلی دیكە كە بەكاریان هێناون، وشەی (أَثَاث)یش لە (أَثَّ)ەوە هاتوە، (أَثَّ: كَثُرَ وَتَكاثَفَ)، شتێك زۆر بێت و چڕ و پڕ بێ، پێی دەگوترێ: (أَثَّ).

( وَمَتَاعًا )، (مَا يُنْتَفَعُ بِهِ فِي البَيْتِ)، (مَتَاع) هەر شتێكە كە لە ماڵێ بەهرەی لێوەربگیرێ و، سوودی لێ وەربگیرێ، كەلوپەلی ماڵ.

( حِينٍ )، (الحِيْنُ: وَقْتُ بُلُوغِ الشيءِ، وَحُصُولِهِ، وَهُوَ مُبْهَمُ المَعْنَى)، وشەی (حِيْن) كاتی گەیشتنی شتێك و پەیدا بوونی شتێكە، بەڵام مانایەكەی نادیارە، بە مانای (أَجَل) دێ، یانی: كاتی پەیدابوونی ئەو شتە، یاخود كاتێكی كەم.

( أَكْنَانًا )، (جَمْعُ كِنّ: مَا يُحْفَظُ فِيهِ الشيءُ، كَنَنْتُ الشيء كَنّاً: جَعَلْتُهُ فِي كِنٍّ)، واتە: (أكنان) كۆی (كِن)ە، ئەویش هەر پەناگەیەك و كونێكە، كە شتی تێدا بشاردرێتەوە،

دەگوترێ: (كَنَنْتُ الشيء كَناً: جَعَلْتُهُ فِي كِنٍّ)، شتەكەم خستە نێو كەلێنێكەوە و پەنایەكەوە حەشارگەیەكەوە.

( سَرَٰبِيلَ )، (جَمْع سِربال: القَمِيصُ مِنْ أَيِّ جنْسٍ كانَ)، (قمیص) (كراس) هەر شتێكە كە سەرتاپا جەستەی مرۆڤ داپۆشێ، یاخود بەشی سەرەوەی جەستە داپۆشێ، كە جاری وایە بە سەرتاپایان گوتوە و، جاری واش هەیە بە بەشێكیان گوتوە، هەروەك (سروال) ئەوەیە كە لە پشتێن بەرە و ژێر مرۆڤ داپۆشێ و، (قَمِيص)یش ئەوە بووە كە لە پشتێن بەرە و سەری داپۆشێ، جاری واش هەیە وەك گوتمان: هەمووی دەگرێتەوە، وا پێدەچێ لێرەدا (سَرَٰبِيلَ ) هەمووی بگرێتەوە، كە كۆی (سِرْبال)ە، واتە: شتێك كە دادەپۆشێ، چونكە دوایی دەفەرموێ: ﴿ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ ﴾، ئنجا پۆشاكێك مرۆڤ لە گەرما و سەرما بپارێزێ دەبێ سەرتاپا بێ، ﴿ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴾، هەروەها پۆشاكێكیش كە لە كاتی جەنگدا دەتانپارێزێ، لە زەبری دوژمن، ئەویش دیسان دەبێ سەرتاپا بێ.

( بَأْسَكُمْ )، (البأسُ: الشِدَّةُ وَالْمَكروه)، واتە: سەختیی و، ناخۆشیی، یانی: لە كاتی زەبر لێوەشاندا، دەتانپارێزێ.

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا، گوتمان خوا ﷻ بیست (٢٠)، یاخود زیاتریش لە چاکە و نیعمەتەکانی خۆی، لەم نۆزدە ئایەتەدا دەخاتە ڕوو، هاوکات لەگەڵ ئەوەش، هەندێ بابەتی دیکەشیان لەگەڵ نێواخن دەکات، وەك عادەتی قورئانی مەزن، کاتێك کە شتێك باس دەکات، شتانی دیکەشی لەگەڵ باس دەکات، نەك هەر ئەو شتە بێ، وەك ئێمە کاتێك شتێکی پزیشکی باس بکەین، هەر ئەوە بێ، بەڵکو خوا ﷻ کاتێك کە باسی شتێکی لایەنی پزیشکیی دەکات، سیاسەت و کۆمەڵایەتیی و لایەنی خێزانیی و لایەنی ڕووحیی و ئەوانەی هەموو لەگەڵ تێکەڵ دەکات، لێرەدا خوا ﷻ باسی ژمارەیەك لە چاکە و نیعمەتەکانی خۆی دەکات لە ژیانی بەشەردا، کە وەك گوتم زیاتر لە بیست (٢٠) نیعمەتن، بەڵام کۆمەڵێك شتی دەیکەیان لەگەڵ نێواخن دەکات، سەرەتا دەفەرموێ:

﴿ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، ئەم (و)ە کە بۆ گێڕانەوە و بادانەوەیە (**واو العطف**) دەگونجێ بۆ دەست پێکردن بێ، واتە: هەروەها خوا ﷻ وەك چۆن ئەو شتانەی ڕابردووی بۆ کردوون، ئا ئەوانەشتان بۆ دەکات، دەشگونجێ ئەمە بگێڕدرێتەوە بۆ سەرەتای سوورەتەکە، کە فەرمووی: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ ...﴿٢﴾ ﴾، واتە: ئەو خوایەی وەك چۆن وەحیی بۆ دابەزاندن بە پێغەمبەراندا و، ئاسمان و زەوی دروست کردوون و، مرۆڤی لە نوتفە دروستکردوە و، ئاژەڵەکانی بۆ دروستکردوون، هەروەها ئەو شتانەشی بۆ کردوون: ﴿ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، واتە: هەروەها خوا لە سەرێوە ئاوی بۆ دابەزاندوون، زۆر جار گوتوومانە: وشەی: ﴿ مَآءً ﴾، وشەیەکی گشتییە، باران، بەفر، تەرزە، ئاونگ، شەونم، هەمووی دەگرێتەوە، خوا ﷻ وشەیەکی بەکارهێناوە کە هەرچی لە سەرێوە دێتە خوار لە تەڕایی، هەمووی بگرێتەوە، ﴿ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾، واتە: زەوی پێ زیندووکردۆتەوە، دوای مردنی، ژیان و مردنی توێخی زەوی، بەستراوەتەوە بە ئاوەوە، هەر شوێنێك ئاوی هەبێ (ئاو و ئاوەدانیی) لە هەر شوێنێك ئاوی لێبێ، ژیانیشی لێیە، لەو زەوییە، هەر شوێنێکیش ئاوی لێ نەبێ، ئاوەدانیی لێ نیە و، ژیانیشی لێنابێ.

ئنجا زەوییەك کە لە ئەنجامی بێ ئاوییدا ڕەق هەڵدەگەڕێ و، ڕووەکەکەی کە لەسەری بووە، دەسووتێ و دەبێتە پووش و پەڵاش، دوای ئەوەی ئاوی بۆ دێتە خوار،

پێی زیندوو دەبێتەوە، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾، واتە: بێگومان لەمەدا نیشانە هەیە، نیشانەیەکی گەورە و مەزن، بۆ کۆمەڵێك ببیستن، هەر ببیستن، بۆیان دەبێتە نیشانە، ئەوەندە شتەکە ئاشکرا و دیارە، ئەو ئاوە ئەو ڕەحمەتە ئەو باران و بەفر و تەرزەیە کە دێتە خوار، چۆن سەر زەوی پێ زیندوو دەبێتەوە! ئەوە هەر کەسێ: کە ببیستێ، پەیامی خوا ببیستێ و گوێی بۆ هەڵبخات، بۆی دەبێتە نیشانەیەك و بەڵگەیەکی گەورە، لەسەر تەنیا پەروەردگارێتیی خوا و، تەنیا پەرستراوێتی خوا.

ئنجا دێتە سەر باسی نیعمەتێکی دی، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً﴾، واتە: هەروەها بۆ ئێوە لە ئاژەڵاندا پەندێکی گەورە هەیە، واتە: حاڵەتێك کە لێیەوە دەگوازنەوە بۆ حاڵەتێکی دی، کە بەس تەماشای ئاژەڵان بکەن، سەرنجدانی ئاژەڵان و، بەرهەمی ئاژەڵان، دەتانگوازێتەوە بۆ ئەوە کە بزانن ئەو ئاژەڵانە پەروەردگارێك و مشوورخۆرێك بۆ ئێوەی ڕەخساند وون، بە هەموو ئەو نیعمەتانەوە کە لە ئاژەڵاندا بۆ ئێوەی هێناونە دی، ئنجا لێرەدا خوا باسی یەك نیعمەتیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ﴾، واتە: بە ئێوەی دەخۆینەوە، لەوەی کە لە نێو سکیان دایە {لە نێو سکی ئاژەڵەکان دایە} لە نێوان پاشەڕۆك و خوێن، لە نێوان ڕیخ و خوێن دا، ﴿فَرْثٍ﴾، وشەی: (رَوْث) واتە: ڕیخ، بەڵام وشەی: ﴿فَرْثٍ﴾، واتە: ئەو پاشەڕۆکەی ئاژەڵ پاش هەزمکردنی خواردن، بەشێکی دەبێتە خوێن و بەشێکی دەبێتە شیر، ئنجا ئەوی دیکە کە دەمێنێتەوە لە گەدە و ڕیخۆڵەیدا، پێی دەگوترێ: ﴿فَرْثٍ﴾، واتە: پاشەڕۆك، کە دوای ئەوەی دانرا و، لە جەستەی جیابۆوە، ئنجا پێی دەگوترێ ڕیخ و شیاکە و پشقل و تەرس و... هتد، ئنجا دەفەرموێ: لەوەی کە لە سکیاندا هەیە، لە نێوان ئەو پاشەڕۆکەو خوێندا: ﴿لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ﴾، واتە: بە ئێوەی دەخۆینەوە، شیرێکی ساغی بە ئاسان چووە خوار لە گەرووتان بۆ خۆرەوانی، بۆ کەسانێك کە بیخۆنەوە بە ئاسانیی لە گەروویان دەچێتە خوار، ئەو شیرە پاڵفتە کراوە.

هەڵبەتە ئێمە دوایی باسێکی تایبەتیی شیر دەکەین، شیرو چۆنیەتی دروست بوونی و سوودەکانی.

﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾، واتە: هەروەها لە میوەکان و بەروبوومی دارخورما و دار ترێ، (دار مێو)، ﴿تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾، کە لە بەروبوومەکانیان لە میوەی خورما و ترێ، هەم ماددەیەکی سەرخۆشکەر

دروست دەکەن، هەم بژیوێکی باشیش دروست دەکەن، ئنجا بژیوە باشەکە: دۆشاوە، مێوژە، باسووقە، مرەببایە، هەموو ئەو شتانەن، کە دروست دەکرێن.

ئەوەش ئاماژەیەکە - وەك دوایی باسی دەکەین - ، بەوە کە شەڕاب و مەی، کە لە خورما و لە ترێ دروست دەکرێ، شتێکی باش نیە، چونکە خوا بەراوردی پێکردوە، لەگەڵ بژیوێکی باشدا، کەواتە: ئەوەش بژیوە، بەڵام بژیوێکی باش نیە.

﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، واتە: بێگومان لەوەدا، واتە: لە بەروبوومی دارخورما و مێودا کە خورما و ترێ دەگرن، کە ماددەی سەرخۆشکەر و بژیوی باشیان لێ دروست دەکەن، نیشانەیەکی مەزن هەیە بۆ کۆمەڵێك کە بفامن و عەقڵی خۆیان بەکاربێنن، دەزانن کە ئەو بەروبوومی دارخورما و دارمێو، نیشانەیەك و بەڵگەیەکی مەزنە لەسەر ئەوە کە هەر خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەروەردگار و مشوورخۆر و هەمەکارەی مرۆڤەکانە، بۆیە پێویستە هەر ئەویش پەرستراویان بێ.

ئنجا دێتە سەر باسی نیعمەتێکی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴾، واتە: هەروەها پەروەردگارت سروشی کرد بۆ هەنگ، نیگای بۆ کرد، واتە: بە شێوەیەکی تایبەت فێری کرد و پەیامی بۆ نارد، ئنجا ئایا چی پێ فەرموون؟ فەرمووی: ماڵان دروست بکەن، واتە: شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونتان دروست بکەن لە چیایەکان و، لە درەختەکان، ﴿ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴾، هەروەها لەوەی کە مرۆڤەکان دروستی دەکەن بۆتان لەو جێ و ڕێیانەدا، لەو کەند و و، خەڵێف و شوێنانەدا، کە بۆ تێدا نیشتەجێ بوونی هەنگ و، هێلانە تێدا دروستکردنی هەنگ، دروستی دەکەن، لەو سێ شوێنانەدا ماڵی خۆتان سازبکەن.

﴿ بُيُوتًا ﴾، کۆی (بیت)ە، (بیت) هەر شوێنێکە کە ئینسان شەوی تێدا بکاتەوە، دوایی کراوە بە ناو بۆ هەر شوێنێك کە ئیسراحەت و پشووی تێدا بدرێ، ئنجا وەك چۆن مرۆڤ ماڵ (بیت)ی هەیە، خوای پەروەردگار ئەو شوێنەی کە هەنگەکانیش تێیدا نیشتەجێن و، ئیسراحەتی تێدا دەکەن و، کاری تێدا دەکەن و، ئەویشی ناو ناوە (بیوت).

﴿ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، واتە: دوای ئەوەی ماڵتان دروستکرد، لە چیا و دارو درەختەکان و، لەو شوێنانەی مرۆڤەکان بۆتان دروست دەکەن، ئنجا ئەی هەنگەکان! لە هەموو میوەکان بخۆن، ﴿ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ﴾، واتە: ئنجا بە ڕێیەکانی پەروەردگارتان دا بڕۆن، ڕام و دەستەمۆ کراون و، ڕێیەکانتان بۆ تەخت و ئاچووخ کراون و، تواناشتان

دراوەتێ کە بەو ڕێیانە دا بڕۆن و، تواناشتان دراوەتێ کە لە شیلەی ئەو میوە و گوڵانە بمژن، ﴿ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِ ﴾، واتە: لە سکیان خواردنەوەیەك دێتە دەرێ، ڕەنگەکانی جۆراو جۆرن، ﴿ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِ ﴾، چارەسەری تێدایە بۆ خەڵکی، واتە: بۆ بەشێك یان زۆرێك لە نەخۆشییەکانی خەڵکی، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، واتە: بەڕاستیی لەوەدا نیشانەیەکی مەزن هەیە، نیشانەیەکی جێی بایەخ هەیە، بۆ کۆمەڵێك بیر بکەنەوە.

ئەمە چونکە وردەکاریی تێدایە، پێویستیی بە ڕامان و بیرکردنەوە و سەرنجدان دەکات، هی پێشووتر بەس پێویستیی بە گوێگرتن بوو، هی دووەم پێویستی بە فامکردن هەبوو، بەڵام ئەمەیان پێویستیی بە ڕامان و سەرنجدان و بیرکردنەوە هەیە.

شایانی باسە: ئێمە باسێکی تایبەت و تێرو تەسەل دەربارەی هەنگ و ژیانی هەنگ و، پاشان هەنگوین، دەکەین، هەروەك باسێکی تایبەتیش دەربارەی هەر کام لە دارخورما و دارمێو و، خورما و ترێش دەکەین، دوایی لە کۆی شوێنەکانی دیکەدا کە باسی ئەوانە دێتەوە پێشێ: دەگەڕێینەوە بۆ ئێرە، ئەو شوێنانەی ئەو باسە تایبەتانەیان تێدا دەکەین و، دواتر باسەکان دووبارە ناکەینەوە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی هەندێك نیعمەتی دیکەی خۆی: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمۡ ﴾، واتە: هەروەها خوا ئێوەی وەدی هێناوە و لە نەبوونەوە پەیدای کردوون، دواییش دەتانمرێنێ، کە هەم پەیداکرانەکەمان نیعمەتە، هەم مراندنەکەشمان نیعمەتە، ئێستا خەڵك نازانێ! وا دەزانێ، تەنیا پەیدا بوون نیعمەتە، بەڵام بێگومان مردنیش هەر نیعمەتە، با سەرنج بدەین: کەسێك کە نەخۆش دەبێ و پیر و کەنەفت دەبێ و دەکەوێتە سەرجێ، ئایا لە ژیان بێزار نابێ ؟! چەندان کەسم بینیوون مردنیان بە ئاوات خواستوە، چەندان کەسم بینیون ئیماندارو مسوڵمان، بە دڵ لە خوا پاڕاوەنەوە کە خوا تەمەنە ئەمانەتەکەی لێ وەربگرێتەوە! بۆ ئەوەی چی دیکە بار نەبن بەسەر خەڵك و خزم و کەسیانەوە.

هەروەها زۆر کەس نەخۆشێکیان هەیە بەڵێ: خۆشیان دەوێ و دڵیان پێوەیە، بەڵام زۆریش پێیان خۆشە کە خوا هەق و حیسابی خۆی لەگەڵدا بکات.

ئنجا ئەوە تەنیا شتی تایبەت، بەڵام ئەگەر وەك حاڵەتی گشتی تەماشا بکەین: ئایا ئەگەر مرۆڤەکان وەك چینی بێستان، هەر چینێك سەر زەوی بەجێ نەهێشتبایە بۆ

چینێکی دوای خۆی، ئەگەر هەموویان کەڵەکە بووبان لەسەر زەوی، کوێ هەڵیدەگرت؟!
بێگومان خوا ﷻ دەیتوانی وایکردبایە هەموو مرۆڤەکان پێکەوە کۆبکاتەوە، ئەو کاتە مرۆڤەکانی لە شوێنێك دادەنا، کە جێی هەموویان ببێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی حیکمەت لە دروستکرانی مرۆڤاندا تاقیکردنەوەیانەو، تاقیکردنەوەکەش بەو ماوە کەمەی دانراوە، تەواو دەبێ و دێتە دی، بۆیە خوا ﷻ حاڵەتی مەرگیشی داناوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ﴾، واتە: خوا ئێوەی وەدیهێناوە و دواییش دەتانمرێنێ، لە ڕاستییدا مردنیش لە کاتی خۆیدا، یەکێکە لە چاك و نیعمەتەکانی خوا، ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ﴾، واتە: هەشتانە دەگێڕدرێتەوە بۆ خراپترین تەمەن، یانی: حاڵەتی پیریی و کەنەفتیی.

وشەی ﴿أَرْذَلِ﴾، (صيغة التفضيل)ی (رَذْل)ە کە (رَذل) بە (رذائل) کۆدەکرێتەوە، ﴿أَرْذَلِ﴾، واتە: حاڵەتێکی خوارتر، کە ئینسان ئارەزووی بۆی نەبێ، وەك باسمکرد و پێشتریش ئاماژەم پێدا، زۆر کەس کە تەمەنەکەی زۆر هەڵدەکشێت و دەگاتە حاڵەت و تەمەنێکی نەویستراو و، نەخوازرا و، کە ئینسان تێیدا پیر و کەنەفت دەبێ و، دەبێتە بار بەسەر خەڵکەوە، هەر بۆیەش لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، لە خوا پاڕاوەتەوە کە خوا نەیگێڕێتەوە بۆ تەمەنی خراپ، تەمەنێك تێیدا پیر و کەنەفت بێ.

﴿لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا﴾، واتە: دەگێڕرێتەوە بۆ تەمەنێکی خراپ، تەمەنێکی زۆر پیر و کەنەفت، تاکو دوای ئەوەی شتی زانیوە، ئنجا هیچ نەزانێت، مێشکی فۆرمات دەبێتەوە و، هیچ شتێك نازانێ، وەك منداڵی لێدێتەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾، واتە: بێگومان خوا زانای توانایە.

ئنجا دێتە سەر باسی نیعمەتێکی دیکەو دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ﴾، واتە: هەروەها خوا هەندێکتانی هەڵبژاردوە بەسەر هەندێکتان دا، لە بژیودا، هەندێکتانی بەرزکردۆتەوە لە بژیودا و زێدەیی بە هەندێکتان، لە بژیو و ڕۆزییدا، ﴿فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾، واتە: ئنجا ئەوانەی کە هەڵبژێردراون و زێدەییان پێدراوە، گێڕەرەوەی بژیوە زیادەکە نین، بۆ ئەوانەی کە لەبەر دەستیانن، بۆ بەردەستەکانیان، ئەوانەی کە بە دەستیانەوەن، ئنجا ئەگەر کۆیلەن، ئەگەر خزمەتکارن، ئەگەر هەرکەسێکن و لەبەر دەستیانن، کە سەرەنجام تێیدا یەکسان ببنەوە.

هیچ کامتان ئەو ڕزق و ڕۆزە زیادە و، ئەو ئیمتیازە ماددیی و مەعنەوییە زیادەی کە لەبەردەستی دایە، نایگێڕێتەوە بۆ ژێر دەستەکانی و بەردەستەکانی، تاکو هەموویان یەکسان ببنەوە، ﴿ أَفَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴾، واتە: ئایا نکوولّیی لە چاکەی خوا دەکەن، واتە: ئێوە ئامادە نین بەردەستەکانتان لەگەڵتان دا یەکسان ببنەوە، ئەدی خوا ﷻ چۆن دروستکراوەکان لەگەڵ خۆیدا یەکسان دەکاتەوە؟ ئەوە شتێکی زۆر بێجێیە، لێرەدا وەك عەرەب دەڵێن: (**أدينُك من فَمِك**) واتە: بە زاری خۆت دەتگرم، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە، کە خوا ﷻ ئیقراری ئەوە بکات و، ئەوەیان لێ بسەلمێنێ کە جیاوازیی بە خۆیان و بە کۆیلەکانیان بکەن، چونکە پێغەمبەری خاتەم ﷺ {وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**النساء**)دا، باسێکمان دەربارەی کۆیلە کرد، کە پەیدابوونی کۆیلەکان حاڵەتێکی ناچاریی بووەو، واقعێکی فەرزکرا و بووەو، ئیسلام نەیتوانیوە بە نووکە قەڵەمێك لای بەرێ، بەڵام زۆر ڕێی داناون تاکو سەرچاوەکانی وشك بکات، ئنجا لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلەکاندا پێغەمبەر ﷺ} ئامۆژگاریی مسوڵمانانی کردوە: هەر کامێك لە ئێوە کە کۆیلەیەکی هەبوو، با بۆخۆی چ بەرگێك دەپۆشێ، لە هەمان پۆشاکیش لەبەر وی بکات و، بۆخۆی چی دەخوات، لەو جۆرە خواردنەش بدات بەو، واتە: جیاوازیی پێ نەکات، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ ڕووی دواندنی لە کافرە ملهوڕ و خۆبەزلگرەکانە، کە ئەصڵەن کۆیلە و بەردەستەکانی خۆیان، بە مرۆڤیش دانە دەنا، ئنجا بە مەنتیقی خۆیان دەیانگرێ.

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴾، واتە: هەروەها خوا لە خۆتان هاوسەرانی بۆ ڕەخساندوون، ئنجا ئەگەر دوێنراوەکان پیاوان بن، واتە: ژنانی بۆ ڕەخساندوون و، ئەگەر دوێنراوەکان ژنان بن، واتە: پیاوانی بۆ ڕەخساندوون، ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ ﴾، واتە: لە هاوسەرەکانیشتان کوڕان و نەوەکانی پێداون.

﴿ وَحَفَدَةٗ ﴾، کۆی (**حَفِيدْ**) یان (**حَافِد**)ە، بۆیەش پێی دەگوترێ (**حافد**) یان (**حفيد**) لەبەر ئەوەی بە خێرایی و، بەبێ بەرانبەر خزمەتی نەنك و باپیریان و دایك و باوکیان دەکەن.

﴿ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾، واتە: هەروەها لە بژیوە خۆش و بەتام و سوودبەخشەکان پێی داون، ﴿ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ﴾، واتە: ئنجا ئایا بڕوا بە باطیڵ و پووچ دەکەن و، سپڵەیی و نا سوپاسیی دەکەن بەرانبەر بە چاکەکانی خوا ؟!

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا ﴾، واتـە: هەروەهـا ئـەو هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر و کافرانـە، جگـە لـە خـوا و، لـە خـوار خـواوە: شـتانێك دەپەرسـتن، کـە نـە لـە ئاسـمان و نـە لـە زەویـدا، هیـچ بژیوێکیـان بەدەسـت نیـە، هیـچ شـتێکیان بەدەسـت نیـە لـە ڕزق و ڕۆزیـی، ﴿ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴾، هیـچ شـتێکیان بـە دەسـت نیـە و ناشـتوانن، وە دەسـتی بخـەن.

﴿ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، واتـە: ئنجـا وێنـان بـۆ خـوا مەهێننـەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، واتـە: بێگومـان خـوا دەزانـێ و، ئێـوە نازانـن، دوایـی وردتـر بـاسی دەکەیـن کـە مەبەسـت لـە وشـەی: ﴿ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، لێـرەدا چییـە؟

أ / دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە: هیچ شتێك وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا مەکەن و، مەیکەنە هاوتای خوا و، مەیکەنە هاوکوفی خوا و، وێنە بۆ خوا مەهێننەوە، واتە: ﴿ ٱلْأَمْثَالَ ﴾، لێرەدا دەبێتە کۆی (**مَثَل**) واتە: (**شَبیه**) هاوتا و هاوکوف.

ب/ دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە (**ضَرب المثَل**) بۆ خوا مەکەن و وێنان بۆ خوا مەهێننەوە.

ئنجا خوا ﷻ دوو وێنە (**ضرب المثل**)مان بۆ دێنێتەوە:

## وێنەی یەکەم:

﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا ﴾، واتـە: خـوا وێنەیـەکی هێناوەتـەوە، وێنەکـەش بریتیـە لە کۆیلەیـەکی خاوەنـدار، ﴿ لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴾، کـە توانـای بەسـەر هیـچ شـتێکدا نیـە، کـە لێـرەدا خـوا ﷻ بـاسی واقیعێك دەکات کـە ئـەو کاتـە هەبـووە، کۆیلـە هیـچ شـتێکی بەدەسـت نەبـووە، ﴿ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا ﴾، کەسـێکیش کـە بژیوێـکی باشـمان پێـداوە، ﴿ فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ﴾، ئنجـا بـە پەنهانیـی و بـە ئاشـکرا لێـی دەبەخشـێ، ﴿ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ﴾، واتـە: ئایـا ئـەو دووانـە وەك یەکـن؟! کۆیلەیـەك کـە نـەك خـاوەنی هیـچ نیـە، خـاوەنی خۆیـشی نیـە و، خـۆشی خاوەنـدارە، لەگـەڵ کەسـێکدا کـە کۆیلـە نیـە و، ئـازادەو، ڕزق و ڕۆزییـەکی باشیشـمان پێـداوە و، بـە پەنهـان و ئاشـکرا لێـی دەبەخشـێ، ئایـا وەك یەکـن ؟! ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، واتـە: سـتایش بـۆ خـوا، بەڵکـو زۆربەیـان نازانـن، ئێمـە دواتـر بـاس دەکەیـن، کـە: ئایـا لێـرەدا خـوا ﷻ وێنـە دێنێتـەوە بـۆ ئینسـانی بـڕوادار و بێبـڕوا، یـان ئینسـانی خـوا بـە یەکگـر و ئینسـانی هاوبـەش بـۆ خـوا پەیداکـەر؟ یاخـود وێنـە دێنێتـەوە بـۆ ئـەو بـت و صەنـەم و پەرسـتراوانەی کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان

دەیانپەرستن لەگەڵ خوادا ﷻ؟ چونکە ڕوونکەرەوان و توێژەرەوانی قوڕئان، هەردووک ڕایەکەیان خستوونە ڕوو.

## وێنەی دووەم:

ئنجا وێنەی دووەم دێنێتەوە: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ﴾، واتە: هەروەها خوا وێنەیەکی دیکەی هێناوەتەوە ﴿ رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ ﴾، واتە: دوو پیاو یەکێکیان لاڵە و توانای بەسەر هیچ شتێکدا نیە، بارە بەسەر سەرپەرشتیارەکەیەوەو، بۆ هەر شوێنێك بینێرێ، هیچ چاکەی لە دەست نایەت و، هیچ شتێکی لێ هەڵناوەرێ، ﴿ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، ئنجا ئایا لاڵێکی بێ توانای دەستەپاچەی بار بەسەر خاوەنەکەیەوە، یەکسانە لەگەڵ کەسێك دا کە فەرمان بە دادگەریی دەکات و، لەسەر ڕێیەکی ڕاستیشە ؟! واتە: هەم ئاخاوتنەکەی باشترین ئاخاوتنە: کە فەرمان کردنە بە دادگەریی، هەم کردەوەکەشی باشترین کردەوەیە، کە ڕۆیشتنە لەسەر ڕێیەکی ڕاست، ئایا کەسێکی ئاوا، لەگەڵ بابایەکی دەستە پاچەی لاڵی هیچ لە دەست نەهاتوودا یەکسانن؟! بێگومان نەخێر، کەواتە: بڕوادارێك لەگەڵ بێبڕوایەك، خوا بە یەکگرێك، کەسێك کە تەنیا خوا دەپەرستێ، لەگەڵ کەسێك دا کە هاوبەش بۆ خوا پەیدا دەکات، وەك یەك نین، یاخود ئەو پەرستراوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن، کە هیچ نین، لە بەرانبەر خوادا ﷻ، لەگەڵ خوادا، یەکسان ناکرێن.

ئنجا باسی بابەتێکی زۆر گەورە و گرنگ دەکات، کە بریتیە لەوە کە خوا بە تەنیا خۆی پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی لەلایەو، هەر ئەویش بڕیاری هاتنی ئاخیرزەمان (**ساعة**)ی بەدەستە، دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: هەروەها تەنیا هی خوایە پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی، هەر ئەو لە نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی ئاگادارە، ﴿ وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ ﴾، واتە: یەکێك لە نهێنیی و پەنهانەکانی ئاسمان و زەوی بریتیە لە: ( ٱلسَّاعَةِ ) واتە: ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتا دێ، ئاخیر زەمان، دەفەرموێ: بڕیاری ئاخر زەمانیش هەروەك چاو ترووکانێکە، یاخود کاری ئاخیر زەمان وەك چاو ترووکانێکە، واتە: چاوترووکان چەند خێرایە، خوا ﷻ دەتوانێ ئاوا بە خێرایی ئەم دنیایە، ئەم گەردوونە، کۆتایی پێ بێنێ، ﴿ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُ ﴾، واتە: یاخود نزیکتریشە، یانی: لەوەش خێراترە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، واتە: بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

ئنجا دەگەڕێتەوە سەر باسی نیعمەتەكان، دوای ئەوەی ئەو بابەتانەی نێواخن كردن: ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ ﴾، واتە: هەروەها خوا ئێوەی لە سكی دایكتان دەرهێناوە، ﴿ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴾، ئەو كاتە كە خوا ئێوەی لە سكی دایكتان دەرهێنا هیچتان نەدەزانی، ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ ﴾، واتە: بەڵام {بۆ ئەوەی كە شت فێربن، خوا} بیستن و چاوەكان و عەقڵەكانی پێداون، ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾، بەڵكو سوپاسگوزاریی بۆ خوا بكەن، واتە: زانست و زانیاریی و شارەزایی بەو گوێ و چاو و عەقڵانەتان پەیدا بكەن و، سەرەنجام ببنە بەندەیەكی بە ئەمەگ و سوپاسگوزار بۆ خواو، ئەو زانیارییە لە ڕەزامەندیی خوادا بەكاربێنن.

ئنجا نیعمەتێكی دیكە باس دەكات: ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ ﴾، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە باڵندان كە ڕام و دەستەمۆو ملكەچ كراون، لە هەوای ئاسماندا ﴿ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، جگە لە خوا هیچ كەس نایانگرێ، كێ ڕایگرتوون ؟! بێگومان خوا بەهۆی ئەو یاسایانەوە كە دایناون، كە ئێمە دوایی باسێكی تایبەت دەربارەی باڵندان دەكەین و، چۆنیەتی فڕینیان و، جۆرەكانی باڵندە و، چۆن دەتوانن بە هەواوە بمێننەوە؟ ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾، واتە: بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك بڕوا بێنن، نەك تەنیا نیشانە، بەڵكو چەندان نیشانە هەن، بۆ كۆمەڵێك بیانەوێ بڕوا بێنن بە خوا ﷻ لە ڕێی ناسین و، پەیپێبردنی دروستكراوەكانیەوە، یانی: لە ڕێی پەیپێبردنی نیشانە و بەڵگەكانیەوە، كە بڵاوی كردوونەوە.

ئنجا خوای بەخشەر باسی كۆمەڵێك چاكە و نیعمەتی دیكەی خۆی دەكات: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا ﴾، واتە: هەروەها خوا ماڵەكانتانی بۆ گێڕاون بە مایەی تێدا پشوودان و، ئیسڕاحەت و نیشتەجێ بوون، ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا ﴾، هەروەها لە پێست و كەوڵی ئاژەڵانیش ماڵی بۆ ڕەخساندوون، كە كاتی خۆی - وەك دوایی باسی دەكەین - لە پێست و چەرم و كەوڵی ئاژەڵان، واتە: حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەڕ و بزن، چادریان دروستكردوون، دیارە بە چەند شێوەیەك دروستیان كردوون، هەروەها لەو خوریی و موو و تووكی كە لەسەر پێستەكانیانە، لەوانیش ڕەشماڵ و چادر و خێوەتیان لێ دروستكردوون.

ئنجا خوا باسی ئەو جۆرە خانو و ماڵانە دەكات كە لە پێست و چەرمی ئاژەڵەكان دروست دەكرێن و دەفەرموێ: ﴿ تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ ﴾، واتە:

سووكتان بە دەستەوە دێن، سووك و زەنگەڵن بەدەستتانەوە، ئەو خانووانە هەم لە كاتی سەفەركردنتان و، هەم لە كاتی ڕۆیشتنتان و، هەم لە كاتی نیشتەجێبونتان دا، واتە: بە ئاسانیی دەتوانن لەگەڵ خۆتانیان بەرن، ئەو ماڵانە: ئنجا چادرە، خێوەتە، ڕەشماڵە، تاوڵە، كە لە نێو كورددا زیاتر چادر و ڕەشماڵ و ئەوانە كە لە موو و خوریی دروستكراون، بەكاردێن، بەڵام لە نێو عەرەباندا، لە چەرم و پێستەكەشیان خانوویان دروستكردوون، چادرو ڕەشماڵیان دروست كردوون، وەك دوایی باسی دەكەین، ئنجا ئەوانە سووك بەدەستەوە دێن، وەك خانووی دیكە نین لە قوڕ و خشت و بەردو لە كەرستەكانی دیكە بن و، نەتوانن لەگەڵ خۆیانیان بەرن، ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَآ أَثَٰثًا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ٨٠﴾ هەروەها لە خورییەكانیان و، لە تووكەكانیان و، لە مووەكانیان، كە (**أصواف**) كۆی (**صوف**)ە، یانی خوریی و هی مەڕ و بەرانە، (**أوبار**)یش كۆی (**وَبَر**)ە یانی: تووك و هی حوشترە.

بە نێرو مێ وە كە نێرەكەی (**جَمَل**) و مێیەكەی (**ناقة**) یەو (**بَعیر و إبل**)یش بۆ نێرو مێن، (**أشعار**)یش كۆی (**شَعْر**)ە واتە: موو، ئەمیش هی بزن و نێرییە و، هەڵبەتە ڕەشەوڵاخ (گاو مانگا، كەڵ و گامێش) مووی هەیە، بەڵام مووی زیادی نیە كە بە كەڵكی بڕین بێ، بەڵام چەرم و پێستەكەیان بە كەڵك دێ.

ئنجا ئایا لە خورییەكان و تووكەكان و مووەكانی ئاژەڵەكانیش خوای پەروەردگار چی بۆ ڕەخساندوون ؟! ﴿أَثَٰثًا﴾، واتە: كەلوپەل شمەك، ئەو شتانەی كە لە خوریی و تووك و مووەكانیان، دروست دەكرێن، هەندێك دەڵێن: (**أثاث**) بریتیە لەو كەلوپەلانەی لەنێو ماڵدا بەكاردەهێندرێن، بەڵام (**مَتاع**) بریتیە لەوەی كە لە دەرەوەی ماڵیش بەكاربهێنرێ، یاخود (**متاعاً**)، واتە: بۆ گوزەراندنتان و ڕابواردنتان و ژیان بەسەربردنتان ﴿إِلَىٰ حِينٍ﴾، واتە: تاكو كاتێكی دیاریكراو، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە كە ئەم ژیانی دنیایە، زۆر كاتییە و گوریسی لەبن ڕامەخەن و وامەزانن مەنزڵگای كۆتاییە.

ئنجا دێتە سەر باسی چەند نیعمەتێكی دیكە: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلًا﴾، هەروەها خوا لەو شتانەی بۆی دروستكردوون، سێبەرەكانی بۆ ڕەخساندوون، ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا﴾، هەروەها لە چیایەكانیش ئەشكەوت و پەناگاكانی بۆ ڕەخساندوون، ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ﴾، هەروەها پۆشاكەكانی بۆ ڕەخساندوون كە لە گەرما دەتانپارێزێ.

ئنجا دیارە لە بەرانبەر گەرمادا، سەرماش هەیە، واتە: لە گەرما و سەرما دەتانپارێزێ، ﴿ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴾، هەروەها چەندان پۆشاکی بۆ ڕەخساندوون، کە لە کاتی سەغڵەتیی و جەنگ و زەبر لێ وەشاندنتاندا، دەتانپارێزێ، ﴿ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ ﴾، ئاوا خوا چاکەی خۆی لەسەر ئێوە تەواو دەکات، ﴿ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴾ بەڵکو (بۆ خوا) ملکەچ بن.

﴿ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾، خوا پێغەمبەری ﷺ خاتەم دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر پشتیان تێکردی و لاملیان تێکردی، بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکرات لەسەرە، ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴾، (ئەوان) چاکەی خوا دەناسن دواییش نکووڵیی لێدەکەن و دانی پێداناهێنن، ﴿ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، زۆربەشیان ناسوپاس و سپڵەن، نەك مەبەست ئەوەبێ: {زۆربەیان بێبڕوان} چونکە هەموویان بێبڕوا بوون، بەڵام زۆربەیان سپڵە بوون و، چونکە هەندێکیان سپڵە نەبوون بەو واتایە کە خوایان دەناسی و دەیانزانی ئەو چاکانە هی خوان و، چاکەکانیان بۆ لای خوا دەگێڕایەوە، دیارە کەم و زۆر چاکەشیان بە نیعمەتەکانی خوا کردوە، کەواتە: هەندێکیان جۆرێك لە سوپاسگوزاریی شوکرانە بژێرییان هەبووە، بەڵام زۆربەیان سپڵە و ناسوپاس بوو ون.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**خـوا تەنیـا خـۆی ئاوێـكی لـە ئاسـمانەوە ناردۆتـە خـوار، كـە زەوی پـاش مـردنی، پـێ ژیاندۆتـەوە، كەسـانێك كـە هـەر ببیسـتن، ئـەوە بۆیـان دەبێتـە نیشـانە لەسـەر تەنیـا پەروەردگارێتیـی و پەرسـتراوێتی خـوا:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ٦٥﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، واتە: خوا لە سەرێوە ئاوی ناردۆتە خوار، پێشتر باسمان كرد وشەی ﴿مَآءً﴾، هەموو حاڵەتەكانی ئاو دەگرێتەوە: بەفر و تەرزە و باران و، شەونم و ئاونگ و، هەرچی كە لە سەرێوە دێتە خوار لە تەڕایی، هەمووی دەگرێتەوە.

٢- ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآ﴾، واتە: زەوی دوای ئەوەی كە مردووە، پێی ژیاندۆتەوە، وەك گوتراوە: ئاو و ئاوەدانیی، ئنجا لە ڕاستییدا دیمەنی زیندووبوونەوەی زەوی، بە تایبەت لە كەشی بەهاردا، زۆر جوان بەرجەستە دەبێ، كە دەبینی زەوییەكی قاقڕ و دێمەكاری وشك و برینگ، دوای ئەوەی كە باران لێی دەدا، وردە وردە گیا و گوڵ و ڕووەك و، پاشان دار و درەخت و، ئنجا دوایی زیندەوەران، هەموویان سەردەردێنن و پەیدا دەبن.

٣- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ﴾، واتە: بێگومان لەوەدا نیشانەیەكی جێی سەرنج و مەزن هەیە بۆ كۆمەڵێك ببیستن، یانی: هەر پەیامی خوا ببیستن و گوێ ڕابگرن، بۆیان دەبێتە نیشانە و بەڵگە، ئەگەر زۆریش سەرنجی لێ نەدەن و لێی ورد نەبنەوە.

(**الخطيب الإسكافي**) لە كتێبەكەی خۆی (**دُرَّة التنزيل وَغُرَّة التأويل**)دا، دەڵێ: (**تَوْبيخٌ لِمَنْ أَنْكر البَعْثَ وَاستَبْعَدَ الحَياةَ الثَّانِية فَكأَنَّهُ قِيلَ لَهُ: إِنَّ ذَلِكَ قَبْلَ التَدَبُّرِ مُقَرَّرٌ فِي أَوَّلِ العَقْلِ، حَتَّى إِنَّ مَنْ يَسْمَعهُ يَعْتَرِفُ بِهِ**)[1].

واتە: ئەمە سەرزەنشتە بۆ كەسێ كە نكووڵیی كردوە، لە زیندووبوونەوەو، ژیانی دووەمی (واتە: ژیانی ڕۆژی دوایی) بە دوور داناوە، وەك ئەوەی پێی گوترا بێ: پێش بیر لێكردنەوە هەر لە سەرەتای عەقڵدا، ئەوە هەیە و هەر كەسێ هەر بیبستێ دانی پێدادێنێ.

خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، ئەوە بۆ جاری دووەمە، باسی دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە دەكات، بەڵام ئەوەی كە لە ئایەتەكانی: ژمارە (١٠ و ١١)دا هات، كە لە دەرسەكانی پێشوودا باسمان كرد، بەڵگە هێنانەوە بوو، ئەمەشیان بۆ خستنەڕووی چاكەیە، یانی: ئەویان (**إستدلال**) بوو و، ئەمەیان (**إمتنان**)ە، واتە: مەقام و حاڵەتەكان دەگۆڕێن، هەڵبەتە خوا ﷻ جاری وایە دە (١٠) كەڕەتان مەبەستێك دووبارە دەكاتەوە، بەڵام هەر جارە نهێنییەكی دیكەی تێدایە و، حیكمەتێكی دیكەی تێدایەو، هەرگیز دووبارەبوونەوەی بە مانای: (دووبارەبوونەوە)، واتە: كە ئەو قسەیە تەنیا دووبارە بێتەوە وەك هی پێشێ و سوودێكی زیادەی تێدا نەبێ، لە قورئاندا، نیە، جگە لە چەند ڕستە و وشە و تەعبیرێك كە خوا ﷻ بە پێویستی زانیوە: ئەو ڕستە و وشە و تەعبیرانە، لە سوورەتێكدا، یان لە چەند سوورەتێكدا، زۆر دووبارە بكاتەوە، بۆ وێنە:

١/ ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ...﴿٦٥﴾﴾، واتە: ئەی گەلەكەم! خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێكی دیكەتان نیە، ئەمە زۆر دووبارەبۆتەوە لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، چەند جارێك و، لە سوورەتی (**هود**)یش دا، چەند جارێك.

٢/ یان: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾﴾، كە لە سوورەتی (**الرحمن**)دا سی و یەك (٣١) جار دووبارە بۆتەوە.

چونكە خوا ﷻ كۆمەڵێك لە نیعمەتەكانی خۆی لە دنیا و دوارۆژدا دەخاتەڕوو، پاشان جند و ئینسان دەدوێنێ، بۆیە (٣١) جار ئەوە دووبارە دەكاتەوە.

٣/ یان لە سوورەتی (**المرسلات**)دا خوا دە (١٠) جاران ڕستەیەك دووبارە دەكاتەوە، ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾﴾.

---

(١) ص ١٨٩.

٤/ یان لە سوورەتی (القمر)دا ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾، چوارجاران دووبارە دەکاتەوە، کەواتە: جگە لە هەندێ ڕستەی دیارییکراو، کە حیکمەتی خوا ﷻ وایخواستوە، وەك خۆیان کتومت، دووبارە ببنەوە، بەڵام ئەوەی دیکە هەرچی لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، بێگومان هەمووی بە شێوەیەکی دیکەیەو، وەك گوتم: هیچی ئەوە نیە کە حیکمەتێکی لە پشتەوە نەبێ، هەڵبەتە ئەو ڕستە قورئانییانەش کە لە سوورەتەکانی (الرحمن) و (القمر)و (المرسلات)دا دووبارە بوونەوە، لەبەرئەوەیە کە کەش و هەوای سوورەتەکەو، باس و بابەتەکانی وایانخواستوە.

## مەسەلەی دووەم:

**لە ئاژەڵان و ئەو شیرە زوڵاڵ و جوانەی کە لە نێوان تڵت و خوێندا دێتە دەرێ، پەندێکی گەورەتان بۆ هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

دوایی باسێکی تایبەت دەربارەی شیرو، پێکهاتەکانی و، سوودەکانی دەکەین:

١- ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ﴾، هەروەها بۆ ئێوە لە ئاژەڵاندا پەندێك هەیە، واتە: دەرس و پەندێکی گەورە هەیە، کە بەدیهێنەر و پەروەردگاری خۆتان و ئاژەڵەکانی پێ بناسن و، پەندێکی گەورە هەیە کە بتانگەیەنێتە ئەو ڕاستییەی کە خوا ﷻ لەگەڵ ئێوەدا چەندە بە کەرەم و لوتفە و، چەندە بەخشندە و بەخشەرە!

وشەی (ٱلْأَنْعَٰمِ): (**إسم جمعٍ للبقرة والإبل والغنم والمعز**)، وشەی (ٱلْأَنْعَٰمِ) ناوی کۆیە بۆ ڕەشەوڵاخ و حوشتر و مەڕ و بزن.

٢- ﴿ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ ﴾، لەوەی لە نێو سکیدایە بە ئێوەی دەخۆێنەوە، کە بێگومان مەبەستی پێ شیرەکەیە، چونکە خوا ﷻ دوایی بۆخۆی ڕوونی دەکاتەوە.

وشەی (**بُطون**): (**جمع بطن، إسم للجوف الحاوي للجهاز الهضمي وغيره**)، (**بُطون**) کۆی (**بطن**)ە، (**بطن**) واتە: سك، زگ، ورگ، کە هەر کام لە کۆئەندامی هەرس و، کۆئەندامەکانی دیکە دەگرێتەخۆ.

٣- ﴿ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ ﴾، (**فرث**): ئەو خواردنەیە کە هەزم کراوەو، لە ڕیخۆڵەکاندا ماوەتەوە، هەر کاتێك خرایەدەر، پێی دەگوترێ پاشەڕۆك، بە نسبەت ئاژەڵەوە، ئنجا بە پێی جۆری ئاژەڵەکان ناوەکەی دەگۆڕێ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی (**رَوث**)ی پێ دەڵێن، (روث) واتە: پاشەڕۆکی ئاژەڵ، بەڵام تاکو لە نێو ڕیخۆڵەکانی دایە (فرث)ی پێ دەڵین، واتە: (تڵت) یان پاشەڕۆکی خواردنی هەرسکراو، ئنجا هی ڕەشەوڵاخ، بە کوردیی (ڕیخ)ی پێ دەڵێین و، هی مەڕ و بزن (قشپل) یان

(پشقل)ی یان (شیاكە)ی پێ دەگوترێ، بە نسبەت حوشتریشەوە هەر (قشپل) و (شیاكە)ی پێ دەگوترێ، بەڵام وڵاخی یەكسم و گوێدرێژ و ئێستر و ئەوانە، (تەرس)ی پێ دەگوترێ.

٤- لە نێوان ئەو تڵت و پاشماوەی ئاڵفی هەرسكراوو، خوێندا، پێتان دەخۆینەوە: ﴿ لَّبَنًا خَالِصًا ﴾، شیرێكی ساغ بووەوە، شارەزایانی زمان گوتوویانە: (**خالص**) وەك (**صافي**) وایە، بەس (**صافي**) ئەوەیە كە هەر لە ئەسڵدا صاف بوو بێت و، هیچی لەگەڵدا نەبوو بێت، بەڵام (**خالص**) ئەوەیە كە شتی دیكەی لەگەڵدا بوو بێت و دوایی لێی جیاكرابێتەوە، واتە: (**شوائب**) و خڵتەی لەگەڵدا بوو بێت، بەڵام دوایی لێی جیاكرابنەوە و، ساغ كرابێتەوە، واتە: ساغكراوە.

٥- ﴿ سَآئِغًا لِّلشَّـٰرِبِينَ ﴾، (سائغ) واتە: بە ئاسانیی لە گەروو چووەوە خوار، بۆ خۆرەوانی، (**السائغ: السهل المرور في الحلق**)، ئەوەی كە بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوار.

پێش ئەوەی بێینە سەر باسێكی زانستی دەربارەی شیر، با سەرنجی ئەم دوو ئایەتە بدەین و پێكەوە بەراوردێكیان بكەین:

أ ) لێرە لە سوورەتی (**النحل**)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ ﴾، واتە: لەوەی لە سكیاندایە، بەڵام ڕاناوی نێرینەی بۆ بەكارهێناون: ﴿ مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ ﴾.

ب) بەڵام لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَـٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ ئنجا بۆچی لێرە لە سوورەتی (**النحل**)دا ڕاناوی نێرینە بەكارهاتوە و، لەوێ لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا ڕاناوی مێینە ؟!

(**الخطيب الإسكافي**) خوا پاداشتی بداتەوە، لە كتێبەكەی خۆی (**درة التنزيل وغرة التأويل**)[1] دا، ڕوون كردنەوەیەكی جوان لەوبارەوە دەدات، كە من دەقە عەرەبییەكەشی دەخوێنمەوە، دەڵێ: (**إن الأنعام في سورة النحل، وإن أُطلق لَفْظُ الجمع ، فإن المراد به بعضها، ألا ترى أن الدرَّ لا يكون لجميعها، وأن اللَّبن لبعضِ إناثها، فكأنه قال: وإن لكم في بعض الأنعام لعبرة نسقيكم مما في بطونه، ولهذا ذهب من ذهب إلى أنه رَدٌّ إلى النَّعم ، لأنه يؤدي ما تؤديه الأنعام في المعنى، وليس كذلك ذكرها في السورة المؤمنين ، لأنه قال:** ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَـٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، **فأخبر عن النَّعَمِ التي في أصناف النعم إناثها وذكورها، فلم يحتمل أن يراد بها فيه البَعْضُ كما كان في الأول**).

---

(١) ص (١٨٩- ١٩٠).

منیش قسەکانی مانا دەکەم بەڵام بە تۆزێك ڕوونکردنەوەی خۆشمەوە:

واتە: وشەی (**الأنعام**) کە لە سوورەتی (**النحل**)دا بەکارهاتوە، هەرچەندە بە ڕەهایی بەکارهاتوە، بەڵام مەبەست پێی هەندێکیانە، چونکە بەڵێ باسی ئاژەڵانی کردوە، بەڵام دوایی باسی شیری ئاژەڵانی کردوە، شیری ئاژەڵەکانیش لە هەموویان دا نیە، واتە: لە نێرەکانیان دا نیەو تەنیا لە مێیەکانیان دایە، وەك ئەوەی خوا فەرموویێتی: لە هەندێك لە ئاژەڵاندا، پەند هەیە بۆ ئێوە، لەوەی کە لە سکیدایە شیر بە ئێوە دەنۆشین، هەر بۆیە هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ (**نَعَمْ**) چونکە هەمان وشەی (**أنعام**) لە مانادا دەگەیەنێ، وشەی (**نَعَمْ**)یش (**مذکر**)ە، بۆیە لە سوورەتی (**النحل**)دا: بە نێرینە (**مذکر**) هێناویەتی: لەبەر ئەوەی مەبەست پێ (**نَعَمْ**)ە.

بەڵام لە سوورەتی (**المؤمنین**)دا، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە ئاژەڵاندا پەندێك هەیە بۆ ئێوە، لەوەی کە لە سکیاندا هەیە، بە ئێوەی دەنۆشین، ئیدی باسی شیری نەکردوە، (سوود گەلێکی زۆریان تێدایە بۆ ئێوەو، لێیان دەخۆن و، لەسەر پشتی ئەوان و لەسەر پشتی کەشتیش ئێوە هەڵدەگیرێن)، لێرەدا باسی ئەو چاکانەی کردوە، کە لە جۆرەکانی ئاژەڵاندا هەیە، چ مێیینەکانیان چ نێرینەکانیان، بۆیە ئەگەری ئەوە نیە کە تەنیا مەبەستی پێ هەندێکیان بوو بێت، کە مێیینەکانن و شیرمان پێ دەدەن٪

{وەك لە سوورەتی (**النحل**)دا هاتوە، بەڵکو مەبەستی پێ کۆی ئاژەڵەکانە، بە نێر و مێیانەوە، چونکە ئەو سوود گەلەی کە باسی کردن، بە تایبەت بارهەڵگرتن لەسەر پشتیان، زیاتر بۆ حوشتری نێر، پاشان بۆ گا و کەڵ، کە لە هەندێك شوێنان شتیان لەسەر بار دەکەن، دەگونجێ}.

پوختەی قسان:

بۆیە خوا ﷻ لە (**النحل**)دا، ڕاناوی نێری بەکارهێناوە، چونکە ئەو شیرە لە هەندێك لە ئاژەڵاندایە، ئنجا ڕاناوەکە دەچێتەوە بۆ هەندێك (**بعض**)، کە ئەویش ڕاناوی نێرینەی بۆ بەکاردەهێنرێ، بەڵام لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا - ڕاناوەکە (**ها**) لە (**بطونها**) دا - بۆ هەمووشیان دەچێتەوەو، هەمووشیان کۆ (**جمع**)یە و ڕاناوی مێیینەی بۆ بەکاردێ.

# کورتە باسێک لەبارەی شیری ئاژەڵەوە

بەڕێــــزان:

بـە ڕاسـتیی خـوا ﷻ ئـەو نیعمەتانـەی کـە بـۆی خوڵقاندووین، جێـی خۆیـەتی هەموویـان هەڵوەسـتەی زۆریـان لـە بەرانبـەردا بکەیـن، بۆیـە هـەر کامێـك لەوانـە، بـە تایبـەتی لـەم سـووڕەتەی (**النحـل**)دا، کـە خـوا ﷻ بـاسی زۆر لـە نیعمەتـەکانی خـۆی تێـدا کـردوە - هەڵوەسـتەی لـە بەرانبـەردا دەکەیـن، وەك لـە ڕابـردوودا بـاسی زەیتوونمـان کـرد، ئێسـتاش باسـی شیر دەکەیـن، دیارە ماستیش هـەر لقێکـە لـە شیر، هەروەهـا پەنیریـش، بـەڵام لێـرەدا بـە تایبـەتی باسـی شـیر و ماسـت دەکەیـن، دواتـر بـاسی خورمـاش دەکەیـن پێکهاتـەکانی و سـوودەکانی، دوایـی بـاسی تـرێ دەکەیـن، پاشـان بـاسی هەنـگ و هەنگویـن دەکەیـن، چونکـە ئـەو چاکـەو نیعمەتانـەی خـوا **عزّ وجـلّ** جێـی خۆیـەتی لێکۆڵینـەوەی وردیـان لەبـارەوە بکەیـن، تاکـو بزانیـن خـوا ﷻ چـی بـۆ خوڵقاندوویـن؟ چونکـە بێگومـان ئێمـە تاکـو لـەو چاکـە و نیعمەتانـەی خـوا، وردتـر بینـەوە و باشـتر سـەرنجیان بدەیـن، خاوەنەکەیـان باشـتر دەناسـین، چونکـە خـوا ﷻ، سیفەتە بـەرزەکانی و نـاوە هـەرە چاکـەکانی، لـە لاپـەڕەی دروسـتکراوەکانیدا تەجەلـلا دەکـەن، وەك کاتی خـۆی لـە شـیعرێکدا گوتوومـە:

سروشت ئاوێنەی تەجەللایی خوایە
باش سەرنجی بدە بزانە چـی تیایە
لە ڕێـی کرەوە کردگار دەناسرێت
سروشـــت کرێکە کردگاری خـــوایە

خوا پشتیوان بێ لە سێ تەوەردا: ئەم کورتە باسە گرنگە پێشکەش دەکەین:

١/ تەوەری یەکەم: شیر.

٢/ تەوەری دووەم: ماست.

٣/ تەوەری سێیەم: چەند زانیارییەك لەبارەی ئاژەڵە شیردەرەکان و بەرهەمەکەیانەوە.

## تەوەری یەكەم: شــیـر

### یەك: پێنــاسە:

شیر بە عەرەبی (حَلِیب، لَبَنْ)و، بە ئینگلیزیی (milk)ی پێدەڵێن، ئاوا پێناسە كراوە: (**الحليب: سائل أبيض اللون أو ضارِبٌ على الإصفِرارِ تُفْرِزهُ الغُدَّة الثدية للإناث ذوات الثدي لِتَغْذية صغَارها**)، ئەمە پێناسەیەكی سادەی لەگەڵ واقیعدا پڕ بە پێستە.

واتە: **شیر**: شلەمەنییەكی ڕەنگ سپییە، بەرەو لای زەردیی دا دەچێ، ڕژێنە مەمكییەكانی (بۆ ئافرەت مەمك و بۆ ئاژەڵ دەگوترێت گوان) مێینەكان دەریدەدەن، ئەو مێینانەی كە خاوەن گوانن بۆ خۆراك پێدانی بەچكەكانی خۆیان.

ئنجا شیر ماددەیەكی خۆراكیی خاوەن زۆر تایبەتمەندییە، چونكە هەموو ئەو توخمانەی كە بە سوودن بۆ جەستە، دەیانگرێتە خۆی و، خواردنێكی تێر و تەواوە، بە تایبەت بۆ منداڵانی شیرە خۆرە و، بۆ بەچكەی ئاژەڵان، بەڵام لە حاڵێكدا كە ئەو شیرە بەرهەمی دایكانێك بێ، (چ بە نسبەت مرۆڤەوە و، چ بە نسبەت ئاژەڵانەوە) مێینانێك بێ، كە هەم خۆیان ساغ بن و، هەم خواردنێكی تەندروستیشیان خواردبێت.

### دوو: پێكهاتەكانی شیر:

هەر كام لە: (وزە و پرۆتین و چەوریی و توخمە كانزاییەكان و ڤیتامینەكان) كە ئەمانە هەموویان شتی بنەڕەتیین و پێكهاتەی بنەڕەتیین لە خۆراكی مرۆڤداو، لە بەچكەی ئاژەڵاندا، ئەوانە هەموویان بە ئەندازەیەكی باش و هاوسەنگ، لە شیردا هەن، با تەماشای ئەم خشتەیە بكەین:

كە ئەو سەرچاوەیەی لێم هێناوە، زیاتری هێناون بەڵام من ئەو حەوت جۆرەم لێ وەرگرتوون:

**١)** شیری مرۆڤ.

**٢)** شیری ڕەشەوڵاخ (واتە: مانگا).

**٣)** شیری بزن.

**٤)** شیری مەڕ.

**٥)** شیری گامێش.

**٦)** شیری حوشتری مێ.

**٧)** شیری ماین (واتە: وڵاخەبەرزە).

**یەکەم:** شیری مرۆڤ: (شیری ئافرەت) پێکهاتەکانی بەم شێوەیەن: (٨٧،٥٪) ئاوە، (٣،٧٪) چەورییە، (٦،٣٪) لاکتۆزە، (٢،٠١٪) پرۆتینە، (٣٠٪) خوێیە کانزاییەکانە.

**دووەم:** شیری مانگا: یان ڕەشەوڵاخ: (٨٧،٦٪) ئاوە، (٣،٧٪) چەورییە، (٥٪) لاکتۆزە، (٣،٤٪) پڕۆتینە، (٧،٢٪) خوێیە کانزاییەکانە.

**سێیەم:** شیری بزن: (٨٦،٧٪) ئاوە، (٤،٧٪) چەورییە، (٤،٧٪) لاکتۆزە، (٣،٧٪) پڕۆتینە، (١٥٪) خوێیە کانزاییەکانە.

**چوارەم:** شیری مەڕ: (٨٠،٧٪) ئاوە، (٧،٨٪) چەورییە، (٤،١٧٪) لاکتۆزە، (١٠٪) پڕۆتینە، (٩٣٪) خوێیە کانزاییەکانە.

**پێنجەم:** شیری گامێش: (٨٢،١٦٪) ئاوە، (٧،٥١٪) چەورییە، (٤،٧٧٪) لاکتۆزە، (٤،٧٢٪) پڕۆتینە، (٨،٤٪) خوێیە کانزاییەکانە.

**شەشەم:** شیری حوشتر (**ناقة**) مێینەی حوشتر: (٨٧،١٣٪) ئاوە، (٥،٣٨٪) چەورییە، (٥،٣٩٪) لاکتۆزە، (٣،٨٧٪) پڕۆتینە، (٧،٤٪) خوێیە کانزاییەکانە.

**حەوتەم:** شیری ماین (وڵاخە بەرزە): (٩٠،٥٨٪) ئاوە، (١،١٤٪) چەورییە، (٥،٨٧٪) لاکتۆزە، (٢،٥٪) پڕۆتینە، (٣،٦٪) خوێیە کانزاییەکانە.

## سێ: ئەندازەی بەرهەمی شیر:

سەرژمێرییەکانی ڕێکخراوی خواردن و کشتوکاڵ (**FAO**) بۆ ساڵی (٢٠٠١) زایینی، ئاماژەی بەوە داوە، کە بەرهەمی جیهانیی لە شیر گەیشتوەتە: (٥٨٣،٣٠٠،٠٠٠) تەن بۆ ئەو ساڵە، کە دیارە ئەویش:

/١ (٤٩٣،٨ ٪) هی مانگا بووە.

/٢ (٦٩،٢ ٪) هی گامێش بووە.

/٣ (٧،٨ ٪) هی مەڕ بووە.

/٤ (١٢،٥ ٪) هی بزن بووە.

ئنجا كۆی بەرهەمی شیری تێكڕای وڵاتانی عەرەبی هەمووی: (١٨،١٠٠،٠٠٠) ملیۆن تەن بووە، كە دەكاتە (٣،١ ٪) لە تێكڕای بەرهەمی جیهانیی[1].

## تەوەری دووەم: ماست

ئنجا با باسێكی ماستیش بكەین، هەڵبەتە خوا ﷻ بەس باسی شیری كردوە، بەڵام دوایی شیر، زۆر بەرهەمی دیكەی لێ دروست دەكرێن بەتایبەت ماست و پەنیر.

### یەك: پێناسە:

ماست كە بە زمانی عەرەبیی (لبن رائب) و (خاثر)یشی پێدەگوترێ، ئاوا پێناسە كراوە: (هو الحَلِيب المُتخَثِّر أو المُتجَبِّن، بفعل نوعين من بكتريا حمض اللبن)، واتە: شیر كە مەیوە و هەوێن كراوە، یاخود كراوەتە پەنیر، بەهۆی دوو جۆرە بەكتریای ترشەڵۆكی ماستەوە.

ئنجا ماست بە كۆنترین ئەو شتانە دەگوترێ كە مرۆڤ هەزاران ساڵە پەی پێبردوە، بێگومان ماست لە شیری مانگا و، مەڕ و، بزن و، گامێش و، جارجاریش لە شیری حوشتر و، مایینیش دروست دەكرێ.

### دوو: پێكهاتەی ماست:

ماست: كۆمەڵێك لە ڤیتامینە هەرە باشەكانی گرتوونە خۆی، ڤیتامینەكانی: (**d،c،b،a**)، هەروەها ئەم پێكهاتانەشی هەن:

١) ڕێژەی (٨٢،٥٪) ئاوە.

---

(١) الموسوعة العربية، ج ٨، ص (٥٠٥ و ٥٠٧).

**٢)** (٤،٤٪) پڕۆتینە.

**٣)** (٦،٧٪) لاکتۆزە (کە شەکری شیری پێ دەگوترێ).

**٤)** (٥،٧٪) چەورییە.

**٥)** (٠،٤٪) ترشەڵۆکی شیرە.

**٦)** (٠،٥٪) خوێیە ئەندامییە کانزاییەکانە.

## سێ: تایبەتمەندییەکانی ماست چین ؟

ماست چوار تایبەتمەندیی هەن:

**یەك:** ماست ئاسانترە بۆ هەرسکران، لەو شیرەی کە لێی دروستکراوە، ئەویش لەبەرئەوەی پێکهاتە ئاڵۆزەکانی شیری شیکردۆتەوە، بۆ هەندێ پێکهاتەی سادەتر، ئەوەش وایکردوە کە لە بەها خۆراکییەکەی زیاد بکات.

**دوو:** شیرە هەوێن بووەکان، کە دەکرێنە ماست یان پەنیر، لە شیر دەوڵەمەندترن، لە کۆمەڵەی ڤیتامینەکانی (B)، چونکە بەکتریای ترشەڵۆکی شیر، دەبێتە هۆی دروستکردنی ئەویش لە ماستدا هەیە.

**سێ:** بەکارهێنانی ماست، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی ترشی (PH) لە کۆئەندامی هەرسدا، کە ئەویش هاوکاریی مژینی کالیسیۆم دەکات، هەروەها لە چالاکی بەکتریای بۆگەن بوون (تَعفّن) کەم دەکاتەوە، چونکە هەندێك ماددەی تێدایە کە لە شوێنەوارە زیان بەخشەکانی ئەو میکرۆبانەی کە لە نێو ڕیخۆڵەکاندا هەن، کەم دەکاتەوە.

## چوار: بەکارهێنانی ماست:

**١** - جەستە نەرم دەکاتەوە.

**٢** - یارمەتیی دەدات بۆ هەرسکردن.

**٣** - جۆرێك لە گورج و گۆڵیی پێدەبەخشێ، بەتایبەت لە کەشی هاویندا.

**٤** - دەبێتە ڕێگر لەوە کە لە نێو گەدەدا ترشان دروست ببێ.

**٥** - ڕێگرە کە گازەکان دروست بن، کە دەبنە هۆی ژەهراویی (تسمُّم) بوونی جەستە.

٦ - هەروەها بەکارهێنانی ماست نیشانەکانی پیریی دوادەخات، کە لە بێهێزیی و لە ڕەق بوونی دەمارەکان و، لە وشکبوونەوەیاندا بەرجەستە دەبێت.

٧ - ماست هاوکاریی دەکات بۆ تواندنەوەی ئەو لمەی کە لە کۆئەندامی میزدا هەیە.

٨ - ڕێگاش دەگرێت لە دروست بوونی بەردی گورچیلە.

٩ - هۆکارە بۆ ئەوە کە ددانەکان سپی بن.

١٠- هەروەها یارمەتی ئەوەش دەدات کە گورچیلە و کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، میزەکەیان فرێ بدەنە دەرێ[١].

## تەوەری سێیەم: چەند زانیارییەک لەبارەی ئاژەڵە شیردەرەکان و بەرهەمەکانیانەوە

١/ چ مانگا، چ مەڕ، چ بزن، چ وشتر، تاکو شیر دروست دەکات، دەبێ: (٣٠٠ - ٥٠٠) لیتر خوێن بەکاربێنێ، ئنجا (١) لیتر شیری دەستدەکەوێ، چونکە ئەو خواردنە کە هەرس دەکرێ، دەبێتە خوێن، دوایی خوێنەکە جارێکی دیکە دەبێتەوە بە شیر، واتە: بەگشتی لە (١/٤٠٠) لیتر (یەك لەسەر چوارسەدی خوێن) دەبێتە شیر.

٢/ بە نسبەت مانگاوە: (ئەوە لە بارەی باسی مانگاوە هاتوە، ئەگەرنا ئیحتیمالی هەیە ئاژەڵە مێیینەکانی دیکەش هەر بەو شێوەیە بن)، هەفتەی یەکەمی کە گوڵك (بەچکە)ی دەبێ، گوانەکانی شیر بەرهەم ناهێنن، بەڵکو ماددەیەکی زەردی لینج بەرهەم دێنن، کە جۆرێك لە تاڵایی تێدایە، کە بە عەرەبی (اللّبأ)ی پێ دەگوترێ و بە کوردیی (فرۆ)ی پێ دەڵێن، ئنجا ئەو ماددەیە ئەندازەیەکی زۆر لەو شتانەی تێدا هەیە کە بەرهەڵستیی نەخۆشیی و میکرۆبەکان بەو گوڵکە دەدات، هەروەها کۆمەڵێك ماددەی چەوری تێدا هەیە زۆر چڕ، دیسان کۆمەڵێك ماددەی پرۆتینی تێدایە، تاکو ببێتە خۆراکێکی چڕ و، هەروەها لە هەمان کاتدا پارێزەریش بۆ ئەو گوڵکە لە یەکەمین قۆناغی تەمەنیدا، کە تازە وا گوانی دایکی دەمژێت، ئنجا دوای ئەو ماوەیە، {واتە: لە (٦ - ١٠) ڕۆژ}، ئنجا گوانی ئەو مانگایە دەگەڕێتەوە سەر حاڵەتی دروستکردنی شیری ئاسایی[٢].

---

(١) الموسوعة العربیة، ج ١٦، ص (٨٨٥ - ٨٨٦).

(٢) تفسیر النابلسي، ج ٥، ص (١٣٨ - ١٣٩).

/٣ هەروەها شیر لە (٩١٪) ئاوە، {پێشتر باسمان کرد کە (**الموسوعة العربية**) بە ئەندازەیەکی کەمتری هێناوە، لەوانەیە ئەو هاوکۆ(**مُعَدَّل**)ی موعەددەلی هەمووی لێك دابێتەوە}.

/٤ لە شیردا کۆمەڵێك ماددەی چەور هەن و، کۆمەڵێك ماددەی شیرینیی و، پێنج جۆرە پرۆتین هەن و، چەند جۆرە کانزایەك هەن، لە پێش هەموویانەوە: کالیسیۆم و فۆسفۆرو، چەند جۆرە ڤیتامینێك هەن، بەتایبەتی ( A ،B ،C ،D)، هەروەها چەند غازێکی تواوەش هەن، وەك کاربۆن و ئۆکسجین و ئازووت.

/٥ ئنجا زۆر جێی سەرنجە! کە: تاکە خۆراکێك ئینسان بتوانێت بەهۆیەوە بژی و تەنیا بەوی ئیکتیفا بکات، بریتیە لە شیر، کە مرۆڤ دەتوانێت هەموو ژیانی خۆی لەسەر شیر بەسەربەرێ، چونکە هەموو جۆرە کانزایە پێویستەکان و، هەموو جۆرە ماددە بنەڕەتییەکانی (پرۆتینیی و چەوریی و ڤیتامینەکان و کانزا و شێوە کانزاییەکانی گرتوونە خۆی)، مانگایەك بەگشتی دەتوانێ ڕۆژانە چل (٤٠) لیتر شیر بەرهەم بێنێت، لە حاڵێکدا کە بەچکەکەی تەنها پێویستیی بە دوو (٢) لیتر دەکات، واتە: سی و هەشت (٣٨) لیتری زیادە بەرهەم دێنێت بۆ ئێمە.

/٦ ئنجا جێی سەرسوڕمانە! کە ئەو ئاژەڵانە (مانگا و مەڕ و بزن و حوشتر و ماین) کاتێك ئاڵف و گیا و گۆڵ و لەوەڕ دەخۆن، دوایی دەبێتە شیر، زۆر جێی سەرنجە! چ کارگەیەکە خوا ﷻ لەوێدا دایناوە ؟

هەر بۆیەشە خوا ﷻ ئاماژەی پێداوە کە دەفەرموێ: ﴿ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ ﴾ واتە: لە نێوان خواردنێکی هەرسکراو و، خوێندا، ئەو شیرەتان دەستدەکەوێ، دوایی خواردنە هەرس کراوەکە دەبێتە خوێن و، پاشان خوێنەکە - وەك گوتمان - لە هەر چوارسەد (٤٠٠) لیتر خوێن، لیترێکیان دەبێتە شیر، کەواتە: کارێکی زۆر دەکرێ لە نێو جەستەی ئەو ئاژەڵە مێینانەدا، تاکو شیر بۆ ئێمە بەرهەم دێت.

/٧ ئنجا ئەگەر تەماشا بکەین: ئەو شیرە نە ئەوەیە کە ڕەنگی پاشەڕۆکی ئاژەڵەکەی هەبێ، کە ڕەشە یاخود بۆرە، کە دوایی وەك ڕیخ و قشپل و شیاکە، لێی جیا دەبێتەوە، نە ڕەنگی خوێنەکەشی هەیە، کە سوورە، بەڵکو ڕەنگێکی سپی جوان، بەڵێ زەرد باوە، بەڵام زۆر جیایە هەم لە پاشەڕۆك (**فرث**) خواردنە هەرسکراوەکە و، هەم لە خوێن (**دَمْ**)ەکەش، با لەوبارەوەش ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بێنین:

{عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللَّهُ عنهُمَا، قَالَ قَالَ رَسُول اللَّه ﷺ: إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلِ: أَللَّهُمَّ بَارِكْ لَنا فِيهِ، وَأَطْعِمْنا خَيْراً مِنْهُ، وَإِذَا سُقِيَ لَبَناً، فَلْيَقُلْ: أَللَّهُمَّ بَارِكْ لَنا فِيهِ، وَزِدْنا مِنْهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلاَّ اللَّبَنُ} (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٣٧٣٠، وَحَسَّنَهُ الألباني).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یەکێك لە ئێوە ئەگەر خواردنێکی خوارد، با بڵێ: ئەی خوایە! پیزمان بۆی تێبخەو، باشتر لەوەمان پێبدە، بەڵام ئەگەر شیری پێدرا بیخواتەوە، با بڵێ: خوایە! پیزمان بۆی تێبخەو، بۆمان زیاد بکە لێی، (با نەڵێ لەوە باشترمان پێبدە)، چونکە هیچ شتێك کەلێنی خواردن و خواردنەوە هەمووی ناگرێت، جگە لە شیر.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەروەها لە میوەی درەختی خورما و مێو، شەراب و بژیویێکی باش وەدەست دێنن، لەوەشدا نیشانەیەکی مەزن هەیە بۆ کەسانێك کە بفامن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا[1]:

١- ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ﴾، هەروەها لە میوەکانی دارخورمایەکان.

(**النخل: للواحد والجمع، والجمع: نخيل**)، (**نَخْل**) بۆ تاك و بۆ کۆش دێ، بەلاَم ئەگەر بتەوێ هەر کۆ بکرێتەوە دەڵێی: (**نخيل**)، دیارە (**نخلة**)ش بۆ درەختی خورمایە، بەلاَم لە جۆری مێ، چونکە درەختی خورما، وەك هەموو ڕووەکەکانی دیکە نێر و مێی هەیە، بەلاَم هی درەختی خورما، دیارە ئاشکراترە، دەبێ تۆوی نێرەکە بەرنە سەر مێیەکە، ئنجا بەردەگرێ.

٢- ﴿وَالْأَعْنَابِ﴾، هەروەها (میوەو بەری) دار ترێیەکان، واتە: مێوەکان، (**العنب: ثمرة الكَرْم، والكرْمُ نفسه**)، (**كَرْم**) واتە: مێو، کە (**عِنَبْ**) هەم بە میوەی مێو دەگوترێ و، هەم بە خودی مێوەکەش دەگوترێ، (**الواحدة: عِنَبة وجمعه: أعناب**) تاکی مێو (**عِنَبة**)ە و کۆیەکەشی (**أعناب**)ە.

٣- خوا دەفەرموێ: لە میوەی دارخورما و لە میوەی مێوەکان: ﴿تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا﴾، ئێوە ماددەیەکی سەرخۆشکەرو، بژیوێکی باش دروستدەکەن، چ لە میوەی خورما و، چ لە میوەی مێو، (**السَّكَر: إسم لما يكون منه السُّكْر**)، (**سَكَر**) ناوە بۆ ئەوەی ماددەی سەرخۆشکەری لێ دروست بکرێت، واتە: شەراب و مەی.

٤- ﴿وَرِزْقًا حَسَنًا﴾، هەروەها بژیوێکی باش، (**الرزق: العطاء الجاري، النصيب، ما يصل إلى الجوف...**)، (رزق) بە بژیوێکی بەردەوام و، بە پشك و بەش دەگوترێ و، بەو خۆراکەش کە دەچێتە نێو گەدەوە.

---

(١) دواتریش (کورتە باسێك) دەکەین دەربارەی خورما و پێکهاتەکانی و سوودەکانی و، هەروەها کورتە باسێك دەربارەی مێو و ترێ و پێکهاتەکانی و سوودەکانی، دەکەین.

بەڵام کە خوا دەفەرمووێ: بژیوێکی باش، ئەوە دواتر ڕوونی دەکەینەوە، کە بۆچی دەفەرمووێ: بژیوی باش، لە بەرانبەر ماددەی سەرخۆشکەردا؟ هەڵبەتە بژیوە باشەکە دەگونجێ زۆر شت بێ، بەڵام ئەوەی کە بۆ ئێمەی گەلی کورد دیارە: دۆشاوە، سرکەیە، مێوژە، باسووقە، سجووقە، مورەببایەو ... زۆر شتی دیکەش کە مرۆڤ، هەم لە خورما، هەم لە ترێ دروستی دەکات.

٥- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانەیەکی مەزن و جێی سەرنج هەیە، بۆ کۆمەڵێك کە بفامن.

هەم لە میوە و بەرهەمی دارخورما و دارمێوداو، هەم لە شیری ئاژەڵانیشدا، چونکە ئەمە بۆ هەردووکیان دەچێتەوە، دیارە دەرککردنی حیکمەتی ئەو شتانەش، پێویستیی بە تێفکرین و بەکارهێنانی عەقڵ دەکات، ئەگەرنا لە سەرەتاوە دیار نیە و دەبێ تۆزێ سەرنج بدەی و وردبییەوە، بۆیە خوا ﷻ بۆ ئەمەیان (يَعۡقِلُونَ)ی بەکارهێناوە، بەڵام بە نسبەت دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە: (**يَسۡمَعُونَ**)ی بەکارهێناوە، چونکە هەر کەسێك هەر تەماشا بکات و، گوێ بگرێ و، گوێ هەڵخات بۆ وەحیی و پەیامی خوا، بە سەرەتا عەقڵییەکان دەزانێ: کە خوایەکی میهرەبانی بەخشندە و بەخشەر، ئەو کارەی بۆ کردوە.

بەڵام بە نسبەت شیری ئاژەڵان و، خورما و ترێ و، ئەو بەرهەمانەی کە لەوانەوە دروست دەکرێن، مرۆڤ پێویستیی بەوە هەیە عەقڵ و بیر و هۆشی خۆی تێدا بەکاربهێنێ، ئنجا دەرکی حیکمەت و فەلسەفەکەیان دەکات.

هەڵبەتە - وەك باسمان کرد - ، ئێمە دوایی (کورتە باسێك) دەربارەی خورما، هەروەها (کورتە باسێك) دەربارەی ترێ، دەکەین، بەڵام پێش ئەوە، پێویستە ئەوە بزانین کە دەفەرمووێ: ﴿ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًا ﴾: ماددەیەك کە سەرخۆشکەرە و، بژیوێکی باشیش دروست دەکەن لە بەرهەمی دارخورما و دارمێو، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو ماددە سەرخۆشکەرە، بژیوێکی باش نیە، چونکە بەراوردی پێکردوە لەگەڵ ﴿ وَرِزۡقًا حَسَنًا ﴾، کەواتە: دیارە ئەوەشیان هەر ڕزقە، بەڵام ڕزقێکی باش نیە.

ئنجا هەندێك لە زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێ، لەبەر هەستیارییان بەرانبەر بە شەڕاب و ماددە سەرخۆشکەرەکان، گوتوویانە: لێرەدا خوا ﷻ مەبەستی لە (سكر) ماددە سەرخۆشکەرەکان و مەی و شەڕاب نیە، چونکە خوا ئەو ماددە سەرخۆشکەرە کە

قەدەغـەی کـردوە، وەك نیعمـەت و چاكەیـەك بـۆ مرۆڤـەكانی بـاس نـاكات، بـۆ مسـوڵمانانی بـاس نـاكات!

ئـەوان وایانزانیـوە، ئـەم قوڕئانـە تەنیـا مسـوڵمانانی دوانـدوون، بـەڵام بێخەبـەر لـەوە كـە قوڕئانێـك كـە لـە مەككـە دابەزیـوە، ئەسـڵەن ڕووی لـە بەشـەرەكان كـردوە بـە گشـتی، (يا أيهـا الإنسـان، يـا بنـي آدم، يـا أيهـا النـاس) ڕووی لـە مرۆڤـەكان كـردوە، ئەسـڵەن ڕووی لـەو مرۆڤانـە كـردوە، كـە جـارێ دەسـتی هیدایەتـی خوایـان نەگەیشـتووەتێ بـۆ ئـەوەی ئیـمان بێنـن، بۆیـە ئـەو كاتـەش بەكارهێنـانی شـەڕاب و مـەی شـتێكی گرنـگ بـووە لـە ژیانیانـدا و، بـە نیعمەتێـكی گەورەیـان زانیـوە، ئیـدی خـوا بۆیـە دەفەرمـوێ: ئـەو مـاددە سەرخۆشـكەرەش لـەو دوو میوەیـە دروسـت دەكـەن، بـەڵام بـۆ ئـەوەی هۆشـدارییان بداتـێ كـە ئـەوە شـتێكی بـاش نیـە، بـەراوردی پـێ دەكات لەگـەڵ ﴿ وَرِزْقًا حَسَنًا ﴾، بژیوێكـی بـاش، كەواتـە: ئـەوەش هـەر بژیـوە بـەڵام بژیوێـكی بـاش نیـە، ئەگـەر نـا بـازرگانی لەسـەر بـووە و، بەكاریانهێنـاوە، تەنانـەت ئـەو كاتـە لەسـەر مسـوڵمانانیش قەدەغـە نەكـراوە، هەمووـمان دەزانیـن كـە شـەڕاب بـە چوار قۆنـاغ قەدەغـە كـراوە، دوا ئایـەت كـە بڕیـاری كۆتایـی دەربـارەی قەدەغـە بـوونی شـەڕاب تێـدا هاتۆتەخـوار سـوورەتی (المائدة)یـە، كـە كاتی خـۆی ئێمـە لـە بەرگـی (٤)ی ئەم تەفسـیرەدا، (تەفسـیری قوڕئـانی بـەرز و بـە پێـز) بـە درێژیـی باسـمان كـردوە.

بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە بزانیـن: مـەرج نیـە كـە شـەڕاب تەنیـا لـەو دوو میوەیـە دروسـت بكـرێ، بۆچـی؟ چونكـە عیللـەت و هـۆكار لـە قەدەغە بـوونی مەی و شـەڕابدا، سەرخۆشـكردنە، بـێ هـۆش بـوون و سـەرخۆش بوونـە، بۆیـە ئـەو چەنـد فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دێنیـن لەوبـارەوە:

١) {كُلُّ شَرَابٍ أَسْكر فَهُوَ حَرَام} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٥٥٨٥، وَمُسْلِم: ٢٠٠١).

واتە: هەر خواردنەوەیەك كە سەرخۆش بكات، ئەوە قەدەغەیە.

٢) {كُلُّ مُسْكر خَمْرٌ، وكُلُّ مُسْكر حَرَام} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٠٠٣).

واتـە: هەمـوو سەرخۆشـكەرێك بـە (خمـر) دادەنـرێ و، هەمـوو سەرخۆشـكەرێك بـە قەدەغـە دادەنـرێ.

٣) {مَا أَسْكر كَثِيرُهُ، فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ} (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد: ٣٦٨١، وَابْنُ مَاجَه: ٣٣٩٣، وَالتِّرمِذِيّ: ١٨٦٥، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: هەر شتێك بە زۆرەکەی سەرخۆش بیت، کەمەکەشی حەرام و قەدەغەیە.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا بە درێژیی باسی ئەوەمان کردوە، بۆیە لێرەدا بە ئەوەندە ئیکتیفا دەکەین، کە بزاندرێ هەرچی مرۆڤ سەرخۆش بکات، چ شلەمەنی بێ، بخورێتەوە و، چ خەست و پەیت، یان ڕەق بێت و، چ بۆن بێ و، چ دەرزی بێ و، چ دووکەڵ بێت، هەموو ئەوانەی کە مرۆڤ سەرخۆش دەکەن، بە قەدەغە دادەنرێن.

## کورتە باسێک لەبارەی (خورما)وە

### یەکەم: پێناسە:

١/ دارخورما (**نخل**) بە کۆنترین درەختی بەردار و خاوەن میوە دادەنرێ لە دنیادا، هەمیشە سەوزەو، تەمەنی زۆرە، ئنجا ئەو سەرچاوەیەی کە من لێمەوە هێناوە، (الموسوعة العربية) هەر دەڵێ: تەمەنی زۆرە، بەڵام (**د. محمد راتب النابلسي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: شەش هەزار (٦٠٠٠) ساڵ تەمەن دەکات.

٢/ خورما بە هەموو جۆرەکانیەوە بە ژەمێکی تەواو دادەنرێ، چونکە هەموو ئەوەی کە جەستەی مرۆڤ پێویستیەتی، لە توخمە جۆرا و جۆرەکان، لە نێو خورمادا هەیە.

٣/ وشەی (**النخيل**) لە قورئاندا (٢٦) جار هاتوە، لە (٢٦) ئایەتدا و، لە شازدە (١٦) سوورەتدا، لە سێ هەزار (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایینەوە، زانیویانە: خورما موتوربە بکەن، واتە: تۆوی نێرەکەی ببەنە سەر مێیەکەی، بە تایبەت لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا، نێوان دوو ڕووبارەکان، کە ئەوە لەسەر ئەو پارچە قوڕانە و ئەو پارچە خەزەفانە (**الرقيمات الطينية الخزفية**) کە شتیان لەسەر نووسیون دۆزراوەتەوە.

٤/ ژمارەی دارخورما لە جیهاندا بە (١٠٥،٠٠٠،٠٠٠) درەخت مەزەندە کراوە، کە (٦٢،٠٠٠،٠٠٠) لە وڵاتانی عەرەبیی دان، شوێنی ئەسڵی دارخورما، وڵاتانی عەرەبیی بوون.

٥/ (٣٧٪) پانتایی زەوی خورمای هەموو جیهان، لە عێراقەو، لە (٢٦٪) بەرهەمهێنانی خورمای جیهان، لە عێراقە.

### دووەم: بەهای خۆراکیی و تەندروستیی خورما (القيمة الغِذائية والصِحّية للتمر):

١) خورما زۆر سوود دەگەیەنێ بۆ چارەسەری نەخۆشی کەم خوێنیی (ئەنیمیا)، هەروەها هاوکارە بۆ پەیداکردنی حاڵەتی ئارامیی دەروونیی.

٢) خورما دەوڵەمەندترین میوەیە لە (**سكريات**)دا، بەتایبەتی: فرەکتۆز و گلوکۆز، کە (٨،٧٪)ی خورما پێکدەهێنن و، زۆر بە ئاسانییش هەزم دەکرێن، کە هەم بە شێوەی فەریکیی دەخورێ، کە پێی دەگوترێ (**رُطَبْ**)، هەم بە وشکییش دەخورێت.

## سێیەم: پێکهاتەی خورماو سوودەکانی:

١) (٢٦،١٣ ٪) ئاوە.

٢) (٨٦،٣ ٪) ماددەی وشکە.

٣) (٩،١ ٪) پرۆتینە.

٤) (٢،٥ ٪) چەورییە.

٥) خورما بە خەزنە و کانگا (**المنجم**) دانراوە، چونکە کانزای زۆری تێدا هەن و، لە هەر سەد (١٠٠) گرام لە خورما، تێکڕای ئەو پێداویستییانەی کە جەستە پێویستینی لە ڕۆژدا، دابینیان دەکات، واتە: لە هەر سەد (١٠٠) گرام خورمادا، ئەم ماددانە هەن:

١/ مەگنیسیۆم (١٥٠) میللی گرام.

٢ / مس (٢١) میللی گرام.

٣ / کبریت (گۆگرد) (٦٥) میللی گرام.

٤ / هەروەها نیوەی پێداویستیی لە ئاسن (٢) میللی گرام.

٥ / یەك لەسەر چواری پێداویستیی لە کالیسیۆم، کە دەکاتە (٧٠) میللی گرام.

٦ / پۆتاسیۆم (٧٩٠) میللی گرام.

جگە لە توخمـــەکانی:

٧ / سۆدیۆم (٩) میللی گرام.

٨ / فۆسفۆر (٧٢) میللی گرام.

٩ / کلۆرید (٢٩) میللی گرام.

١٠/ کلۆر (٣) میللی گرام.

١١/ سیلینیۆم (٣٠٠) میللی گرام و، جگە لەوانەش.

٦) هەروەها خورما بە هەموو جۆرەکانیەوە: ڤیتامینەکانی: (e،a،c،d) تێدان، جگە لە ڤیتامینەکانی دیکەی: (B1، B2، B3، B6)، هەروەها بیووتینی تێدایە، کە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی جەستە لە بەرانبەر نەخۆشییەکاندا.

٧) لە خورمادا ماددەیەك هەیە کە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی دڵ و، بەهێزکردنی دیواری لوولەکانی خوێن.

هەروەها جگە لەو پێکهاتانەی کە باسمان کردن:

٨) ترشەڵۆکی ڤۆلیك و، ڕەنگی ئەنسۆسیانین، لە نێو پێکهاتەی خورمادا هەن، کە هەردووکیان دژی ئەکسەدەن، واتە: دژی ژەنگهێنانی لوولەکانی خوێنن و، دژی بەڵغ گرتنیانن.

٩) هەروەها لە خورمادا ماددەیەك هەیە، کە دژی بەکتریا و ڤایرۆس و کەڕووەکانە و، ڕێگرە لە تووش بوون بە شێرپەنجە، بەتایبەت پێکهاتەی: (13B) (بیتا دیگلۆن) کە کۆئەندامی بەرگریی لە جەستەدا بەهێز دەکات و، دەیپارێزێ لە تیشکە زیان بەخشەکان، بەتایبەتی ئەوەی لە تەلەفۆنی مۆبایلدا هەیە.

١٠) هەروەها خورما ڕێگریی دەکات لە کلۆربوونی ددان، چونکە ماددەی (فلۆر)ی تێدایە و، ڕێگا دەگرێ لە ڕەقبوونی دەمارەکان و، ڕێژەی (کۆلیسترۆڵ) لە خوێندا کەم دەکاتەوە.

## چوارەم: جۆرەکانی دارخورما لە دنیادا:

لە جیهان دا: (٢٥٠٠ - ٣٠٠٠) جۆرە دارخورما هەیە، ئنجا لەو (٢٥٠٠ - ٣٠٠٠)ە، (٢٠٠٠) جۆری لە نیشتمانی عەرەبییدا هەیە، تەنیا لە عێراق دا (٦٠٠) لەو جۆرانە هەیە و، (٤٠٠) جۆری لە عەرەبستانی سعوودیە هەیە و، (٤٥٠) جۆری لە باکووری ئەفریقیا و نزیکەی (١٠٠) جۆریشی لە میسر و سوودان‌دا هەیە[١].

(**النابلسي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (٣٠٠٠) جۆری دارخورما هەیە[٢].



---

(١) الموسوعة العربية، ج ٢٠، ص (٥٣٥ - ٥٤٢).

(٢) تفسير النابلسي، ج ٥، ص (١٣٩).

## کورتە باسێک لە بارەی درەختی مێو و ترێ وە

وەك پێشتریش لە شیکردنەوەی وشەکاندا باسمان کرد، (الأعناب) کۆی (عِنَبْ)ە، کە بە درەختی ترێ دەگوترێ و، وێڕا ئەوەی پێشی دەگوترێ: (الكَرْم) یاخود (الكرم) و (الدّالية) شی پێدەگوترێ، واتە: شۆڕبووەوە، لەبەرئەوەی شۆڕ دەبێتەوە، ئێمە لە پێنج بڕگەدا باسی درەختی (ترێ) یان (دارمێو) کە ترێ دەگرێ، دەکەین:

### یەکەم: پێناسە:

**(سُمِّي العنب عالمياً: مَلِكة الفاكهة، وَيُعَدُّ تأريخياً من أقدم الأشجار المنتشرة في الحالة البَرِّية على سطح الكرة الأرضية، منذ العصر الطّباشيري، وقبل ظهور الإنسان)**[1].

واتە: ترێ لەسەر ئاستی جیهانیی پێی دەگوترێ: پادشای میوە، لە ڕووی مێژووییەوە یەکێکە لە درەختە هەرە کۆنە بەردارەکان کە لە وشکانییدا بڵاوبۆتەوە، لەسەر گۆی زەوی، لە سەردەمی تەباشیریەوە پێش دەرکەوتنی مرۆڤ.

دیارە زانایانی زەویناسیی (جیۆلۆجیی) کە لە مێژووی جوگرافیی دەکۆڵنەوە، مێژووی زەوییان دابەش کردوە بۆ چەند قۆناغێك، یەکێك لە قۆناغەکان پێی دەگوترێ: چاخی تەباشیریی.

### دووەم: جوگرافیای درەختی ترێ لە جیهان دا:

درەختی ترێ لە سووریا (شام) هەروەها لە میسر: (٥٠٠٠) ساڵ پێش زایین، کە ئێستا ساڵی (٢٠١٧ز)یە، واتە: (٧٠١٧) ساڵ لەمەو پێش چێنراوە و بەهەرەی لیوەرگیراوەو، بابلییەکان و ئاشوورییەکانیش لە (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایینەوە، واتە: (٥٠١٧) ساڵ لەمەو پێش، خەڵکی ئەو شوێنانە سوودیان لەو ڕووەکە وەرگرتوەو، ڕەنگە زووتریش، بەڵام دیارە ئەو مێژووانە کاتی خۆی لەسەر هەندێك شت نووسراون، لەوەوە دیارییان کردوون.

---

(١) الموسوعة العربية: ج ١٣، ص ٥٦٩ - ٥٧٠.

## سێیەم: ژمارەی درەختی ترێ:

لـە سـاڵی (٢٠٠٣)ی زایینـی دا سـەرژمێری درەختـی مێـو کـراوەو، بەگشـتی بـە سی و شـەش (٣٦) ملیـۆن درەخـت مەزەنـدە کـراوە، لـە هەمـوو دنیـادا، بـە شـێوەیەکی نزیکەیـی بەوەندەیـان دانـاوە.

## چوارەم: بەهای خۆراکیی ترێ:

کاتی خـۆی (**إبـن سينا**) لـە کتێبەکـەی خـۆی: (**القانـون في الطـب**) کـە کتێبێـکی زۆر نـاودارە، بـاسی سـوودەکانی ترێـی کـردوەو، ئامۆژگاریـی کـردوە، کـە بۆڵـوەکانی تـرێ لەگـەڵ نێوکەکەیـدا بەکاربهێـنرێ، ئـەوە هـەم خوێـن بەهێـز دەکات و، هـەم چالاککـەرە بـۆ لایـەنی جینسـیی مـرۆڤ.

هەروەهـا خـواردنی تـرێ دەبێتـە هۆکارێـکی ئەرێنیـی و بـاش، لـە مەسـەلەی هەرسـکردندا، هەروەهـا کاریگەریـی بـاشی هەیـە لەسـەر کۆئەندامـی دەمـارو، لەسـەر کۆئەندامـی خوێـن، هەروەهــا تــرێ وا لــە جگــەر دەکات، باشــتر ئەرکــەکانی خــۆی ڕاپەڕێنــێ، هەروەهــا تــرێ هـاوکارە بـۆ مێشـك و کۆئەندامـی هـەرس و، چارەسـەرە بـۆ قەبزیـی و، بـۆ دەردی (**نِقـرس**) کـە دەردە پادشـا (**داء الملوك**)یـشی پـێ دەڵێـن، باشـە، گوتـراوە: (**النِقـرس: مـرض مُؤْلِـمٌ يحـدث في مَفاصـل القـدمِ و في الإبهـام الأكـبر**)، واتـە: نەخۆشـییەکی بـە ئـازارە کـە لـە جوومگـەکانی پێـدا، بـە تایبـەت پەنجـە گـەورەدا پەیـدا دەبـێ، لەبەرئـەوەی کـە هەندێـك توخمـی کانزایـی و، شـێوە کانزایـی تێـدا هـەن، کـە زۆر گرنگـن بـۆ ئـەو چارەسـەرانە، لـەو کانزایانـەی تێیـدان: (پۆتاسـیۆم، کالیسـیۆم، سـیلیۆم، کلـۆر، کبریـت، مەنگەنیـس، ئەلەمنیـۆم، ئاسـن، مـس، یـۆد... هتـد)، هەروەهـا (تـرێ) بـۆ دروسـتکردنی ئـەو دەرمانانـەی کـە دژی کلۆربـوونی ددانـن، سـوودی لێوەردەگیـرێ.

## پێنجەم: پێکهاتەی ترێ:

**١)** (٨٠ ٪)ی ئاوە.

**٢)** (٠،٩٢ ٪)ی ترشە ئەمینیەکانن.

**٣)** (١ ٪)ی چەورییەکانن.

٤) (١،٠٣)ی ڕەمادە.

٥) (١٥ ٪ - ٦٠ ٪) شەکرەکانن وەك: گلوکۆز و فرەکتۆز و نیفۆلۆس.

٦) (٠،٥ ٪)ی سلیلۆزە.

٧) (١ ٪)ی بەکتینە.

٨) (١٢ ٪ میللیگرامێکی (١٠/٢) ی فیتامین c) یە.

٩) (١٢/ ١٠٠٠) میللیگرامێکی ڤیتامین A).

١٠) (١٠/٦)ی میللیگرامێکی کۆمەڵە ڤیتامینەکانی: B1، B2،B3، B6) تێدایە.

### مەسەلەی چوارەم:

پەروەردگارت ئیلهامی بۆ هەنگ کرد: کە لە چیاو درەخت و کەپر، جێگا بۆخۆی دروست بکات، پاشان شیلەی گوڵان بمژێ و، هەنگوینێك بەرهەم بێنێ کە شیفای بۆ خەڵکی تێدایە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ٦٨ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٦٩ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

دواتر باسێکی تایبەت هەم دەربارەی هەنگ و، هەم دەربارەی هەنگوین دەکەین:

**١-** ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ ﴾، پەروەردگارت وەحیی کرد بۆ لای هەنگ.

وەك پێشتر باسمان کرد: وشەی وەحیی لێرەدا، بە مانای فێرکردنی تایبەت دێ، بە مانای ئیلهام و، بە مانای ئەوە دێ کە خوا ﷻ وەك غەریزەیەك لە هەنگدا دایناوە، یەکێك لە زانایان گوتوویەتی: (**أُطلق الوحي هنا على التكوين الخفي الذي أودعه اللّه في طبيعة النحل**).

واتە: لێرەدا وشەی وەحیی بەکارهێنراوە بۆ ئەو پێکهاتە پەنهانەی کە خوا ﷻ لە سروشتی هەنگدا دایناوە، واتە: هەنگی وا دروستکردوە کە ئەو شتانە بزانێ، وەك پەیامی بۆ ناردبێ وایە، بەڵام بۆچی خوا ﷻ وشەی (**وحي**) بەکارهێناوە بۆ هەنگ ؟

لەبەرئەوەی - وەك لە دواییشدا باسی دەکەین - هەنگ زیندەوەرێکی زۆر سەرسووڕهێنەرەو، بەسوودترین زیندەوەریشە بۆ مرۆڤ، کە هەنگوین بەرهەم دەهێنێ، ئەو هەنگوینەی کە دوایی باسی دەکەین، چەندان سوودی تێدا هەن.

**٢-** پەروەردگارت سروشی کرد بۆ هەنگ، پێی ڕاگەیاند: ﴿ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا ﴾، کە لە چیایەکان دا ماڵان دابنێن.

٣- ﴿ وَمِنَ ٱلشَّجَرِ ﴾، هەروەها لە درەختەکان دا.

٤- ﴿ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ﴾، هەروەها لەو کەپر و شوێنە تایبەتییانەدا کە مرۆڤەکان دروستیان دەکەن، (يَعۡرِشُونَ) خوێنراویشەتەوە (يَعْرُشُوْن) کە هەردووکیان یەك واتایان هەیە.

٥- ﴿ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، دوایی لە هەموو میوەکان بخۆ، واتە: لە شیلەکەیان بخۆ، هەڵبەتە هەنگ پێش ئەوەی میوەکان دروست بن، شیلەی گوڵەکانیان دەمژێ، بەڵام ئەو گوڵانەن کە دوایی دەبنە میوە، واتە: لەو گوڵانە بمژە کە دوایی دەبنە میوە، ئاوای لێدێتەوە.

٦- ﴿ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗا ﴾، ڕێیەکانی پەروەردگارت بگرەبەر، بۆت ڕام و دەستەمۆ کراون، دەڵێ: (السلوك: المرور وسط الشيء من طريق ونحوه، ذُلُـلاً جمع ذلول، أي مُذَلَّـلَـة مُسَخَّرة).

واتـە: (سـلوك) بریتیـە لـەوەی کە ئینسـان بە نێوەڕاسـتی شـتێکدا بڕوات، بـۆ وێنە: بە نێوەڕاسـتی ڕێگایەکـدا، {واتـە: ڕێـك بـڕۆ}، بـڕۆ بـە ڕێیـەکانی پەروەردگارتـدا، ئـەو ڕێیانـەی کـە پـەروەردگارت بـە حوکمـی پێکهاتـە سروشـتییەکەی خـۆت و غەریـزەت فێـری کـردووی کـە چـۆن پێیـان دا بـڕۆی، {(ذُلُـلا) کـۆی (ذلـول)ە، (ذلـول) واتـە: ملکـەچ و دەسـتەمۆ}، واتـە: بـە ڕێـگاکانی پەروەردگارتـدا بـڕۆ، کـە بـۆ تـۆ ملکـەچ و دەسـتەمۆ کـراون و، ڕێیەکانـت بـۆ تەخـت و ئاچـووغ کـراون.

٧- ﴿ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ ﴾، لە سکیان {لە سکی ئەو هەنگانە}، خواردنەوەیەك دێتە دەرێ، کە ڕەنگەکانی جۆراو جۆرن، بە پێی جیاوازیی ڕەنگی گوڵەکان کە دەیانمژێ، هەم تام و، هەم بۆن و، هەم ڕەنگی ئەو خواردنەوەیەش، کە مەبەستی پێ هەنگوینە، جۆراو جۆر دەبێت.

٨- ﴿ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِ ﴾، بۆ خەڵك چارەسەری تێدایە، زانایان گوتوویانە: (**تنكير الشفاء يدلُّ على أنه ليس شفاءً لكل داء**)، ئەوە کە (**شفاء**) بە نەناسراوی (**مُنْكر**) هاتوە و نەیفەرموە (**فيه الشفاء للناس**)، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِ ﴾، چارەسەرێکی تێدایە، نەیفەرمووە: چارەسەر، بەڵکو چارەسەرێکی بۆ خەڵکی تێدایە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەنگوین بەگشتی چارەسەر نیە بۆ هەموو دەردێك، بەڵکو بۆ هەندێك نەخۆشییان چارەسەرە.

٩- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، بێگومان لەوەدا واتە: لەوەدا کە هەنگ ماڵ دروست دەکات و دەگەڕێ و شیلەی گوڵان دەمژێ و، هەنگوین دروست دەکات و، ڕەنگی جۆراو جۆرە و، شیفای بۆ هەندێ نەخۆشیی خەڵکی تێدایە، نیشانەیەکی مەزن هەیە بۆ کۆمەڵێك کە بیر بکەنەوە.

ئەمەیان: سەرنجدان لە هەنگ و، چۆنیەتی ماڵ دروستکردنی و، چۆنیەتی هەنگوین دروستکردنی، نەك هەر بەوەندە ئیکتیفا ناکرێ کە: کەسانێك ببیستن، بەڵکو تەنیا بەوەندەش ئیکتیفا ناکرێ، کە کەسانێك: بفامن، بەڵکو وێڕای فامکردن، دەبێ بیریش بکەنەوە و ڕا بمێنن و ورد سەرنج بدەن، چونکە بەبێ ڕامان و سەرنجدان و لێوردبوونەوە و بیرکردنەوە، ئینسان ئەو حیکمەتەی کە لە هەنگ و هەنگوینە چارەسەرکەرەکەیدا هەیە، بۆی دەرك ناکرێ.

## کورتە باسێک لەبارەی (هەنگ و هەنگوین)ەوە

### تەوەری یەکەم: لەبارەی هەنگەوە:

(مێش هەنگوین) و (هەنگ)یش پێ دەگوترێ، بە عەرەبی (نَحْل)، کە ناوی کۆیەو، بۆ (جینس)ی هەنگ و، تاکی (نحل)یش بریتیە لە (نحلة)، واتە: یەك دانە (مێش هەنگوین) یەك دانە هەنگ، بەڵام بە کۆیان دەگوترێ: (نَحْل) هەنگ بە گشتی.

ئێمە بە گشتی لە شازدە (١٦) خاڵدا باسی هەنگ دەکەین، کە لە کۆمەڵێك سەرچاوە دەیانهێنینین و ئاماژەیان پێ دەکەین:

**١)** هەنگ یەکەمین زیندەوەرە، کە دەتوانێ شیلەی گوڵان بمژێ و، خواردنیان لێ دروست بکات، لەو شیلانەی دەیانمژێ، زیندەوەرێکی دیکەمان نیە، وەك ئەو بێ، هەڵبەتە شەربەتووکە (زەردەواڵە) و زەرگەتەش هەنگوین دروست دەکەن، بەڵام ئەوانیش هەر لە جینس و ڕەگەزی هەنگن.

**٢)** خەڵێفی هەنگ کە بە عەرەبی (**خلية**)ی پێ دەگوترێ بە کوردیش (خەڵێف) و (پووره)ی هەنگ و (صندووق)ی پێ دەڵێن، ئەو شوێنەی کە هەنگ ماڵی خۆی تێدا دادەنێت، بە وڵاتێکی سەربەخۆ دادەنرێت، چونکە سیستمێکی زۆر سەرسوڕهێنەری تێدایە، کە مرۆڤەکان ناتوانن بەو شێوەیە وڵاتی خۆیان بەڕێوەبەرن، نەك هەر ناتوانن، بەڵکو ناتوانن وەك هەنگیش بکەن، یانی: نەك خۆیان نەیانتوانیوە سیستمێکی وەك هی هەنگ دابێنن، بەڵکو نەیانتوانیوە لە هەنگیشەوە ئەو سیستمە فێربن، پێغەمبەریش ﷺ بڕواداری بە هەنگ چواندوە، کە دەفەرموێ: {**مَثَلُ الْمُؤْمِنِ مَثَلُ النَّحْلَةِ لا تَأْكُلُ إلا طَيِّباً وَلا تَضَعُ إلا طَيِّباً**} (**أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبان: ٢٤٧، قَالَ شُعيب الأَرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ**)، واتە: وێنەی بڕوادار وەك وێنەی هەنگ وایە، کە تەنیا شتی پاك و چاك دەخوات و، تەنیا بەرهەمی پاك و چاکیشی هەیە.

**٣)** جێی سەرنج ئەوەیە: هەنگ هەتا ماڵ دروست نەکات و جێ و ڕێ و شوێنێك بۆخۆی دانەنێت، هەنگوین دروست ناکات، ئایەتەکەش هەروا دەگەیەنێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ

﴿ذُلُلًا﴾، واتە: پەروەردگارت سروشی کرد بۆ هەنگ و فێری کرد: کە لە چیاییەکان و لە درەخت و لەوەی کە مرۆڤەکان دروستی دەکەن {لە کەپر و شوێنی تایبەت بۆ هەنگ}، ماڵ و شوێن بۆخۆت دابنێ، دواتر لە بەر و شیلەی هەموو میوەکان بخۆ (بمژە).

واتە: دەبێ پێشێ شوێنەکە هەبێ، ئنجا هەنگوینەکە دروست دەبێ، ئێستاش هەروایەو، ئەوەی کە خوا فەرموویەتی بەو شێوەیە.

٤) هەنگ بە گشتی دابەش دەبێ بۆ سێ بەش، بەڵام تاکو ئێستا چوار هەزارو پێنجسەد (٤٥٠٠) جۆر لە هەنگ دۆزراوەتەوە[١]، بەڵام هەنگ بەگشتی دەبن بە سێ بەش:

١ - نێر. ٢ - مێ. ٣ - بێ ڕەگەز، نێرە مووك (الخنثى).

هەڵبەتە ئەوە هەندێك لە زانایان ڕایان وایە، بۆ وێنە (**محمد الطاهر ابن عاشور**) لە (**التحرير والتنوير**)[٢]ەكەی خۆیدا دەڵێ:

**١/ فالذكور هي التي تحرس بيوتها ولذلك تكون محوّمة بالطيران، والدّوي أمام البيت، وهي تُلقح الإناث لقاحاً به تلد الإناث إناثاً.**

**٢/ والإناثُ هي المسمّاة اليعاسيب، وهي أضخم جرماً من الذكور، ولا تكون التي تلد في البيوت إلا أنثى واحدة، وهي قد تَلِد بدون لقاح ذكر، ولكنّها في هذه الحالة لا تلد إلا ذكوراً، فليس في أفراخها فائدة لإنتاج الوالدات.**

**٣/ وأما الخنثى فهي التي تفرز العسل، وهي العواسل، وهي أصغر جرماً من الذكور، وهي معظم سكان بيت النّحل).**

واتـــــە:

١/ نێرینەکان ئەوانەن کە ئیشیان بریتیە لە پاسەوانیی کردنی ماڵی خۆیان، ماڵی هەنگ، (واتە: پوورە هەنگەکە خەڵیفەکە)، بۆیە نێرینەکان هەمیشە خەریکی فڕین و گرمە گرمن لە بەردەم شوێنی خۆیان، ئیشی نێرینەکانیش ئەوەیە لەگەڵ مێینەکاندا جووت دەبن و، لە ئەنجامی ئەوەدا مێینەیان دەبێ.

---

(١) ئەمە لە کتێبی (أولين دانشگاه) لە بەرگی پێنج (٥) لاپەڕە (٥٥)دا هاتوە کە کتێبێکی فارسییە، لە شتە زانستییەکان دەکۆڵێتەوە، کۆمەڵێك زانا و خەڵکی پسپۆڕ لە بواری خۆیاندا دایانناوە.

(٢) ج ١٢، ص ٢٠٥.

{منیش دەڵێم: بەڵکو ئەوانی دیکەش هەر لەوان دەبن، کە پێیان دەگوترێ: بێ ڕەگەز}.

**٢/** مێینەکان کە پێیان دەگوترێ: (**اليعاسيب**) {کۆی (**يعسوب**)ە، واتە: شا هەنگ}، جەستەیان گەورەترە لە نێرینەکان و، تەنیا یەك مێینەش دەبێ ببێتە شاهەنگ بۆ هەنگەکان، ئنجا جاری وا هەیە ، ئەو شاهەنگە بە بێ ئەوەی کە لەگەڵ نێرینەشدا جووت بێ گەرا دادەنێ، بەڵام لەو حاڵەتەدا، تەنیا گەرای نێر دادەنێ و، گەرایەکان سوودێکیان نابێ بۆ دروستکردنی دایکەکان (شاهەنگەکان).

**٣/** نێرەمووکەکان: ئەوانەی کە هەنگوین دروست دەکەن، بێ ڕەگەزن، پێیان دەگوترێ: (**العواسل**) واتە: ئەوانە کە هەنگوین دروست دەکەن و، قەبارەیان لە هی نێرینەکان بچووکترەو، زۆربەی دانیشتووانی ماڵی هەنگ ئەوانە پێکی دەهێنن.

{دەڵێم: بەڵام زانایانی دیکە بەوانە دەڵێن: مێینە، دیارە شاهەنگیش هەر مێینەیە، بەڵام ئەو شای ئەو پوورە هەنگەیە کە ماڵێك بۆخۆیان دادەنێن}.

لە (**الموسوعة العربية**)[1] دا، هەندێ زانیاری دەربارەی بەشەکانی هەنگ، بەمجۆرەی خوارێ، هاتوون:

{نەك جۆرەکان بەگشتی کە گوتمان (٤٥٠٠)ە، بەڵکو لە نێو خۆیاندا}:

**١** - جۆری یەکەم: دەڵێ: (**ملكة النحل: هي أكبر الأفراد حَجْماً وطولاً، طولها نحو (١٨ -٢٠) مليمتراً، تدافع عن نفسها ضد منافساتها الملكات، بأداة لسْعٍ غير مُسَنَّنة تستخدمها أكثر من مرة**).

واتە: شاژنی هەنگ کە لە هەموویان قەبارەی گەورەترە و لە هەموویان درێژترە، درێژییەکەی لە (١٨ - ٢٠) میللیمەترەو، بەرگریی لە خۆی دەکات دژی شاژنە هەنگەکانی دیکە، کە بێنە نێو ماڵەکەیەوە، بە ئامرازێکی پێوەدان کە تیژ نیەو، زیاتر لە جارێك بەکاری دێنێ، {وەك هەنگی هەنگوین دروستکەر نیە کە یەك جار پێوە بدات بۆ خۆی دەمرێ، درێشووکەکەی کە پێی پێوە دەدات ، بەجێ دەمێنێ و لە ئەنجامدا دەمرێ}.

**٢** - جۆری دووەم: (**الشغالة: هي أصغر الأفراد يبلغ طولها نحو: (١٤ - ١٥) مليمتراً، يبرز من نهاية حلقات بطنها، أداة لسع (زبان) مسننة الحافة، تفقدها حين اللَّسْع منغرسة في جسم الضحية**).

واتە: ئیشکەران (**شغالة**) ئەوانەن کە هەنگوین کۆدەکەنەوە، قەبارەیان لە هەموویان بچووکترە (١٤ - ١٥) میللیمەتر درێژە و، لە کۆتایی سکیاندا ئامرازێکی پێوەدانی تیژ هەیە،

---

(١) ج ٢٠، ص ٥٠٨ - ٥١٠.

بەڵام هەر بۆ یەکەمجار کە پێوە دەدات ئەو درێشووکەیەی بەجێدەمێنێ، لە جەستەی ئەوەدا کە پێی وەدەدات بۆ خۆشی دەمرێ.

٣ - جۆری سێیەم: (**الذكر: يبلغ طول جسمه نحو: (١٦ - ١٨) مليمترا، وقُطْرُ جسمه نحو: (٦) مليمترات، أَعدادها قليلة، تقوم بتلقيح الملكات العذارى، تتخلّص منها طائفة النحل في الموسم السكوني، في فصلي الخريف والشتاء**).

واتە: نێرینەکە درێژیی جەستەی ( ١٦ - ١٨) میللیمەترە و، تیرەی جەستەی (٦) میللیمەترە، {واتە: ئەستوورییەکەی}، ژمارەیان کەمە و، ئیشیان ئەوەیە کە لەگەڵ شاژنەکاندا جووت دەبن، {ئەوانەی کە نەپیتێنراون و جووتبوونیان لەگەڵ نەکراوە، ئەگەرنا کە یەك جار لەگەڵی جووتبوو ئەو شاژنە پێویستی بە جووتبوونی دیکە نیە و، دەتوانێ چەند جارێك گەرا دابنێ}، ئنجا هەنگەکان ئەو نێرینانە لەبەین دەبەن، لە کاتی کەشی پایز و زستاندا، کە هەنگ ئیش ناکات و خەریکی پشوودانن، ئەو نێرینانە لەبەین دەبەن.

چونکە گەلۆر گەلۆر دەبێت هەر خەریکی خواردنی بن، بۆیە دەیانفەوتێنن و، لە نێو ماڵی هەنگدا هیچ کەس نابێ، بێ ئیش بێت و بێ ئیشوکار دابنیشێ، بۆیە ئەو نێرینانە کە ئیشیان تەواو دەبێ، دەبێ هەر بخۆن، بۆیە لە کۆڵ خۆیانیان دەکەنەوە.

٥) هەنگ لە سێ شوێناندا خانوو دروست دەکات:

١ - چیا. ٢ - درەخت. ٣ - خەڵێف کە بە عەرەبی (**خلية**)ی پێدەڵێن.

ئەو شوێنەی هەنگ ماڵی خۆی تێدا دادەنێت، یان لە چیایە یان لە شوێنێکی عاسێیە و لەنێو بەردێکی خاوێن دا، یان لە نێو درەختدایە، یاخود ئەو شوێنەی کە مرۆڤ بۆی دروست دەکات.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجدان و ڕامانە ئەوەیە کە:

شێوەی دروستکردنی ئەو خانانەی هەنگ هەنگوینیان تێدەکات، دەبێ هەموویان شەشپاڵوو (**مُسَدَّس**)بن، واتە: لەسەر شێوەی شەشگۆشە و، شەشپاڵوو، چونکە بە پێی سیستمی ئەندازیاریی دەرکەوتوە کە ئەگەر هاتبا و خانەکان سێگۆشەیی، یان بازنەیی، یان لاکێشەیی، یان چوارگۆشەیی، بوونایە، چەند کەلێنێك پەیدادەبوون و شوێنیان لێ

زایە دەبوو، بەڵام شێوەی شەشپاڵوویی، هەموو خانەکان پاڵ دەدەنە یەك، ئنجا هەر کەسێك تەماشای شانەی هەنگوین بکات، زۆر جوان دیارە، کە هیچ بۆشایی نابێ لە نێوان خانەکاندا، کە هەنگوینیان تێدەکرێ.

سبحان اللّـه! خوا ﷻ هەنگی فێر کردوە، کە باشترین شێوەی هەندەسیی هەڵبژێرێ، بۆ ئەو خانانەی کە هەنگوینیان تێ دەکات، بە شێوەیەك کە هیچ بۆشاییەك زایە نەبێ و هیچ شوێنێکیان بە فیڕۆ نەچێت.

٦) هەر خەلێفێك، هەر شارە هەنگێك، یەك شاژنی تێدایە و، ئەگەر بێت و شاژنە هەنگێکی دیکە بێت ،{واتە: هەنگێکی مێیەی دیکە بێت} ئەوەی دووەمیان دەبێ بکوژرێ، چونکە باسمان کرد کە شاژنەهەنگ درێشووکەیەکی هەیە، تەنیا بۆ بەرگریی لەخۆکردن بەکاری دێنێ لە بەرانبەری ئەو شاژنە هەنگانەدا کە دەیانەوێ بێنە نێوماڵەکەیەوەو، زیاتر لە جارێکیش دەتوانێت بەکاری بێنێ.

٧) ئەرکی شاژنە هەنگ بریتیە لە گەرا دانان، ئنجا هێلکە و گەرایەکانیشی نەك بە سەدان، بەڵکو بە هەزارانن و، ئەو شاژنە هەنگە دەچێ:

١- لەو شوێنەی کە پێویستە گەرای نێر دابنێ، گەرای نێر دادەنێ.

٢- لەو شوێنەش کە پێویستە هی ئیشکەرەکان کە مێینەن، یاخود بێ ڕەگەزن، لەوێ ئەوە دادەنێ.

٣- لەو شوێنەش کە پێویستە گەرا بۆ شاژنە هەنگێکی دیکە دابنێ، ئەوە دادەنێ، واتە: لە هەر شوێنە و گەرای تایبەتی خۆی دادەنێ.

ئنجا ئەو شاژنە هەنگە، چەند هەنگێکی دیکە هەن کە خزمەتکار و، کارەکەرنی لەگەڵیدان و، خزمەتی دەکەن و خواردنی تایبەتی بۆ دێنن، خواردنە تایبەتییەکەشی پێی دەڵێن: (**غُبار الطَّلْع**) و پێشی دەگوترێ: خواردنی شاهانە (**الغداء الملكي**) کە زۆر دەوڵەمەندە، بە ماددە پڕۆتینییەکان، پاشان شیلەی گوڵانی بەسەردا دەکات و، خۆشیان جۆرێك لە ماددەی بەسەردا دەڕێژن و، لە ئەنجامدا دەبێتە ئەو خواردنی شاهانە (**الغداء الملكي**)ە کە مەشهوورە چۆنە.

٨) لە نێو خەلێف و شاری هەنگدا، هەندێك هەنگ هەن تەنیا ئیشیان بریتیە لە پاسەوانیی کردن و، لە دەرگای شارە هەنگەکە ئێشکچێتی دەکەن بەردەوام دەفڕن و، هەر خەریکی گرمە گرمن، ئنجا هەر هەنگێکیش بێ، ئەگەر وشەی نهێنییەکە نەڵێ، وەك زانایانی لێکۆڵەرەوە بۆیان

دەرکەوتوە هەنگێك لە شوێنێكی دیكەوە بێ و، بیەوێ بچێتە نێو ئەو شارە هەنگەوە، ئەگەر ئاشنا بێ و خەڵكی ئەو شوێنە بێ، دەبێ نهێنییەكە بزانێ و بیڵێ، ئەگەرنا دەكوژرێ.

**٩)** كۆمەڵێك هەنگ هەن، كە پاككەرەوە (**مُنَظِّفات**)ن و، ئیشیان بەس ئەوەیە كە نێو ئەو شارە هەنگە لە هەر پیسییەك پاك بكەنەوەو، هەر هەنگێك لەسەر شوێنێكی پیس نیشتبێ و، پیسییەكی پێوە بێ، یەكسەر دەكوژرێ، لەلایەن ئەو هەنگانەوە كە كاریان پاككردنەوەیە.

## قوڵــە نەزیلـەیــەك:

برایـەكی هەنگـەوانی خۆمـان كـە هەنگـی هـەن، بـۆی گێڕامـەوە، گـوتی: جارێـك لـە پـوورە هەنگێـك دا، هەنگوینەكـەم دەردەهێنـا تەماشـام كـرد، لـە نێـو شـانەكەدا شـتێكی هەڵتۆقیـوو زەق هەیـە، منیــش بــە چەقۆیــەك كرانــدم، تەماشــام كــرد، مشــكێكە ویســتوویەتی بچێتــە نێـو خەڵێفەكـە، بـەڵام لەوێـدا تۆپیـوە، هەنگەكانیـش دەورەكەیـان هەمـوو بـە مێـو تەنیـوە، بـە شـێوەیەك كـە ئەسـڵەن نـەك هـەر بـۆن بـۆ ئـەو شـوێنە نەچـووە، مشـكەكەش بۆخـۆی ڕەق نەبــووەو، وەك تــەڕ و تــازە بێــت و مۆمیــا (**تحنیط**)یــان كــرد بــێ، خــوای پــەروەردگار ئـەو توانایـەی پێـداون، لەبەرئـەوەی مشـكەكەیان پـێ دەرنەكـراوە، ئـەوان چـوون دەورەیـان تەنیـوە، بـە مێـو بـە شـێوەیەك كـە بـە هیـچ جۆرێـك بـۆنی ئـەو مشـكە بـڵاو نەبێتـەوەو بۆخـۆی لەوێـدا بـە بێدەنگیـی خنـكاوە !

**١٠)** هەندێك هەنگ هەن، ئیشیان تەنیا ئەوەیە كە هەوای نێو شارەكەیان ڕادەگرن: لە زستاندا گەرمی دادێنن و، لە هاویندا فێنكی دەكەنەوە.

**١١)** هەنگ زۆرباش بە ڕێی خۆی دەزانێتەوە، هەرچەندە بۆ ماوەی چەند كیلۆمەترێك دەڕوات بۆ مژینی شیلەی گوڵان و چرۆیەكانیان.

**١٢)** یەك دڵۆپە لە شیلەی گوڵان كە هەنگ دەیمژێ، پێویستی بەوە هەیە كە لەسەر (٥٠٠ - ١١٠٠) گوڵ بنیشێ و شیلەكەیان بمژێ و، بۆ دروستكردنی (١٠٠) گرام، هەنگوین، پێویستی بەوە هەیە كە لە یەك ملیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠) گوڵ شیلە بمژێ و، بۆ (١٠٠٠) گرام، واتە: یەك كیلۆ هەنگوین، هەنگ پێویستیی بەوە هەیە كە چوارسەد هەزار (٤٠٠) هەزار كیلۆمەتر ببڕێت و بێ و بچێ، ئنجا ئەگەر بۆ سەد (١٠٠) گرام هەنگوین، پێویستیی بە مژینی شیلەی یەك ملیۆن گوڵ هەبێ، ئەوە بۆ یەك كیلۆ، پێویستیی بە مژینی شیلەی دە (١٠) ملیۆن گوڵ هەیە و، پێویستیی بە بڕینی ماوەی (٤٠٠) هەزار كیلۆمەتر هەیە، ئنجا هەمووو بازنەی زەوی (٤٠) هەزار كیلۆمەترە،

كەواتە: هەنگ بۆ ئەوەی كیلۆیەك هەنگوین دروست بكەن، دەبێ ماوەیەك ببڕن، دە (١٠) جاران هێندەی بازنەی زەوی بێت لە لای هێڵی یەكسانیی (**خط الإستواء**)یەوە !!

**١٣)** هەنگ، بەتایبەتی هەنگە مێینەكانیان، یان هەنگە بێ ڕەگەزەكان، ئەوانەی كە هەنگوین دروست دەكەن، بە جۆرێك دەفڕن، كە جۆرێك لە شایی دەكەن بۆ ئەوانی دیكە، كە پێیان دەڵێن: ئەو گوڵانە كە ئەو چووە بیانمژێ، چەند دوورن، بۆ وێنە: ئەگەر جارێك سووڕێك بداتەوە، دەزانن كە چەندەیە، ئەگەر دوو بێت زیاتر و، ئەگەر سێش بێت زیاتر.

ئنجا وێڕای ئەوەی كە لە كتێباندا هاتوە، ئەو كەسانەی كە شارەزاشن دەڵێن: هەتا هەنگ شوێنەكەی دوورتر بێ، زیاتر بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە و جۆرێك لە شایی دەكات.

**١٤)** خێرایی هەنگ كاتێك كە دەچێ بۆ مژینی شیلەی گوڵان دەوری شەست و پێنج (٦٥) كیلۆمەترە لە سەعاتێكدا، بەڵام لە گەڕانەوەدا دەوری سی (٣٠) كیلۆمەترە، چونكە باری پێیە، پاشان هەر بەڕێوەش لە ڕژێنێكی خۆی دەڕژێنێتە سەر ئەو شیلەی گوڵانە، تاكو وەك چۆن شیر هەوێنی تێدەكرێ و دەمەیێت، بەو شێوەیەش ئەو گوڵە جۆرێك ماددەی بەسەردا دەكات، ئنجا دەبێتە هەنگوین، تاكو كات (**وقت**)ی بۆ بگەڕێتەوە، هەر بەڕێوە ئەو پڕۆسەیەی هەوێن كردن (**تخمیر**)ی پێدەڵێن، ئەنجامی دەدات !!

**١٥)** (مۆریس میتر لینگ) كە كتێبێكی تایبەتیی هەیە لەسەر هەنگ و، زۆر لێكۆڵینەوەی وردی كردوە، دەڵێ: ئەگەر هەنگ نەبێ، سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) جۆرە گوڵ و ڕووەك، لەبەین دەچن، كە بەهۆی هەنگەوە كە شیلەكانیان دەمژێ و لەوێوە دەچێ بۆ ئەوێ، دەپیتێنرێن و موتوربە دەبن، ئەگەرنا ئەگەر هەنگ نەبووایە، ئەو سەد هەزار جۆرە ڕووەك و گوڵە لە نێو دەچوون[١]، بەهۆی نەپیتێنرانیانەوە.

**١٦)** ئەگەر هەنگ پێوە بدات دەمرێ، كە هەرگیز لەخۆڕا ئەوە ناكات مەگەر ناچار بكرێ و، ئەو ژەهرەی كە لە هەنگدا هەیە، بۆ نەخۆشییەكانی ڕۆماتیزم و مەلاریا و ئازاری دەمارەكان بەسوودە و، لە پێوەدانی هەنگ وەردەگیرێ، یاخود دەگونجێ ژەهرەكەی بە جۆرێك لە جۆرەكان لێ وەربگرن.

---

(١) ئەمە لە كتێبی (أولین دانشگاه) بەرگی (٥) لاپەڕە (٥٥) وەرگیراوە، ئەوەی دیكەش هەرچی گوتمان، لە تەفسیرەكەی (د. محمد راتب النابلسي) لە بەرگی (٥) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا، وەرمانگرتوە.

### تەوەری دووەم: لەبارەی هەنگوینەوە:

لە چوار بڕگەدا باسی هەنگوین و سوودەکانی دەکەین:

### یەك: پێناسە:

(**العسل مُنْتَجٌ زراعي حُلْو المذاقِ، لَزِجٌ لهُ رائحة مميِّزة عطرية، تجمعه شغّالات من غدد رحيق أزهار النباتات المختلفة**)[1]، واتە: هەنگوین بەرهەمێكی كشتوكاڵییە، تامی شیرینە و لینجە و، بۆنێكی خۆشی جیاكەرەوەی هەیە، ئەو هەنگانەی كە كار دەكەن، لە شیلەی گوڵە جۆراو جۆرەكان دەیمژن و دروستی دەكەن.

### دوو: گرنگیی خۆراكیی و تەندروستیی، هەنگوین[2].

**١/** هەنگوین بە خۆراكێك و دەرمانێكی زۆر باش بۆ مرۆڤ دادەنرێ و، گەلێك سوودی هەن، هەم سوودی پاراستن لە نەخۆشییان و، هەم سوودی چارەسەری نەخۆشییان، چونكە هەنگوین توانای بەرهەڵستییكردنی جەستە دیار دەكات بۆ دژی ژمارەیەك لە نەخۆشییەكانی، كە تووشی كۆئەندامی هەناسەدان دەبن و، تەنانەت بۆ نەخۆشیی شەكرە و، ئەو نەخۆشییانەش كە تووشی كۆئەندامی هەرس دەبن و، تووشی كۆئەندامەكانی دەمار دەبن، هەروەها بۆ نەخۆشییە پێستییەكان و بۆ نەخۆشییە هەستیارییەكان (**أمراض الحساسية**)، بۆ هەموو ئەوانە باشە[3].

**٢/** هەنگوین سوودی هەیە بۆ پاراستنی ددانەكان لە كلۆر بوون.

**٣)** هەروەها هەنگوین بە خۆراكێكی زۆر باش دادەنرێ بۆ منداڵان، بە تایبەت لە حاڵەتی كەم خوێنییدا.

**٤)** هەروەها هەنگوین سوودی هەیە بۆ بیرمەندان و، وەرزشوانان، چونكە پلەی ترشی لە خوێنداو، لە خانەكانی جەستەدا ، لە ئەنجامی ماندووبووندا ، كەم دەكاتەوە.

---

(١) الموسوعة العربية: ج ١٣، ص١٨٤ - ١٨٥.

(٢) الموسوعة العربية: ج١٣، ص ١٨٤ - ١٨٥.

(٣) هەندێك لە سوودانەی دەیاننوسین، جۆرێك لە دووبارەبوونەوەیان تێدایە، بەڵام بە باشمان زانی هەموویان بێنین و، هۆكاری دووبارەبوونەوەكەش ئەوەیە كە لەچەند سەرچاوەیەكەوە هێناومانن.

٥) هەروەها هەنگوین زۆر بە خێرایی لە جەستەدا هەرس دەبێت و وزەیەكی باش بە جەستە دەبەخشێ.

٦) هەنگوین بە ماددەیەكی خۆراكی پاككەرەوەو، دژی هەوكردن (**عفونة**)و ئیلتیهابە و، دژی ئەو زیندەوەرە بچووك و بەكتریا و كەڕووانەشە، كە زیان بە جەستە دەگەیەنن.

٧) هەروەها هەنگوین بۆ چارەسەری سووتان و، گەلێك لەو برینانەی كە چارەسەریان بەزەحمەت دەكرێت، بەكاردێ.

٨) هەروەها هەنگوین بۆ دواخستنی پیربوونی خانەكان و، زیادبوونی تواناایان بۆ پارێزگاریی كردن لە چالاكیی و گەنجایەتییان، بەسوودە.

٩) هەنگوین یارمەتیی جەستە دەدات بۆ پاراستن لە دژی نەخۆشییەكانی شێرپەنجە (**سرطان**).

١٠) هەنگوین پێش ئەوەی بگوترێ: خۆراكە، چارەسەر و دەرمانە، بەڵكو بە دەرمانگەیەكی تایبەت دادەنرێ.

١١) لە هەمووی گرنگتر: هەنگوین شوێنێكە كە میكرۆب و بەكتریا و كەڕووەكان تێیدا گەشە ناكەن، بەڵكو لەنێویشیان دەبات.

١٢) هەنگوین چارەسەرە بۆ هەموو ئەو نەخۆشییانەی تووشی كۆئەندامی هەرس دەبن، بەتایبەت: ئەو نەخۆشییانەی كە دەبنە هۆی پەیدابوونی میكرۆب و، پیسبوونی گەدە و ڕیخۆڵەكان، دیسان چارەسەرە بۆ ئەو ترشەڵۆكە (**حموضة**) زۆرەی كە لە ڕیخۆڵەكان و لە كۆئەندامی هەرسدا بەگشتی پەیدا دەبێ.

١٣) هەنگوین چارەسەرە بۆ نەخۆشییەكانی كۆئەندامی هەناسەدان و، نەخۆشییەكانی سییەكان و، ئەو نەخۆشییانەی كە تووشی قوڕگ و گەروو دێن، هەروەها بۆ تەنگە نەفەسیی و ڕەبوو و، بۆ نەخۆشیی دڵیش.

١٤) هەنگوین چارەسەرە بۆ نەخۆشیی كەم خوێنیی.

١٥) هەنگوین چارەسەرە بۆ نەخۆشییەكانی جگەر و، ڕێگرە لە مێوكردنی جگەر (**تَشَمُّع الكبد**) كە حاڵەتێكە، تووشی جگەر دەبێ، سست و خاوی دەكات و، هەنگوین بە چالاككەرێكی پلە یەك دادەنرێ، بۆ بەهێزكردنی جگەر لە ئەنجامدانی ئەركەكانی خۆی دا.

**١٦)** هەرچەندە هەنگوین شیرینە، بەڵام بۆ نەخۆشیی شەكرەش باشە، بەڵام دەبێ بە پێی خۆی بەكاربهێنرێ و، دەبێت پزیشكی تایبەت دیاریی بكات.

**١٧)** هەنگوین چارەسەرە بۆ ئەو نەخۆشیيانەی كە تووشی كۆئەندامی میزكردن دێن و، ئەو تێكچوونانەی كە تووشی گورچیلەكان دێن.

**١٨)** هەنگوین چارەسەرە بۆ حاڵەتی بێخەویی و ئەو نەخۆشیيانەی تووشی كۆئەندامی دەمار دێن، چونكە هەندێ ماددەی تێدان هێمنكەرەوەو ئارامیی بەخشن.

**١٩)** هەنگوین چارەسەرە بۆ نەخۆشییەكانی چاو، بە تایبەت ئیلتیهابی گلێنەی چاو.

**٢٠)** هەنگوین چارەسەرە بۆ نەخۆشییەكانی ئافرەتان[١].

**٢١)** هەنگوین چارەسەرە بۆ حاڵەتی قەبزیی (**إمساك**).

**٢٢)** هەنگوین دەبێتە هۆی لابردنی ماندوویەتیی و شەكەتیی جەستەیی و زەینیی.

**٢٣)** هەنگوین ڕێژەی كالیسیۆمی خوێن بەرز دەكاتەوە.

**٢٤)** هەنگوین باشە بۆ لابردنی باكردنی گەدە و ڕیخەڵۆكان.

**٢٥)** هەنگوین بۆ نەخۆشیی سكچوون (**إسهال**) باشە.

**٢٦)** هەنگوین بۆ چارەسەری نەخۆشیی هەڵامەت باشە.

**٢٧)** هەنگوین بۆ چارەسەری دومەڵ و برینی زار و زمان، باشە كە جارجار بلۆق و زیپكەی لێ پەیدادەبن.

**٢٨)** هەنگوین بۆ چارەسەری قڵیشانی پێست باشە، كە دەبێ پێی چەور بكرێ.

**٢٩)** هەنگوین شەش ڤیتامینی گرنگی تێدان كە بریتین لە: (A، B، C، D، K، I)ن[٢].

---

(١) ئەوانە هەموویان لە تەفسیری: (النابلسي) بەرگی (٥) لاپەڕە (١٤٣ - ١٤٤) وەرگیراون.

(٢) تەفسیری نموونە، بەرگی (١١)، لاپەڕە (٣٠٢ – ٣٠٣).

## سێ: چەند تایبەتمەندییەکی هەنگوین:

هەنگوین چەند تایبەتمەندییەکی هەن:

**یەکەم:** هەنگوین هەرگیز تێکناچێ، هەتا هەندێك لە مێژووزانان دەڵێن: لە هەڕەمەکانی میسڕدا، هەنگوین دۆزراوەتەوە کە لەگەڵ فیرعەونەکاندا دایانناوە، ئێستاش ماوە، یانی: هی سێ چوار هەزار (٣٠٠٠ - ٤٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش.

**دووەم:** هەنگوین نابێ گەرم بکرێ، چونکە ئەگەر گەرم کرا، هەندێك لە سوودەکانی لەدەست دەدات.

**سێیەم:** نابێ لە قاپی کانزاییدا هەڵبگیرێ.

**چوار:** دوو فەرموودەی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لەبارەی هەنگوینەوە:

کۆتایی باسی هەنگ و هەنگوین بەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

**١)** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثَة: فِي شَرْطة مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبة عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٍ بِنارٍ، وَأَنا أَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٥٦٨٠، وَمُسْلِم: ٢١٢٥، عَنِ ابْنِ عَباسٍ).

واتە: چارەسەر لە سێ شتاندا هەیە: لە کەڵەشاخ گرتن دا و، لە هەنگوینێك دا کە بخورێتەوەو، لە سووتاندن دا، بەڵام من ڕێگریی لە ئۆممەتم دەکەم کە سووتاندن بەکاربێنن.

بێگومان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەر ئەوانە هەبوون، بەڵام ئەمڕۆ عەمەلیات هەیە و، چەندان جۆرە چارەسەری دیکە هەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە پێی ئەوە کە لە ڕۆژگاری خۆیدا هەبووە، فەرموویەتی: چارەسەری پزیشکی لەو سێ شتانەدا هەیە، بەڵام سووتاندنی پێ باش نەبووە.

**٢)** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى رسول اللَّه ﷺ فَقَالَ: يا رَسُول اللَّه إِنَّ أَخِي استطْلَقَ بَطْنُهُ؟ فَقَالَ: (اسْقِهِ عَسَلاً)، فَسَقَاهُ عَسَلاً، ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: سَقَيْتُهُ عَسَلاً، فَمَا زادهُ إِلاَّ استطْلاَقًا، قَالَ: (اذهب فاسْقِهِ عَسَلاً). فَذهب فَسَقَاهُ، ثُمَّ جَاء فقال: فَمَا زَادهُ إِلاَّ استطْلاَقًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (صَدَقَ اللَّهُ، وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ اذهب فاسْقِهِ عَسَلاً)، فَسَقَاهُ فَبَرَأَ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٥٦٨٤، وَمُسْلِم: ٢٢١٧).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! برایەکم سکی دەچێ، (واتە: ڕەوانە)، فەرمووی: هەنگوینی بدەیە، هەنگوینی دایە و هاتەوە، گوتی: هەنگوینم دایە و، هەر زیاتر سکی دەچێ، فەرمووی: دووبارە بچۆ هەنگوینی بدەیە، چۆوە و دووبارە هەنگوینی دایە و هاتەوە و، گوتی: هەنگوینم دایە و، دووبارە زیاتر سکی دەچێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جاری سێیەم فەرمووی: خوا ڕاستی فەرمووە و زگی برایەکەت درۆ دەکات، بچۆ هەنگوینی بدەیە، بۆ جاری سێیەم دووبارە چوو هەنگوینی دایە، ئنجا چاك بوو).

پزیشەکەکان دەڵێن: هەندێك حاڵەتی سکچوون هەن، دیواری گەدە ماددەیەکی لینجی لێ دەئاڵێ، کە باش خواردن هەرس ناکات و، دەبێتە هۆی سکچوون و ڕەوانیی، ئنجا دیارە بۆ جاری یەکەم بە تەواویی گەدەی نەشۆردۆتەوە و، بۆ جاری دووەمیش تەواو نەبووە و، جاری سێیەم شۆردوویەتەوە، ئێستا دکتۆرەکانیش هەروا دەکەن، کە قۆناغ بەندیی دادەنێن بۆ چارەسەرەکان، مەرج نیە ئەو چارەسەرە بە یەك جار ببێتە هۆی چارەسەرکردن و لابردنی ئەو نەخۆشییە.

لە کۆتایی دا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە بەگشتی دەربارەی چارەسەر فەرموویەتی:

**{لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ، بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٢٢٠٤، عَنْ جَابِرٍ).**

واتە: هەموو دەردێك چارەسەری هەیە، هەر کاتێك ئەو چارەسەرە گەیشتە ئەو دەردە، دەردەکە لادەچێ، بە مۆڵەتی خوا.

کە بێگومان ئەوە هاندانی مسوڵمانانە و، هاندانی مرۆڤە کە لە بەرانبەر هیچ نەخۆشییەك و دەردێکدا، دەستە و ئەژنۆ دانەنیشن و، بزانن کە چارەسەر و دەرمانێکی هەیە، ئنجا هەرچەندە تاکو ئێستاش نەیاندۆزیوەتەوە، بزانن کە هەیە.

مەسەلەی پێنجەم:

**خـوا مرۆڤـەکانی دروسـت کـردوون، پاشـان دەیانمرێنـێ و، هەشـیانە دەگەڕێتـەوە بـۆ حاڵـەتی زۆرخراپـی تەمـەن (پیریـی کەنەفـت) کـە سـەرەنجام ئـەوەی زانیویـەتی لەبیـری دەچێتـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمۡۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡ لَا يَعۡلَمَ بَعۡدَ عِلۡمٖ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١- ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ ﴾، هەروەها خوا، وێڕای ئەو چاکە و نیعمەتانەی کە باسکران: ئێوەی وەدیهێناوە و، دروست کردوە.

بێگومـان ئەمـە بـۆ بیرهێنانەوەیـە، کـە ئێمـە لـە بیرمـان نەچێتـەوە کـە ئـەو نیعمەتانـە هەموویـان بـۆ ئێمـە دروسـت بـوون و، ئەگـەر ئێمـە بوونمـان نەبووایـە، ئـەو نیعمەتانـە بـە کەڵـك ئێمـە نەدەهاتـن و، لێیـان بەهرەمەنـد نەدەبوویـن، کەواتـە: لـە پێشـدا نیعمـەتی بـوون پـێ بەخشرانمـان، ئـەوە بناغـەی هەمـوو نیعمەتەکانـە، کـە خـوا ﷻ ئێمـەی هێناوەتـە بـوون.

٢- ﴿ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمۡۚ ﴾، دواییش (خوا) دەتانمرێنێ: (**يَتَوَفَّاكُمْ: يَقْبِضُكُم**) ڕووحەکانتان وەردەگرێ و، بە تەواویی لە جەستەتانیان جیادەکاتەوە، کە دیارە نیعمەتی بوون پێدران، گەورەترین نیعمەتە، ئنجا بە هەمان شێوە نیعمەتی مرێنرانیش، - وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد لە مانا گشتیەکەیدا - ئەویش هەر نیعمەتە، چونکە با مرۆڤ تەماشا بکات:

جـاری وایـە کەسـێك زۆر نەخـۆش دەبـێ و، بـە تەمـەن دادەچـێ، هـەم خەڵـك لێـی بێـزار دەبـێ، هـەم لـە خۆیـشی بێـزار دەبـێ، مرێـنران بـۆ بابـای وا نیعمەتێـکی زۆر گەورەیـە، زۆر کـەس هەیـە، کـە بـە دڵ داوای لـە خـوای کارزان کـردوە: بیمرێنـێ و، ڕووحـە ئەمانەتەکـەی لـێ وەربگرێتـەوە، وە بێئـەوەی ناشـوکورییش بـکات.

ئنجا ئەگەر بە گشتیش تەماشای مرۆڤ بکەین لەسەر زەوی: ئایا ئەگەر ئەو مرۆڤە وەك چینی بێستان، جیلێك نەڕۆیشتبن و، جیلێکی دیکە شوێنی نەگرتبایەوە و، هەموویان لەسەر یەك کەڵکە بوونایە، بێگومان حاڵەتێکی زۆر سەیر پەیدا دەبوو، کە تەحەممول ناکرێ! هەڵبەتە ئەگەر گریمان خوا ﷻ وای دانابایە، ئەو کاتە شوێنێکیشی هەڵدەبژارد کە جێی هەمووان ببێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەم سەرزەوییەی ئێمە، هەر ئەوەندە بەشەرانە هەڵدەگرێ، کە پەیدا دەبن، لە جیلێکدا و، لە دوایی دا جیلێکی دیکە دێن و، ئەو جیلەی پێشێ وردە وردە دەڕۆن، جا ئەگەر مرۆڤ تەماشا بکات: زۆر بە ڕوونیی دەبینێ کە دەستی خوا ﷻ لە کارەکاندا هەیە، چ لە مراندنی جیلی پێشێ تاکو جیلی تازە جێیان بگرنەوە، چ لە مەسەلەی ئەو هاوسەنگییەی لە نێوان نێرو مێ دا هەیە، هاوسەنگییەك کە لە پەیدابوونی کوڕان و کچان (نێر و مێ)دا هەیە، ئەویش خوا هاوسەنگییەکی زۆر وردی تێدانـاوەو، وانیە هەر کوڕ، یان تەنیا کچ لە دایك ببن، بەڵکو کوڕان و کچان بە هاوسەنگیی دێنە دنیاوە.

٣- ﴿ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ ﴾، هەشتانە دەگێڕدرێتەوە بۆ تەمەنێکی خراپ، پێشەوا (طبري) دەڵێ: واتە: (**وَمِنْكُم مَنْ يَهْرمُ فيَصيرُ إلى أَرْذَلِ العُمُرِ، وَهُوَ أَردؤه وَمِنْهُ: رَذَلَ الرَّجُلُ وَفَسَلَ**)[١]، واتە: هەتانە پیر دەبێ، تاکو دەگەڕێتەوە بۆ خراپترین تەمەن، وەك دەگوترێ: (**رَذَلَ الرَّجُلُ وَفَسَلَ**) واتە: ڕەزیل و، زەبوون و، کەنەفت بوو.

٤- ﴿ لِكَيۡ لَا يَعۡلَمَ بَعۡدَ عِلۡمٖ شَيۡـًٔاۚ ﴾، ئەم (ل)ە، (**لام العاقبة**)یە، وەك زانایان دەڵێن، واتە: سەرەنجام وای لێدێتەوە: هیچ نەزانێ دوای ئەوەی شتی زانیوە، هیچ نەزانێ و، شتەکانی لەبیر دەچنەوە، پێشەوا (**طبري**) دەڵێ: (**لِئَلاَّ يَعْلَمَ شَيْئاً بَعْدَ عِلْمٍ كانَ يَعْلَمُ فِي شَبابِهِ**)[٢]، واتە: تاکو ئەوەی لە کاتی گەنجییەتیی و تین و تاقەتدا، دەیزانی، لە کاتی پیر و کەنەفتییدا، هیچ نازانێ و هەمووی لەبیر دەچێتەوە، بەڵکو هەیە مێشکی فۆڕمات دەبێتەوە و، ناوی خێزانی و منداڵەکانیشی و، ناوی خۆشی لەبیر دەچێتەوە.

٥- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴾، بێگومان خوا زانای توانایە، واتە: خوا هیچی لە بیر ناچێ و، زانیارییەکەی ناگۆڕێ و، ئەوەی ڕابردوە و، ئەوەی دادێ هەمووی دەزانێ و، هەرگیز هیچ شتێکیش خوا دەستەوسان ناکات، (**الطبري**) ئاوای تەفسیر کردوە ڕەحمەت و ڕەزای خوای لێبێ.

---

(١) جامع البيان، ج ١٤، ص١٤٦.

(٢) ج ١٤، ص١٤٧.

## بەراوردێكی نێوان
## ئایەتی ( ٧٠)ی (النحل) و ( ٥)ی الحج

لە سوورەتی (النحل)، لە ئایەتی (٧٠)دا دەفەرموێ: ﴿ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ﴾، بەڵام لە سوورەتی (الحج)، لە ئایەتی (٥)دا دەفەرموێ: ﴿ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا ﴾، ئنجا ئایا ئەم (مِنْ)ە بۆچی لێرەدا زیاد كراوە و، هۆكارەكەی چییە ؟

(الخَطيب الإِسْكافِي) لە: (دُرَّةُ التنزيل، وَغُرَّة التأويل)دا[1]، دەڵێ:

(الفرق: ما ذكر في (النحل) إجمالٌ لِتَفصيل ما ذُكر في (الحج)، واتە: بۆیە ئەو (من)ە لە (بعد علم) لە سوورەتی (الحج)دا، زیادكراوە، چونكە ئەوەی لە سوورەتی (النحل)دا هاتوە، كورتەی ئەو درێژەیە كە لە سوورەتی (الحج)دا هاتوە.

هەڵبەتە قسەكەشی زۆر بەجێیە، با تەماشای ئایەتەكەی سوورەتی (الحج) بكەین، خوا وردەكاریی زۆری لەوێدا باس كردوە، بەڵام لێرە (النحل) بەس دەفەرموێ: ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ ﴾.

بەڵام با بزانین لە سوورەتی (الحج)دا، خوا چ وردەكارییەكی باسكردوە، دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا ﴾.

ئنجا دوایی (الخطيب الإسكافي)، دەڵێ: (فذكر تفصيل الأحوال ومبادئها، فقال: مِن كذا ومِن كذا الإبتداء ، كل حالٍ ينتقلُ مِنهُ إلى غيرِهِ... فَكَما حَدَّدَ أَوائِلَها بِ (مِنْ) كَذَلِكَ حَدَّدَ الحَالَ الأَخِيرةَ الْمُنْتَقِلَةَ عَمَّا قَبْلَهَا ب (مِنْ) فَقَالَ: (مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ)، شیكردنەوەیەكی چەند جوانە !!

---

(١) ص ١٩٠.

واتە: لە سووڕەتی (الحج)دا خوا ﷻ وردەكارییەكانی دروستبوونی مرۆڤ باس دەكات، كە من ڕاستە مانای ئایەتەكە بە كورتیی و بە پوختیی دەكەم:

واتە: ئەی خەڵكینە! ئەگەر لە دوو دڵییدان لە زیندووبونەوەدا، ئەوە ئێوەمان لە گڵ دروست كردوە، (بە نسبەت ئادەمەوە كە ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بووە)، ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾، {ئەمەش بەنسبەت وەچەكەیەوە}، دوایی لە تۆ و (ئاو)، دوایی لە خوێن پارە، پاشان لە پارچە گۆشتێك بە ئەندازەی زارجوویێك، ﴿مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾، كە شێوەی وەرگرتوە، یان شێوەی وەرنەگرتوە، تاكو بۆتان ڕوون بكەینەوە، {چۆن دروست دەبن !}، دوایی لە منداڵداندا ئەوەی بمانەوێ نیشتەجێی دەكەین و، جێگیری دەكەین، {هەشیانە دوایی لەبار دەچێ، دوای ئەوەی كە جێگیری دەكەین، ئەگەر خوا بیەوێ بیكاتە مرۆڤ} بە شێوەی منداڵ و كۆرپە دەتانهێنینە دەر، دوایی بۆ ئەوەی بگەنە قۆناغی تاقەت و تین و گەنجیەتیی و، هەشتانە دەمرێ و، هەشتانە دەگێڕدرێتەوە بۆ تەمەنێكی خراپ، {پیریی و كەنەفتیی}، تاكو لە دوای ئەوەی شتی زانیوە، هیچ نەزانێ.

(الإِسْكافِي) دەڵێ: (لێرەدا خوا) باسی وردەكاریی حاڵەتەكان و سەرەتاییەكان دەكات و، دەفەرموێ: لە فلان شت دروست بوون و لە سەرەتاوە بەو حاڵە و پاشان بەو حاڵە، ئنجا وەك چۆن سەرەتای حاڵەكانی بە {لە} (من) دەست پێكردوە: ﴿مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ﴾، بە هەمان شێوە، كۆتا حاڵیشی كە لەوانی پێشێ ی دەگوازێتەوە ئەویشی هەر بە (من) باسكردوە.

كە مرۆڤ دەبێتە پیرێكی كەنەفت، كە هیچ شتێك لەوەی لە ڕابردوودا زانیویەتی، لە بیری نامێنێ و مێشكی بە زاراوەی كۆمپیوتەریی (فۆرمات) دەبێتەوە.

لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتوە، لە خوا پاڕاوەتەوە كە خوا نەیگێڕێتەوە بۆ تەمەنی خراپ، كە تەمەنی پیریی و كەنەفتییە، {اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي: ٦٦٦٧، وَمُسْلِم: ٢٧٠٦، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ).

واتە: ئەی خوایە! پەنا دێنمە بەر تۆ لە تەنبەڵیی و، پەنا دێنمە بەر تۆ لە ترسنۆكیی و، پەنا دێنمە بەر تۆ لە پیریی (پیرییەكی خراپ و بێدەسەڵات) و، پەنا دێنمە بەر تۆ لە ڕژدیی و چرووكیی.

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ**} (**أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ: ٢٨٢٢، عَنْ أَبِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ** رضي الله عنه).

کە مەبەست لە (**أَرْذَلِ الْعُمُرِ**) حاڵەتی پیریی و کەنەفتییە، کە ئینسان ببێتە بار بەسەر خەڵکییەوە، لێی بێزار بن و، خۆشی لە خۆی بێزار بێ، هەرچەندە ژیان ئەوەندە خۆشەویستە، هی وا هەیە دەکەوێتە ئەو حاڵەتەش، دیسان هەر پێی خۆشە کە چوار ڕۆژ زیاتر بژی و، پەنا دەباتە بەر چەندان پزیشك و داودەرمان، لە حاڵێکدا کە تەواو بێتاقەتیش بووە! کە من پیری وام بینیوە: لە نەوەد (٩٠) ساڵ زیاتر بووە، کە چی زۆر گلەیی لە حاڵی خۆی کردوە، کاتێك پێم گوتوە هەر باشە تەمەنێکی باشت بەڕێ کردوە، گوتوویەتی: وەڵڵا تەمەنەکەم وانیە، بەڵام فلان نەخۆشییە وازم لێنایەنێ (نارەحەتی کردووم)، بەڵێ کە مرۆڤیش دەکەوێتە ئەو تەمەنەوە، تەمەنیش باجی خۆی هەیە و، مرۆڤ دەبێ باجی لەسەر بدات و، تاکو تەمەن زیاتر بێت، باجی زیاتری دەدەی.

**مەسەلەی شەشەم:**

**هەروەها خوای کارزان بژیوی زیاتری داوە بە هەندێك لە مرۆڤەكان، ئنجا ئەوانەی زیاتری پێداون، زێدەییەكە ناگێڕنەوە بۆ بەردەستەكانیان! تاكو تێیدا یەكسان بن، ئەدی چۆن ئەوەی بۆ خۆیانیان پێ شایستە نیە، بۆ خوایان پێ شایستەیە؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ ۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ ﴾، خوا هەندێكتانی لە بژیودا بەسەر هەندێكتاندا بەرز كردۆتەوە، واتە: بژیوی زیاتری داوە بە هەندێكتان لە چاو هەندێكتان، هەندێكتانی دەوڵەمەنتر كردوەو، توانای زیاتری كارو كەسابەت و ماڵ پێكەوەنانی پێداون.

٢- ﴿ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ ﴾ ئنجا ئەوانەی زێدەییان پێدراوە، گێڕەرەوەی ئەو بژیوە نین كە پێیان دراوە، بۆ ئەوانەی كە لەبەر دەستیانن.

ئنجا ئەوە مەبەست پێی كۆیلەكانە، یان بەردەست و خزمەتكارەكانیان، كە لەبەردەستی ئەواندا ئیش دەكەن، هەمووی دەگرێتەوە، واتە: كەسە دەوڵەمەندەكان ئیمكانیەتە زیادەكان، ناگێڕنەوە بۆ ئەو ژێر دەستانەیان كە لەوانیان زیاتر پێدراوە.

٣- ﴿ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ﴾، تاكو سەرەنجام هەموویان تێیدا یەكسان بن.

٤- ﴿ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾، ئایا نكوولّیی دەكەن لە چاكەی خوا ؟

**١) (القُرطُبي) دەڵێ: (وهَذَا مَثَلٌ ضَرَبَ اللَّهُ لِعبَدَةِ الأَصْنامِ: أَي إِذَا لَمْ يَكُنْ عَبِيدُكُمْ مَعَكُمْ سَوَاءً، فَكَيْفَ تَجْعَلُونَ عَبِيدِي مَعِيَ سَوَاءً؟)[1].**

واتە: ئەمە وێنەیەكە خوا هێناویەتەوە بۆ بتپەرستەكان، واتە: ئەگەر ئێوە كۆیلە و بەردەستەكان لەگەڵتاندا یەكسان نەبن، چۆن بەندەكانم لەگەڵم دا یەكسان دەكەن و دەیانهێننە ڕیزی من ؟!

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج ١٠، ص١١٦.

**٢)** (**مُحَمَّد الطَّاهِر بن عَاشُور**)[1]، لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (**الغَرَضُ مِنَ التَّمْثِيلِ: تَشْنِيعُ مَقَالَتِهِم، وَاستحَالَةُ صِدْقِهَا بحَسَبِ العُرْفِ، ثُمَّ زِيَادَةُ التشْنِيعِ بأَنَّهُمْ رَضَوْا لِلَّهِ، مَا لاَ يَرْضَونَ لأَنْفُسِهِم**).

واتە: مەبەست لەم وێنەیە ناقۆڵا پیشاندانی قسەکەیانە و، دەرخستنی ئەوەیە، کە مەحاڵە ئەو قسەیە ڕاست بێ، بەپێی عورف و باوی خۆیان، دواییش زیاتر ناشیرین خستنە بەرچاوی ئەوەیە، کە ئەوەی بۆ خوایان پێ پەسندە، بۆ خۆیان نایانەوێ، {بۆ خوایان پێ پەسندە کە هەندێك لە دروستکراوەکان بچنە ڕیزی خوا، بەڵام بۆ خۆیانیان پێ پەسند نیە، کە ئەوانەی لەبەردەستیانن وەك خۆیانیان تەماشا بکەن}.

ئەم ئایەتە، وەك ئایەتی ژمارە (٢٨)ە، لە سوورەتی (الروم)، کە لەوێ خوا ﷻ بە تەعبیرێکی دیکە هێناویەتی، دەفەرموێ:

﴿ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾﴾.

واتە: خوا وێنەیەکی لە خۆتان بۆ هێناونەوە، {واتە: بۆ ئیسپاتی ئەوە کە ناگونجێ هاوبەش بۆ خوا دابنرێ و، دروستکراوەکانی خوا وەك خوا تەماشا بکرێن و، مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ}، ئایا لەوانەی کە لەبەر دەستتانن (واتە: کۆیلەکانتان، یان بەردەستەکانتان)، هیچ هاوبەشتان هەن لەوەی کە پێماندا‌ون، ئێوە تێیدا یەکسان بن و، وەك چۆن مەترسییتان لە خۆتان هەیە مەترسییتان لەوانیش هەبێ؟ (واتە: وەك خۆتان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن)، ئاوا بەم شێوەیە ئایەتەکانمان بۆ کەسانێك کە بفامن، شی دەکەینەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**تَجْحَدون**) واتە: بە حاڵەتی (**خِطَاب**) و دواندنی ڕاستەوخۆ، نەك دواندنی نادیار، بۆیە وشەی: (**يَجْحَدُونَ: جَحَدَ نِعْمَةَ اللّٰه**)، واتە: نکووڵیی لە نیعمەتی خوا کرد، پێویستی بە پیتێکی دیکە ناکات، کە پیتی (ب)یە بۆ ئەوەی بەرکار (**مفعول**) پێ بخوازێ! {**عُدِّيَ (يَجْحَدون) بالباءِ لِتَضَمُّنِهِ مَعنى يَكْفُرون، وتكُونُ الباءُ لِتوكِيد تَعَلُّقِ الفِعْلِ بالمَفْعُولِ مِثْل:** ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ﴾}[2].

---

(١) التحرير والتنوير، ج ١٤، ص٢١٥.

(٢) التحرير والتنوير: لمحمد الطاهر بن عاشور، ج ١٤، ص (٢١٦-٢١٧).

واتـە: وشـەی (**يَجْحَـدون**) بـە (**ب**) بـەرکاری پێخـوازراوە، تاکـو مانـای (**يكفـرون**) بگرێتـە نێـو خـۆی، واتـە: سـپڵەیی و ناسوپاسـگوزاریی دەکـەن، هەروەهـا وێـڕای ئـەوە: (**ب**)یەکـەش بـۆ جەختکردنـەوەی پەیوەسـتبوونی کردارەکەشـە، بـە بەرکارەکـەوە، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ﴾، دەیتوانـی بفەرمـوێ: (**وَامْسَـحُوا رُءُوسَـكُم**)، واتـە: دەسـتی تـەڕ بەسـەری خۆتانـدا بێنـن، بـەڵام بـۆ تەئکیدکردنـەوەو جەختکردنـەوەی مانـای: {دەسـتی تـەڕ بـە سـەری خۆتانـدا بێنـن}، (**ب**) زیادکـردوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أَفَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ﴾، ئەو (**ف**)ە کە چۆتە سەری:

**أ)** دەگونجێ پەیوەست بێ بە ڕستەی: ﴿وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلرِّزۡقِ﴾، واتە: کە خوا زێدەیی ڕزق و بژیوی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکتاندا، کەچی لە بەرانبەر ئەوەشدا نکوولیی دەکەن لە چاکەی خوا.

**ب)** دەشگونجێ پەیوەست بێتەوە بە ڕستەی: ﴿فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّي رِزۡقِهِمۡ﴾، واتە: ئەوانەی کە زیادەیان پێدراوە، گێڕەرەوەی بژیوەکەیان نین بۆ لای ئەوانەی بەردەستیان، کەواتە: ئەگەر خۆتان ئەوە ناکەن، ئەدی چۆن دروستکراوەکانی خوا دێننە ئاستی خوا، کە خۆتان ڕازی نین بەشێك لە بژیوەکەتان بگێڕنەوە بۆ ئەوانی دیکە، ئەدی چۆن نیعمەتەکانی خوا دەگێڕنەوە بۆ دروستکراوەکانی خوا ؟!.

## مەسەلەی حەوتەم:

**هەروەهـا خـوای بەخشـەر، لـە خۆتـان هاوسـەران و لـە هاوسـەرەکانتان کـوڕان و نـەوەکانی پێداون و، لـە بژیـوە خـۆش و سوودبەخشـەکانی پێداون، ئـەدی چـۆن بـڕوا بـە باطیڵ دێنـن و سـپڵەیی بەرانبـەر بـە چاکـەکانی خـوا دەکـەن؟ :**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شه ش بڕگەدا:

١- ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، هەروەها خوا لە خۆتان هاوسەرانی بۆ ڕەخساندوون، ئەم مەسەلەیە وەك خوا **عزّ و جلّ** لە سووڕەتی (**الروم**)دا، وردتر باسی دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتـە: هەروەهـا لـە نیشـانەكانی خـوا ئەوەیـە كـە لـە خۆتـان هاوسـەرانی بـۆ گێـڕاون و ڕەخسـاندوون، تاكـو بەهـۆی ئـەو هاوسـەرانەوە ئۆخژنتـان بـۆ بـێ و، هۆگـری یەكـدی بـن و، خۆشەویسـتیی و بەزەیـی لـە نێوانتانـدا دانـاوە، بێگومـان لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ كەسـانێك بیـر بكەنـەوە.

بـەڵام لێـرەدا خـوا هـەر بـە كورتیـی دەفەرمـوێ: خـوا لـە خۆتـان هاوسـەری بـۆ گێـڕاون، ئنجـا لێـرەدا ئەگـەر دوێنراوەكـە پیـاوان بـوون، واتـە: ئـەی پیـاوەكان! خـوا لـە خۆتـان ئافرەتـانی بـۆ ڕەخسـاندوون كـە ببنـە هاوسـەرتان، بـەڵام ئەگـەر دوێـنراوەكان ئافرەتـان بـن، واتـە: ئـەی ئافرەتـەكان! خـوا پیـاوانی بـۆ ڕەخسـاندوون كـە ببنـە هاوسـەرتان.

لێـرەدا هەنـدێ لـە زانایـان بـە تایبـەتی (**القرطبـي**) كـە زۆر وردبۆتـەوە لـە ئایەتـەكان، كـە ئایـا چ حوكـم و یاسـایەكی شـەرعییان لـێ وەردەگیـرێ ؟

منیـش جارجـار هەنـدێ شـت كـە بـە پێویسـتی بزانـم، لێـی وەردەگـرم، لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا كـە دەفەرمـوێ: خـوا لـە خۆتـان هاوسـەری بـۆ پەیـدا كـردوون، بـاسی ئـەوەی

کردوە کە ئایا: لە ماڵەوە، ژن و مێرد چۆن مامەڵە بکەن و، چۆن خزمەتی یەکدی بکەن؟ لەوبارەوە دەڵێ:

(وَلِهَذَا قَالَ عُلَمَاؤُنا: عَلَيْهَا أَنْ تَفْرِشَ الفِرَاشَ، وَتَطْبَخَ القِدْرَ، وَتَقُمَّ الدَّارَ، بِحَسَبِ حَالِهَا، وَعَادَةِ مِثْلِهَا).

واتە: زانایانمان لە ڕوانگەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە گوتوویانە:

ئافرەت (ژن) پێویستە لە ماڵەوە جێگاو ڕێگا ڕابخات، هەروەها نان و چێشت ساز بکات و، ماڵ خاوێن بکاتەوە و گەسکی لێبدات، بە پێی حاڵ و عادەت و داب و نەریتی وێنەی ئەو.

هەروەها دوایی دەڵێ: (وَيَخدم الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ فِيمَا خَفَّ مِنَ الخِدْمَةِ وَيُعِينُهَا)، واتە: هەروەها پیاویش خزمەتی ژنەکەی خۆی دەکات، ئەو خزمەتەی کە بۆی گونجاو بێ و، لە توانایدا بێ و، هاوکاری دەبێ.

ئنجا لەوبارەوە ئەم سێ فەرموودەیە دێنین:

یەکەم: {عَنْ عَائِشَة، قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلَائِدَ بُدْنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِيَدَيَّ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٣٦٩٦، وَمُسْلِمٌ: ١٣٢١).

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: ڕێشمە و گەردنبەندەکانی حوشترەکانی پێغەمبەر ﷺ کە لە ملیان دەکرێن، بە دەستی خۆم چنیومن و ڕستوومن.

چونکە (فَتْل) هەم بە مانای ڕستنی مو و خوریی دێ و، هەم بە مانای چنینیش دێ.

دووەم: {عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، سَأَلْتُ عَائِشَة: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْنَعُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَة أَهْلِهِ، فَإِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ خَرَجَ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٦٧٦).

واتە: ئەسوەدی کوڕی یەزید، دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ کرد: ئایا پێغەمبەر ﷺ لە نێو ماڵ و منداڵ دا چی دەکرد؟ گوتی: خزمەتی ماڵ و خێزانی خۆی دەکرد {ئەگەر کارێك هەبووایە ئەنجامی دەدا و بۆی دەکردن} و، کاتێ گوێی لە بانگ دەبوو، دەچووە دەرەوە{ و نوێژەکەی دەکرد}.

سێیەم: {عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ عَائِشَة، هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْمَلُ فِي بَيْتِهِ شَيْئاً؟ قَالَتْ: نَعَمْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْصِفُ نَعْلَهُ، وَيَخِيطُ ثَوْبَهُ، وَيَعْمَلُ فِي بَيْتِهِ، كَمَا يَعْمَلُ أَحَدُكُمْ فِي بَيْتِهِ}

(أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٥٣٨٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَلَهُ إِسْنادَانِ: الأَوَّل إِسْناد صَحِيح رجاله ثقات رجال الشيخين).

واتـە: هیشـامی کـوڕی عـوڕوە دەڵـێ: پیاوێـك پرسـیاری لـە عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ کـرد: ئایـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە نێومالّـی خـۆی دا هیـچ ئیشـێکی دەکـرد؟ گـوتی: بەڵـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ماڵـەوەدا: پێـڵاوی خـۆی دەدووریـەوە و پینـەی دەکـردو، بەرگـی خۆیشـی دەدووریـەوەو، ئیشـوکاری ماڵـی ئەنجـام دەدا، وەك چـۆن یەكێـك لـە ئێوە ئیشـوکاری ماڵـەوەی خـۆی ئەنجـام دەدات.

٢- ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ ﴾، واتە: هەروەها لە هاوسەرەکانیشتان کوڕان و نەوەکانی بۆ پەیدا کردوون.

٣- ﴿ وَحَفَدَةً ﴾، وشەی (**حَفَدَة: جمع حَافِد، وَالحَافِد أَصْلُهُ: الْمُسْرِعُ فِي الخِدْمَةِ، وَأُطْلِقَ عَلَى ابْنِ الإِبن لِهَذَا...**)، وشەی (**حَافِد**) کە کۆیەکەی (**حَفَدَة**)یە، کەسێکە خێرایی دەکات لە خزمەتداو، بۆیە بە (نەوە) {کچ یان بە کوڕی کوڕ} گوتراوە (**حَافِد**)، لەبەرئەوەی لەش سووکەو تازە دەگاتێ، خزمەتی نەنك و باپیر و دەوروبەری دەکات، واتە: خوا هەم کوڕانی پێداون، هەم نەوەکانیشی پێداون.

٤- ﴿ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾، هەروەها لە بژیوە خوش و بە تام و بەسوودەکانیش ڕزقی ئێوەی داوە، (**الطَّيِّبات: صِفَةٌ لِمَوصُوفٍ مَحْذُوفٍ: أَي رَزَقَكُمْ مِنَ الأَرْزَاقِ الطَّيِّبات**)، واتە: لە بژیوە خۆش و بەتام و چاکەکان، بەشی ئێوەی داوە.

٥- ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾، ئایا بڕوا بە باطیڵ دەکەن؟ واتە: بێ ئەمەگ و ناسپاس دەبن بەرانبەر بە چاکەی خوا؟ (**الباطِلُ: ضِدُّ الحَقِّ، لأَنَّ مَا لا يَحِقُّ لاَ يُعَدُّ بحَقٍّ**)، (**باطِل**)، واتە: شتی پووچ و بێ بنەما، پێچەوانەی هەقە، هەق یانی: چەسپاو، ئەوەش کە نە چەسپێ، بە هەق لە قەڵەم نادرێ.

٦- ﴿ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴾، بەرانبەر بە چاکەی خواش، ئەوان سپڵەو ناسپاس دەبن؟ لێرەدا مەبەست لە: (**كُفْر**) (**كُفْرَان**)ە، سپڵەیی و ناسپاسیی، نەك بێبڕوایی (**كفر**)، ئنجا ئەمە وەك ئایەتی ژمارە: (٦٧)ی سووڕەتی (**العنكبوت**)ە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾ واتە: ئایا سەرنجیان نەداوە! ئێمە حەرەمێکی هێمن و پڕ ئاساییشمان بۆ ڕەخساندوون (کە مەبەست پێی مەککەیە) و، خەڵك لە دەوریان دەڕفێنرێن، ئنجا ئایا بڕوا بە باطیڵ دەکەن و، بەرانبەر بە چاکەی خوا نا سوپاسن ؟!

(الخَطِيبُ الإِسْكَافِي)، دەڵێ: ئایا بۆچی لە سووڕەتی (**النحل**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾، بەڵام لە سووڕەتی (**العنكبوت**)دا، تەنیا دەفەرموێ: ﴿ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، ئەو (هُمْ)ە، کە پێی دەگوترێ: ڕاناوی جیاکردنەوە (ضمير الفصل)، بۆچی لە سووڕەتی (**النحل**)دا زیاد کراوە؟

وەڵامەکەی جوان دێنێ و دەڵێ:

(إِنَّ الكَلاَمَ فِي سُورَةِ النحْلِ قَدْ نُقِلَ عَنِ الخِطَابِ الَّذِي يصلُحُ لِغَيْرِ الكُفَّارِ إِلى الإِخْبارِ عَنْهُمْ، وَهُوَ قَوْلُهُ: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾، ثُمَّ انْتَقَلَ الكَلاَم عَنِ الخِطَاب العَام إِلى الإِخْبار الخَاص، فَقَالَ: ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾:٧٢، فَأَكَّد الكَلاَم بقَوْله: (هُم) لِئَلاَّ يُتَوَهَّم أَنَّ هَذَا الإِخْبارَ خِطَابٌ، وَهُوَ بالتاء دُونَ الياء، إِذْ لاَ فَرْقَ فِي الخَطِّ بَيْنَهُمَا، وَلَمْ يَكُن كَذَلِكَ الأَمْرُ فِي سُورَةِ العَنْكَبُوت، لأنَّ الإِخْبارَ المُستمِرّ فِي الآيَة الَّتِي قَبْلَ هَذِهِ، أَغْنَى عَمَّا يَحْصِرُهُ للخَبَرَ دُون غَيْرِه، وَهُوَ قولُهُ: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾العنكبوت)[1].

واتە: لە سووڕەتی (**النحل**)دا، خوا ﷻ قسەکەی گواستۆتەوە لە دواندنێك، کە بۆ غەیری کافرەکانیش دەگونجێ، گواستوویەتەوە بۆ هەواڵ لەبارەوە دانیان، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾، ئەمە شێوەی دواندنە، دوایی لە دواندنی گشتییەوە گواستوویەتەوە بۆ هەواڵ پێدان، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾، بۆیە پێویستی بە ڕاناوی (**هُم**) کردوە، بۆ ئەوەی وا نەزانرێ کە ئەم هەواڵ پێدانەش، بریتیە لە دواندن و، لە جیاتی ئەوەی ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾، وابزانێ کە (**تُؤمِنون**)ە، چونکە لە خەتی (**مصحف**) دا، کە نووسراوە، وەك یەك دەنووسرێ و، دوایی سەرو بۆری بۆ کراوە: (**يُؤْمِنُونَ و تُؤْمِنُونَ**)، لێك جیاکراونەوە، بەڵام لە سووڕەتی (**العنكبوت**)دا، چونکە هەواڵ پێدانەکە بەردەوامە لە پێش ئەم ئایەتەدا، کە بریتیە لە هەواڵدان لەبارەوەدان، دەربارەی کافرەکان، بۆیە پێویستی نەکردوە کە ڕاناوی (**هُم**) بەکاربهێنرێ، تاکو بزانرێ ئەوە هەواڵ پێدانە،

---

(١) درة التنزيل وغرة التأويل، ص ١٩١.

نـەك دوانـدنی ڕاسـتەوخۆ، چونكـە ئایەتەكـەی سـووڕەتی (**العنكبـوت**) دەفەرمـویٚ: كاتـێ كـە سـواری كەشـتیی دەبـن، بـە دڵسـۆزیی لـە خـوا دەپاڕێنـەوەو ملكەچیـی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغ دەكەنـەوە، بـەڵام كاتێـك كـە دەربازیـان دەكات بـۆ وشـكانیی، هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن، بـا سـپڵەیی بكـەن بەرانبـەر بـەوەی كـە پێـمان داون و، بـا ڕابوێـرن، لەمـەودوا دەزانـن! ئایـا سـەرنجیان نـەداوە كـە ئێمـە حەڕەمێـكی هێمـن و ئارامـمان بـۆ ڕەخسـاندوون و، خەڵـك لـە دەوری وان دەڕفێـنرێ، ئایـا بـڕوا بـە **باطـلَ** دەكـەن و، بەرانبـەر بـە چاكـەی خـوا سـپڵەن ؟!

واتـە: لێـرەدا ڕوونـە كـە هەمـووی: هەواڵدانـە دەربـارەی كافـرەكان، بـەڵام لـە سـووڕەتی (**النحـل**)دا بـۆ ئـەوەی دیـار بـێ: كـە ئـەوەش هـەر هـەواڵ پێدانـە، نـەك دوانـدن، بۆیـە بـەو ڕانـاوەی (**هُـم**)، ئـەو ئەگـەرەی كـە دواندنـە، لابـراوە.

**مەسەلەی هەشتەم:**

**ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن، هیچ شتێکیان لە ڕۆزیی لە ئاسمانەکان و زەوی بە دەست نیە و، تواناشیان نیە، وەدەستی بێنن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها (کافرەکان) جگە لە خوا، لە جیاتی خوا، شتانێك دەپەرستن.

٢- ﴿ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا ﴾، کە هیچ جۆرە بژیویێکیان بە دەست نیە، نە لە ئاسمانەکان و، نە لە زەوی دا.

ئەم وشەی (شَيْـًٔا)ە، بۆ جەختکردنەوەیە، کە هیچ جۆرە ئەندازەیەك، یان بەشێك لە بژیویان بەدەست نیە.

ئاشکرایە کە دەفەرموێ: بژیویان بە دەست نیە، یانی: ناتوانن بیدەن و، وشەی (**مِن**) لە: ﴿ مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بۆ دەست پێکردنە (**مِن إبتدائية**) بۆ ڕۆزییەکە، کە لە ئاسمان و زەوییەوە دێ.

وشەی (شَيْـًٔا) بۆ زێدەڕۆییە لەوەدا کە لابراوە، واتە: تەنانەت شتێکی کەمیشیان لە بژیو بەدەست نیە.

٣- ﴿ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴾، واتە: سەرەڕای ئەوەش کە بەدەستیان نیە، ناتوانن وەدەستیشی بێنن، واتە: نە لە ڕابردوودا توانیوویانەو، نە ئێستاش لە ژێر دەستیان دایە و، نە لە داهاتووشدا دەتوانن وەدەستی بێنن، کەواتە: ئێوە چۆن شتانێك دەپەرستن، کە نە ئێستادا هیچیان بە دەستە و، نە لە داهاتووشدا، ئەگەری هەیە، هیچیان بکەوێتە دەست، بژیوتان بدەن؟ پەرستراو دەبێ ئەوانەی کە دەیپەرستن، بیانژیەنێ و، سەرپەرشتییان بکات و، بەهرەمەندیان بکات.

**مەسەلەی نۆیەم:**

**خـوا دەفەرمـوێ: وێنـان بـۆ خـوا مەهێننـەوە، چونکـە بێگومـان خـوا دەزانـێ و ئێـوە نازانـن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٧٤ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١- ﴿ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ ﴾، وێنان بۆ خوا مەهێننەوە، (**الأَمْثَال: جَمْعُ مَثَل، أَي: الْمُمَاثِل، وَهُوَ الشَّبَه وَالْمُشَابِه**)، (**أَمثال**) لێرەدا کۆی (**مَثَل**)ە، کە بە مانای: وێنە (**مُمَاثِل**) و (**شَبَه، مُشَابِه**) دێ، کە ئەوانیش هەمان واتایان هەیە، واتە: شتێك بە شتێك دەچێ و، لە ئاستی دایە.

ئنجا ئەمە دوو واتای هەن:

أ) خوا دەفەرموێ: وێنان بۆ خوا مەهێننەوە، واتە: ئەو شتانەی دیکە وەك خوا مامەڵەیان لەگەڵدا مەکەن و، تەماشایان مەکەن.

ب) دەشگونجێ کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴾، مەبەست ئەوە بێ، کە: ئەو پەرستراوانەتان بە خوا مەچوێنن، (**ضَرْبُ الْمَثَل: إِستعْمَالُهُ فِي تَشْبيه حَالَةٍ بِحَالَةٍ: وهَيْئَةٍ بِهَيْئَةٍ، وَمَنْ يُشْرِكُ باللّهِ شَيْئاً، يُثْبِتُ لَهُ مِنَ الأَوْصَافِ مَا لِلّه تَعَالَى: وَيُشَبِّهُهُ باللّهِ تَعَالَى**).

واتـە: وشـەی: (**ضَرْبُ الْمَثَـل**) وێنـە هێنانـەوە و پەنـد هێنانـەوە، بەکارهێنـانی لـەوەدا بـاوە، کـە حاڵەتێـك وەك حاڵەتێـکی دیکـە، یـان شـێوەیەك وەك شـێوەیەکی دیکـە، تەماشـا بکـرێ، کەسـێکیش کـە شـتێك دەکاتـە هاوبەشـی خـوا، هەندێـك سـیفەتانی بـۆ دەچەسـپێنێ، کـە هـی خـوان و، ئـەو شـتە کـە دەیکاتـە هاوبـەشی خـوا، دەیشـوبهێنێتە خـوا و، بـە خـوای پـەروەردگاری دەچوێنـێ.

ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴾، (**القُرطُبـي**) دەڵـێ: (**أَي: لاَ تَشَـبِّهوا بِـهِ هَـذِهِ الجَـمَادَات لأَنَّـهُ وَاحِـدٌ، قَـادِرٌ، لاَ مِثـلَ لَـهُ**)[1]، واتـە: ئـەو بـێ ژیـان و پەرسـتراوانە، بـە خـوا مەچوێنـن، چونکـە خـوا تاکـەو توانایـە و وێنـەی نیـە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج ١٠، ص ١١٩.

٢- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا بە ڕەهایی هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام ئێوە بە ڕەهایی هیچ شتێك نازانن، خوا هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام ئێوە هیچ نازانن، لە چاو خوا ﷻ، کەواتە: سواری سەری خۆتان مەبن و، بە نەزانیی قسە مەکەن و، بە نەزانیی شت مەڵێن، بەڵکو خوا کە بەدیهێنەر و پەروەردگاری هەموو شتێکە و، هەموو شتێك دەزانێ، گوێی لێبگرن و، لێی وەربگرن تاکو ئەو پێتان بڵێ: دەبێ چی بپەرستن و چی بکەن و چۆن بکەن ؟!

## مەسەلەی دەیەم:

**خوا وێنەی بە بابایەكی كۆیلەی خاوەندار، كە هیچی لە دەست نایەت و، بابایەكی ئازادی ساماندار، كە بە پەنهان و ئاشكرا، ماڵەكەی دەبەخشێ، هێناوەتەوە كە بێگومان یەكسان نین:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا﴾، خوا وێنەیەكی هێناوەتەوە.

بێگومان وێنەكەی بۆ ئەوە هێناوەتەوە كە: هاوبەش دانان بۆ خوا، زۆر ناقوڵا و دزێو و ناشیرین بخاتە بەرچاو و، نەفامیی و كەودەنیی، هاوبەش دانەرانیش زۆر جوان وێنا بكات، ئنجا ئایا ئەو وێنەیەی هێناویەتەوە چییە ؟

٢- ﴿عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾، ئەمە جیدار (**بدل**)ە بۆ (**مَثَل**)، یاخود ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا﴾، (ضَرَبَ) مانای (**جَعَلِ**)ەی خراوەتە نێو، كە ئەو كاتەش: (عَبْدًا) (**مفعول**)ی یەكەمەو، دواخراوە و (مَثَلًا) (**مفعول**)ی دووەمە و پێشخراوە، بە هەر حاڵ خوا وێنەیەكی هێناوەتەوە بە كۆیلەیەك (عَبْدًا مَّمْلُوكًا) كۆیلەیەكی خاوەندار (لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ) هیچ توانایەكی نیە، (**شَبَّهَ حَالَ أَصْنامِهِم فِي العَجْزِ عَنْ رِزْقِهِم ، بِحَالِ مَمْلُوكٍ**)، خوا وێنەی بتەكان و پەرستراوەكانی ئەوان لە دەستە پاچەیی دا، كە ناتوانن بژیویان بدەن، چواندوویەتی و تەشبیهی كردوە بە حاڵی كۆیلەیەكی خاوەندار.

ئنجا كۆیلە هەر خاوەندارە، بەڵام خوای كاربەجێ بۆ زیاتر جەختكردنەوە دەفەرموێ: (عَبْدًا مَّمْلُوكًا) كۆیلەیەكی خاوەندار، چونكە جاری واش هەیە كۆیلەیەك ڕای كردوە لە خاوەنەكەی و، لەبەردەستی نیە.

یـان ئەمـە وەك ئەوەیـە کـە لـە شـوێنێکی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿... تِلۡكَ عَشَرَةٞ كَامِلَةٞۗ ... ١٩٦﴾ البقـرة، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿... لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ... ٥١﴾ النحـل، (إِلَٰهَيۡنِ) هـەر دووانـە، بـەڵام (ٱثۡنَيۡنِ) بـۆ جەختکردنەوەیـە حاڵـەتی دووانەیەتیـی.

ئنجـا خـوا وێنـەی هێناوەتـەوە بـە کۆیلەیـەکی خاوەنـدار، کـە هیـچ توانایـەکی بەسـەر هیـچ شـتێك نیـە.

٣- ﴿وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا﴾، هەروەها وێنەی هێناوەتەوە: بە کەسێکیش کە لەلای خۆمانەوە بژیوێکی باشمان پێداوە.

٤- ﴿فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرّٗا وَجَهۡرًاۖ﴾، ئنجا ئەو کەسە ساماندارە: بە پەنهانیی و بە ئاشکرا، لێی دەبەخشێ، واتە: لە هەموو حاڵاندا تەصەڕڕوف لەو ماڵەی خۆی دا دەکات.

٥- ﴿هَلۡ يَسۡتَوُۥنَۚ﴾، ئایا یەکسانن ؟! کەسێك کۆیلەیەکی خاوەندارەو، هیچ توانایەکی نیەو، کەسێك کە بژیوێکی باشمان پێداوە و، بە هەموو حاڵان، بە پەنهان و بە ئاشکرا، لێی دەبەخشێ، وەك یەکن ؟!

٦- ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ﴾، ستایش بۆ خوا، واتە: خوا خاوەنی هەموو چاکیی و پاکیی و بەزرییەکە.

٧- ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵکو زۆربەیان نازانن:

أ- بۆیە دەفەرموێ: زۆربەیان (أَكۡثَرُهُمۡ) چونکە هەیانبووە هەقی زانیوە، بەڵام دانی پێدا نەهێناوەو، نکووڵیی لێکردوە، مەبەست پێی ئەوەیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ﴾، جێی ڕامانە کە: خوا ﷻ لە قورئانی خۆیدا کەم وایە حاڵەتی گشتاندنی بەکارهێنا بێ، مەگەر چۆن، دەنا هەڵاواردنی تێدا کردوە.

ب- یان لەبەر ئەوە بووە فەرموویەتی: ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، چونکە هەندێکیان لە داهاتوودا مسوڵمان دەبن و، خوا ﷻ نەیویستوە بە نەزان باسیان بکات، چونکە ئەوانەیان کە لە دواییدا کە مسوڵمان دەبن، زانیارییان پەیدا دەبێ، بەهۆی ئیمانەوە، ئنجا خوا ﷻ ئەوانی هەڵاواردوە، چونکە ئەوان لەو کەمینەیەن کە مسوڵمان دەبن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا﴾، حاڵـی خـوا ﷻ چوێـنراوە بـە حاڵـی دەوڵەمەندێـکی خۆشـگوزەران و بـە توانـا، کـە بـەو شـێوەیە بژیـو و یارمەتییـان دەدات، کـە دەوڵەمەندێـك بـە دڵـی خـۆی، بـە پەنهـان و بـە ئاشـکرا، ماڵەکـەی خـۆی دەبەخشـێ، مەبەسـت

لەم وێنە هێنانەوەش: دەرخستنی پووچیی شیرك و حەقانیەتی خوا بە یەكگرتنە، كە هیچ كامیان گومانی تێدانیە.

بەڵام ئایا مەبەست لێرەدا بەراورد (**مقارنة**) كردنە لە نێوان مرۆڤی بڕوادار كە ئەهلی خوا بە یەكگرتنە، لەگەڵ مرۆڤی بێبڕوای هاوبەش بۆ خوا بڕیاردەردا، كە ئەهلی شیركە؟ یاخود مەبەست بەراوردە لە نێوان پەرستراوەكانی ئەوان و، خوای پەروەردگاردا؟ هەردوو ڕایەكان زانایان قسەیان لەسەر كردوون، كە دواتر تیشكی زیاتری دەخەینە سەر.

**مەسەلەی یازدەیەم:**

**خوا وێنەی دوو پیاوان دێنێتەوە: کە یەکێکیان: لات و دەستە پاچەیە و، بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە و، هیچی لەدەست نایەت، ئەوی دیکەش: خۆشی لەسەر ڕێیەکی ڕاستە و فەرمانیش بە دادگەریی دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ﴾، هەروەها خوا وێنەیەکی دیکەشی هێناوەتەوە، هەر بۆ دەرخستنی حاڵی هاوبەش بۆ خوا دانەران، کە لە چ حاڵێکی خراپ و نزم و، پەست و، نامەنتیقیی دان، هەروەها حاڵی خوا بەیەکگران، کە لە چ حاڵەتێکی سەربەرزانەو مەنتیقیی و ئاسایی و، سروشتیی دان.

٢- ﴿ رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴾، خوا عزوجل دوو پیاوی بە نموونە هێناونەوە، کە یەکێکیان لاڵەو توانای بەسەر هیچ شتێکدا نیە.

٣- ﴿ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ ﴾، هەروەها باریشە بەسەر سەرپەرشتیارەکەیەوە.

٤- ﴿ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ﴾، بۆ هەر شوێنێك بینێرێ، هیچ چاکەیەکی لە دەست نایەت، (أَبْكَم)، واتە: (أَخْرَس) لاڵ، کەسێك کە حاڵەتی (بُكْم)ی هەیە، بەڵام لە زگماکەوە، (الكَلُّ: العِيالُ، وَالجَمْعُ الكُلُولُ كَلَّ السِّكِّينُ كَلاًّ: غَلَظَتْ شَفْرَتُهُ فَلَمْ يَقْطَع)، (كَلّ) واتە: بار بەسەر کەسێکەوەو، کۆیەکەی (كُلُول)ە، دەگوترێ: (كَلَّ السِّكِينُ)، چەقۆیەکە، تیغەکە کول بوو، واتە: دەمەکەی تیژ نەماوە و نابڕێ.

بەڵێ (كَلّ) واتە: کەسێك کە بارە بەسەر خەڵکەوە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ كَلاًّ فَإِلَيْنَا} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٢٢٦٨، وَمُسْلِمٌ: ٤٢٤٦، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه).

واتە: هەر کەس و ماڵ و سامانێکی جێهێشت دوای خۆی، ئەوە بۆ میراگرەکانیەتی و، کەسێکیش کە ماڵ و منداڵی بەجێهێشتوە، کە بارن، بۆ بەڕێوەبردن و ژیان و گوزەران، ئەوە عایدی ئێمەیە.

ئەصڵی وشەی (كَلّ) لە (ثِقَل)ەوە هاتوە، واتە: قورس، لەبەرئەوەی دەبێتە بار بەسەر غەیری خۆیەوە.

وشەی (مَوْلى): (الَّذِي يَلِي أَمْرَ غَيْرِهِ)، ئەو کەسەی کاروباری غەیری خۆی بەڕێوە دەبات، کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ﴾، (أَي: هُوَ عَالَةٌ عَلَى كافِلِهِ لا يُدَبِّرُ أَمْرَ نَفْسِهِ)، بارە بەسەر سەرپەرشتیارەکەیەوە، کاری خۆی بۆ بەڕێوەناچێ و، بۆ هەموو شتێك چاوی لە دەستی ئەوە.

٥- ﴿أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ﴾، بۆ هەر شوێنێك بینێرێ و، هەر کارێکی پێ بسپێرێ، هیچ چاکەی لەدەست نایەت و هیچی باشی لێ هەڵناوەرێ، چونکە لاڵە و، هیچیشی لە دەست نایەت.

ئەمە خوێندراویشەتەوە: (أَيْنَمَا يُوَجَّهُ)، واتە: بۆ هەر کوێیەك بنێررێ، ئەم دوو خوێندنەوەی هەن.

ئنجا بێگومان کەسێ لە قسە تێ نەگات و، نەتوانێ خەڵك تێ بگەیەنێ، هیچ خێرێکی پێوە نیەو، لە حاڵێك دا بنێردرێ بۆ ئەملاولا، مادام نەتوانێ خەڵك تێ بگەیەنێ و، مانای وایە هیچ لێك تێگەیشتنێکی بۆ پەیدا نابێ و، ناتوانێ هیچ پەیامێك بگەیەنێ و، یاخود قسەو پەیامێك بهێنێتەوە.

٦- ﴿هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ﴾، ئایا ئەوەی کە حاڵی وایە یەکسانە.

٧- ﴿وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ﴾، لەگەڵ کەسێك دا کە فەرمان دەکات بە دادگەریی.

٨- ﴿وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾، هەروەها لەسەر ڕێیەکی ڕاستیشە؟ لەبەر ئەوەی: کە فەرمانکردن بە دادگەریی، لە بەرزترین جۆری قسەکردنەو، ڕۆیشتنیش لەسەر ڕێیەکی ڕاست، لە بەرزترین جۆری توانا و هەڵسوکەوتکردنە، واتە: کەسێك کە باشترین جۆری قسەکردنی هەیە، کە فەرمانکردنە بە دادگەریی و، باشترین جۆری هەڵسوکەوتکردنیشی هەیە، کە بریتیە لەسەر ڕێی ڕاست بوون، ئایا یەکسانە لەگەڵ کەسێکی لاڵی دەستە پاچەی بێخێری، بار بەسەر خەڵکەوە؟ بێگومان نەخێر.

ئەم تەعبیرەی دوایی لە تەفسیری: (**أَوْلَى مَا قِيْلَ فِي آياتِ التنزيل**)[١]ەوە، هێناومە.

ئنجا (**القُرْطُبِي**) دەڵێ: (**هَـذَا مَثَل آخـر، ضَرَبَـهُ اللَّـهُ تَعَـالَى لِنَفْسِـهِ وَلِلْوَثَـن**)[٢]، واتـە: ئەمـە وێنەیەکـە خـوا بـۆ خـۆی و، بـۆ ئـەو بـت و صەنەمـەی دەپەرسـترێ، هێناویەتـەوە.

(**الطبري**) دەڵـێ: (**يَقُـولُ تَعَـالَى ذِكـرهُ: وَشَـبَّهَ لَكُـمْ شَـبَهَاً أَيُّهَـا النـاس! لِلْكافِـرِ مِـنْ عَبِيـدِهِ، وَالمُؤْمِـنِ بِـهِ مِنْهُـمْ**)[٣].

{بـە پێچەوانـەی ئـەوەوە کـە (**قرطبـي**) دەیڵـێ}، (**الطَّبري**) دەڵـێ: خـوا نـاوی بـەرز بـێ، دەفەرمـوێ: ئـەی خەڵکینـە! خـوا وێنەیـەکی بـۆ هێناونـەوە، بـۆ کەسـێك کـە لـە بەنـدەکانی بێبڕوایـە و، بـۆ کەسـێك کـە پێـی بـڕوادارە.

واتـە: بابـای بـڕوادار وەك ئەوەیـە کـە فەرمـان دەکات بـە دادگەریـی و لەسـەر ڕێـی ڕاسـتە و، بابـای بێبـڕواش وەك بابـای لاڵـی دەسـتە پاچـەی هیـچ لـە دەسـت نەهاتوویـە.

(**طـبري**) بـۆ وێنـەی یەکەمیـان دەڵـێ: ئەمـە بـۆ ئینسـانی بـڕوادار و ئینسـانی هاوبـەش بـۆ خوادانـەرە.

ئنجـا دوایـی (**طـبري**) ڕوونی کردۆتـەوە، کـە بۆچـی ئـەوەی یەکەمیـان بـۆ بـڕوادار و بێبڕوایە، بـەڵام ئـەوەی دووەمیـان بـۆ خـواو بـت و صەنەمەکانە ؟

بـەڵام مـن پێـم وایـە: ئەگـەر بڵێیـن: ئـەم دوو وێنەیـە هـەر کامیـان بـۆ جیاوازیـی نێـوان بـڕوادار و بێبـڕواو، خـوا بەیەکگـرو هاوبـەش دانـەرە، شـتێکی گونجـاوە، هەروەهـا ئەگـەر بشـڵێین: هەردووکیـان، بـە تایبـەت هـی دووەمیـان بـۆ بـەراوردی نێـوان پەرسـتراوە سـاختەو پووچـەکان، لەگـەڵ پەرسـتراوی ڕاسـتەقینەدا، کـە تەنیـا خـوای پـەروەردگارە، ئـەوەش هـەر گونجـاوە، بۆیـەش زانایـان تێیانـدا کەوتوونـە ڕاجیاییـەوە.

---

(١) المؤلف: رَشيد الخَطيب الموصلي، ج ٤، ص ٤٨٥.

(٢) ج ١٠، ص ١٢٢.

(٣) جامع البيان: ج ١٤، ص ١٥٤.

**مەسەلەی دوازدەیەم:**

**خـوای باڵادەسـت ڕایگەیانـدوە، کـە نهێنیـی ئاسـمانەکان و زەوی، بـەس لـە لای خۆیـەتی و، هێنـانی ئاخیـر زەمـان (سـاعة)یش وەك چاوترووکانێـك یـان خێراتریشـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١- ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، واتە: نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی تەنیا هی خوایە، (وَلِلَّهِ) کە پێشخراوە، وەك زۆر جاران گوتوومانە: هەر کاتێ کە (**جارو مجرور**) پێشخران: کورت هەڵێنان (**حَصر**) دەگەیەنێ، واتە: نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی تەنیا لە لای خوایە ﷻ.

(**الغَيْـبُ: مَصْـدَرٌ بِمَعْنَـى اسْـمِ الفَاعِـلِ، أَي: الأَشْـياءِ الغَائِبـة**)، (**غیـب**) لێـرەدا چاوگـە بـە مانـای (**اسـم الفَاعِـل**)ە، واتـە: ئـەو شـتانەی کـە پەنهانـن و ونـن.

٢- ﴿ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ ﴾، هەروەها کاری ( السَّاعَةِ ) واتە: ئاخیر زەمان، ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتایی دێ، تەنیا وەك چاوترووکانێکە، (**لَمْحِ البَصَر: كَنَظْرَةٍ مِنَ البَصَر، اللَّمْحُ: النَّظر بسُرْعَة، يُقَالُ: لَمَحَهُ لَمْحاً وَلَمَحَاناً**)، (**لَمْح البَصَر**) واتە: چاوترووکان، بریتیە لە ڕوانینێکی چاو، یاخود بریتیە لەوە کە ئینسان بە خێرایی سەرنجی شتێك بدات، دەگوترێ: (**لَمَحَهُ لَمْحاً وَلَمَحَاناً**)، سەرنجی دا ئێمە بە کوردیی دەڵێین: چاوترووکان.

(**السـاعَة: عَلَـمٌ بالغَلَبـة عَـلَى وَقْـتِ فَنـاءِ العَالَـم**)، واتـە: (سـاعة) ناوێکـە بـۆ لەبەینچـوونی ئـەم جیهانـە و، کۆتایـی پێهاتنـی ئـەم دنیایـە.

بۆیـە مـن (**سـاعَة**)م، لـە زۆربـەی شـوێنەکان دا بـە ئاخیرزەمـان و کۆتایـی هاتنـی ئـەم ژیـانی دنیایـە لێکداوەتـەوە، هەندێکیشـان لێـرەدا (**السـاعَة**)یان بـە مانـای قیامـەت لێکداوەتـەوە، واتـە: هەڵسـانەوە و زیندووبوونـەوە.

لە قوڕئانیش دا بەگشتی بە سێ واتایان بەکارهاتوە:

١) ئاخیرزەمان.

٢) هەڵسانەوەو زیندووکرانەوە (**قیامة**).

٣) ڕۆژی دوایی بە هەردووك قۆناغی (ئاخیرزەمان) و (هەڵسانەوە) وە.

٣- ﴿أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾، (**أَو: للإضْرَابِ الإنْتِقَالِي، أَي: أَسْرَعُ حُصُولاً**) واتە: خێراتریش پەیدادەبێ لە چاوترووکان، یاخود (**أَوْ القُربُ المَكانِيُّ كِناية عَنْ كَوْنِهِ فِي المَقْدُورية مِثْل الشيءِ القَرِيب**).

یاخود کە دەفەرموێ: ﴿أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾، نیزیکترە، ئەمە کینایەیە بۆ ئەوە کە لە توانا بەسەرداشکان دا، وەك شتێکی نیزیکەو، شتی نزیکیش بە ئاسانیی دەستی دەگەیەنیە.

لێرەدا دەڵێ: (**أَوْ هُوَ أَقْرَبُ أَي المُشَبَّه أَقْوَى مِنَ المُشَبَّه بِهِ، فَلاَ يُوجَدُ مَا يُشْبِهُهَا فِي سُرْعَةِ حُصُولِهَا**) واتە: وێچوێنراو، لەوشتەی کە پێ دەچوێنرێ، بەهێزترەو هیچ شتێك نیە پێی بچێ لە خێرا پەیدابون دا.

واتە هاتنی (**الساعَة**)، وەك چاوترووکانێکە، یاخود لە چاوترووکانیش خێراترە، دیارە چاوترووکان: پێچوێنراو (**مشبَّهٌ بِهِ**)یەکەیەو، (**الساعَة**) پێچوو، (**مُشبَّه**)ەکەیە، کە دەفەرموێ: ﴿أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾ واتە: (**مُشبَّه**) کە ئەوەی دەتەوێ بە شتێکی بچوێنیی، بۆخۆی لەو شتەی کە پێی دەچوێنرێ، بەهێزترە، مانای وایە هیچ شتێك نیە هێندە خێرا بێ، چونکە: مادام لە چاوترووکانێك خێراتر بێ، کەواتە: هیچ شتێك نیە وەك (**ساعة**) بە خێرایی بێ و، هەر کاتێ خوا ﷻ ویستی بیهێنێ دەیهێنێ.

٤- ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾﴾ واتە: بەدڵنیایی خوا بەتوانایە لەسەر هەموو شتێك، لە زانینی پەنهان و کاروباری دوا ڕۆژ و هێنانی ئاخر زەمان، کە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك ئەصڵەن پێویستی بە کات نیە.

### مەسەلەی سێزدەیەم:

**خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە کاتێ مرۆڤەکانی لە سکی دایکانیان دەرهێناون، هیچیان نەزانیوە، بەڵام بەهۆی چاوو گوێ و عەقڵەوە، ڕێی وەدەستهێنانی زانیاریی بۆ تەخت و هەموار کردوون:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ ﴾، ئەم (و)ە، بادەرەوە (**عاطفة**)یەو ئەو قسانەی کە دێن دەیانگێڕێتەوەو، بایاندەداتەوە بۆ سەر ئەوانەی پێشێ باسکراون، واتە: (هەروەها)، وەك چۆن خوا ﷻ ئەو چاکەو نیعمەتانەی کە ڕابردن لەگەڵ ئێوەیدا کردوون و، بەسەر ئێوەیدا ڕشتوون، نیعمەتێکی دیکەشی ئەوەیە: کە ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە.

(بُطُونِ ) کۆی (**بَطن**)ە، (**بَطن**): بە کوردیی دەڵێین: (سك) یان (زگ) یان (ورگ)، دەڵێ: (**البَطنُ: مَا بَيْنَ ضُلُوعِ الصَّدْرِ إلى العَانَة، وَفِيهِ الأَمعاءُ وَالمَعِدَةُ وَالكَبِدُ وَالرَّحِمُ**)، واتە: (**بَطْن**): لە پەراسووەکانی سینەوە تاکو دەگاتە میزڵدان، کە ڕیخۆڵەکان و گەدەو جگەرو، {بەنسبەت ئافرەتەوە} منداڵدانیشی، گرتوونە نێو خۆی.

(**أُمَّهَات**)یش کۆی (**أُم**)ە، یانی: دایك، هەڵبەتە منداڵ و کۆرپە لە هەموو سکەکەدا نیە، بەڵکو لە نێو منداڵداندایە، کە منداڵدانیش لە نێو سك دایە.

٢- ﴿ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴾، کاتێك خوا ئێوەی دەرهێناوە هیچتان نەدەزانی، واتە: بە کردەوە هیچتان نەدەزانی، نەك لە تواناتاندا نەبێ هیچ فێر بن، (**أَي: لا تَعْلَمُونَ شَيْئاً بالفِعْلِ لاَ بالقُوَّة**).

٣- ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ ﴾، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانی بۆ ئێوە دانان، بۆ ئێوە پەیدا کردوون و، بە ئێوە داون.

(**سمْع**) لە قورئاندا هەمیشە بەتاك هاتووە، چونکە (**سمْع**) واتە: بیستن، چاوگە (**مصدر**)ە، بەڵام (**أَبصَار**) کە کۆی (**بَصر**)ە: چاو، هەمیشە بە کۆ هاتووە.

هەڵبەتە جاری واش هەیە بە تاك هاتوە، وەك: ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾﴾ الإسراء، (واتە: بێگومان بیستن و دیتن و عەقڵ)، هەر كام: لەمانە لێی دەپرسرێتەوە، بەڵام بە زۆریی (بَصر) بە كۆ هاتوە، (أَبصَار)یش كۆی (بَصَر)ە، واتە: چاو، یان دیتن، (أَفئِدَة)ەش كۆی (فُؤاد)ە، كە زۆر لە زانایان دەڵێن: بە مانای (دڵ) دێ، بەڵام من وای تێدەگەم كە زیاتر (أَفئِدَة) كە بە (فؤاد) كۆدەكرێتەوە ، بە مانای عەقڵ دێ و، جار جاریش بە مانای (دڵ) دێ، كە پێم وایە پێشتر قسەمان لێكردووە، ئێستا دەرفەتی ئەوەمان نیە، ئەگەرنا هەر تەماشای وشەی (أَفئِدَة) و (فؤاد) بكەین كە لە قورئاندا هاتوون، دەزانین كە زیاتر مانای عەقڵ دەگەیەنن[1].

ئنجا ئێستا زانایانی هاوچەرخ دەڵێن: بەڵێ ئینسان بەهۆی مێشكەوە، بەهۆی دەماغەوە، كە ئامرازی ڕووحە، بۆ دەرككردنی شتەكان و، ئامرازی عەقڵە، لە شت تێدەگات و، زانیارییەكان هەموویان پەیوەندییان بەوێوە هەیە، بەڵام: دڵیش جۆرێك لە پەیوەندیی هەیە بە زانینی شتەكانەوە، هەرچەندە تا ئێستا زۆر شتی مرۆڤ ڕوون نەبۆتەوەو، ئەوەش یەكێكە لەو شتانەی كە تا ئێستا ڕوون نەبۆتەوە، ئەگەرنا مەرج نیە زانینی شتەكان، هەمووی تەنیا پەیوەندیی بە مێشكەوە هەبێ، بەڵكو بەشێكیشی پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە.

٤- ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾، بەڵكو سوپاسگوزاریی بكەن، واتە: بەڵكو سوپاسگوزاریی بكەن لەسەر ئەوە كە هیچتان نەدەزانی، بەڵام خوا ﷻ لە ڕێی پێنج هەستەكان و، لە ڕێی عەقڵەوە، زەمینەی ئەوەی بۆ ڕەخساندوون كە زانیاریی، وەدەست بێنن و، شت فێربن.



(١) لە كتێبی دووەمی {موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه} دا، بەدرێژیی باسی ئەو مەسەلەیەمان كردوە.

## کورتە باسێک لەبارەی چۆنیەتی پەیدابوونی زانستەوە[1]

لێرەدا کورتە باسێك لەبارەی چۆنیەتی پەیدا بوونی زانستەوە دەکەین، بەڵام زۆر بە کورتیی و، لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە موبارەکەدا، ئایەتی (٧٨)ی (**النحل**) و دەڵێین:

**یەکەم:** بێگومان سەرەتای دەستگیربوونی مرۆڤ، لە زانیاریی و، زانست و فێربوون، لە ڕێی پێنج هەستەکانەوەیە: دیتن، بیستن، تامکردن، بۆنکردن، دەست لێکوتان، یانی: (**البَصَرُ، وَالسَّمعُ، وَالذَّوقُ، والشَّمُّ، وَاللَّمسُ**)، لە ڕێی ئەو پێنج هەستانەوە، زانیاریی تاك تاك کۆ دەکەینەوە:

**١)** لە ڕێی چاوەوە، لە ڕێی دیتنەوە، دیمەنەکان و بیندراوەکان (**المُبصَرَات، المَرئِیات**)، کە دەبیندرێن، چاو کۆیان دەکاتەوە، هەڵبەتە عەقڵە چاو بەکاردێنێ و، کەسێك کە عەقڵەکەی باش ئیش نەکات، چاوی هەزاران دیمەن ببینێ، بایی فلسێکە.

**٢)** لە ڕێی گوێوە، لە ڕێی بیستنەوە، بیستراوەکان (**المَسمُوعات**) دەنگەکان کۆدەکرێنەوە.

**٣)** لە ڕێی زار (زمان)ەوە چێژراوەکان، تامەکان (**المَذوقات**).

**٤)** لە ڕێی لووتەوە بۆنکراوەکان، (**المَشمُومات**).

**٥)** لە ڕێی دەست و لە ڕێی پێستەوەش دەستلێدراوەکان (**المَلمُوسات**) و هەست پێکراوەکان بە پێست، ئەوە هەنگاوی یەکەمی بەدەست هێنانی زانیاریی و زانست و دەرککردنی دەوروبەرە، لە لایەن مرۆڤەوە.

**دووەم:** ئنجا دوایی عەقڵ ئەو زانراوان (**المَعلُومات**)ەی کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە کۆی کردوونەوە، کە ئەوانە پێیان دەگوترێ: وێناکراوەکان (**التَصَوُّرات**)، یانی: کە مرۆڤ دیمەنی خۆری بینی، دوایی شێوەی خۆر (وێنەی خۆر) لە مێشکی دا دروست دەبێ، ئیدی کە گوترا: خۆر، یەکسەر عەقڵ دەرکی دەکات، خۆر یانی چی؟ با هەمیشە خۆریش نەبینێ، هەروەها بەنسبەت دەنگەکان و، بۆنەکان و، تامەکان و، دەست لێکوتراوەکانیشەوە، بە هەمان شێوە لە مێشکدا کۆدەکرێنەوەو، مێشك وەك زەخیرەیەك لەلای خۆی بەکاریان دێنێ، ئەوەش قۆناغی دووەم.

---

(١) بۆ نووسینی وێڕای بیرکردنەوەی خۆم، لە چەند سەرچاوەیەکیش سوودمەند بووم.

**سێیەم:** قۆناغێكی دیكەی زانست ئەوەیە: ئنجا عەقڵ دێنێ ئەو زانراوانە، هەندێكیان لەگەڵ هەندێكیان پێكەوە بەراورد دەكات، كە ئەوەش پێی دەگوترێ: بەڕاستدانراوەكان (**التَّصدِيقَات**)، ئنجا ئەم بەڕاستدانراوانە (**تصدِيقَات**)یش دەبنەوە بە دوو بەش:

**یەك:** بەڵگە نەویستەكان (**البَدِيهِيّات**)، وەك ئەوە كە:

**١/** {هەموو لە بەشێكی گەورەترە} (**الكل أكبر من جزئه**).

**٢/** {دوو شتی بەیەكەوە ناكۆك، لە هەموو ڕوویەكەوە، پێكەوە كۆنابنەوە} (**إستحالة إجتماع النَّقيضَيْن**).

واتە: ناگونجێ شتێك هەبێ و نەشبێ، جوانیش بێ و ناشیرینیش بێ، لە هەموو ڕوویەكەوە، نەك بە دوو سێ ئیعتیباری جیا جیا، كە عەقڵ پێویستیی بە بەڵگە هێنانەوە ناكات، بۆ ئەوەی ڕاستی ئەوانەی بۆ دەربكەوێ، بۆ وێنە: {هەموو پەیدابوویێك پەیداكەرێكی هەیە}، {هەموو ڕێكخراوێك ڕێكخەرێكی هەیە}، {هەموو لە بەشەكەی گەورەترە}،... هتد.

**دوو:** وەدەست هێنراوەكان (**الكَسبِيّات**) یاخود (**النظرِيّات**)، ئەویش ئەوەیە كە عەقڵ دێنێ هەندێك لەو شتانەی كە زانیوونی، لەگەڵ ئەوانەی دیكەدا، پێكەوە بەراوردیان دەكات، بۆ وێنە:

**أ** / جەستە (**جسم**) چیە ؟

**ب/** ماددە چییە؟

**ج/** پەیدا بوو چییە؟

دێنێ جەستە، یاخود ماددە لەگەڵ پەیداكراودا، پێكەوە بەراورد دەكات، كەواتە: جەستە دەبێت پەیدا بكرێ، یانی: جەستە، یان ماددە بۆخۆی نیە، بوونەكەی، زاتیی نیەو، دەبێ پەیدا بكرێ، ئنجا دوایی عەقڵ بە پشت بەستن بە یەكێ لە بەڵگە نەویستەكان، كە بریتیە لەوەی: {هەموو پەیدابوویێك پەیداكەرێكی هەیە}، عەقڵ دەگاتە ئەوە كە ئەو جیسمە، ئەو ماددەیە، ئەو ڕواڵەتانە كە پەیداكراون، بەپێی قانوونێك كە لە عەقڵدا هەیە، كە پێی دەگوترێ: یاسای هۆكاریی، یانی: {هەموو پەیداكراوێك پەیداكەرێكی هەیە} و، یاسای ڕێك و پێكیی، یانی: {ڕێكخراو پێویستی بە ڕێكخەر هەیە}، دەڵێ: كەواتە ئەو ماددانە، ئەو ڕواڵەتانە، پێویستییان بە پەیداكەرێك و ڕێكخەرێك هەیە،

کە خوایە ﷻ، واتە: عەقڵ دێنێ بەراورد دەکات لە نێوان سیفەتی جەستە و، سیفەتی ماددەو، وەسفی پەیدابووندا و، لێکیان دەدات و سەرەنجام: دەگاتە ئەنجامێك.

دیارە زانیارییە بەڕاستزانراوەکان (**التَّصدِیقَات**) کە لە جۆری وەدەستهێنراوەکان (**کَسبِیات**) و (**نَظَرِیات**)ن، بەهۆی بەڵگە نەویستەکان (**البدیهیات**)ەوە نەبێ، بە تەئکید بۆی پەیدانابن، بەڵام بەڵگە نەویستەکانیش کاتێك بۆ مرۆڤ پەیدا دەبن، کە وێناکراوەکانی لە مێشکدا هەبن، وێناکراوەکانیش بێگومان لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە پەیدا دەبن.

کەواتە: پێنج هەستەکان بناغەی پەیدابوونی زانستن و، بناغەی شت زانینن بۆ مرۆڤ، هەر بۆیەش خوا ﷻ کە باسی مرۆڤان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴾، کاتێك کە خوا ئێوەی لە سکی دایکتان، دەرهێنا، هیچتان نەدەزانی، ئەدی دوایی چۆن زانیاریان بۆ پەیدا بوو؟ ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ ﴾، دوایی بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانی پێدان، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن، واتە: بەهۆی بەکارهێنانی ئەو هەستەوەرانەو عەقڵەوە، زانیاریی وەدەست بێنن و، دوای ئەوە کە زانیاریتان وەدەست هێنا، لەسەر ئەو نیعمەتی وەدەستهێنانی زانیارییە، بەهۆی ئەو ئامرازانەوە، کە خوا ﷻ بۆی ڕەخساندوون، سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام بدەن.

**مەسەلەی چواردەیەم:**

**خوا سەرنجی خەڵك ڕادەكێشێ بۆ دیاردەی ڕامكردنی باڵندان، لە هەوای ئاسماندا، كە جگە لە خۆی هیچ كەس نایانگرێ و، لەمەشدا نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك بیانەوێ بڕوا بێنن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ ﴾، ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە؟ وشەی (**الطَّير**) ناوی كۆیە و بۆ جینسە، تاكەكەی بریتیە: لە (**طَائِر**) یەك باڵندە، (**طَيْر**) یانی: باڵندە بە گشتی، كە هەم بۆ تاكیش بەكاردێ، بۆ كۆش بەكاردێ، ئایا نەیانڕوانیوەتە باڵندە؟ سەرنجیان نەداوە ؟

ئنجا وەك پێشتر گوتوومانە: وشەی (يَرَى)، و (يَرَوْا) یان (رَأَى)، بۆخۆی بەركار دەخوازێ، وەك (**رَأَى مُحَمَّدٌ الشَّجَرَةَ**)، واتە: موحەممەد درەختەكەی بینی، بەڵام كە بە (**إلى**) تەعەددا دەكات، بۆ (**مَفعُول**) و بەركار دەخوازێ، ئەوە مانای سەرنج لێدان و لێوردبوونەوە دەگرێتە نێوخۆی.

واتە: وێڕای بینین، سەرنج لێدان و تێوەڕامانیش دەگرێتە نێوخۆی، بەهۆی پیتی (**إلى**)ەوە كە بەركاری پێ دەخوازێ، ئایا تەماشایان نەكردوەو وردنەبوونەوەو تێوەڕانەماون، لە باڵندان؟

٢- ﴿ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ ﴾، لە هەوای ئاسمانێ، لە هەوای سەرێدا ڕامكراون، ملیان پێ كەچكراوە، دەستەمۆ كراون، (**الجَوُّ: الفَضَاءُ الَّذِي بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرض**)، ئەو فەزاو بۆشاییەی ئەو هەوایەی كە لە نێوان ئاسمان و زەویدایە پێی دەگوترێ: (**جَوّ**).

٣- ﴿ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ ﴾، جگە لە خوا كەس ئەو باڵندانە ناگرێ، كێ دەیانگرێ؟ بێگومان خوا، خوا ڕاستەوخۆ ﷻ بۆخۆی دەیانگرێ؟ نەخێر بەڵكو بەهۆی ئەو یاسایانەوە كە بۆی داناون، بەپێی ئەو یاسایانەوە كە خوا دایناون، بە پێی ئەو تایبەتمەندییانەی، كە لە باڵنداندا دایناون، ئەو باڵندانە دەتوانن بە هەواوە بمێننەوەو بفڕن.

(**الإمساكُ: الشَدُّ مِن التَفَلُّت**)، (**إمساك**): بریتیە: لە توند گرتنی شتێك نەهێڵێ بڕوات، ﴿مَا يُمۡسِكُهُنَّ﴾، واتە: هیچ کەسێك ڕایانناگرێ بە هەواوە، جگە لە خوا ﷻ.

٤- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾، بێگومان لەوەدا (واتە: لە دیاردەی فڕینی باڵندان و پەلەوەران دا بە ئاسمانەوە)، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن.

واتە: کەسێك کە بیەوێ بڕوا بێنێ، هەر سەرنجی باڵندان بدات، زۆر نیشانەو بەڵگەی پەروەردگارێتیی خواو، خاوەندارێتیی خوا، پاشان تەنیا پەرستراوێتیی خوا لە دیاردەی باڵندان و فڕین و هاتن وچوونیان بە ئاسماندا، زۆر نیشانەو بەڵگەی دەست دەکەون، بەڵام کەسێك کە نەیەوێ بڕوا بێنێ، وەك گوتراوە: (کەسێك بە زۆریی بینێری بۆ مازووان، لە دارێ هەڵناڕوانێ)، واتە: تەماشا ناکات و دێتەوە بەدەستی خاڵیی و، دەڵێ: درەختەکان هیچیان پێوە نەبوو، چونکە نەیویستوە مازووان بکات، یان دەڵێ: (ئەگەر دز بێ، تاریکە شەو زۆرن).

ئەم مەسەلەی باسی باڵندان لە ئایەتی ژمارە (١٩)ی سوورەتی: (**المُلك**)یش دا هاتوە، بە تەعبیرێکی دیکە، خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۢ بَصِيرٌ ١٩﴾.

واتە: ئایا سەرنجی باڵندیان نەداوە لە سەروویانەوە؟ کاتێك کە باڵیان پان ڕادەخەن و، باڵیش دێننەوە یەك، {کاتێك باڵ لێك دەدەن}، کە ئەوە دەگونجێ ئاماژە بێ بۆ ئەوە: کە باڵندە بە گشتی دوو جۆرە فڕینیان هەیە، یاخود ئاماژەیە بۆ هەردوو حاڵەتەکەی کە: باڵندە جاری وا هەیە باڵ لێکدەدا و، جاری واش هەیە باڵ ڕادەگرێ، بە هەواوە ڕادەوەستێ، ﴿مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾، بێجگە لە خوای خاوەن بەزەیی هیچ کەسی دیکە نایانگرێ، بەهۆی ئەو یاسایانەوەو ئەو تایبەتمەندییانەوە کە خوا بە باڵندانی داون، دەتوانن بە هەواوە بمێننەوە، ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۢ بَصِيرٌ﴾، بێگومان خوا بینەری هەموو شتێکە.

ئنجا: ﴿أَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾، یان لە سوورەتی: (**المُلك**)دا: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ﴾، دەڵێ: (**الرُؤيـة بَصَرية وَفِعلُهـا يَتَعَـدَّى بِنفسِـهِ فَتَعدِيَتُـهُ بِ (إلى) لتضمِـين الفِعـلِ مَعنَـى: يَنظُـرُوا، يَتَأَمَّلُـوا**)، واتە: لێرەدا مەبەست لە (**رُؤيـة**) بینینی چاوە، {چونکە جاری واش هەیە مەبەست پێی بینینی عەقڵە، بەڵام لێرە مەبەست بینینی چاوە}، ئنجا (**رأى** ) کردارەکەی بۆخۆی بەرکار (**مفعول**) دەخوازێ، بەبێ ئەوەی یارمەتیی وەربگرێ لە پیتێکی دیکە، بەڵام لێرەدا کە بە (إِلَىٰ) بەرکار (**مفعول**)ی خواستوە، مانای سەرنج لێدان و بیرلێکردنەوەی خراوەتە نێو.

﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (أَلَم تَرَوا)، ئایا سەرنجتان نەداوە؟ ئەو پرسیارکردنەش لێرەدا پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە و، مانای لابردن (نفي) دەگەیەنێ، یانی: ئەوانە دیارە باڵندان نابینن؟ ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ ﴾، ئایا باڵندەیان نەبینیون؟ بە سەرنج لێدانەوە لە هەوای ئاسماندا، واتە: ئەو بینینەیان نەبینیوە، کە عەقڵی لەگەڵدا بێ و، بیرکردنەوەو سەرنجدانی لەگەڵ دابێ، چونکە ئەو جۆرە بینینەی کە هیچ ئەنجامگیرییەکی لە دواوە نەبێ، لە حوکمی نەبینین دایە.

## کورتە باسێک لەبارەی باڵندان (طیر)ەوە

لێرەدا کورتە باسێك دەکەین لەبارەی باڵندانەوە، چونکە جگە لەو ئایەتەی ژمارە (١٩)ەی سووڕەتی: (المُلك)، لە شوێنی دیکەش دا خوا ﷻ باسی باڵندان دەکات، کورتە باسەکەشمان لە حەوت (٧) بڕگان دا دەخەینەڕوو، کە دیارە هەموویشم لە: (**المَوسُوعَة العَرَبية**) [1] وەرگرتووە، من تەنیا خوڵاصەو کورتەیەکی دێنم:

### ١) پێناسەی باڵندان:

باڵندەکان بەگشتی لە جۆری بڕبڕەییەکان (**فقاريات**)ن، ئەو جۆرە ژیاندارانەی کە پێیان دەگوترێ: بڕبڕەییەکان (**فقاريات**)، بڕبڕەی پشت و هەیکەلی پەیکەری ئێسقانیان هەیە، هەروەها باڵندەکان لە جۆری خوێن گەرمەکانن، کە پلەی گەرمیی جەستەیان: (٣٨ - ٤٤)ی سەدییە و، جەستەی باڵندان بە پەڕ و تووك داپۆشراوەو، دەتوانن بفڕن، جگە لە هەندێکیان وەك (**بطريق**) و حوشترمەل (**نعامة**)، ئنجا لە زۆر ڕووەوە باڵندەکان وەك خشۆکەکان دەچن، لە زۆر سیفەتیاندا، بۆ وێنە: کە بە هێلکە زاوزێ دەکەن و، بەو شێوەیە بەچکەیان دەبێ، پاشان کۆئەندامەکانی نێو جەستەیان و، ئەوە کە ڕژێن (**غُدَّة**) لە پێستیاندا نیە، جگە لە ڕژێنی کلك، کە ئەویش بۆ هەموویان نا، بۆیە لە زۆر ڕووەوە، دەشوبهێنە خشۆکەکان.

### ٢) تووك، یان پەڕ (الرِّيش):

ئەوەی زۆر شتێکی دیارەو ئیمتیازێکی گەورەو گرنگی باڵندەیە، بریتیە لەو تووك و پەڕە، کە هەیەتی، بۆیە دەبێ تۆزێك قسەی لەبارەوە بکەین:

١/ باڵندەکان جەستەیان بە تووك، یان بە پەڕ داپۆشراوەو، ئەو پەڕانە، یان ئەو تووکە، کە لەسەر جەستەیانە، زۆر بەهێزەو، زۆریش نەرمەو کێشیشی زۆر کەمە، ئنجا ئەو پەڕو تووکە، بۆ باڵندان لە زۆر شتان لە دەیانپارێزی وەك: سەرماو گەرما، هەروەها یارمەتیشیان دەدا بۆ فڕین و، باڵندە بەبێ تووك و پەڕ ناتوانێ بفڕێ.

---

(١) ج ١٢، ص ٦٩٦ -٧٠٤.

٢ / جۆرەكانی پەڕ، یان تووك:

١ - ئەو پەڕو تووكەی كە لە دەرەوە دەبینرێ و، بەسەر جەستەی باڵندەوەیە.

٢ - ئەو وردە تووكانەی كە لە ژێر تووك و پەڕە سەرەكییەكەوەن.

٣ - جۆرێكی دیكە، كە لەویش وردترە.

٤ - ئەو پەڕە درێژانەی كە پێیان دەفڕێ، كە پێیان دەگوترێ: پەڕی قەڵەمیی، كە هەم لەسەر كلكی هەن و، لەسەر باڵەكانی هەن، كە هەروەك ئەو پەڕ و تووكەیە، كە كۆی جەستەی باڵندە دادەپۆشێ، بەڵام بەهێزترو درێژترن و هەموومان دەزانین چۆنن!

٣/ گۆڕینی پەڕو تووكەكان:

باڵندە هەموو ساڵێك جارێك پەڕو تووكەكانی خۆی دەگۆڕێ، خوای زاناو شارەزا وایكردوە، كە وەك چۆن (مار) كاژ، توێخ دادەنێ، ئەوانیش پەڕو تووكەكەی خۆیان دەگۆڕن، بەڵكو هەیانە ساڵی دوو جاران ئەو پەڕو تووكەی خۆی دەگۆڕێ و، پەڕی نوێ و تووكی تازەی لێ دەڕوێتەوە .

٤/ پاككردنەوەی پەڕو تووكەكان:

حاڵەتێكی دیكە كە باڵندە هەیەتی بەنسبەت پەڕو تووكەكەیەوە، ئەوەیە كە: باڵندەكان گرنگیی زۆر دەدەن بە پەڕو تووكی خۆیان و، بەردەوام پاكیی دەكەنەوەو، بە زەیتێك كە لە غوددەیەك دایە لەلای كلكیان ، جۆرێك لە ڕژێنی تێدا هەیە، ئەو تووكەی خۆیانی پێ چەور دەكەن، ئەگەر تەماشای باڵندە بكەین: جارجار سەرێك دەباتەوە بۆ پشتەوەی خۆی بۆ لای كلكی، دوایی دەندووك بە پەڕو تووكەكانی خۆی دادێنێ، ئەوە پەڕو تووكەكەی خۆی چەور دەكات و پاكی دەكاتەوە.

## ٣) چۆنیەتیی میكانیزمی فڕینی باڵندان ؟

باڵندەكان بە گشتی، دوو جۆرە فڕینیان هەیە:

أ / فڕینێكیان كە ڕاستەوخۆیە، كە پێی دەگوترێ: خلیسكانیی چارۆگەیی (**الإنزلاقي الشّرَاعِي**): ئەوە سادەترین جۆری فڕینە، ئەویش ئەوەیە كە بەبێ ئەوەی باڵەكان لێك بدات، ڕێك لەسەرڕا دێتە خوارەوە، وەك باشو و و باز و ئەوانە، كە بە زۆریی بەو شێوەیە دەفڕن، هەڵبەتە هەموو

باڵندەیەکیش ناتوانێ بەو شێوەیە بفڕێ، بەڵام هەندێکیشیان بە هەردوو جۆرەکە دەتوانن بفڕن، بەس هەندێکیان ئەو جۆرەیان زیاترە.

ب/ بریتیە لە فڕینی بە باڵ لێکدان، کە ئەویش میکانیزمێکی زۆر ئاڵۆزی هەیە، کە بەهۆی باڵ لێکدانەوەیە، وەك ئایەتەکە ئاماژەی بە هەردووك جۆرەکە کردوە: ﴿ صَـٰٓفَّـٰتٍ وَيَقۡبِضۡنَ ﴾، واتە: باڵەکانیان دێننەوە یەك و پانیان ڕادەخەن، هەڵبەتە ئەگەر سەرنجی پەیکەری ئێسکی باڵندە بدەین ئەوانەیان دەفڕن، دەبینین: لە نێو پەیکەری ئێسکییەکەیان دا، لە نێو ئێسکەکانیان دا بۆشایی هەیە، هەوای تێدایە، بۆ ئەوەی کێشیان سووك بێ، بەڵام هاوکات: ئێسکی باڵندە زۆر پتەوە، پاشان ماسوولکەکانی سینەیان زۆر بە قووەتەو، هەناسەدانیان زۆر ڕێك وپێکە.

ئنجا هەناسەدان و فڕینیان هەموویان لەگەڵ پرۆسەی هەرسکردن و، سووڕی خوێن و، پاشەڕۆك لە خۆ فڕێدان و، شێوەی باڵەکانیان هەموویان پێکەوە گونجاون، هەر باڵندەیەك ئەو شتانەی پێکەوە گونجاون، ئنجا ئێسقانی باڵندە وێڕای ئەوە کە بۆشن، زۆریش دەوڵەمەندە بە هەموو جۆرە خوێیەکان و کالسیۆم، بەتایبەت ئەوەش وادەکات کە هەم بەهێز بێ و، هەم سووك بێ، لە یەك کاتدا.

## ٤) جۆرەکانی باڵندە بەپێی ژینگەکان:

بەپێی ئەو ژینگەو شوێنانەی کە باڵندەکان تێیاندا دەژین، دابەش دەکرێن بۆ شەش (٦) جۆری بنەڕەتیی:

**یەکەم:** باڵندە درەختییەکان (**طِيورٌ شَجَرِية**)، کە بە زۆریی لەسەر دارو درەخت و ئەوانە، هێلانەو دروست دەکەن و ژیانیان بەزۆریی لەسەر درەختەکانە.

**دووەم:** باڵندە زەمینییە درەختییەکان (**طِيورٌ أَرضِية شَجَرِية**)، کە هەم لەسەر درەخت و، هەم لەسەر زەویش، هێلانەو ماڵ بۆخۆیان دادەنێن.

**سێیەم:** باڵندە زەمینییەکان (**طِيورٌ أَرضِية**) کە بەزۆریی هێلانەی خۆی لەسەر زەوی دادەنێ.

**چوارەم:** باڵندە نیزیك ئاوییەکان (**طِيُور قُربَ مَائِية**)، یان: کەنار ئاوییەکان، کە هێلکەکانی لە دەرەوەی کەناری ڕووبارو دەریا دادەنێ، بەڵام ژیانەکەی بە زۆریی لە نێو ئاو دایە.

**پێنجەم:** باڵندە ئاوییەکان (**طِيُور مَائِية**)، کە بە زۆریی ژیانیان لەنێو ئاو دایەو، هێلانەشیان هەر لە نێو ئاو دایە.

**شەشەم:** باڵندە هەواییەکان، (**الطُّيُور الَّتِي تَصطَادُ فِي الجَو**)، ئەوانەی بە زۆریی لە هەوادا ژیان بەسەر دەبەن و، خۆراکی خۆیان لە هەوادا دابین دەکەن، ئنجا ئەو نێچیرە: باڵندەی لە خۆیان بچووکترە، پەپوولەو کوللەو مێش و مەگەزە، زیندەوەرەکانی دیکەن، ڕاویان دەکەن، بە زۆریی خۆراکی خۆیان لە هەوادا دابین دەکەن.

## ٥) کۆچی باڵندەکان:

کۆچکـردن و سـەفەر و هاتـن وچوونـی باڵنـدەکان، پەلـەوەرەکان، لـە ڕووی جموجـۆڵ و هاتـن وچوونیانـەوە دەبـن بـە سـێ (٣) کۆمـەڵ:

**یەکەم:** ئەو باڵندانەی کە نیشتەجێن لە شوێنێکی دیارییکراودا (ناجووڵێن).

**دووەم:** ئەو باڵندانەی کە دەجووڵێن، بەڵام بە شێوەیەکی سنووردار.

**سێیەم:** ئەو باڵندانەی کە کۆچ دەکەن، (ساڵانە کۆچ دەکەن) گەرمێن و کوێستان دەکەن، یان لە شوێنێکەوە دەچن بۆ شوێنێکی دیکە، جاری وا هەیە لە قاڕەیەکەوە دەچن بۆ قاڕەیەکی دی و، هەزاران کیلۆمەتر دەبڕن.

## ٦) پرسیارێك: ئایا چۆن باڵندەکان بە شوێنی خۆیان دەزاننەوە؟

ئایا ئـەو باڵندانـەی سـەفەر دەکـەن، بـە تایبـەتی ئەوانـەی گەرمیـان و کوێسـتان دەکـەن، بـۆ وێنـە: (حاجـی لـەق لـەق) کـە ئێمـە لەنێـو کوردەواریـدا دەزانیـن، هەروەهـا (قـاز و قورینـگ) و ئـەو باڵندانـەی دیکـە کـە دەزانیـن لـە بەهاراندا سـەفەر دەکـەن و لـە پایزانـدا دێنـەوە، چـۆن بـە شـوێنی خۆیـان دەزاننـەوەو چـۆن ڕێ دەردەکـەن، کـە هـی وایـان هەیـە نـەك سـەدان، بگـرە هـەزاران کیلۆمەتـر ڕێ دەبـڕێ ؟!

هەتـا ئێسـتا زانایـان لەوبـارەوە حـەوت (٧) بیردۆزەیـان خسـتوونە ڕوو، بـەڵام هیچیـان وانیـن کـە دڵنیاکـەر بـن، کـە فـڵان باڵندەیـە بەهـۆی ئـەوەوە بـە شـوێنی خـۆی دەزانێتـەوە، چونکـە زۆر جێـی سـەرنجە کـە هـەزاران کیلۆمەتـر دەڕۆن و، هەنـدێ لـەو باڵندانـە لـە وڵاتێکـەوە دەچـن، بـۆ وڵاتێـکی دی، بـۆ وێنـە لـە هێڵـی یەکسـانییەوەو، لـە خـوار هێڵـی یەکسـانیی، لـە ئەفریقیـاوە دێـن بـۆ ئاسـیا دەچـن، بـۆ سـەرووی ئاسـیا، هـەزاران کیلۆمەتـر دەبـڕن:

١/ یەكێ لە بیردۆزەكان دەڵێ: باڵندەكان پشت دەبەستن بە تیشكی خۆر و، ڕووناكی ئەستێرەكان، لە فڕینیان دا.

٢/ بیردۆزەیەكی دیكە دەڵێ: بەهۆی بەرزیی و نزمییە جوگرافیەكانەوە، وەك زنجیرە چیاكان و، كەنار دەریاكان و ڕووبارەكان، بەڕێیە دەزاننەوە.

٣/ بیردۆزەیەكی دیكە دەڵێ: لە ڕێی هەستی بۆنكردنەوە، ڕێ دەردەكەن.

٤/ بیردۆزەی چوارەم دەڵێ: بەهۆی تیشكی ژێر سوور، یاخود شەپۆڵە سەروو دەنگییەكانەوە باڵندەكان بە جێ و ڕێی خۆیان دەزاننەوە.

٥/ بیردۆزەی پێنجەم دەڵێ: بەهۆی هۆكارە كەشییەكانەوە (**العَوامِل الجَويَّة**)، بۆ وێنە: ئاڕاستەی با، هەروەها فشاری هەوا، پێ دەزاننەوە.

٦/ بیردۆزەی شەشەم دەڵێ: بەهۆی ئەوەوە كە شوێنەكەیان لەبیر دەمێنی و لە زاكیرەیاندا دەیپارێزن و، بە ڕێیەكەوە پێیەوە ڕاهاتوون، بۆیە پێی دەزاننەوە.

٧/ بیردۆزەی حەوتەم دەڵێ: باڵندە كۆچكەرەكان، قیبلەنومایەكی موگناتیسییان هەیە لە تۆڕی چاویان دا، بەهۆی ئەوەوە ڕێ دەردەكەن.

ئەو حەوت بیردۆزانە هەموویان هەن، بەڵام هیچیان وا نین كە تەواو دڵنیاكەر بن، دەشگونجێ بە هەموو ئەوانەوەو هەندێ شتی دیكەش، كە جارێ زانست پێی نەگەیشتوە، ئەو باڵندانە بەو ڕێ و بان و شوێنی هاتوچۆی خۆیان بزاننەوە.

### ٧) گەشەسەندنی باڵندەكان:

زانایانی بواری، پەلەوەرناسیی و باڵندەناسیی، دەڵێن: كاتێ خۆی باڵندەكان لە خشۆكەكانەوە هاتوون، نزیكەی سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش دوای ئەوەی كە گواندارەكان یان مەمكدارەكان (**الثَّدیِّیات**) جۆراو جۆریی (**تنوُّع**) لە نێودا پەیدابووە، باڵندەكان لەوێوە هاتوون! هەڵبەتە بۆ خوای پەروەردگار ئاسانە، هەموو ئەو زیندەوەرانەی بردبێتەوە سەر (ئەمیبا)، ژیانداری یەك خانەیی و، لەوێڕا هاتبن، بەڵام دیسان ئەوەش هەر بیردۆزەیەكە، هەروەها بۆ خوای پەروەردگاریش ئاسانە كە هەركام لەو: پەلەوەر و زیندەوەر و ئاژەڵ و دڕندەو ژیاندارانەی كە لەسەر زەوی

دروستی کردوون، هەرکامێکیانیی سەربەخۆ دروست کردبێ، بەڵام بە تەئکید ئەگەر ئەو ژیاندارانە لە یەکدییەوە هاتبن، وەك بیردۆزەکەی (داروین) دەڵێ: کە ئێستا بووە بە ئەفسانە، بە تەئکید مرۆڤ هیچ پەیوەندیی نیە، بەوەوەو، هیچ پەیوەست نیە بەو ئاژەڵ و دروستکراوانەی دیکەوە، چونکە مرۆڤ یەك تایبەتمەندیی زۆر گەورەی هەیە، جگە لەوەی کە عەقڵی هەیەو قسەی هەیە، کە هەندێکیان بۆ پێناسەکەی گوتوویانە: (**حَيوَانٌ ناطِق**) (**أو حَيوَانٌ عاقِل**) گیاندارێکی گۆیایە، یاخود ژیاندارێکی عاقڵە، هەروەها هەندێکیان گوتوویانە: (**حَيوَانٌ ضَاحِك وباكٍ**) ژیاندارێکە پێدەکەنێ و، دەگری! بەڵام هەموو ئەوانە بێگومان شوێنەواری ڕووحن، نا لە حەقیقەتدا مرۆڤ بە ڕووح لە ژیاندارانی دیکە جیابۆتەوە، ئەوانی دیکە هەموویان ژیانیان هەیە، حەیاتیان تێدایە، بەڵام تاکە دروستکراوێکی خوا کە بەهرەمەند بووبێ لە ڕووح، مرۆڤە [1]، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي .... ﴿٢٩﴾﴾ الحجر، دەربارەی ڕووحیش دەفەرموێ: ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ... ﴿٨٥﴾﴾ الإسراء، کە ڕووح لە جیهانی فەرمان (**عالم الأمر**)، لە جیهانی خەلق نیە، تاکو ئێمە بتوانین بە پێنج هەستەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، ئنجا دەزانین کە جیهانی خەلق پلە پلە دروست دەبێ، بەڵام ڕووح جۆرە دروستکراوێکی تایبەتی خوایەو، وا پێدەچێ ڕێك بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوای بەرزو مەزن دروست بوو بێ.

## ٨) جۆرەکانی باڵندە:

زانایانی پەلەوەرناس و باڵندەناس دەڵێن: ئێستا جۆرەکانی باڵندە، لەم قۆناغەی ئێستای ژیانی بەشەردا، بە نۆ هەزار (٩٠٠٠) جۆر مەزەندە دەکرێ، بەڵام ئەو باڵندانەش کە فەوتاون، ئەویش بە هەشت سەد (٨٠٠) جۆر مەزەندە دەکرێن، دەڵێن: هەشت سەد (٨٠٠) جۆر لە باڵندان هەبوون، بەڵام فەوتاون.

---

(١) واپێدەچێ فریشتە (ملائكة) و جند (جِنّ)یش ڕووحیان هەبێ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکم - تا ئێستا - پێ شك نایەت، جگە لەوەی هەردووکیان جەستەکەیان لە جۆرێك تیشك (نور - نار) دروستبووە و، مرۆڤیش جەستەکەی لە قوڕ (طين) دروست بووە.

## مەسەلەی پازدەیەم:

خـوا ماڵەکانتـانی گێـڕاون بـە مایـەی نیشـتەجێبوون و ئۆخـژن و، لـە پێسـتی ئـاژەڵان ماڵانێـکی سـووکباری کاتی سـەفەر و نیشـتەجێبوونتانی بۆ ڕەخسـاندوون و، لـە خوریـی و تـووك و موویـان، کەلوپـەل و شـمەکێکی بـۆ ڕەخسـاندوون، تاکـو ماوەیـەك:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ٨٠﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا﴾، هەروەها خوا ﷻ لە ماڵەکانتاندا مایەی سوکنایی و ئیسراحەت و ئۆخژنی بۆ ڕەخساندوون.

خوێنراویشـەتەوە: (**بِيُـوت**)، واتـە: هـەم بـە (بـۆر) (**بُيُـوت**)، هـەم بـە (ژێـر) (**بِيُـوت**)، کـە بـە تەئکیـد لێـرەدا مەبەسـت لـەو ماڵانـە کـە مایـەی سـوکنایی و، ئۆخژنـن، ئەوانـەن کـە لـە کەلوپـەل و، لـە کەرەسـتەی وەك بـەرد و قـوڕ و گـەچ و ئەوانـە دروسـت دەکرێـن.

٢- ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا﴾، وێڕای ئەو ماڵانە کە لە شارەکان و، دێیەکان دا بۆی ڕەخساندوون، بەو کەرەستانەی کە لەبەردەستتان دان، بە هەمان شێوە: ماڵانێکیش کە مایەی تێدا ئیسراحەتکردن و ئۆخژنتانن، لە پێست و کەوڵی ئاژەڵانیش: حوشتر و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و بزن، دروست دەکەن و خوا بۆی ڕەخساندوون.

(جُلُودِ) کـە کـۆی (جِلْـد)ە، واتـە: پێسـت، یـان کـەوڵ، کـە: بریتیـە لـەو پێسـتەی دەبـاغ دەکـرێ و، خوریـی و، مـوو و، تووکەکـەی لـێ دەکرێتـەوە.

هەندێکیـش گوتوویانـە: مەبەسـت ئەوەیـە کـە: لـەو خوریـی و تـووك و مـووەی، لەسـەر پێسـتەکەیانە، ئـەو ماڵانـە دروسـت دەکـەن، وەك ڕەشـماڵ و چـادر و خێـوەت.

هەڵبەتـە هەردووکیشـیان لـە یـەك کاتـدا دەگونجـێ مەبەسـت بـن و، هەندێکیـان - لـەو ماڵانـە - هـەر لـە خـودی پێسـتەکانیان دروسـت دەکرێـن، هەندێکیـش لـەو خوریـی تـووك و

مووەی کە لە پێستەکانیان دەکرێنەوە، کە بە عەرەبی هەندێك جۆریان (**خیمة، قبة، خبیء**) یان پێ دەڵێن، کە (**خَیْمَة**) بە (**خِیام**) و، (**خِبیء**) بە (**أَخبِیة**)، و (**قُبَّة**) بە (**قِباب**) کۆ دەکرێنەوە کە ئێمە بە کوردیی چادر و ڕەشماڵ و تاوڵ و خێوەتیان پێ دەڵێین، ئنجا چ لە موو و تووك و خورییەکەیان دروست بکرێن، چ لە خودی پێستەکەیان کە لە نێو کوردەواریی ئێمەدا عادەت نەبووە لە پێستەکەیان چادر و ڕەشماڵ و تاوڵ دروست بکرێن، بەڵام لە نێو عەرەب دا، ئەوە بووەو، ئێستاش هەیە.

٣- ﴿تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ﴾، هەم ڕۆژی سەفەرکردنتان (هاتن و چوونتان) و، هەم ڕۆژی نیشتەجێبوونتان (بۆ کاتی نیشتەجێبوونتان) ئەو ماڵانە کە لە پێست و کەوڵ و تووك و موو و خوریی ئەو ئاژەڵانە دروستیان دەکەن، سووك بە دەستتانەوە دێن.

(تَسْتَخِفُّونَهَا ) یانی: (**تَجِدُونَهَا خَفِيفَةً**) سووکبارن، سووك و زەنگەڵن، سووك بە دەستتانەوە دێن، (**ظَعْن**) کە خوێنراویشەتەوە: (**ظَعَنْ**)، (**ظَعْن، ظَعَنْ**) کە بە مانای سەفەرو ڕۆیشتن، دێ، (**إقامة**)ش یانی: نیشتەجێبوون.

٤- ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾، هەروەها لە خورییەکانیان و، لە تووکەکانیان و، لە مووەکانیان، کۆمەڵێك کەلوپەل دروست دەکەن و، کۆمەڵێك پێداویستیی تاکو کاتێکی دیارییکراو.

(**الأَثَاثُ: إِسمُ جَمعٍ لِلأَشياءِ الَّتِي تُفْرَشُ فِي البُيُوتِ مِن وَسائِد وبُسُطٍ وَزَرَابِي، وَالمَتَاعُ أَعَمُّ مِنْ أَثَاثٍ، وَلا يَختَصُّ بالبَيْت**).

واتە: (**أَثَاثٍ**) بریتییە لەو شتانەی کە لە ماڵدا ڕادەخرێن و، دادەنرێن، وەك: باڵنج و، بەڕەو، سەرین و... هتد، کە لە خوریی و لە تووك و موو دروست دەکرێن {(**أَصوَاف**) کۆی (**صُوف**)ە، خوریی، کە هی مەڕ و بەرانە، (**أَوبار**) کۆی (**وَبَر**)ە، واتە: تووك، کە هی حوشترە، بە نێرو مێ وە: (**جَمَل، ناقة**)، (**أَشعَار**)یش کە کۆی (**شَعر**)ە، موو، کە هی بزن و نێریی یە، بەڵام ڕەشەوڵاخ (گاو مانگاو کەڵ و گامێش) هەر پێستەکەیان سوودی لێ دەبینرێ، ئەگەرنا ئەوەندەی موویان پێوە نیە لێی بکرێتەوە.

بەڵام چەمکی وشەی (**مَتَاع**) فراوانترە لە هی (**أثات**) ئەو کەلوپەلانەی کە لە ماڵدا هەبن، بەڵکو هەندێ شتی دیکەش دەگرێتەوە کە لە دەرەوەی ماڵیش سوودیان لێ وەردەگیرێ، کە لە خوریی و تووك و، مووی ئەو ئاژەڵانە دروستیان دەکەن، وەك تێر و

جەواڵ و گوریس و کەژوو و بەڕەو، فەڕش و هەموو ئەو کەلوپەلانەی دیکە، کە لە ژیانی کۆچەریی و، لە ژیانی خەڵکی دەشتەکیی و بیاباننشین و خێڵەکیی و، خەڵکی ئاژەڵداردا بەکاردەهێنرێن.

لەبارەی پێست (پێستی ئاژەڵان)ەوە، ئەو دوو فەرموودەیە دێنین:

فەرموودەی یەکەم: {أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم : ٣٦٦).

واتە: هەر پێستێك دەباغ کرابێ، پاك بۆتەوە، واتە: با ئەو ئاژەڵە مرداریش بوو بێ، کە پێستەکەی دەباغ کرا، پاك دەبێتەوە، ئەگەرنا مادام سەرببڕێ، پێستەکەی هەر بە پاك دادەنرێ، لە ڕووی شەرعییەوە، بەڵام لە ڕووی پزیشکیی و تەندروستییەوە، ئەگەر بۆنی لێبێ، یاخود زیانێکی هەبێ ئەوە شتێکی دیکەیە.

فەرموودەی دووەم: {لاَ تَنْتَفِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلاَ عَصَبٍ} (أَخْرَجَهُ الطيالسي: ١٢٩٣، وَأَحْمَد: ١٨٨٠٤، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة: ٣٣٨٨٦، وَالتِّرمِذِيُّ: ١٧٢٩، وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالنَّسائِيُّ: ٤٢٤٩، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: لە هیچ شتێکی مردارەوە بوو بەهرەمەند مەبن، نە پێست نە دەمار.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەو دوو فەرمایشتە تێکدەگیرێن.

بەڵام مانایەکەی ئاوایە، لە هیچ شتێکی مردارەوە بوو بەهرەمەند مەبن، گۆشتەکەی ئەوە هیچ، بەڵام بۆ پێستەکەی، واتە: پێش ئەوەی دەباغی بکەن، لێی بەهرەمەند مەبن، بەڵام ئەگەر دەباغ کرا، بێگومان دوای دەباغ پاك دەبێتەوە.

## مەسەلەی شازدەیەم:

هەروەها خوا ﷻ لە دروستکراوەکان دا سێبەر و لە چیایەکاندا، پەناگاو مەئوای بۆ مرۆڤان ڕەخساندوون و، پۆشاکی پارێزەر لە سەرما و گەرما و، لە زەبری جەنگیشی بۆ ڕەخساندوون، ئاوا چاکەی خۆی لەسەر تەواو کردوون، تاکو ملکەچی بن:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١- ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا ﴾، هەروەها خوا لەوەی کە دروستی کردوە لە دیاردە ماددییەکان، سێبەری بۆ ڕەخساندوون.

لێرەدا خوا ﷻ دوو وشەی بەکارهێناون: (جَعَلَ) و (خَلَقَ)، ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا ﴾، بەنسبەت سێبەرەوە (جَعَلَ)ی بەکارهێناوە، بەڵام بۆ شتەکان کە دروستیکردوون (خَلَقَ)ی بەکارهێناوە، چونکە: شتەکان پەیداکراون، بەڵام سێبەرەکان پێویستییان بە پەیداکردن نیە، سێبەر شتێك نیە پەیدا کرابێ، بەڵکو لە ئەنجامی نەمانی ڕووناکیی دا، سێبەر پەیدا دەبێ، واتە: کاتێك خۆر هەڵدێ لە خۆرهەڵاتەوە، ئەگەر بەرەو قیبلە بوەستی، یەکسەر لای ڕاستت دەبێتە سێبەر، لەبەر ئەوەی تیشکی خۆر نایگاتێ، چونکە دوایی کە خۆر وردە وردە خۆر دێتە نێوەڕاستی ئاسمان، ئەو سێبەرە نامێنێ، کە لەلای ڕاست بووە، بەڵکو ئنجا وردە وردە، کە خۆر دەکەوێتە لای خۆرئاواو بەرەو ئاوا بوون دەچێ، ئنجا سێبەر لەلای چەپەوە پەیدا دەبێ.

کەواتە: لە ڕاستییدا سێبەر شتێك نیە پەیدا کرابێ، بەڵکو لە ئەنجامی نەمانی تیشکدا، نەمانی ڕووناکیی دا، پەیدا دەبێ، بۆیە: (جَعَلَ)، واتە: خوا سێبەرەکانی بۆ گێڕاون، لەو شتانەی کە دروستیکردوون، (الظِّلَال: جَمْعُ ظِلّ، وَهُوَ كُلُّ مَا يُستظَلُّ بِهِ مِنَ الجَبَلِ وَالبَيتِ والشَّجَرِ)، واتە: (ظِلَال) کۆی (ظِلّ)ە، (ظِلّ)یش هەر شتێکە کە بە سێبەر لە قەڵەم دابنرێ و خەڵك بچێتە بنی {بۆ خۆ پەنهانکردن لە شتێکی خۆرو هەتاو} لە چیاو ماڵ و، دار و درەخت و... هتد.

٢- ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا﴾، هەروەها خوا لە چیایەکانیش پەناگای بۆ ڕەخساندوون، ئەشکەوت و چاڵ و چۆڵ و شوێنانێك کە حەشارگە بن و خۆیان تێدا پەنهان بکەن.

(**أَكْنَان: جَمْعُ كِنّ، فِعْلٌ بِمَعنَى مَفعُول، أَي: مَكنُونٍ فِيهِ: الغِيرَانُ وَالكُهُوف، غَارُ حِرَاء وغَارُ ثَور**)، (**أَكنان**) کۆی (**كِنّ**)ە، (**كِنّ**) لەسەر کێشی (**فِعل**)ە، بەڵام بە مانای (**مفعول**)ە، واتە: ئەو شوێنەی کە شتی تێدا شێردراوەتەوەو حەشار دراوە، کە مەبەست پێی ئەشکەوتەکان و پەناگاکان و نەدیوەکان و ئەنوایەکانن، لە چیایەکاندا، وەك لە سیرەدا هاتوە: ئەشکەوتی حیراء (**غَارُ حِرَاء**)، {ئەو ئەشکەوتەی کە پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی خوا بە پێغەمبەر هەڵیبژێرێ و، وەحیی بۆ بنێرێ، خواپەرستیی تێدا دەکرد} و، ئەشکەوتی ثەور (**غَارُ ثَور**)، (ئەو ئەشکەوتەو حەشارگەیەی کە پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ ئەبووبەکری صیددیقی هاوەڵیدا، خوا لێی ڕازی بێ، سێ شەوو سێ ڕۆژان خۆیان تێدا پەنادا، لە کاتێکدا کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە لە ترسی کافرەکان).

٣- ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ﴾، هەروەها خوا چەند پۆشاکێکی بۆ گێڕاون کە دەتانپارێزن لە گەرما.

(سَرَٰبِيلَ): (**جَمْعُ سِرْبَال، و السِّربَالُ: هُوَ القَمِيصُ مِنْ أَيِّ نَوْعٍ كان، أَوِ الشِّعَار تَحْتَ الدِّثَار**)، (**سِربال**) بریتیە: لە کراس لە هەر جۆرێك بێ، ئنجا (**قَمِيص**) کراس ئەوەیە کە سەرتاپا بێ، یاخود لە پشتێن بەرەو ژووری ئینسان داپۆشێ، هەروەها بە ژێرکراسیش دەگوترێ، (**سَرَوَال**)یش ئەوەیە کە لە پشتێن بەرەو ژێری داپۆشێ، بەڵام جاری واش هەیە کە (**سِربال**) - ئەگەر قەمیص تەنیا لە پشتێن بەرەو سەر بگرێتەوە - ئەو کات هەموو جەستەی ئینسان دەگرێتەوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ﴾، پۆشاکێك کە لە گەرما دەتانپارێزێ، ئنجا لە گەرما بیانپارێزێ، دەبێ هەموو جەستەیان دابگرێ.

٤- ﴿وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ﴾، هەروەها (خوا) جۆرە پۆشاکانێکیشی بۆ ڕەخساندوون، کە لە کاتی ناڕەحەتیی و شەڕ و جەنگدا، دەتانپارێزێ، کە ئەویش مەبەست پێی زرێ بووە، یاخود ئەو جۆرە پۆشاکانەی ئێستا، کە گوللە نەبڕن و لەبەر دەکرێن، خوای پەروەردگار ئەوانەشی بۆ ڕەخساندوون.

وشـەی (بـأس) لێـرەدا بـە مانـای جەنـگ دێ، بـەڵام لـە ئەسـڵ دا بـە مانـای ناڕەحەتیـی و سـەختیی دێ، ئنجـا جەنگیـش لەبـەر ئـەوەی ناڕەحەتیـی و سـەختیی تێـدا هەیـە و، خەڵکەکـە زەبـر لـە یەکـدی دەوەشـێنن، واتـە: لـە زەبـر وەشـاندنی کاتی جەنـگ، دەتانپارێـزێ.

٥- ﴿كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ﴾، ئاوا بەو شێوەیە خوا چاکەی خۆی لەسەر ئێوە تەواو دەکات، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (**كَذَلِكَ تَتِمُّ نِعمَتُهُ عَلَيْكُم**)، ئاوا چاکەی خوا لەسەر ئێوە تەواو دەبێ.

٦- ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾، بەڵکو ملکەچ بن، خوێنراویشەتەوە: (**لَعَلَّكُم تَسْلَمُون**)، کە ئەمە خوێندنەوەی: (**عکرمة وابن عباس**)ە، خوا لێیان ڕازی بێ، واتە: بەڵکو سەلامەت بن، واتە: تاکو بەهۆی ئەو نیعمەتانەی خواوە، سەلامەت بن، لە سەرماو لە گەرماو، لە کاتی جەنگیش دا، سەلامەت دەبن لە زەبری دوژمنان.

١ / (**القرطبي**) پرسیارێکی وورووژاندوە لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ: (**إِنْ قَالَ قَائِلٌ: كَيْفَ قَالَ: وَجَعَلَ لَكُم مِنَ الجِبالِ أَكناناً، وَلَم يَذْكر السَّهْلَ؟ وَقَالَ: تَقِيكُمُ الحَرَّ، وَلَم يَذْكر البَرْدَ؟ فالجَوَابُ: أَنَّ القَومَ كانُوا أَصْحَابَ جِبالٍ، وَلَم يَكُونوا أَصحَابَ سَهْلٍ، وَكانُوا أَهلَ حَرٍّ ، وَلَم يَكُونوا أَهلَ بَردٍ ، فَذَكر لَهُم نِعَمَهُ الَّتِي تَختَصُّ بِهِم، كَمَا خَصَّهُم بِذِكر الصُّوفِ وَغَيرِهِ، وَلَم يَذكر القُطنَ وَالكَتَّان وَذكر المطر والبَرَد، ولم يَذكر الثَّلجَ، فَإِنَّهُ لَم يَكُن بِبِلاَدِهِم**).

واتـە: ئەگـەر قسـەکەرێك بڵـێ: چـۆن خـوا ﷻ بـاسی کـردوە کـە لـە چیاکانـدا پەنـاگاو ئەشـکەوتی بـۆ ڕەخسـاندوون، بـەڵام بـاسی دەشـتی نەکـردوە؟ هەروەهـا بـاسی ئـەوەی کـردوە کـە لـە سـەرما دەتانپارێـزێ، بـەڵام بـاسی پارێـزران لـە سـەرمای نەکـردوە؟

وەڵامەکـەی ئەوەیـە: کـە ئـەو دوێنراوانـەی یەکەمجـار قوڕئانیـان بـۆ دابەزێـنراوە، خـاوەنی چیـا بـوون و، کەمـتر لـە پـێ دەشـتەکان ژیـاون، هەروەهـا ژینگەکەیـان، شـوێنی گەرمـا بـووەو، شـوێنی سـەرما نەبـووە، تاکـو بـاسی بـکات لـە سـەرما بیانپارێـزێ، بۆیـە ئـەو چاکانـەی خـۆی بـۆ باسـکردوون، کـە تایبەتـن بەوانـەوە، هـەروەك چـۆن بـاسی خوریـی و مـوو و تـووکی کـردوە، بـەڵام بـاسی کەرسـتەکانی دیکـەی نەکـردوە، وەك لۆکـەو کەتـان، هەروەهـا بـاسی بـاران و تـەرزەی کـردوە، بـەڵام بـاسی بەفـری نەکـردوە، چونکـە لـە وڵاتی ئـەوان نەبـووە.

ئنجـا لەوبـارەوە قسـەیەك لـە (**ابـن عبـاس**)ەوە دێنـێ، کـە گوتوویـەتی: (**الثَّلجُ شَيءٌ أَبيَضُ يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا رَأَيتُهُ قَطُّ**)، واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ، گوتوویـەتی: (ثَلج) شـتێکی سـپییە لـە ئاسـمانەوە دێتـە خـوار، بـەڵام هەرگیـز نەمبینیـوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٠، ص١٥٣.

خـوا ﷻ لـە قورئانـدا بـاسی: بـاران (وَدق) و، (مَطَـر)ی کـردوەو، بـاسی تـەرزە (بَرَد)یـشی کردوە، لـە سـوورەتی: (النـور)دا، بـەڵام بـاسی (ثَلـج)ی نەکـردوە، لەبەرئـەوەی لـە وڵاتی ئەوانـدا نەبووە.

ئەمـە دەگونجـی وەك (القرطبي) دەڵـێ: وابـێ و لەبـەر ئـەوە بـێ، خـوا ﷻ ڕەچـاوی حـاڵ واقیعـی ئـەوانی کـردوە، چونکـە ئەگـەر بـاسی (ثَلـج)ی کردبایـە، بۆیـان جێـی پرسـیار دەبـوو، (ثَلـج) چیـە؟ هەروەهـا ئەگـەر بـاسی ئـەوەی کردبایـە کـە خـوا لـە سـەرما دەتانپارێـزێ، بۆیـان جێـی پرسـیار دەبـوو، کـوا خـۆ سـەرمامان نیـە، تاکـو لـە سـەرما بمانپارێـزێ ؟

هەرچەنـدە بێگومـان ئـەو شـوێنانەش بـەشی خۆیـان سـەرمایان لـێ هەیـە، بـەڵام بـە هەرحـاڵ ئەمـە وەڵامێکـە.

**٢** / وەڵامێکی دیکە ئەوەیە: کە خوا ﷻ کاتێك لە دوو شتی دژو پێچەوانە، یەکێکیان باس دەکات، ئەویدیکەشی مەبەستە، بۆ وێنە:

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ﴾، واتـە: لـە گەرمـا دەتانپارێـزێ، هەروەهـا لـە سـەرماش، یـان: کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡ﴾، لـە کاتی جەنـگ دا دەتانپارێـزێ، یـانی: لـە کاتی ئاشـتیشدا هـەر داتاندەپۆشـێ و لێـی بەهرەمەنـد دەبـن، لەوبـارەوەش شـیعرێکیان هێنـاوە، دەڵـێ:

وَمَا أَدرِي إِذَا يَمَّمتُ أَرْضَاً أُرِيدُ الخَيْرَ أَيُّهُمَا يَلِينِي
أَلخَيرُ الَّذِي أَنا أَبتَغِيهِ أَمِ الشَّرُّ الذَّي هُوَ يَبتَغِينِي؟

دەڵـێ:

**ئەگەر ڕوومکردە سـەر زەمینێك بەهیوای چاکە، نازانم کام لە دووەکان دێ بۆ لام !**

(جارێ باسی شەڕو خراپەی هەر نەکردوە، بەڵام یەکسەر دەڵێ:)

**ئایا ئەو چاکەیەی کە من دەیخـوازم یان ئەو خراپەیەی کە ئەو بە دوای من دادێ**

واتـە: یەکسـەر کـە بـاسی خێـر دەکـرێ، شـەڕیش دێتـە زەینـەوە، هەروەهـا کـە بـاسی گەرما دەکـرێ، سـەرماش دێتـە زەینـەوە، دیسـان کـە بـاسی کاتی جەنـگ دەکـرێ، کاتی ئاشـتییش دێتـە زەینـەوە، ئـەوەش وەڵامێکی دیکـەی دووەم.

٣ / وەڵامێكی دیكە ئەوەیە: لەبەر ئەوەی كە بەرهەڵستیی مرۆڤ لە بەرانبەر گەرمادا كەمترە، وەك لە سەرما، چونكە جەستە خوا ﷻ وای خوڵقاندوە، خۆی خۆی گەرم دەكاتەوەو، كونەكانی دەگرێ و، مێشك ڕێنمایی دەدا، كە جەستە لە بەرانبەر سەرمادا، بەرهەڵستیی بكات و، خۆی گەرم بكاتەوە.

بەڵام من ئەو وەڵامەم بە دڵ نیە، چونكە جەستە، خوا ﷻ وای خوڵقاندوە لە كاتی گەرماشدا بەبێ ئەوەی كە مرۆڤ بیری لێ بكاتەوە، یەكسەر مێشك فەرمان دەكات، كونەكانی پێست بكرێنەوەو، ئارەق دەربدرێ و، ئەو گەرمایەی كە لەنێو جەستەدا هەیە، وردە وردە بچێتە دەرێ، بۆ ئەوەی جەستە هاوسەنگ بێتەوە، لەگەڵ ئەو گەرمایەدا كە لە دەرەوەی جەستە هەیە.

٤/ منیش دەڵێم: زۆر ئاساییە خوا ﷻ لێرەدا زیاتر خەڵكی دەشتەكیی و بیابانشینی دواندبێ، لەم سێ چوار ئایەتەدا، ئنجا با ئەو سێ چوار ئایەتە تایبەت بن بە خەڵكی دەشتەكیی و بیابانشینەوە، كە لە هەموو دنیادا ئەو جۆرە خەڵكانە هەن، تەنیا لەنێو گەلی عەرەب دا ئەو جۆرە كەسانە نین!

ئنجا سبحان اللّه! زۆر لە توێژەرەوانی قورئان لە سۆنگەی ئەوەوە كە لە ناوچەی عەرەبستان بوون، یان هەر زیاتر وەك ئەوان بیریان كردۆتەوە، وایانزانیوە كە ئەو جۆرە خەڵكە، یان ئەو جۆرە كەلوپەلە، یان ئەو جۆرە ئاژەڵانە، هەر لەوێ هەن، بەڵام ئەوە لە (هیند)یش هەیەو، لە (چین)یش هەیەو، لە (ئەفریقیا)ش هەیەو، لەوپەڕی دنیاش هەیەو، لەوپەڕی دیكەشی هەیە.

كەواتە: خوا ﷻ لەم چەند ئایەتەدا، دەگونجێ كە تەنیا ئەو جۆرە خەڵكەی دواندبێ كە لە بیابانشینن و دەشتەكیی و ڕەوەندن و، ژیانیان لەگەڵ ئاژەڵان دایە، لەسەر كەوڵی ئاژەڵانن و، لێیان بەهرەمەند دەبن، دەگونجێ خوا ﷻ بە تایبەت ئەوانی دواندبێ، كە نەك هەر عەرەب، بەڵكو هەموو ئەو گەل و نەتەوانەی كە لەو خاڵەدا، لەگەڵ عەرەباندا هاوبەشن.

بەڵام وەڵامەكانی دیكەش هەر ڕێیان تێدەچێ، كە خوا ﷻ هەر باسی گەرمای كردوە، سەرماش لە بەرانبەری دا و، باسی هەندێ شتی كردوە، شتەكانی دیكەش، یەكسەر دێنە زەینەوە.

## مەسەلەی حەڤدەیەم:

خوا ﷻ بە پێغەمبەری خۆی ﷺ ڕایگەیاندوە: کە ئەگەر کافرەکان لامل بوون، ئەوە تۆ بەس گەیاندنی ڕوونی پەیامی خوات لەسەرە، نەك هێنانە سەرڕێیان:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٨٢ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١- ﴿ فَإِن تَوَلَّوۡاْ ﴾، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، پشتیان تێکردی و ڕوویان وەرگێڕا.

(التَـوَلِّي: الإِعْـرَاض) ڕوو وەرگێـڕان، (أَي: فَـلا تَقصِيرَ لَدَيْـكَ، وَلا مُؤَاخَـذَة عَلَيْـكَ)، واتـە: هیـچ کەمتەرخەمیـی لـە تـۆوە نیـەو، هیـچ لێپرسـینەوەو سـزات لەسـەر نیـە.

٢- ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، بێگومان تۆ تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشكرات لەسەرە، یاخود گەیاندنی ڕوونكەرەوەو ئاشكراكەرت لەسەرە.

شایانی باسە: وشەی: (بلاغ) سێ واتای هەن:

**یەكەم:** بریتیە لە گەیشتن، گەیشتن بە ئەوپەڕی ئامانج و، كۆتاییەكەی.

**دووەم:** واتە: (تَبلِيغ)، واتە: ڕاگەیاندن، ﴿ هَٰذَا بَلَٰغٞ لِّلنَّاسِ ٥٢ ﴾إبراهيم، ئەمە گەیاندن و ڕاگەیاندنە بۆ خەڵك.

**سێیەم:** (البَلاَغُ)، یانی: (الكِفَاية)، واتە: شتێك بەس بێ بۆ شتێك و كافی بێ بۆی، ﴿ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ١٠٦ ﴾الأنبياء، واتە: لەمەدا كیفایەت و بەس بوون هەیە، بۆ كۆمەڵێك كە بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ بكەن.

## مەسەلەی هەژدەیەم و کۆتایی:

خوا ڕایگەیاندوە: کە بێبڕوایەکان چاکەی خوا دەزانن، بەڵام نکوولیی لێ دەکەن و، زۆربەیان سپڵەو ناسوپاسن:

خوا عزّ و جلّ دەفەرموێ: ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ﴾، (ئەوان) چاکەی خوا دەزانن، واتە: دەزانن کە لە خواوەیەو، خوا ئەو نیعمەتانەی بۆ ڕەخساندوون.

٢- ﴿ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴾، کەچی دواییش نکوولیی لێدەکەن، (ثُمَّ) ئەمە بۆ ڕیزبەندیی پلەپلە پلەییە، یانی: (التَّرتِيب الرُّتبِي)، یانی: لەگەڵ ئەوەش دا کە چاکەکانی خوا دەزانن، کەچی دەچن نکوولییان لێدەکەن.

{الإِنكَارُ: ضِدُّ العِرْفَانِ، أَنكرتُ كَذَا، وَنَكرتُهُ، وَأَصْلُهُ: أَن يَرِدَ عَلَى القَلْبِ، مَا لاَ يَتَصَوَّرُهُ وَذَلِكَ ضَرْبٌ مِنَ الجَهلِ: ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ ﴿٧٠﴾ ﴾ هود، ﴿ فَدَخَلُوا عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ يوسف، وَلاَ يَستعمِلُ فِيمَا يُنكر باللِّسَانِ، وَ سَبَبُ الإِنكارِ باللِّسَانِ هُوَ الإِنكارُ بالقَلْبِ، وَلكِن رُبَّمَا يُنكر اللِّسَانُ الشَيءَ، وَصُورَتُهُ فِي القَلْبِ حَاصِلَةٌ، وَيَكُونُ فِي ذَلِكَ كَاذِباً، وَعَلَى ذَلِكَ قَولُهُ تَعَالَى: ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴿٨٣﴾ ﴾ النحل، ﴿ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ المؤمنون، ﴿ فَأَيَّ ءَايَٰتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ غافر}.

واتە: (إنكار)، یانی: نەزانین، نەناسین، پێچەوانەی عیرفانە، عیرفان، واتە: زانین و ناسین، (أَنكرتُ كَذَا وَنَكرتُهُ)، واتە: ئەو شتەم نەناسی، یان نەمزانی، ئەمیش لە ئەصڵدا ئەوەیە کە شتێك بەسەر دڵ و عەقڵی مرۆڤ دابێ، کە وێنای ناکات، کە ئەوە جۆرێکە لە نەزانین، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ ﴿٧٠﴾ ﴾ هود، واتە: کاتێك ئیبراهیم عليه السلام دەستی فریشتەکانی بینیی بۆ خواردنەکە نەدەچوو، بە نامۆی هاتنە بەرچاو: نەناسراو.

یـان بـە نسـبەت (یوسـوف)ەوە عليه السلام کـە برایـەکانی دەچـن بـۆ لای: ﴿فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨﴾ یوسـف، برایـەکان لێـی وەژوور کەوتـن، ئـەو ناسـینی، بـەڵام ئـەوان بـۆ وی نەنـاس بـوون، نەیانناسی، کەواتـە: (عَرَفَهُم) واتـە: ئـەو پێیـان ئاشنا بـوو، بـەڵام ﴿وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨﴾ یوسـف، ئـەوان نـا ئاشـنا بـوون بـەوی، واتـە: نەیاننـاسی.

جـاری وا هەیـە وشـەی (إنـكار)، یـان (أنكـرتُ) یـان (نَكـرتُ)، بەکاردەهێـنرێ، بـۆ شـتێك کـە بـە زمـان نکووڵیـی لێدەکـرێ، هـۆکاری ئـەوەش کـە زمـان نکووڵیـی لـە شـتێك دەکات، لەبەرئـەوەی بـە دڵ نکووڵیـی لێـدەکات و، بـە دڵ نایناسـێ، پێـی ئاشـنا نیـە، بـە زمانیـش نکووڵیـی لێـدەکات، بـەڵام جـاری واش هەیـە، زمـان نکووڵیـی لـە شـتێك دەکات، کـە وێنەکـەی لـە دڵ و لـە عەقـڵ دا هەیـە، لـەو حاڵەتـەدا ئـەو کەسـە بـە درۆزن دادەنـرێ، وەك خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا﴾، چاکـەی خـوا دەناسـن، بـەڵام دوایـی نکووڵیـی لێدەکـەن، کـە ئەمـە لـەو جۆرەیانـە، واتـە: بـە عەقـڵ و دڵ دەزانـن: ئـەوە چاکـەی خوایـە، بـەڵام بـە زمـان نکووڵیـی لێدەکـەن و دانی پێداناهێنـن.

هەروەهـا کـە لـە سـووڕەتی: (المؤمنـون)دا دەفەرمـوێ: ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُواْ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٦٩﴾، ئایـا ڕەوانەکراوەکەیـان ناناسـن بۆیـە نکووڵیـی لـێ دەکـەن؟ واتـە: بـە دڵ دەیناسـن، چونکـە ئـەم هەمـزە (أ)یـە، هەمـزەی ئیسـتیفهامی ئینکارییـە، واتـە: دەیناسـن، کـە ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، بـەڵام بـە زمـان نکووڵیـی لێدەکـەن و دانی پێـدا ناهێنـن.

هەروەهـا لـە سـووڕەتی (غافـر)دا کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ۝٨١﴾، کام لـە نیشـانەکانی خـوا نکووڵیـی لێدەکـەن، واتـە: هەمموویـان دەزانـن بـە عەقـڵ و دڵتـان، بـەڵام بـە زمـان نکووڵییـان لـێ دەکـەن و، دانیـان پێداناهێنـن.

٣- ﴿وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، زۆربەیان کافرن، زۆربەی مانا لێکدەرەوانی قوڕئان، وشەی (ٱلْكَٰفِرُونَ)یان لێرەدا، بە (بێبڕوایان) لێکداوەتەوەو (كفر) یان (**كفر الإعتقاد**) مانا کردوە، بۆیە گوتوویانە: ئەوانە هەموویان کافر بوون، ئەدی بۆچی فەرموویەتی: زۆربەیان ؟

## چەند وەڵامێکیان داوەتەوە:

١/ هەندێکیان گوتوویانە: (أكثَر) لێرەدا مانای (جَمِيع)ە، یانی: (**جَمِيعُهُم كافِرُون**)، کە ئەوە وەڵامێکی بێهێزە، چونکە خوا دەیتوانی بفەرموێ: (**وَكُلُّهُم كافِرُون**)، یان (**جَمِيعُهُم كافِرُون**)، بەڵام کە دەفەرموێ: (**أَكثَرُهُم**) دیارە (**أَكثَرُهُم**) لە (**كُلُّهُم**) و (**جَمِيعُهُم**) جیایە.

٢/ هەندێکیان گوتوویانە: بۆیە فەرموویەتی: (**أَكْثَرُهُم**)، (**لأَنَّ فِيهِم مَنْ يُؤمِنُ**)، چونکە تێیاندا هەیە، دوایی بڕوا دێنێ.

ئەمە ڕێی تێدەچێ.

٣/ گوتوویانە: (**أَكْثَرُهُم: لأَنَّ مِنهُم مَنْ لَم تَبلُغه الدعوَةُ فَيُنكرهَا كَي يُعتَبَرَ كافِراً: أَي ساتِراً لِلحَق**)، واتە: بۆیە فەرموویەتی: زۆربەیان چونکە هەیانبووە، بانگەوازی پێ نەگەیشتوە تاکو نکوولیی لێ بکات و، بەهۆی ئەوەوە بە (**کافر**) دابنرێ، چونکە (**کافِر ، ساتر**) واتە: هەقی پێگەیشتوە، بەڵام دایپۆشیوە.

٤/ وەڵامێکی دیکە کە هی (**محمد حسين الطَّباطَبائي**)یە، لە تەفسیری (**الميزان**)دا دەڵێ: ﴿ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، (**أَي كامِلُونَ فِي الكُفرِ**)، زۆربەیان تەواویان کردوە لە کوفردا، یانی: کافری تەواون.

٥/ (**الشعراوي**) لە (**خواطر**)[1]دا، دەڵێ: (**هَذَا أُسلُوبٌ قُرآنِيٌّ لِصِيانة الإِحتِمَالِ وَلِلإِحتِياطِ لِلقِلَّةِ الَّتِي تُفَكر فِي الإِسْلَام... وَكَذَلِكَ مُرَاعَاةً لِهَؤُلاءِ الَّذِيْنَ لَم يَبلُغُوا حَدَّ التَّكلِيفِ مِنْ أَبْنَاءِ الكُفَّار**)، ئەوەش وەڵامێکی بەجێیە.

واتە: ئەمە شێوازێکی قورئانییە بۆ پارێزگاریی لێکردنی (ئەگەر) و، بۆ دووربینیی بۆ ئەو کەمینەیەی کە مسوڵمان نین، بەڵام بیردەکەنەوە لە ئیسلام، هەروەها بۆ ڕەچاوکردن و لەبەرچاوگرتنی ئەوانەی لە ڕۆڵەکانی کافرەکان، نەگەیشتوونە ڕاددەی باڵغ بوون، تاکو بە کافر لە قەڵەم بدرێن و، جارێ تەکلیفی شەرعیی ڕووی تێ نەکردوون.

٦/ بەڵام من وای تێدەگەم کە: لێرەدا (**كفر**) مەبەست پێی کوفری ئیعتیقادیی نیە، چونکە سیاقەکەو هەموو ئایەتەکان باسی چاکەو نیعمەتەکانی خوا دەکەن و، هەر ئەم ئایەتەش: ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، باس باسی بڕوا بە خوا نەهێنان و ئیعتیقاد نەبوون بە خواو ئەوانە نیە، بەڵکو باس باسی نیعمەتەکانی خوایە، واتە: چاکەکانی خوا دەناسن، بەڵام نکوولییان لێدەکەن و، زۆربەیان سپڵەن، ناسوپاسن.

کەواتە: لێرەدا مەبەست لە کوفر، کوفرانی نیعمەتە، نەك کوفری ئیعتیقادیی، ئنجا ئایا مەبەست لەوە چیە؟ مەبەست ئەوەیە کە هەندێك لە کافرەکان بەڵێ: هەموویان بێبڕوا بوون، نەك تەنیا زۆربەیان، بەڵام هەموویان سپڵەو ناسوپاس و بێ ئەمەگ نەبوون، هەیانبووە چاکەکانی خوای میهرەبان و چاکەکاری لەبەرچاوبوون، واتە: سپڵەو ناسوپاس نەبووە، ئنجا جاری وایە کەسێك کافرە، بەڵام سیفەتێکی باشی تێدایە، یانی: هەندێکیان

(١) بەرگی (١٣)، لاپەڕە: (٨١٣٨ - ٨١٣٩)دا.

شوكرانە بژێر بوون و، سوپاسی خوایان كردوە، ئەو چاكەو نیعمەتانەیان لە خوا زانیوە و، تا ڕاددەیەك بە شوكری ئەو نیعمەتانە هەڵساون، بۆ وێنە: سەخاوەتیان كردوە، یارمەتیی خەڵكیان داوە، وەك (**حاتم الطائي**) و هەندێك لە پیاوانی دیكە كە لە نێو عەرەب دا بوون، هەیانبووە چەندان كچ، كە بابیان بە تەما بوون، زیندە بەچاڵیان بكەن، گوتوویەتی: بێنە ئەو كچە بدە بە من، بەخێوی دەكەم، كە گەورە بوو دەتدەمەوە !

كەواتە: ﴿ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، یانی: زۆربەیان سپڵەو ناسوپاسن، بەڵام هەندێكیشیان تێدان كە شوكری نیعمەتی خوا دەكەن، ئەو وەڵامە كە مەرج نیە هەر من گوتبێتم، بەڵام لە تەفسیرەكان دا نەمبینی، ئەم وەڵامەم پێ بەهێزترە، هەڵبەتە: ئەوانی دیكەش وەك گوتم: زۆربەیان ڕێیان تێدەچێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی (٨٤ - ٨٩)، واتە: شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی و، لەو شەش ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕواو هاوبەش دانەران دەکات، لە ڕۆژی دوایی دا، کە چۆن پەشێمان دەبنەوەو، پەرستراوەکانیان لێ بزر دەبن و، ملکەچیی بۆ خوا دەردەبڕن و، لە نێو خۆیاندا، دەکەونە دەمەقاڵێ و قسە بە یەکدی گوتن و، سەرکۆنەی یەکدی کردن.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ: کە کتێبێکی بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ ناردوە، کتێبێکی بۆ دابەزاندوە، کە ڕۆشنکەرەوەی هەموو شتێك و، ڕێنمایی و بەزەیی و موژدەیە بۆ مسوڵمانان، ڕوونکردنەوەی هەموو شتێك، واتە: هەموو شتێك وەك بەرنامەی ژیان و گوزەرانی مرۆڤ، کە پەکی لەسەر وەحیی بکەوێ: ڕوونی دەکاتەوە.

﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەو ڕۆژە (ڕۆژێکی زۆر مەزنە)، کە لە نێو هەر کۆمەڵێکدا شایەدێك دێنین (شایەدییان لەسەر بدات)، ئنجا ئەوانەی ستەمیان کرد بوو، مۆڵەتیان نادرێ (هیچ بڵێن) و، داواشیان لێ ناکرێ داوای لێبوردن بکەن (و خوا ڕازی بکەن) ﴿٨٤﴾ هەر کاتیش ئەوانەی ستەمیان کردوە، سزاو ئازاریان بینی، نە لەسەریان سووك دەکرێ و، نە مۆڵەتیشیان دەدرێ و دوادەخرێن ﴿٨٥﴾ هەروەها کاتێك ئەوانەی هاوبەشیان (بۆ خوا) داناوە، هاوبەشەکانیان دیتن، دەڵێن: پەروەردگارمان! ئەوانە ئەو هاوبەشانەمان بوون کە لە جیاتی تۆ لێیان دەپاڕاینەوە، ئەوانیش (هاوبەشەکان وەڵامیان دانەوەو) قسەکەیان بۆ فڕێدانەوە (و گوتیان): بێگومان ئێوە درۆکارن ﴿٨٦﴾ لەو ڕۆژەدا (هەموویان) مل کەچییان بۆ خوا دەربڕی و، ئەوەی هەڵیاندەبەست (لە هاوبەشان بۆ خوا) لێیان ون بوون ﴿٨٧﴾ ئەوانەی بێبڕوا بوون و، خەڵکیان لەڕێی خوا لادا، سزا لەسەر سزا بۆیان زێدە دەکەین، بەهۆی ئەوەوە کە تێکدانیان لە زەویدا دەکرد ﴿٨٨﴾ ئەو ڕۆژەش (ڕۆژێکی بێڕەزایە) کە لە هەر کۆمەڵێك لە خۆیان شایەدێکیان بەسەرەوە دێنین، تۆش (ئەی موحەممەد!) بە شایەد بەسەر ئەوانەوە (کە تۆ بۆ لایان ڕەوانکراوی) دینین، کتێبیشمان دابەزاندۆتە سەرت، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، (کە پێویستیی بە ڕوونکردنەوەی خوا هەبێ) و، ڕێنمایی و بەزەیی و موژدەیە بۆ گەردنکەچان (بۆ خوا) ﴿٨٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( نَبْعَثُ ): واتە: دەینێرین، یان زیندووی دەکەینەوە، (أَصْلُ البَعثِ: إِثَارَةُ الشَّيئِ وَتَوجِيهُهُ، وَيَخْتَلِفُ البَعْثُ بِحَسَبِ اخْتِلَافِ مَا عَلَقَ بِهِ: بَعَثَ البَعِيرَ، بَعَثَ اللَّهُ المَوتَى..)، وشەی (بَعث) لە ڕیشەدا پەیداکردنی شتێك و ئاراستەکردنی شتێکەو، بە پێی ئەوەی پێیەوە پەیوەست دەبێ، ماناکەی دەگۆڕێ، (بَعَثَ البَعِيرَ)، واتە: حوشترەکەی هەڵساند، بەڵام (بَعَثَ اللَّهُ المَوتَى)، خوا مردووەکانی زیندوو کردەوە، کە لێرە مەبەست لە ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە دوای مردنیان، زیندوویان دەکەینەوە، هەڵیان دەسێنینەوە.

( وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ): (عَتَب): هەر شوێنێکە، کە کەسێك بیەوێ لەسەری دابنیشێ و، بەرز بێ لە بنی دا، بۆیە (عَتَبَة الباب)، واتە: شیپانەی دەرگا، ئەو کۆسپەی پێش دەرگا، (إستعتَبَ: طَلَبَ الإِعْتَابَ)، داوای (إِعتَاب)ی کرد، (وَالإِعتَابُ: إِزَالَةُ الشَّكْوَى والعِتَاب)، (إعتَاب)، بریتیە: لە لابردنی سکاڵاو لابردنی (عِتَاب) و، (عُتبَى)ش ناوە لە (إِعتَاب)، (عُتبَى)، واتە: ڕازیکردن، ئنجا (وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ)، واتە: داوایان لێ ناکرێ، داوای لێبوردن بکەن، یان داوایان لێ ناکرێ کە خوا ڕازی بکەن و، عوزری بۆ بێننەوەو داوای لێبوردنی لێ بکەن و، خوا ڕازی بکەن، چونکە قیامەت شوێنی ئەوە نیە.

( فَأَلْقَوْاْ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ ): واتە: قسەیان بۆ فڕێدان، (أَلْقَيْتُ الشَّيءَ: طَرَحْتُهُ، وَأَلْقَيتُ إِلَيْهِ القَولَ: أَبْلَغْتُهُ، وَأَلْقَيْتُ عَلَيْهِ: أَمْلَيْتُ عَلَيْهِ)، (أَلْقَيْتُ الشَّيءَ)، واتە: شتەکەم فڕێدا، هاویشتم، (وَأَلْقَيْتُ إِلَيْهِ القَولَ)، واتە: قسەکەم گەیاندێ، بەڵام (وَأَلْقَيْتُ عَلَيْهِ)، واتە: بەسەرم دا خوێندەوە.

( ٱلسَّلَمَ ): (سِلْمُ، وَسَلْمُ، سَلَم) هەرسێکیان بە مانای صوڵح و ئاشتەوایی و تەبایی و ملکەچیی دێن، بە (مُذَكَّر) دێن و، بە (مُؤَنَّث)یش.

( تِبْيَٰنًا ): واتە: ڕوونکردنەوە، (بَيَّنَ الشَّيءَ تَبْيِيناً وَتِبيانا: أَوْضَحَهُ تَوْضِيحاً)، (تِبْيَٰنًا ): یانی: (بیان)، ڕوونکردنەوە، بەڵام دیارە ماناکەی بەهێزترە لە (بیان)، واتە: ڕوونکردنەوەیەکی باش، یان ڕوونکردنەوەیەك بە تۆخیی.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم شـەش ئایەتـەدا وەك لـە پێناسـەكەیاندا گوتمـان: بـاسی سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان دەكات لـە ڕۆژی دوایـی دا، كـە چـۆن خـوا ﷻ شـایەدانیان بەسـەرەوە دێنـێ و، چۆن ڕێیـان نـادرێ كە نـە داوای لێبـوردن لـە خـوا بكـەن، نـە قسـەیەك بكـەن، نـە خـوا ڕازی بكـەن و، پاشـان لەنێـو خۆیـان دا، چـۆن دەكەونـە مشـتومڕو گلەیـی و بناشـت لـە یەكـدی كـردن.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ﴾، ئـەو ڕۆژە كـە لـە هەمـوو كۆمەڵگایـەك، لـە هەمـوو كۆمەڵـە خەڵكێـك، شـایەدێكیان بەسـەرەوە دێنیـن، واتـە: ئـەو ڕۆژە ڕۆژێـكی گەورەیـە، یاخـود یـادی ئـەو ڕۆژە بكـەوە، ئـەو ڕۆژە بێنـە بەرچـاوی خـۆت، كـە لـە هـەر كۆمەڵگایـەك شـایەدێكیان بەسـەرەوە دێنیـن، كـە وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەكانـدا، بـاسی دەكەیـن، مەبەسـت لـەو شـایەدانە، پێغەمبەرانـن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، دەشـگونجێ لـە دوای پێغەمبـەران، مەبەسـت میراتگـرانی پێغەمبەرانیـش بـن، هـەر كەسـێك كـە لـە نێـو كۆمەڵـگاو ئۆممەتێـك دا، بەڵگـەی خوایان لەسـەر تـەواو بـكات و پەیامـی خوایـان پـێ ڕابگەیەنـێ، لـە ڕۆژی دواییشـدا لەسـەریان دەبێتـە شـایەد، ﴿ ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، پاشـان ئەوانـەی كـە بێبڕوا بـوون، مۆڵەتیـان نـادرێ، مۆڵەتیـان بەچـی نـادرێ؟ یـانی: مۆڵەتیـان نـادرێ قسـە بكـەن، مۆڵەتیـان نـادرێ داوای لێبـوردن بكـەن، مۆڵەتیـان نـادرێ بەرگریـی لـە خـۆ بكـەن و، قسـەی بێجـێ بكـەن، ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾، هەروەهـا داواشیان لـێ ناكـرێ: داوای لێبـوردن بكـەن و، خـوا ڕازی بكـەن و، پـۆزش بـۆ خـوا بێننـەوە ﷻ.

﴿ وَإِذَا رَءَا الَّذِينَ ظَلَمُوا الْعَذَابَ ﴾، هەروەهـا كاتێـك ئەوانـەی سـتەمیان كـردوە، سـزایان بینـی، ئـازاری خوایـان بینـی، ﴿ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾، نـە لەسـەریان سـووك دەكـرێ و، نـە مۆڵەتیـش دەدرێـن، چاوەڕوانییـان ناكـرێ و، دوا ناخرێـن.

كـە مەبەسـت لـە: (الْعَذَابَ)، لێـرەدا زیاتـر وا پێدەچـێ سـزای ڕۆژی دوایـی، (دۆزەخ بـێ)، دەشـگونجێ سزاو بەڵایـەك بـێ، كـە خـوا دەینێـرێ بـۆ لەبەینـبردنی كۆمەڵـگاكان، یاخـود مەبەسـت پێـی سـزای سـەرەمەرگ بـێ، بـۆ هـەر مرۆڤێـك كـە لەسـەر كوفـر و زوڵـم و خراپـە دەمـرێ.

﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ شُرَكَآءَهُمْ ﴾، کاتێـك ئەوانـەی هاوبەشـیان دانـاوە، هاوبەشـەکانی خۆیـان دەبینـن، لـە ڕۆژی دواییـدا، ﴿ قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُواْ مِن دُونِكَ ﴾، کاتێـك دەیانبینـن، چـی دەڵێـن؟ خـوا بـە کـرداری ڕابـردوو هێناویـەتی، هەرچەنـدە جـارێ ئـەو قیامەتـە نەهاتـوە، بـەڵام چونکـە بـۆ خـوا ﷻ ئاسـانە و هەمـوو شـتێك لەبەردەسـتی خوادایـەو، هیـچ شـتێکی لەبـەر عاسـێ نابـێ، بۆیـە: وەك هاتبـێ و تێپەڕیبـێ، گوتیـان: پەروەردگارمـان! ئـا ئەوانـە ئـەو هاوبەشـانەمان بـوون کـە لـە جیاتی تـۆ، لـە خـوار تـۆوە لێیـان دەپاڕاینـەوە، ﴿ فَأَلْقَوْاْ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾، کەچـی هاوبەشـەکانیان قسـەیان بـۆ فڕێدانـەوە، گوتیـان: بێگومـان ئێـوە درۆ کارن، درۆزنـن، واتـە: ئێـوە ئێمەتـان نەدەپەرسـت.

﴿ وَأَلْقَوْاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ﴾، هەروەهـا لـەو ڕۆژەدا، ملکەچییـان بـۆ خـوا فڕێـدا، ملکەچییـان بـۆ خـوا خسـتە ڕوو، وەك چـۆن کەسـێك لـە بەرانبـەر دوژمنەکەیـدا، تەسـلیم دەبـێ و چەکەکـەی بـۆ فـڕێ دەدا، ئەوانیـش ئـاوا تەسـلیم بـوون، خۆیـان بەدەسـتەوەدا، ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾، ئـەوەش کـە هەڵیـان دەبەسـت، لێیـان ونبـوو، لێیـان بزربـوو، بێسـەر و شـوێن بـوو، ئایـا ئـەوەی هەڵیاندەبەسـت چـی بـوو؟ بریتـی بـوو لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان، چونکـە خـوا ﷻ نـە لـە دنیـا و نـە لـە دواڕۆژدا، هاوبـەشی نیـە (هـەر خـوا خوایـە، ئـەوی دیکـە هەمـووی کاو بایـە)، بۆیـە ئەوانـە بـەدوای وەهـم و گومـان کەوتبـوون، شـەیتان فێڵـی لێکـرد بـوون و، چـوو بـووە زەینیانـەوە، کـە ئەوانـە هاوبـەشی خـوان، بـەڵام موستەحیلە خـوا ﷻ هاوبـەشی هەبـێ، لـە نێـو دروسـتکراوەکانی دا، کـە خـۆی دروسـتی کـردوون! ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون و، خەڵکیشـیان لـە ڕێـی خـوا لاداوە، سـزا لەسـەر سـزایان بـۆ زیـاد دەکەیـن، بەهـۆی ئـەو خراپەکارییـەوە کـە دەیانکـرد، بەهـۆی ئـەو تێکدانـەوە، کـە دەیانکـرد، بەوەنـدە ئیکتیفایـان نەکـرد بـوو کـە خۆیـان لەڕێـی خـوا لابـدەن، خەڵکیشـیان لـە ڕێـی خـوا لادەدا، بۆیـە خـوا ﷻ لـە سـەرووی سـزای خۆیانـەوە، سـزای دیکەشـیان بـۆ زیـاد دەکات.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، ئـەو ڕۆژەش کـە لـە هـەر کۆمەڵگایـەك لـە خۆیـان شـایەدێکیان بەسـەرەوە دەگریـن، ئـەو ڕۆژە ڕۆژێـکی مەزنـە، یاخـود یـادی ئـەو ڕۆژە بکـەوە، بیهێنـە بەرچـاوی خـۆت، ﴿ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، هەروەهـا ئـەو ڕۆژە کـە تۆشـمان هێنـا شـایەد بـی، بەسـەر ئەمانـەوە،

(ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (موحەممەد) ﷺ بۆیان ڕەوانە کراوە)، کە هەم کافرەکانی ڕۆژگاری خۆی و، هەم هەموو بەشەر تاکو تاکە مرۆڤێك لەسەر زەوی مابێ، ئەوانە هەموویان ئەو خەڵکەن کە پێغەمبەر ﷺ بەسەریانەوە دەبێتە شایەد.

﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾، کتێبیشمان دابەزاندۆتە سەر تۆ، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، زۆر چاکی ڕوون دەکاتەوە.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: کوا خوا ﷻ لە قورئان دا بۆی باس نەکردووین: چۆن کۆمپیۆتەر دروست بکەین؟ چۆن فڕۆکە دروست بکەین؟ چۆن: ڕۆکێت دروست بکەین؟ بۆیە وەك دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، واتە: هەموو شتێك کە پێویستیی بە ڕوونکردنەوەی خوا هەبێ، بەڵام ئەوەی لە مەودای عەقڵی خۆتاندایەو، خۆتان دەتوانن دەرکی بکەن، خوا بە پێویستی نەزانیوە ئەوە ڕوون بکاتەوە، بەڵکو شتێك کە لە مەودای عەقڵی بەشەر بەدەر بێ و، مرۆڤ خۆی فیکری پێ نەشێ، خوا ئەو شتانەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾، هەروەها (قورئان) ڕێنمایی و بەزەییەو، مژدەشە، بۆ بۆخوا ملکەچان، بۆ ئەوانەی گەردنکەچی خوان.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**لە ڕۆژی دوایی دا، خوا هەر کۆمەڵگایەك شایەدێکی لەسەر ڕاست دەکاتەوە، پاشان مۆڵەت نادرێتە بێبڕوایەکان، قسە بکەن و داوای لێبوردن بکەن و، داواشیان لێ ناکرێ: لۆمەو ڕەخنەی خوا لەسەر خۆیان لابەرن و، خوا لە خۆیان ڕازی بکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ﴾، ئەو ڕۆژە کە لە هەر کۆمەڵگایەك شایەدێك دێنین، شایەدێکیان بۆ دەنێرین، {ڕۆژێکی مەزن و دژوارە}.

ئەمە لە چەند شوێنێکی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

أ) لە سوورەتی (**یونس**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

واتە: بۆ هەر کۆمەڵگایەك ڕەوانەکراوێك هەیە، ئنجا کاتێك کە ڕەوانەکراوەکەیان دێ، دادوەرییان لە نێواندا دەکرێ، {مەبەستی پێ ڕۆژی دواییە}، بەبێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

کەواتە: مەبەست لە (شهید)یش، ئەو پێغەمبەرەیانە، کە بۆیان ڕەوانە کراوە، ئەوە بەسەریانەوە دەبێتە چاودێرو شایەد.

ب) هەروەها لە سوورەتی (النساء)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ ﴾.

واتە: چۆن دەبێ کاتێك کە لە هەر کۆمەڵگایەك شایەدێك دێنین و، تۆشمان بەسەر ئەوانەوە بە شایەد گرت؟ ئەو ڕۆژە ئەوانەی کە بێبڕوا بوون و سەرپێچییان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، خۆزگە دەخوازن کە لەگەڵ خاکدا یەکسان بن و، لەو ڕۆژەدا هیچ قسەیەك لە خوا پەنهان ناکەن.

٢- ﴿ ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، دوایی مۆڵەت نادرێ بەوانەی بێبڕوان.

لە سوورەتی (المرسلات)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، ئەمە لە سوورەتی: (المرسلات)دا ڕوونکراوەتەوە، مۆڵەتی چییان نادرێ؟ کە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، ئەمە ڕۆژێکە کە قسەی تێدا ناکەن، ئاخاوتنی تێدا ناکەن، تێیدا نادوێن، ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، مۆڵەتیشیان نادرێ، داوای لێبوردن بکەن و، پۆزش بۆ خوا بێننەوە.

قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات.

٣- ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾، ئەمە تۆزێك پێویستی بە وردەکاریی هەیە، ڕاستە مانایەکەی ئەوەیە: داوایان لێ ناکرێ، داوای لێبوردن لە خوا بکەن، داوایان لێ ناکرێ، خوا لە خۆیان ڕازی بکەن.

بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئەم ڕستەیە، قسەی چوار لە زانایان دێنین:

١- (أَي لا يُطْلَبُ مِنْهُمُ العُتْبَى)، واتە: داوایان لێناکرێ خوا ڕازی بکەن، دەڵێ: (العُتْبَى: إِزَالَةُ عَتْبِ رَبِّهِم وَغَضَبِهِ)، (عُتبَى) بریتیە لە لابردنی گلەیی و توورەیی خوا، (وَالعُتبَى: الرِّضَا، وَهُوَ الرُّجُوعُ عَنِ الإِساءةِ إِلَى مَا يُرْضِي العَاتِبَ، يُقَالُ: إستعتَبَهُ: أَعْطَاهُ العُتْبَى بالرُّجُوعِ إِلَى مَسَرَّتِهِ، وَالعَتْبُ: لومُكَ الرَّجُلُ عَلَى إِساءَةٍ كانَت لَهُ إِلَيْكَ، وَالمَرْءُ إِنَّمَا يَطْلُبُ العتَابَ مِن خَصمِهِ ، لِيُزِيلَ مَا فِي نَفسِهِ عَلَيهِ مِنَ المَوجِدَةِ وَالغَضَبِ، وَيَرجِعُ إِلَى الرضَا عَنهُ، فَإِذَا لَم يَطلُبِ العِتَابَ مِنهُ، دَلَّ ذَلِكَ عَلَى أَنَّهُ ثَابِتٌ عَلَى غَضَبِهِ عَلَيهِ)[1].

واتە: (عُتبَى)یان لێ داوا ناکرێ، یانی: لابردنی گلەیی و توورەیی خوا، (عُتبَى): بریتیە لە ڕەزامەندیی، ئەویش ئەوەیە کە کەسێك خراپەی کردوە، بگەڕێتەوەو کارێك بکات: ئەوەی گلەیی لێی هەبووە و ڕەخنەی لێی هەبووە، لێی توورە بووە، لێی ڕازی بێ، دەگوترێ: (إستعتَبَهُ)، واتە: (عُتبَى)ی پێدا، بەوە کە تائێستاکە لێی توورە بووە، لەمەودوا

---

(١) مَحاسِن التَّاويل: ج ١٠، ص ١٤٦.

لێـی ڕازی بـێ، (عَتب): بریتیـە لـەوە تـۆ لۆمـەی پیاوێـك بكـەی، كـە خراپـەی لەگـەڵ تـۆدا كـردوە، ئنجـا مـرۆڤ كـە داوا لـە بەرانبەرەكـەی دەكات، كـە ناكۆكیـی لەگەڵیـدا هەیـە، كـە لۆمـەی لـێ بـكات و پێـی دەڵـێ: گلەییـم لـێ بكـە، لۆمـەم بكـە، تاكـو ئـەو تووڕەیـی و لـە دڵگرتنـەی كـە چۆتـە دڵـی، لـە بەرانبەریـدا لابچـێ و، سـەرەنجام لێـی ڕازی بـێ، بـەڵام ئەگـەر كەسـێك داوا نـەكات، لـە كەسـێك كـە لێـی تـووڕە بـووە، پێـی بڵـێ: لۆمـەم بكـەو، ڕەخنـەم لـێ بگـرە و قسـەم پـێ بڵـێ، ئەگـەر داوای لـێ نـەكات، مانـای وایـە بەرانبەرەكـەی چەسـپاوە لەسـەر تووڕەیـی و گلەییەكـەی خـۆی.

**٢/** (الشعراوي) دەڵێ: (**يُستعتَبون: مَادَّة استعتَبَ مِنَ العِتَابِ وَالعِتَاب مَأخُوذ مِنَ العَتْبِ وَأَصلُهُ الغَضَبُ وَالمَوجِدَةُ، تَجِدُهَا عَلَى شَخصٍ آخَر صَدَرَ مِنهُ نَحْوكَ، ما لَم يَكُن مُتوقَّعًا مِنهُ، فَإِن استقرَّ العَتبُ فِي النَّفسِ، فَأَنتَ إِمَّا أَن تَعتَبَ عَلَى مَن أَساءِ إِلَيكَ وَتوضِّح لَهُ مَا أَغضَبَكَ، فَرُبَّمَا كانَ لَهُ عُذرٌ، أَو أَساءَ عَن غيرِ قَصْدٍ مِنْهُ، فَإِن أَوضَحَ لَكَ المَسأَلَةَ وَأَرضَاكَ وَأَذهَبَ غَضَبَكَ، فَقَد أَعتَبَكَ فَنَقُولُ: عَتَبَ فُلانٌ عَلى فُلانٍ فَأَعتَبَهُ، أَي أَزَالَ عَتبَهُ** ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾**، أَي: لايَطلُبُ أَحَدٌ مِنهُم أَن يَرجِعُوا عمَّا أَوجَبَ العَتْبَ، وَهُو كُفرُهُم، فَلَم يَعُد هُناكَ وَقتٌ لِعِتَابٍ، لأَنَّ الآخِرَةَ دَارُ حِسَابٍ وَلَيسَ دَارَ عَمَلٍ وَتَوبَة**)[1].

دەڵێ: (**يَستعتِبون**) لە ماددەی (**إستعتَبَ**)ەوە هاتوە، كە ئەویش لە (**عِتَاب**)ەوە (**عِتاب**)یش لە (**عَتب**)ەوە هاتوە، یانی: لۆمەكردن، ئەویش بریتیە لە تووڕە بوون و لە دڵگرتنێك كە دەچێتە دڵت بەرانبەر بە كەسێكی دیكە، شتێك لەوەوە دەرچووە بەرانبەر بە تۆ، كە لێت چاوەڕوان نەكردوە، ئنجا هەر كاتێك گلەیی لە دڵدا جێگیر بوو، تۆ یان ئەوەتا گلەیی دەكەی لەو كەسە كە خراپەی لەگەڵ تۆ كردوەو، بۆی ڕوون دەكەیەوە، ئەوەی كە تۆی تووڕە كردوە، كە ڕەنگە عوزرت بۆ بێنێتەوە، یاخود لەوانەیە بەبێ ئەوەی بیەوێ، خراپەی لەگەڵ تۆ كرد بێ، ئنجا ئەگەر ئەویش بۆی ڕوونكردیەوە، تۆی ڕازی كرد، تووڕەیی تۆی لابرد (**فَقَد أَعتَبَكَ**)، ئەوە عیتابەكەی تۆی لابردوە، دەگوترێ: (**عَتَبَ فُلانٌ عَلى فُلانٍ، فَأَعتَبَهُ، أي أزال عَتْبَهُ** )، فلانكەس گلەیی لە فلانكەس كرد، ئەویش گلەییەكەی لابرد.

كەواتـە ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾، واتـە: هیـچ كەسـێك داوایـان لـێ نـاكات، كـە ئـەوەی مایـەی گلەیـی لێكرانیـان بـووە، كـە كوفرەكەیانـە، لابچـێ، چونكـە لـەو كاتـەدا مەجالـی گلەیـی كـردن نەمـاوە، لەبەرئـەوەی ڕۆژی دوایـی شـوێنی لێپرسـینەوەو سـزایە و، شـوێنی كـردار و گەڕانـەوە نیـە.

---

(١) تفسير الشعراوي: ج ١٣، ص (٨١٤٠ -٨١٤١).

**٣/** ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾، (**لا تُطلَبُ مِنهُمُ العُتبَى بِمَعْنَى: لا يُكَلَّفُونَ أَن يُرضُوا رَبَّهُم**)[1]، قسەی (**الشَنقيطي**)يەو، بە دوو شێوە هێناویەتی دەڵێ:

**یەکەم:** (**لاَ يُستعتَبون**)، واتە: (**عُتبَى**)یان لێ داوا ناکرێ، واتە: داوایان لێناکرێ پەروەردگاریان ڕازی بکەن.

**دووەم:** هەروەها گوتوویەتی: (**لا يُعتَبون بِمَعنَى: لا يُزَالُ عَنهُمُ العَتْبُ، وَيُعْطونَ العُتبَى وَهِيَ الرِّضَا**)، واتە: گلەییەك کە لەسەریانە، لاناچێ کە سەرەنجام عوتبایان پێ بدرێ، کە بریتیە: لە ڕەزامەندیی.

**٤/** ( **محمد الطاهر بن عاشور**)یش دەڵێ: (**الإستعتَابُ: أَصلُهُ طَلَبُ العُتبَى، والعُتبَى: الرِّضَى بَعدَ الغَضَب**)[2]، (**إستعتَابُ**): بریتیە لە داواکردنی (عتبى)، (عتبى)ش واتە: ڕازیبوونی دوای تووڕە بوون.

کەواتە: ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾، داوایان لێناکرێ کە خوا ڕازی بکەن و، گلەیی خوا لەسەر خۆیان لابەرن.



(١) (أَضواءُ البَيان) ج ٢، ص ٤٢٣، للشنقيطي.

(٢) (التَّحرِير وَالتَّنوِير) ج ١٤، ص ١٤٤.

**مەسەلەی دووەم:**

**لە ڕۆژی دوایی دا كاتێك كافرە ستەمكارەكان سزای خوا دەبینن، نە لەسەریان سووك دەكرێ و نە مۆڵەتیشیان دەدرێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ  ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ ﴾، كاتێك ئەوانەی ستەمیان كردووە سزاو ئازاری خوا دەبینن، لێرەدا نەیفەرمووە: (وَإِذَا رَأَوا)، چونكە پێشتر قسە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان كراوە و، بە سیاق دەزانرێ كە مەبەست پێی ئەوانە، بەڵام بۆیە لێرەدا دەرخستن (**إظهار**) خراوەتە شوێن بەكارهێنانی ڕاناو و شاردنەوە (**إضمار**)، تاكو ئەو سیفەتانەی كە ئەوانە ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، لە خۆیانیاندا هێناونە دی، دەربخرێن، تاكو بزانرێ كە وێڕای ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرن، ئەهلی ستەم (**ظُلم**)یشن، ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ ﴾، ئەوانەی كە ستەمیان كردوە، كاتێك كە سزاو ئازاری خوایان بینی.

كە دەگونجێ مەبەست لە (ٱلۡعَذَابَ)، سزای دواڕۆژی بێ، كە سزای دۆزەخە.

دەشگونجێ مەبەست پێی سزای دنیایی بێ، یانی: كاتێك سزای خوا دێ، بەڵای خوا دێ، بۆ لەبەینچوونیان، یاخود سزای كاتی سەرە مەرگ دێ، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی سزای دۆزەخ بێ، (ئەلیف و لامی) سەر (ٱلۡعَذَابَ)یش، كە بۆ ناساندن و (**تعريف**)ە، بۆ (**عهد**) بێ، یانی: كاتێك سزایەكەیان بینی، واتە: ئەو سزایەی كە دەزانرێ كامەیە كە سزای دۆزەخە.

٢- ﴿ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ ﴾، واتە: هەرچەند داوا بكەن لەسەریان سووك بكرێ، لەسەریان سووك ناكرێ، مەبەست ئەوەیە، یانی: سزایەكەیان لەسەر سووك ناكرێ.

٣- ﴿ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾، هەروەها چاوەڕوانییشیان ناكرێ، یان مۆڵەتیان نادرێ، یاخود دوا ناخرێن، دواناخرێن: (**أي: لا يُؤَخَّرُ إقْحَامُهُم فيهِ**)، خستنە نێویان بۆ ئەو سزایەی خوا، دواناخرێ، بەڵكو یەكسەر دەخرێنە نێو سزای خوای دادگەرەوە، بەبێ دواخران.

**مەسەلەی سێیەم:**

هاوبەش بۆ خوا دانەر و بە هاوبەش دانراوەکان لە ڕۆژی دوایی دا، دەبێتە مشتومڕ و دەمەقاڵێیان و، سەرەنجامیش هەموویان تەسلیمی خوا دەبن و، ئەوەی هەڵیان دەبەست، لێیان بزر دەبێ، کە مەبەست پێی ئەو شتانەیە کە کردوویاننە هاوبەشی خوا ﷻ:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾:

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

١- ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ ﴾، کاتێك ئەوانەی هاوبەشیان داناوە، هاوبەشەکانی خۆیانیان بینین.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەوانە کوا هاوبەشی خوا بوون؟ دەڵێین: ئەمە دوو واتای هەیە:

**یەکەم:** ئەوانەی کە بەپێی ئیعتیقادی ئەوان و بە بۆچوونی ئەوان، هاوبەشی خوا بوون، ئەوانەیان بینی.

**دووەم:** یاخود لێرەدا وشەی (شُرَكاء) یەکسەر بۆتە نازناوی بت و صەنەمانیان و، مانای هاوبەشی خوا بوونی لێ لابراوە، وەك گێڕراوەتەوە: جارێك هۆزێك بەسەر هۆزێك دادەدەن، ئنجا ئەو سەرۆك هۆزەی کە بەسەر هۆزەکەی دیکەیان داداوە، دەڵێ: فلان کەسیشم کوشت لە هۆزی بەرانبەر، دیارە مەجلیسێکی فراوان دەبێ و، ئەو کەسەش لە مەجلیسەکەدا دەبێ، (بەڵام واپێدەچێ نەیناسیبێ)، دەڵێ: (مَهْلاً أَبا ثَورٍ قَتِيلُكَ يَسْمَعُ)، واتە: ئەبوو ثەور لەسەرەخۆبە، کوژراوەکەت دەبیستێ، واتە: ئەوەی کە بە خەیاڵی خۆت کوشتووتە، گوێی لێیەو زیندوویە، یانی: ئەوەی کە بە حیسابی تۆ کوژراوە، ئەگەرنا لە حەقیقەتدا کوژراو نیە، ئنجا (شُرَكَآءَهُمْ) واتە: ئەوەی بە بۆچوونی ئەوان هاوبەش بوون بۆ خوا.

ئنجا کاتێك هاوبەش دانەرەکان هاوبەشەکانی خۆیان دەبینن، چی دەڵێن ؟

٢- ﴿قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان! ئا ئەو هاوبەشانە بوون کە ئێمە لە جیاتی تۆ لێیان دەپاڕاینەوەو، دەمانپەرستن، ئا ئەوانە بوون کە ئێمە کردبوومانن بە هاوبەشی تۆو، لە جیاتی تۆو، لە خوار تۆوە، لێیان دەپاڕاینەوە.

لێرەدا ئەگەر مەبەست پێی بت و صەنەمەکان بێ، دەڵێ: (**الجَمْعُ فِي اسْمِ الإِشَارَةِ، وَاسْمِ الْمَوصُولِ، جَمْعُ العُقَلاَءِ، جَرِياً عَلَى اعْتِقَادِهِم**)، ﴿هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ﴾، هەم ناوی ئاماژەکە، (**هؤلاء**) هەم ناوی (**موصول**) (ٱلَّذِينَ)، هەردووکیان بۆ کۆمەڵە عاقڵێکن کە خاوەنی هەست و ئیرادە بن، ئنجا بۆیە ئەوە بۆ بت و صەنەمەکان بەکارهێنراوە، هەرچەندە بت و صەنەمەکانیان دارو بەردو پەیکەری بێ گیان و بێ شعوور بوون، چونکە:

١/ بەپێی ئیعتیقادی ئەوان کە پێیان وابووە، ئەو بت و صەنەمانە هەستیان هەیە و، توانای دەرککردنیان هەیە و، بەپێی عەقڵی ئەوان، ناو لەو پەرستراوانە نراوەو، بەگوێرەی عەقڵ و عەقیدەی خۆیان دوێنراون.

٢/ دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ﴾، بت و صەنەمەکان نەبن و، ئەو بتەوانانە (**سَدَنة**)[1] بن کە خزمەتی بت و صەنەمەکانیان کردوە ، هەر بتێك کەسێکی هەبووە خزمەتی کردوەو، لەپشت بتەکەوە قسەی کردوەو، گوتوویەتی: ئاواو ئاوا دەڵێ.

٣/ یاخود مەبەست هەموو ئەو کەسانەیە لە شەیتانەکان و لە مرۆڤە لە خوا یاخییەکان، کە لە جیاتی خوا دەپەرسترێن.

٤/ یاخود مەبەست پێی هەموویان بێ، ئنجا خاوەن عەقڵ و شعوورەکان، زاڵ کرابن بەسەر بێ ژیان و بێ شعوورەکان دا، بەسەر بت و صەنەمەکاندا.

٣- ﴿فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ﴾، ئەو هاوبەشانەیان کە لە خەیاڵی ئەواندا هاوبەشی خوا بوون، ئەو پەرستراوانەیان: قسەیان بۆ فڕێدان، واتە: ئەو قسەیە، خوا فڕێی داوەتە سەر زمانی بت و صەنەمەکان، یان لە زاریان کەوتە خوارێ و، قسەکەیان بۆ هاویشتنەوە.

٤- ﴿إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾، گوتیان: بێگومان ئێوە درۆزنن، ئێوە درۆکارن، واتە: ئێوە لە ئێمە نەپاڕاونەوەو ئێمەتان نەپەرستوە.

---

(١) (سدنة) کۆی (سادِن)ە واتە: خزمەتچیی و سەرپەرشتیاری بت و صەنەم.

٥- ﴿ وَأَلْقَوْاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ﴾، لەو ڕۆژەدا ملکەچییان بۆ خوا فڕێدا، ملکەچییان بۆ خوا دەرخست، وشەی (ألقى) لێرەدا: (تَشبِيهٌ بِحَالِ المُحَارِبِ الَّذِي يُلْقِي سِلاَحَهُ بَيْنَ يَدَي غَالِبِهِ)، حاڵیان بە حاڵی جەنگاوەرێك چوێنراوە، کە لە بەردەم کەسێکدا کە بەسەریدا زاڵ بووەو، تێکی شکاندوە، چەکەکەی بۆ فڕێ دەداو، تەسلیمی دەبێ و، خۆی بەدەستەوە دەدات.

واتە: لەو ڕۆژەدا خۆیان بەدەست خواوەداو، بۆ خوا ملکەچبوون، هەم پەرستارەکان، هەم پەرستراوەکان.

٦- ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾، ئەوەش کە هەڵیان دەبەست، لێیان ون بوو.

(ئەوەی هەڵیان دەبەست):

أ) دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ: هاوبەش بۆ خوا هەڵبەستنەکەیان لێ ون بوو.

ب) یاخود ئەوانەی کە درۆیان بۆ هەڵدەبەستن، کە ئەوانە پەرستراوی خوان، ئەوانەیان لێ ون بوو، واتە: ئەوانەی کە بە درۆ بە پەرستراویان دانا بوون، ئەوانەیان لێ ون بوو.

(ضَلَّ: أَي غَابَ، ضَاعَ) ونبوو، زایە بوو.

ج) ﴿ مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴾، لە ئەسڵ دا ئاوایە: (مَا كانُوا يَفْتَرُونَهُ)، ئەوەی کە هەڵیان دەبەست، واتە: ئەوەی بۆ بتەکانیان هەڵیان دەبەست، لە خەسڵەت و کارو کردەوەی ئەفسانەیی کە گوایە: دەبیستن و دەزانن و شیفایان دەدەن و، سەریان دەخەن... هتد.

دوو فەرموودەیە لەوبارەوە:

١/ فەرموودەی یەکەم:{عَن أَبي هُرَيرَةَ ﷺ أَنَّ ناساً قَالُوا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ يا رَسُولَ اللَّهِ! هَلْ نَرَى رَبَّنا يَوْمَ الْقِيامَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ)؟ قَالُوا: لاَ يا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: (هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ)، قَالُوا: لاَ يا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: (فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ، يَجْمَعُ اللَّهُ الناسَ يَوْمَ الْقِيامَةِ، فَيَقُولُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ شَيْئاً فَلْيَتَّبِعْهُ، فَيَتَّبِعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ الْقَمَرَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الطواغِيتَ الطواغِيتَ...) } (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٧٥٧٣، ٧٤٣٧، وَمُسْلِم: ٤٥٠، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِم).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: خەڵکێك لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگارمان دەبینین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرمووی: ئایا لە شەوی بەدردا، (واتە: کە مانگ دەگاتە پازدەو جێخونکە دەکات)، زیانتان پێ دەگات لە دیتنی مانگدا؟ گوتیان: نا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەدی خۆر کە هیچ پەردەی لەبەر نەبێ، (واتە: هەور نەبێ و تەمومژ نەبێ و، تۆز و خۆڵ نەبێ)، زیانتان پێ دەگات لە دیتنی خۆردا؟ (واتە: زۆر بە ڕوونیی و بە چاکیی نایبینن؟) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ زیانمان پێ ناگات و بە چاکیی دەیبینین، فەرمووی: ئێوەش پەروەردگارتان ئاوا دەبینن، (وەك خۆر لە ڕۆژێ داو، وەك مانگ، لە چواردەو پازدەی دا)، خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا خەڵك کۆدەکاتەوە، دەفەرموێ: هەر کەسێك هەر شتێکی پەرستوە، با شوێنی بکەوێ، ئنجا ئەوەی خۆری پەرستوە شوێن خۆر دەکەوێ و، ئەوەی مانگی پەرستوە شوێن مانگ دەکەوێ و، ئەوەی طاغووتەکانی پەرستوون، شوێن طاغووتەکان دەکەوێ.

٢/ فەرموودەی دووەم: لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە، کە درێژەی هەیەو دوایی لە درێژەی فەرمایشتەکەدا هاتوە: {**فَيَتَمَثَّلُ لِصَاحِبِ الصَّلِيبِ صَلِيبُهُ، وَلِصَاحِبِ الصُّوَرِ صُوَرُهُ، وَلِصَاحِبِ النارِ نارُهُ، فَيَتَّبِعُونَ مَا كانُوا يَعْبُدُونَ**} (**أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ: ٢٥٥٧، وَصَحَّحَهُ الألباني في «صحيح الجامع»**: ٨٠٢٥).

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بۆ کەسێك کە خاچی پەرستوە (نەصرانییەکان)، خاچەکەی بۆ وێنا دەکرێ (بۆ بەرجەستە دەکرێ) و، بۆ کەسێك کە پەیکەرێکی پەرستوە پەیکەرەکەی (وێنەکەی) بۆ بەرجەستە دەکرێ و، بۆ کەسێك کە ئاگری پەرستوە ئاگرەکەی بۆ وێنا دەکرێ و، هەر کامێك لەوانە شوێن ئەوە دەکەوێ کە پەرستوویەتی.

## مەسەلەی چوارەم:

**ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون و، خەڵکیـان لە ڕێی خـوا لاداوە، بەهۆی تێکـدان و خراپەکارییانەوە، لە سـەرووی سـزای خۆیانەوە، سـزای دیکەشـیان بۆ دەخرێتە سـەر:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون.

لێـرەدا (ٱلَّذِينَ) (ال) ئەلیـف و لامەکـەی، بـۆ ناسـاندنی جینسـە، واتـە: تێکـڕای ئەوانـەی کـە بێبـڕوا بـوون.

٢- ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، خەڵکیشیان لە ڕێی خوا لاداوە، یانی: ئەو ڕێیەی کە خەڵك لێیەوە دەگاتە ڕەزامەندیی خوا.

لێرەدا (صَدُّوا) دوو واتای هەن:

أ) بە مانای: (**حَرَّفُوا**) یان (**مَنَعُوا**) هاتوە، خەڵکیان لاداوە، یان ڕێگرییان لە خەڵك کردوە، لەوە کە شوێن ڕێی خوا بکەوێ.

ب) دەشگونجێ (صَدَّ) بە مانا (**مُتَعَدِّي**)یەکەی نەبێ، (صَدَّ) مانای خەڵکی لادا، بەڵکو بە مانای (**لازم**) کەی بێ، (صَدُّوا)، یانی: (**إِمتَنَعُوا عَن سَبِيلِ اللَّه**) خۆیان لایانداوە لە ڕێی خوا، چونکە (صَدَّ) هەم بە حاڵەتی لازیم هاتوە، (**صَدَّ عَن سَبِيلِ اللَّه**)، واتە: لایدا لە ڕێی خوا، هەم بە مانا موتەعەددیی، (**صَدَّ غَيْرَهُ عَنْ سَبِيلِ اللَّه**)، یانی: خەڵکی لەڕێی خوا لادا.

٣- ﴿زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ﴾، لە سەرووی سزاوە، سزای دیکەمان بۆ زیاد کردن، واتە: لە سەرووی سزایەك کە خۆیان شایستەی بوون، سزای دیکەشیان بۆ دەخەینە سەر، بۆیان دوو قات دەکەینەوە، یان بۆیان چەند بەرانبەر دەکەینەوە، بۆچی؟ ﴿بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە خراپەکارییان دەکرد، واتە: هەم سزای گوناهی خۆیان دەدرێن، هەم سزای گوناهی ئەوانەش کە لە ڕێیان لاداون و سەریان لێ شێواندوون.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَوْقَ ٱلْعَذَابِ ﴾، دیارە (أل) ئەلیف و لامی سەر (ٱلْعَذَابِ)، بۆ ناساندن (تَعرِيف)ەو مەبەست پێی (عهد)ە، یانی ئەو سزایەی کە باسکردنی پێشتر ڕابردوە، چونکە پێشتر خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلْعَذَابَ ﴾، ئەوانەی کە ستەمیان کردوە، کاتێك سزایەکەیان بینی، (ئەو سزایەی کە دەزانرێ چییە)، پێشتریش باسمان کردووە کە (أل)ی (عهد) لە بەرانبەر (کە)یە لە زمانی کوردیی دا کەواتە (ٱلْعَذَابِ) یانی: سزاکە.

کەواتە: ﴿ فَوْقَ ٱلْعَذَابِ ﴾، یانی: سزای دیکەیان بۆ زیاد دەکرێ، لە سەرووی ئەو سزایەوە کە هی خۆیان بووە، بە تایبەت، ئنجا بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ ﴾، دەڵێ: (**لأنَّ عَذَابَ صَدِّهِمُ الناسَ عَن سَبِيلِ اللّه، لا يَخْطُرُ بالبالِ، فَكانَ مَجهُولاً فَناسَبَهُ التَّنكير**)، سزای خەڵك لادانیان لەڕێی خوا، لە خەیاڵیان دا نەبووە، لەسەر ئەوە سزا بدرێن، بۆیە بۆ ئەوان شتێکی نامۆ و نەزانراو بووە، بۆیە بە نەناسراو (**نكرة**) هێناویەتی.

کەواتە: نابێ وابزانرێ، ئەو ئایەتە لەگەڵ ئایەتی: ﴿ ...وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾[1] الأنعام، دا تێکدەگیرێ! چونکە لادانی خەڵکیش لە ڕێی خوا هەر کردەوەی خراپ (**سيئة**)ی خۆیانەو لەسەری سزا دەدرێن.

٤- ﴿ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە خراپەکارییان دەکرد، یاخود بەهۆی ئەوەوە کە تێکدانیان دەکرد: (**أي إفسادُ الرَّاغِبِينَ فِي الإسلام**)، بەهۆی ئەوەوە کە کەسانێك ئارەزوومەند بوون بۆ ئیسلام، لە ڕێیان لادەدان، بەهۆی ئەوەوە ئەو سزا زیادەیان بۆ دەخرێتە سەر.

وەك لە سیرەدا هاتوە:

**أ)** کە ئەبو زەڕی غیفاریی خوا لێی ڕازی بێ، کاتێك مسوڵمان دەبێ، - کە بەسەرهاتەکەی بە تەفصیل باسکراوەو پێشتر ئاماژەیەکمان پێدا، لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە -، دوای ئەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پێی دەزانن، زۆر ئەزیەتی دەدەن و نارەحەتی دەکەن، کە دەزانن مسوڵمان بووە، بۆئەوەی هەڵیگێڕنەوە، هەتا دوایی یەکێك دێ، هەڕەشە دەکات، هۆشدارییان دەداتێ، دەڵێ: ئێوە چۆن وا لەو کابرایە دەکەن! ئەدی نازانن هۆزی غیفار دوایی دەتوانن ڕێی کاروانتان لێ بگرن و بازرگانییتان لێ قەدەغە بکەن؟ ئەوجار لێی دەگەڕێن.

**ب)** هەروەها (**عامر بن طُفَيل الدَّوسي**) کە دەیەوێ بچێ بۆ مەککە، ئنجا ئایا هەر بۆ خواپەرستیی خۆی دەچێ، بەپێی ئایینی خۆیان، یاخود بۆ ئەوەی کە بزانێ پێغەمبەر (محمد) ﷺ کێیە؟ قوڕەیشییەکانیش زۆر دەیترسێنن لە پێغەمبەر ﷺ، کە هەڵنەخەڵەتێ و ئاگای لە خۆی بێ !

---

(١) واتە: هەرکەس خراپەیەك بێنێ (لە ڕۆژی دوایی دا) تەنیا وەك خراپەکەی سزا دەدرێ و، ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ٪

ج) هەروەها هەمان هەوڵیان لەگەڵ (الأعشى)شدا، داوە كە شاعیرێك بووە، ئنجا بەهۆی ئەو تێكدانەوە كە كردوویانە، خەڵكیان لە ڕێی خوا لاداوەو، خراپەكارییان كردوە، بۆیە سزایان بۆ زیاد دەكرێ.

## مەسەلەی پێنجەم و كۆتایی:

**خوا ڕایگەیانـدوە: كـە ئـەو ڕۆژەی بـۆ سـەر هـەر كۆمەڵگایـەك شـایەدێك دێنـێ، كـە ڕۆژی دواییـە، پێغەمبـەر موحەممەدیـش ﷺ بـە شـایەد دەگـرێ لەسـەر كافـرانی ڕۆژگاری خـۆی و، كتێبێكیـش كـە دابیەزاندۆتـە سـەری، ڕوونكـەرەوەی هەمـوو شـتێك و ڕێنمایـی و بەزەیـی و موژدەیـە بـۆ ملكەچـان بـۆ خـوا:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، ئەو ڕۆژە كە لە هەر كۆمەڵێك لە خۆیان شایەدێكیان بەسەرەوە دەگرین.

ئـەو ڕسـتەیە بۆیـە دووبـارە بۆتـەوە كـە پێشـتریش فەرمـووی: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، بـۆ ئـەوەی ئـەو ڕسـتەیەی دیكـەی لەسـەر بنیات بنـێ، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ ﴾، تۆشـمان وەك شـایەد هێنـا لەسـەر ئەمانـە، (لەسـەر ئـەو خەڵكـەی ڕۆژگاری خـۆت).

ئنجـا كـە دەفەرمـوێ: ﴿ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، لـە هـەر كۆمەڵگایـەك شـایەدێك دێنیـن لـە خـودی خۆیـان، كەواتـە: مـادام لـە خۆیـان بـێ، بـواری تانەدانیـان نیـە، لـە شـایەدیدانەكەی، چونكـە لـە خۆیانـە، خەڵكێـكی بێگانـە نیـە، بڵێـن: غـەرەزی هەیـەو دوژمنایەتیـمان دەكات، هـەر هـی خۆیانـە، كـە بێگومـان (**شهید**) بـە پلـەی یەكـەم مەبەسـت پێـی پێغەمبەرانـە، وەك پێشـتریش باسـمانكرد.

٢- ﴿ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، هەروەها تۆشمان وەك شایەد هێنا بەسەر ئەمانەوە، بەسەر ئەو خەڵکەوە (خەڵکی ڕۆژگاری خۆی)، ئنجا ئەوە ئەو ڕاستییە لە سوورەتی: (النساء)دا، ڕوونتر هاتوە و لەوێ، تەفصیلی زیاتری دراوەتێ، کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴿٤٢﴾ ﴾.

واتە: چی دەبێ، چ دەقەومێ، چەند جێی سەرنجە! کاتێك کە لە هەر کۆمەڵگایەك شایەدێکیان بەسەرەوە دەگرین، تۆشمان وەك شایەد هێنا بەسەر ئەمانەوە، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی کە بێبڕوا بوون و سەرپێچییان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، بە ئاوات دەخوازن، خۆزگە دەخوازن، کە لەگەڵ خاکدا یەکسان بن، لەگەڵ زەویدا تەخت بن و، هیچ قسەیەکیش لە خوا ﷻ ناشارنەوە، هەموو شتێکیان دەکەوێتە گۆڕێ.

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ ﴾ الطارق، ئەو ڕۆژەی کە نهێنییەکان ئاشکرا دەبن.

٣- ﴿ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ ﴾، کتێبیشمان دابەزاندۆتە سەر تۆ ڕوونکردنەوەیە بۆ هەموو شتێك.

(**كُلِّ شَيء: يُفِيدُ العُمُوم لَكِن عُمُومٌ عُرفِيٌّ فِي دَائِرَة خَاصَّة**)، (**كُلِّ شَيء**) هەموو شتێك، واتایەکەی گشتییە، بەڵام واتایەکی گشتی بەپێی باو و لە بازنەیەکی دیاریکراودا.

واتە: ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێك کە ئێوە پێویستییتان پێی بێ و، پەکی لەسەر ڕوونکردنەوەی وەحیی و پەیامی خوای پەروەردگار کەوتبێ، بەڵام شتێك کە خۆتان دەرکی بکەن و، لە مەودای عەقڵتاندا بێ، وەحیی خوای زاناو توانا نەهاتوە ئەو شتانە ڕوون بکاتەوە، کە مرۆڤ بۆخۆی دەتوانێ دەرکیان بکات و، عەقڵی پێیان دەشکێ.

٤- ﴿ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴾، لەم ئایەتەدا قورئان بە چوار وەسف پێناسە کراوە:

**یەکەم:** ﴿ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ ﴾، ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێك {کە پێویستیی بە ڕوونکردنەوە بێ لە لایەن خواوە}.

**دووەم:** ﴿ وَهُدٗى ﴾، ڕێنماییە، ڕاستە ڕێکەرە، یانی: وەك حاڵەتی تیۆریی (**نظري**) ڕوونکەرەوەیەو، وەك حاڵەتی کردەیی: ڕێ پیشاندەرو ڕاستەڕێ کەرە.

**سێیەم:** ﴿ وَرَحۡمَةٗ ﴾، سەرەنجامەکەشی هۆکاری دابەزینی بەزەیی خوایە.

**چوارم:** ﴿ وَبُشۡرَىٰ ﴾، هەروەها موژدەو دڵخۆشییشە، بەڵام بۆ مسوڵمانان، ملکەچان بۆ خوا، ئەوانەی کە بۆ خوا تەسلیم و گەردنکەچن، کە لێرەدا مەبەست پێی مسوڵمانان نیە، بە چەمکە باوەکەی کە ئۆمەتی پێغەمبەرن ﷺ بەڵکو یانی: کەسانێك کە بۆ خوا ملکەچ دەبن، ئنجا بۆیەش ناو لە شوێنکەتووانی پێغەمبەری خاتەم نراوە (**مُسلِمِین، مُسلِمُون**)، لەبەرئەوەی بۆ خوا ملکەچن.

کەواتە: وەك ڕیزبەندییەکی لۆژیکیی ئەگەر تەماشای قورئان بکەین:

**١)** ڕوونکەرەوەیە.

**٢)** ئەو ڕوونکردنەوەیە دوایی دەبێتە هۆی ڕێ پێشاندان.

**٣)** ئەو ڕێ پێشاندانەش دەبێتە هۆی ئەوە کە ڕەحمەتی خوا دابەزێ بۆ سەر ئەو کەسانەی بەدوای ڕێنمایی خوا کەوتوون.

**٤)** سەرەنجام ئەویش دەبێتە هۆی شادمانیی و دڵخۆشیی و موژدەی بەهەشت و ڕەزامەندیی خوا، پێدران.

**کورتە بەسەرهاتێك:** کاتی خۆی کە شێخ (**محمد عبدە**) لە فەڕەنسا دوورخراوە (**نفي**) دەبێ، ماوەیەك، لەگەڵ (**جمال الدین الأفغاني**)دا ڕەحمەتی خوایان لێبێ لەوێ بوون بە دوورخراوەیی، ئنجا ڕۆژێك ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەوروپیی لێی دەپرسێ، ئێوە دەڵێن: قورئان هەموو شتێکی تێدایە و، خوا دەفەرموێ: ﴿ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ ﴾، باشە من پرسیارت لێ دەکەم؟ ئایا ئێردەبێك گەنم چەند نانی تێدایە؟ {ئێردەب: بیست و چوار (٢٤) ڕبە (صاع) یەو، هەر صاعێکیش چوار مستە، مانای وایە چوار (٤) جارانی بیست و چواری بکە، (٢٤X٤ = ٩٦) مست، ئێردەبێك گەنم (٩٦) مستە، یانی: دەوری سەد (١٠٠) کیلۆ} مادام قورئان هەموو شتێکی تێدایە، کوا قورئان لە کوێدا باسی کردوە کە ئێردەبێك گەنم چەند نانی تێدان؟ شێخ محمد عەبدە دەڵێ: لە نانەوا دەپرسین، ئەویش دەڵێ: ئەدی نالێن قورئان هەموو شتێکی ڕوون کردۆتەوە؟ دەڵێ: بەڵێ ڕاستە ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە، چونکە قورئان دەفەرموێ: ﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣ ﴾النحل، ئەگەر نازانن لە شارەزایان بپرسن، بابای نانەوا شارەزای ئەوەیە کە ئەوەندە گەنمە، چەند نانی تێدایە؟ ئێمەش بەپێی ڕێنمایی قورئان، ڕەفتار دەکەین لێرەش قورئان ڕێنماییمان دەکات کە لە هەر بوارێکدا، لە پسپۆڕان و شارەزایانی ئەو بوارە بپرسین !

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتـەکانی: (٩٠ - ٩٧) دەگرێتـەوە، واتـە: هەشـت ئایـەت، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم هەشـت ئایەتـە، فەرمانکـردنی خـوای بـەرزی مەزنـە، بـە دادگەریـی و چاکەکاریـی و، بەخشین بـە نیزیـکان و خـۆ پاراسـتن لـە خراپـەو تـاوان و دەسـتدرێژیی، ئەمـە لـە ئایـەتی ژمـارە: (٩٠)دا هاتـوە.

دوایـی لـە حـەوت (٧) ئایەتەکـەی دیکـەدا، خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە وەفاداریـی بـە بەڵێـن و پەیـمان و، پاراسـتنی و، نەشـکاندنی بەڵێـن و پەیمانـەکان، بـە هیـچ بیانـو و پاساوێك.

دوایـی بـاسی پاداشـتی بـەرزی خـوا کـراوە بـۆ کەسـانێك کـە بەڵێـن و پەیمانەکانیـان دەپارێـزن و، سـوێندەکانیان دەپارێـزن و نایانشـکێنن.

سـەرەنجام: ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاستییە کـە ئیـمان و کـرداری بـاش، کـە لـە پێشـەوەی کـرداری بـاش، بریتیـە لـە وەفاداریـی بـە بەڵێـن و پەیـمان، بەڵێـن و پەیمانێـك کـە بـە خـوا دەدرێ و، بـە خەڵـك دەدرێ، بەڵـێ ئیـمان و کـرداری بـاش، مایـەی بەختەوەریـی دنیـاو، هۆکاریـی سـەرفرازیی دوارۆژن، بـۆ پیـاوان و ئافرەتـان، واتـە: بـۆ هـەردوو ڕەگـەزی نێـرو مـێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ

ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی خوا فەرمان دەکات بە (ئەنجامدانی) دادگەریی و، چاکەکاریی و بەخشین، بە خاوەن نیزیکایەتییان (بە خزمان) و، ڕێگریی لە: هەر قسەو کردارێکی دزێوو بێزراو و، هەر قسەو کردارێکی نامۆ و خراپ و، سنوور شکێنیی، دەکات، ئامۆژگارییتان دەکات بەڵکو بێتەوە بیرتان (پەند وەربگرن) ﴿٩٠﴾ هەروەها (خوا فەرمانتان پێ دەکات) کە هەر کات پەیمانتان دا، پەیمانی خوا جێبەجێ بکەن و، سوێندەکانتان پاش جەخت لەسەر کرانەوەو پتەوکرانیان، هەڵمەوەشێننەوە، لە حاڵێکدا کە خواتان بەسەرەوە کردۆتە چاودێر، بێگومان خوا دەزانێ چی دەکەن! ﴿٩١﴾ هەروەها وەك ئەو ئافرەتە مەبن کە چنراوو ڕیسەکەی خۆی دوای پتەوکردنی، هەڵوەشاندۆتەوەو پس پسی کردوە، (با حاڵتان وانەبێ) کە (پەیمان و) سوێندەکانتان لە بەینی خۆتاندا، بکەنە مایەی ناپاکیی و موخەننەتیی، بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێك (کە دەویسترێ پەیمانیان بۆ هەڵبوەشێنرێتەوە) لە کۆمەڵێك (کە هاوپەیمانتانن) زیاترن! بە دڵنیایی خوا بەهۆی ئەوەوە، تاقیتان دەکاتەوەو، مسۆگەر ڕۆژی قیامەتیش ئەوەتان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە تێیدا دەکەونە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە ﴿٩٢﴾ خواش ئەگەر ویستبای (تاقییتان نەکاتەوە) دەیکردنە یەك کۆمەڵ (ی کۆك لەسەر هەق و ڕاستیی)، بەڵام هەر کەسێکی بوێ (بەو ویستە ئازادەی پێیداوە) گومڕای دەکات و، هەر کەسێکیشی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ و، بێگومانیش لەوەی دەتانکرد (لە ژیانی دنیادا) لێتان دەپرسرێتەوە ﴿٩٣﴾ هەروەها (پەیمان و) سوێندەکانتان مەکەنە مایەی موخەننەتیی نێوانتان، کە سەرەنجام پێیەك دوای چەسپانی، بخلیسکێ (بۆ نێو باتلاغی ناپاکیی) و بەهۆی (خەڵك) لادانتان لە ڕێی خواوە (سزای) خراپە بچێژن و ئازارێکی مەزنتان هەبێ! ﴿٩٤﴾ هەروەها بە پەیمانی خوا، نرخێکی کەم، مەکڕن، بێگومان ئەگەر

بزانن ئەو پاداشتەی لەلای خوایە، بۆ ئێوە باشترە، (لە سوودێکی دنیایی کە بە پەیمان شکێنیی دەستی دەخەن) ﴿٩٥﴾ ئەوەی لەلاتانە (هەر چییەك و هەرچەند بێ) تەواو دەبێ و نامێنێ و، ئەوەی لەلای خوایە، لەبن نەهاتوویە و، مسۆگەر پاداشتی ئەوانەی خۆیان ڕاگرتوە {لەسەر جادەی شەریعەت} بەپێی باشترین کردەوەیان دەدەینەوە ﴿٩٦﴾ هەر کەس کردەوەی باش بکات و بڕوادار بێ، لە نێر یان مێ، بە ژیانێکی پاك و چاك دەیژیەنین و، بە پێی باشترین کردەوەشیان، پاداشتیان دەدەینەوە ﴿٩٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(العَدل): وشەی (عَدْل) و (عَدَالَة) ئێمە بە داد دادگەریی، مانای دەکەین، (العَدَالَةُ وَالمُعَادَلَةُ: لَفْظٌ يَقْتَضِي مَعْنَى المُساوَاةِ، وَالعَدْلُ وَالعِدْلُ يَتَقَارَبانِ، لَكِنَّ العَدْلَ يُستعْمَلُ فِيمَا يُدْرَكُ بالبَصِيرَةِ، كالأَحْكَامِ، وَالعِدْلُ فِيمَا يُدرَكُ بالحَاسةِ، كالمَوْزُوناتِ وَالمَعدُودَاتِ وَالمَكِيلات).

وشەی (عَدَالَة) و (مُعَادَلَة) وشەیەکە مانای یەکسانیی دەخوازێ و، وشەی (عَدل) و (عِدل) مانایان لێك نزیکە، بەڵام (عَدْل) بۆ ئەو شتانەیە کە بە عەقڵ دەزاندرێن، وەك یاساکان، بەڵام (عِدْل) بۆ شتێکە کە بە هەست بزاندرێ، چونکە (عِدل) واتە: لابار، وەك کێشراوەکان و ژمێردراوەکان و پێوراوەکان، {ئەو شتانەی کە دەکێشرێن و دەژمێردرێن و دەپێورێن}، دەڵێن: ئا ئەوە بەرانبەری ئەوەیە، (هَذَا عِدْلُ هَذَا)، ئنجا بار کە دەخرێتە سەر پشتی وڵاخ، دەگوترێ: (عِدْلَي الحِمْل)، هەردووك لا بارەکە، (حِمْل)، واتە: بار، (عِدْلان)، واتە: دوو لا بارەکە.

(ٱلْفَحْشَآءِ): (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَة: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَال)، هەر کام لە وشەکانی (فُحْش، فَحَشَاء، فَاحِشَة)، بریتین لەو کردەوەو قسانەی کە زۆر ناقۆڵاو دزێوو ناشیرین بن، هەندێکیشیان گوتوویانە: بریتیە لەو گوناهانەی پەیوەندییان بە لایەنی جنسییەوە هەبێ.

(مُنكَرِ): (كُلُّ فِعْلٍ تَحْكُمُ العُقُولُ الصَحِيحَةُ بِقُبحِهِ، أَو تَتَوَقَّفُ فِي استقبَاحِهِ وَآستحْسَانِهِ العُقُولُ، فَتَحْكُمُ بِقُبحِهِ الشَّرِيعَةُ).

(مُنْكر): هەر قسەیەکە، کە عەقڵە ڕاستەکان حوکم دەکەن، بەوە کە شتێکی خراپەو ناشیرینە، یاخود عەقڵەکان دەوەستن و بڕیار نادەن لەبارەی ناشیرین بوون، یاخود

چـاك بوونیـەوە، بـەڵام شـەریعەت دێ، بڕیـاری ناشـیرین بـوونی بـۆ دەدات، {هەڵبەتـە ئـەو گوتوویـەتی: (كُلُّ فِعْلٍ)، بـەڵام (مُنْكر)یـش، هـەم قسـەو هـەم كـردەوە دەگرێتـەوە، واتە: قسـەو كـردەوەی خـراپ}.

( وَٱلْبَغْيِ ): (البَغْـيُ: طَلَـبُ تَجَـاوزُ الإِقْتِصَـادِ فِيـمَا يُتَحَـرَّى، تَجَـاوَزَهُ أَم لَـمْ يَتَجَـاوَزه)، (بَغْـي): بریتیـە لـە خەفتـان لـە تێپەڕانـدن لـە حاڵـەتی میانجیـی، لـە شـتێكدا كـە دەویسـترێ لێـی تێپەڕێـنرێ، ئنجـا لێـی تێپـەڕێ یـان لێـی تێنەپـەڕێ، واتـە: زێدەڕۆیـی.

لـە ڕاسـتییدا (بَغْـي) دوایـی بـە مانـای دەسـتدرێژیی و، سـتەم و، سنوورشـكێنیی و، مـاف پێشـێلكردنی بەرانبـەر، هاتـوە.

( نَقَضَتْ غَزْلَهَا ): (النَّقْـضُ: إِنْتِشَـارُ العَقْـدِ مِـنَ البِنَـاءِ وَالحَبْـلِ وَالعِقْـدِ، وَهُـوَ ضِـدُّ الإِبْـرَامِ)، (نَقْـض): بریتیـە لـە هەڵوەشـاندنەوەی شـتێك كـە پێكـەوە بەسـترابێ (گـرێ درابـێ)، ئنجـا خانـوو بـێ، یاخـود گوریسـێك بـێ، پەتێـك بـێ، یاخـود ملوانكەیـەك بـێ و، (نَقـض) پێچەوانـەی (إِبـرَام)ە، (إِبـرَام) واتـە: قایـم كـردن و، گرێـدان، (نَقض)یـش، واتـە: هەڵوەشـاندنەوە.

( أَنكَـٰثًا ): (أَنْـكاث: جَمْـعُ نِكْـث، كالنَّقْـضِ، وَنَكْـثَ الأَكْسِـية وَالغَـزْلَ، أَي: قَرِيـب مِـنَ النقـض وَاسـتعِيرَ لِنَقْـضِ العَهْـدِ)، (أَنـكاث): كـۆی (نِكْـث)ە، (نِكْـث)، وەك (نَقـض) وایـە، (نَقـض) واتـە: هەڵوەشـاوە، یـان هەڵوەشـاندنەوە، (نِكْث)یـش بـە هەمـان شـێوە، كاتێك پۆشـاكێك، یاخود ڕیسـێك هەڵدەوەشـێنرێتەوەو شـیدەكرێتەوە، نزیكـە لـە مانـای (نَقـض)و هەڵوەشـاندنەوەوە، بۆیـە وشـەی (نَكـث)، یاخـود (نَقـض) خوازراوەتـەوە بـۆ شـكاندنی پەیـمان، هەڵوەشـاندنەوەی پەیـمان، دیـارە (أَكسِـيَة) كـۆی (كِسـاء)ە، واتـە: پۆشـاكەكان، (غَزْل)یـش واتـە: ڕسـتراو، چـنراو.

( دَخَلًۢا ): (الدَّخَـلُ: كِنايَـة عَـنِ الفَسـادِ وَالعَـدَاوَةِ المُسـتبطَنَة كالدَّغَـلِ، دَخِـلَ: أَمْـرُهُ دَخَـلاً: فَسَـدَ، دُخِـلَ فُـلاَنٌ فَهُـوَ مَدْخُـولٌ: كِنايَـة عَـن بَلَـهٍ فِي عَقْلِـهِ وَفَسـادٍ فِي أَصْلِـهِ).

وشـەی (دَخَـل) كینایەیـە بـۆ خراپەكاریـی، واتـە: لـە پەنـاڕا، ئـەو واتایـە دەگەیەنـێ و، بـۆ دوژمنایەتییـەكی پەنهانكـراو، ئنجـا (دَخَـل) وەك دەغـەڵ وایـە، یـانی: واتایـان لـە یـەك نزیكـە، دەگوتـرێ: (دَخِـلَ: أَمْـرُهُ دَخَـلاً، أَي: فَسَـدَ)، ئیشـەكەی خـراپ بـوو، تێكچـوو، دیسـان دەگوتـرێ: (دُخِـلَ فُـلاَنٌ فَهُـوَ مَدْخُـولٌ: كِنايَـة عَـن بَلَـهٍ فِي عَقْلِـهِ وَفَسـادٍ فِي أَصْلِـهِ)، كینایەیـە كـە كەسـێك عەقڵـی تـەواو نەبـێ، یاخـود بناغـەو ڕیشـەكەی تـەواو نەبـێ، یـانی: پەروەردەكـەی تـەواو نەبـێ، (سروشـتەكەی تـەواو نەبـێ)، لـە كوردەواریـی خۆمانـدا هەنـدێ وشـە بەكاردێنیـن بـۆ وێنـە: فڵانكـەس تەختـەی نوقصانـە.

( أَرۡبَىٰ ): یانی: (أَزْیَد)، (أَرْبَى عَلَى الحِصَّةِ: زَادَّه)، (أَرۡبَىٰ): یانی زیاتر، (أَرْبَى عَلَى الحِصَّةِ)، لەو بەشەی دانراوە، لێی زیاد کرد.

( فَتَزِلَّ قَدَمُۢ ): پێیەك دوای ئەوەی کە چەسپاوە، بخلیسکێ، لابچێ لە شوێنی چەسپاوی خۆی، دەڵێ: (زَلَّ عَن مَكانِهِ: تَنَحَّى، وَالمَزَلَّةُ: المَكانُ الدَحضُ)، (زَلَّ عَن مَكانِهِ) واتە: لە شوێنەکەی خۆی لاچوو، (المَزَلَّةُ) بە شوێنێکی لووس دەگوترێ کە پێی لێ بخلیسکێ.

( يَنفَدُ ): (نَفِدَ، يَنفَدُ: فَنيَ وَانقَطَعَ، وَأَنفَدتُهُ: أَفنَيتُهُ)، (نَفِدَ، يَنْفَدُ)، واتە: ئەو شتە تەواو بوو، بڕا، کۆتایی هات، (وَأَنفَدتُهُ)، یانی: خەلاسم کرد، تەواوم کرد.

( حَيَوٰةً طَيِّبَةً ): واتە: ژیانێکی بەختەوەر، یان ژیانێکی پاك و چاك، دەگوترێ: (طَابَ الشيء يَطِيبُ طِيْبا: إِذَا كانَ لَذِيذاً، أَو حَلالاً فَهُوَ طَيِّبٌ، طَابَت نَفسُهُ: إِنْبَسَطَت وَانشَرَحَت)، (طَابَ شَيء يَطِيبُ طِيبا)، شتەکە خۆش بوو، خۆش دەبێ، خۆش بوون، ئەگەر بەتام بێ، یاخود حەڵاڵ بێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (طَيِّب)، (طَابَت نَفسُهُ)، واتە: دڵی خۆش بوو، شادمان بوو.

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئەوەی لەم دەرسەدا دەخرێتە ڕوو، باسێکی تازەیە لەم سووڕەتەدا، چونکە تەوەری سەرەکیی ئەم حەوت (٧) ئایەتە: باسی دادگەریی و، پابەندیی بە بەڵێن و پەیمان، پاشان پاداشتی خاوەن بەڵێنان و، وەفاداران بە پەیمان و، سزای بێ بەڵێنان و پەیمان شکێنان، بە هەر بیانوو و پاساوێك بێ، باسی ئەوەیە، کە ئەمە بابەتێکی تازەیە، بەڵێ لە سووڕەتە مەککەییەکاندا کەم و زۆر باسی دادگەریی کراوە، بەڵام ئێرە یەکەم شوێنە کە لە هەموو قورئانی مەککەییدا، بەو خەست و خۆڵییە، بەو تۆخییە، باسی بەڵێن و پەیمان بکرێ و، گرنگیی پابەندیی بە بەڵێن و پەیمانەوە، بخرێتەڕوو.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەکات بە دادگەریی و، چاکەکاریی و، بە بەخشین بە نیزیکان (بەوانەی کە خاوەنی نزیکایەتیین)، واتە: خزمان و، خەڵك قەدەغە دەکات لە (ٱلۡفَحۡشَآءِ)، واتە: قسەو کرداری ناقۆڵاو ناشیرن و دزێو، (وَٱلۡمُنكَرِ) قسەو کرداری خراپ و

ناپەسند، (وَٱلۡبَغۡيِ ) لە دەستدرێژیی و سنوور بەزێنیی و، ماف پێشێلکردنی بەرانبەرەکان، ﴿يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، خوا ئامۆژگارییتان دەکات بەڵکو وەبیرتان بێتەوە، یان بەڵکو بیربکەنەوە، بیرکردنەوەیەك کە بتانگەیەنێ بە پەند وەرگرتن و، بەهرە وەرگرتن لەو بیرکردنەوەیەی خۆتان، ئەم ئایەتە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، گرنگییەکی تایبەتی هەیە، لە قورئاندا و، لە ئیسلامدا، بۆیە هاوەڵان و، زانایان زۆر قسەیان لەسەر کردوە و، ئێمەش ئەوەندەی کە لەگەڵ سروشتی ئەم تەفسیرەدا بگونجێ، قسە لەسەر ئەو ئایەتە موبارەکە دەکەین، چونکە خوا ﷻ لەم ئایەتەدا، سێ شتان فەرمان پێ دەکات و، سێ شتانیش قەدەغە دەکات، ئەو سێ شتەی فەرمانیان پێ دەکات:

١/ دادگەریی.

٢/ چاکەکاریی.

٣/ بەخشین بە خزمان.

ئەو شتانەش کە قەدەغەیان دەکات: -

١) ( ٱلۡفَحۡشَآءِ)، واتە: کردار و قسەی ناقۆڵاو ناشیرین.

٢) ( وَٱلۡمُنكَرِ)، واتە: کردار و قسەی ناپەسندو خراپ و زیانبەخش.

٣) (وَٱلۡبَغۡيِ ) دەستدرێژیی و سنوور شکێنیی.

دواییش خوای کارزان، ئەمە بە ئامۆژگاریی خۆی دادەنێ، (يَعِظُكُمۡ ) واتە: ئەوەی کە پێی فەرموون ئەو سێ فەرمانە و، ئەو سێ قەدەغەیە، ئەوە ئامۆژگاریی خوایە، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، بەڵکو پەند وەربگرن، بەڵکو بیر بکەنەوە.

ئنجا دێتە سەر باسی بەڵێن و پەیمان بردنە سەر، دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ ﴾، هەر کاتێ پەیمانتان دا، وەفاداربن بە پەیمانی خواوە، پەیمانی خوا جێبەجێ بکەن، (وفاء) واتە: جێبەجێکردنی شتێك بە تەواویی، (أوفوا) واتە: بە تەواویی پەیمانی خوا جێبەجێ بکەن، باش پابەند بن پێیەوە، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ﴾، هەرچەندە پەیمانەکە لە نێوان مرۆڤەکان خۆشیان دابێ، چونکە بە ناوی خواوە ئەو پەیمانانە، تەواو دەکرێن، سوێندیان لەسەر دەخورێ، خوا دەکرێ بە شایەد، یاخود لەبەرئەوەی: خوا ﷻ وەفا کردن بە بەڵێن و پەیمانی، بە یەکێ لە بەها بەرزەکان

داناوە، لە هەموو شەریعەتەکانی خۆیدا، بۆیە ئەو پەیمانە پاڵ دەداتە لای خوا، ئەگەرنا هەموو شتێك هەر هی خوایە، بەڵام ئەوە جۆرێك لە تەشریفە بۆ بەڵێن و پەیمان، یانی: ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە پەیوەستە بە خواوەو، خوا بایەخێکی تایبەتی پێداوە، پێیەوە پابەندو وەفادار بن.

﴿وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا﴾، سوێندەکان دوای ئەوەی جەختیان لەسەر کراوەتەوە، هەڵمەوەشێننەوە.

ئەمجارە وشەی (ٱلۡأَيۡمَٰنَ) بەکاردێنێ لە جیاتی بەڵێن و پەیمان، لەبەرئەوەی هەر بەڵێن و پەیمانێك کە دەدرێ، سوێندی لەسەر دەخورێ و، بە سوێند جەختی لەسەر دەکرێتەوەو داکۆکیی لەسەر دەکرێ.

کەواتە: کە دەفەرموێ: سوێندەکانتان هەڵمەوەشێننەوە، واتە: ئەو پەیمانانەی کە سوێندتان لەسەر خواردوون، دوای ئەوەی جەختتان لێ کردوونەوە ﴿وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًا﴾، لە حاڵێکدا کە خواتان بەسەر خۆتانەوە کردوە بە چاودێر، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ﴾، بێگومان خوا دەزانێ چی دەکەن، چ بە ئاشکرا، چ بە پەنهان، وریا بن !

ئنجا خوا ﷻ بۆ ئەوەی پێشانمان بدات کە پەیمان شکاندن و هەڵوەشاندنەوەی بەڵێن، چەند شتێکی خراپ و، قێزەونە! بەمجۆرە بۆمان وێنا دەکات: دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا﴾، وەك ئەو ژنە مەبن کە ڕیسەکەی خۆی دەکردەوە بە خوری و هەڵیدەوەشاندەوە، دوای ئەوەی زۆر بە مەحکەمی دەیڕست و دەیهۆنیەوە !

(**غَـزْل**) یانی: چنراو، (**مِغْزَل**)یش تەشییە کە خوریی و مووی پێ دەڕێسرێ، پێی دەهۆنرێتەوەو، دەچنرێ، ﴿مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە زۆر چاك چنراوەو، ڕێسراوەو، توندو پەیت کراوە، ڕیسەکەی خۆتان مەکەنەوە بە خوریی، (أَنكَٰثًا): (**أَنكاث**) کۆی (**نِكْث**)ە، واتە: ئەو شتەی کە چنیوتانەو ڕستووتانە پس پسی مەکەن، لە کوردییدا ڕیسێك کە دەکرێتەوە بە خوریی و، دەشکنرێتەوە، یاخود پەتێك کە دوای هۆنرانەوەی هەڵدەوەشێنرێتەوە، دەگوترێ: پس پسی کرد، واتە: بەش بەشی کردو پساندی.

﴿ تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًا بَيْنَكُمْ ﴾، لە حاڵێکدا ئێوە پەیمان هەڵدەوەشێننەوە، کە پەیمانەکانی خۆتان لە بەینی خۆتاندا دەکەنە هۆکاری موخەننەتیی و ناپاکیی و فێڵ و فەرەج لە دژی یەکدی، ﴿ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ ﴾، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کە پەیمان هەڵدەوەشێننەوە: پەیمان و سوێندەکانی کە خواردووتن، لە بەینی خۆتاندا دەکەنە زەمینە سازیی بۆ موخەننەتیی و ناپاکیی و فێڵ و فەرەج لە دژی یەکدی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە کۆمەڵێك زیاترە لە کۆمەڵێك، واتە: ئەو کۆمەڵەی کە دەتانەوێ پەیمانی تازەی لەگەڵ ببەستن، لەو کۆمەڵە زیاترن کە پێشتر پەیمانتان لەگەڵ بەستوون! بەڵام مەچن یەکسەر پەیمان لەگەڵ ئەوەی پێشێ هەڵمەوەشێننەوەو، ئەوانی دیکەیان لە جێ دانێن، هەر لەبەرئەوەی لەوان زیاترن، ﴿ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ اللَّهُ بِهِۦ ﴾، بێگومان خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوە، کە ئایا لەبەر بەرژەوەندییەکی دنیایی (میکیا ڤیلیانە) بەڵێن و پەیمانە پێشووەکەتان دەشکێنن، لەبەرئەوەی چاوتان لەوەیە کە لەگەڵ لایەنێکی بەهێزتردا، کە ژمارەیان زیاترە، پەیمان ببەستن؟ خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوە، ﴿ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، لە ڕۆژی دواییشدا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، بێگومان ئەوەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی و کێشەو مشتومڕەوە، واتە: ئەوێ شوێنی تەصفیە حیساب و شوێنی (کا و دان) لە یەك جیا کردنەوەیە، ئێوە لە دنیادا ئەو جۆرە تەصفیەو حیسابانە بەیەکەوە مەکەن، پابەند بن بە بەڵێن و پەیمانی نێوانتانەوە.

﴿ وَلَوْ شَآءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، ئەگەر خواش ویستبای دەیکردن بە یەك کۆمەڵ، کە هەمووتان کۆمەڵێکی خواپەرست بن، لەسەر ڕێی هەق و لانەدەن، ﴿ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ، لە ڕێی لادەدات و سەرگەردانی دەکات و گومڕای دەکات، هەروەها هەر کەسێکیشی بوێ دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست.

لێرەدا ئەو (هدایة)ە، کە لە: (يَهدِي)دا هەیە، بە مانای ڕێ پێشاندان نیە، چونکە خوا ویستوویەتی و ڕێی پیشانی هەموو خەڵك داوە، بەڵکو بە مانای خستنە سەر ڕێیە، هەروەها (يُضِلُّ)ش بە مانای ئەوە نیە، کە خوا ڕێیان پێشان نەدات، خوا ڕێی پێشانی هەموو لایەك داوە، بەڵکو (يُضِلُّ) واتە: بێ بەشی دەکات لەوەی کە ڕێگای ڕاست بگرێ، هەر کەسێك کە خوا بیەوێ، بەڵام بە ویستی ئازادانەی خۆی، بێبەشی دەکات لەوەی کە ڕێگای ڕاست بگرێ، هەروەك ئەویدیکەش: خوا بە ویستی ئازادانەی خۆی، بەهرەمەندی دەکات، لەو ڕێیە ڕاستەی کە پێشانی داوە، کە بیگرێتە بەر، ﴿ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا

﴿ كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، بە دڵنیاییەوە (سوێند بە خوا) لەوەی کە دەتانکرد لە دنیادا، لێتان دەپرسرێتەوە.

﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ ﴾، دووبارەی دەکاتەوە: سوێندەکانتان لە بەینی خۆتاندا مەکەنە مایەی موخەننەتیی و فێڵ و فەرەج و یەکدی هەڵخەڵەتاندن، ﴿ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا ﴾، کە لە ئەنجامی ئەوەدا: پێیەکی چەسپاو، بخلیسکێ، لێرەدا خوا پەیمان شکێنیی ئاوا وێنا کردوە: کەسێك لە شوێنێکی مەحکەم پێی داناوە، کەچی هەر هێندە دەزانێ، پێی دەخلیسکێ، کەسێکیش کە پابەندە بە بەڵێن و پەیمانی خۆیەوە، وەك کەسێکە پێی مەحکەم کردبێ و، پەیمان شکاندنەکەش وەك پێ خلیسکانێکە کە کەسێك ڕەتەڵێك دەبات دەخلیسکێ و، لە شوێنێکی بەرز دەکەوێتە خوار، یان دەکەوێتە نێو باتلاغێکەوە.

﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها سەرەنجام: خراپە بچێژن بەهۆی ئەوەوە کە خەڵکتان لە ڕێی خوا لاداوە، یان بۆخۆتان لاتانداوە لە ڕێی خوا، ﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ ﴾، واتە: (تَذُوقُوا العَذَابَ السُّوء)، یان (عِقَابَ السُّوء)، سزای خراپ بچێژن، یاخود تۆڵەی خراپ بچێژن، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕێتان لاداوە (لە ڕێی خوا)، یاخود خەڵکتان لە ڕێی خوا لاداوە، چونکە پەیمان شکێنیی و بێ بەڵێنیی، دەبێتە هۆی ئەوە، کە خەڵك متمانەی نەبێ بە ئیسلام و، ئیسلامی لە پێش چاو ببێزرێ، هەروەك ئەو گرووپە پەڕگیرانەی کە لەم ڕۆژگارەدا پەیدا بوون، شتی وادەکەن، ڕێك پێچەوانەی ئیسلامە، ڕێك لەگەڵ سروشتی ئیسلامدا تێکدەگیرێ، لەگەڵ پەیامی پێغەمبەردا ﷺ تێکدەگیرێ، ئیدی سەرەنجام: بۆ خەڵکێکی سادەی نەزانی نەشارەزای ناشێ، دەبێتە پەردەیەك کە ڕووی ڕاستەقینەی ئیسلامی لە پێش چاو بشێوێ، یاخود ئیسلام هەر نەناسێ، یاخود بە پێچەوانەی سروشتی خۆیەوە، ئیسلام بناسێ.

ئیسلامێك کە بۆ ڕەحمەت هاتوە، پێی وابێ مایەی زەحمەتە، ئیسلامێك کە بۆ بەختەوەرکردنی خەڵك هاتوە، پێی وابێ مایەی بەدبەخت کردنیانە، ئیسلامێك کە بۆ ئاوەدانیی هاتوە، پێی وابێ کە ئیسلام مایەی ماڵ وێرانییە، چونکە شوێنەواری ئەو گرووپە پەڕگیرانە بەتایبەتی ئەو (داعش)ەی کە ملۆزمە، پێش هەموو کەس بۆ موسوڵمانان و بۆ ئیسلام، وەك دەبینین لە هەر شوێنێك دەستەڵاتیان بوو، بە تایبەت لە سووریاو عێراقدا، وەك چۆن دەڵێن: کوندەپەپوو لە هەر شوێنێك بخوێنێ، کاول دەبێ، ئەوانە پێیان بچێتە

هەر شوێنێك كاول دەبێ، خوێنێكی زۆر دەڕێژن و، وڵاتەكەش كاول دەكەن و، خەڵكەكە تووشی سەغڵەتیی و ناڕەحەتییەكی زۆر دەكەن، ئنجا بە ناوی ئیسلامیشەوە دەیكەن، كە كردەوەكانیشیان پێچەوانەی ئیسلامن، پێچەوانەی ئەو هیدایەتەیە كە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەمدا ناردوویەتی، بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤایەتیی پێ بەختەوەر بكات، بەڵام ئەوان پێشێ بەڵان بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، ئنجا دوایی بەڵان بۆ خەڵكی دیكەی جیا لە مسوڵمانان، ئەگەرنا سەدا نەوەدی ئەوەی كە بە دەستی (داعش) لە بەین چووە لە عێراق و لە سووریا، مسوڵمانانن، ئنجا ئەگەر لە پەنای مسوڵمانانیشدا كە كەسێكی مەسیحیی، یان ئێزیدیی، ئەوانەش تووشی زیان و زەرەر بوون، بەڵام بەڵایەكە زیاتر بۆ ئیسلام و ئەهلی ئیسلامە، ئنجا بێگومان خوا دەفەرموێ: بەهۆی بێ پەیمانیی و بەڵێن شكێنییەوە خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، كە ئەوە وایەو هەر مومارەسەیەكی هەڵە بە ناوی دینەوە بكرێ، دەبێتە هۆی ناشیرینكردنی ڕووی گەشی ئیسلام لەبەر چاوی خەڵك، هەڵبەتە خەڵكێك كە خۆیان شارەزای ئیسلام نین، ﴿ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، سەرەنجام سزایەكی مەزنیشتان بۆ دەبێ.

﴿ وَلَا تَشْتَرُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، دووبارەی دەكاتەوە، دەفەرموێ: بە نرخێكی كەم، پەیمانی خوا مەكڕن، واتە: پەیمانی خوا وەك كاڵایەك مامەڵە پێ مەكەن، كە لە بەرانبەریدا نرخێكی كەم وەربگرن، ﴿ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، بێگومان ئەوەی كە لە لای خوایە، باشترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن، ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾، ئەوەی لە لاتانە تەواو دەبێ و دەبڕێ، هەرچی بێ، ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾، بەڵام ئەوەی لەلای خوایە، كە بەهەشتی خوایە، ڕەزامەندیی خوایە، بەخششی خوایە، لە ڕۆژی دوایی دا، دەمێنێتەوەو، لەبن نایەت، ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، بە دڵنیاییەوەش پاداشتی ئەوانەی كە خۆیان ڕاگرتوە {لەسەر جادەی شەریعەت}، پاداشتەكەیان دەدەینەوە، بەپێی باشترینی ئەوەی كە دەیانكرد، واتە: باشترینی كردەوەكانیان بۆ دەكەینە پێوەر بۆ پاداشت دانەوەیان.

لە كۆتاییدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ﴾، هەر كەسێك كردەوەی باش بكات لە نێر یان مێ و، بڕواداریش بێ، بە دڵنیایی بە ژیانێكی پاك و چاك و بەختەوەرانە دەیژیەنین، واتە: لە دنیادا، ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، بە دڵنیاییەوەش

لـە دواڕۆژیـش دا پاداشـتیان دەدەینـەوە، بەپێـی باشـترینی ئـەوەی ئەنجامیـان دەدا، بەپێـی باشـترینی کردەوەکانیـان.

کەواتـە: ئیـمان و کـردەوەی بـاش، مایـەی بەختەوەریـی و، مایـەی سـەرفرازیی و، مایـەی ژیانێـکی پـاك و چـاك و، پـڕ بەختەوەرییـە، لـە دنیـادا، کـە بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی ئـەو حاڵەتـە ئیمانییەیـە، کـە لـە دڵ و دەروونـدا جێگیـر دەبـێ، کـە ئینسـان بەرچـاوی ڕوونـە، بـە پاکیـی دەژی، بەڕاسـتی دەژی، بـە سـاغیی دەژی، لەگـەڵ خـواو لەگـەڵ خەڵـك دا، هەسـت بـە بەختەوەریـی دەکات و، هەسـت بـە دڵخۆشـیی دەکات و، هەسـت بـە سـەرفرازیی و سـەربەرزیی دەکات لـە لای خـواو خەڵـك، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە هەسـت بـە کامەرانیـی و شـادمانیی بـکات.

لـە دواڕۆژیشـدا بـە پێـی باشـترینی کردەوەیـان پاداشـتیان دەداتـەوە، خـوای پـەروەردگار لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ، بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێگومان خوا فەرمان دەکات بە دادگەریی و چاکەکاریی و بەخشین بە خزم و نیزیکان و، ڕێگریی لە قسەو کرداری دزێوو ناشیرین و کاری خراپ و، سنوور شکێنیی دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ﴾، بە دڵنیایی، بە جەختکردنەوەوە، خوا فەرمان دەکات بە دادگەریی، ئنجا ئایا ئەو دادگەرییەی خوا فەرمانی پێ دەکات، زانایان چۆنیان شی کردۆتەوە ؟

**(العَدْلُ: القَصْدُ فِي الأُمُورِ، وَهُوَ خِلَافُ الجَورِ، عَدَّلْتُهُ: سَوَّيْتُهُ، وَالعَدْلُ: الإِنْصَافُ، وَهُوَ إِعْطَاءُ المَرْءِ مَا لَهُ، وَأَخْذُ مَا عَلَيْهِ).**

واتە: (**عَدل**) بریتیە لە نێوەنجیی بوون لە کاروبارەکاندا و، پێچەوانەی لادان (**جَور**)ە، {(**جَور**) واتە: لادان، بەڵام (**عَدل**) یانی: ڕێك ڕۆیشتن، ڕێك بوون}، (**عَدَّلْتُهُ سَوَّيْتُهُ**)، (**عَدَّلْتُهُ**)، واتە: یەکسانم کرد، ڕێکم کرد، تەختم کرد، {زەوییەك کە بەرزیی و نزمیی هەبێ، دەگوترێ: (**عَدَّلْتُها**)، زەوییەکەم ڕێکخست و بەرزو نزمییم تێدا نەهێشت}، هەروەها (**عَدْل**) بە ئینصاف لێك دراوەتەوە، ئینصاف ئەوەیە تۆ مافی خۆت وەربگری و مافی ئەوانەی دیکەش بسەلمێنی و، ئەگەر بەدەستت بێ بۆیان دابین بکەی.

هەروەها (**عَدل**) ئاواش پێناسە کراوە: بریتیە لەوەی هەر کەسە ئەوەی کە لەسەریەتی بیدات و، ئەوەی کە مافیەتی، وەریبگرێ.

هەڵبەتە دەگونجێ زیاتریش لەوبارەوە قسە بکرێ، بەڵام ئێمە ئێستا بە کورتی قسە دەکەین.

٢- ﴿ وَٱلْإِحْسَٰنِ ﴾، هەروەها خوا فەرمان دەكات بە چاكەكاریی.

(الحَسَنُ: مَا كانَ مَحْبُوباً عِنْدَ المُعَامِلِ بِهِ، وَلَم يَكُن لازِمَاً لِفَاعِلِهِ، وَالإِحْسانُ: هُوَ مُعَامَلَةٌ بالحُسْنَى مِمَّن لاَ يَلْزمُهُ إِلى مَنْ هُوَ أَهْلُهَا).

وشەی (حَسَن) واتە: هەر شتێكە كە بە چاك دابنرێ، لەلای كەسێك كە مامەڵە دەكات لەگەڵ كەسێكدا، لەسەر بكەرەكەشی پێویست نەبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (حَسَن).

(إحسان) یانی: ئەنجامدانی شتی باش، ئەنجامدانی ئەو باشەی كە باسمان كرد، ئەویش ئەوەیە كە بە جۆرێك مامەڵە بكەی لەگەڵ كەسێكدا كە شایستەیەتی، بە كام جۆرە باشترە، ئاوا مامەڵەی لەگەڵ دابكەی، (الأحسان) زیاتر لایەنی مەعنەویی دەگرێتەوە.

٣- ﴿ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾، هەروەها بەخشین بە نیزیكان، یان بە خزمان، كە بێگومان مەبەست پێی بەخشینی سەروەت و سامانە، هاوكاریی ماددییە، ﴿ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾، (ذِی) و (ذُو) یانی: خاوەن، (ٱلْقُرْبَىٰ) یانی: نیزیكایەتیی و خزمایەتیی، كەواتە: یانی: (صَاحِبِ القَرَابة)، كەسێك كە بابای بەخشەر لەگەڵیدا خزم بێ و نزیك بێ.

لە چەند شوێنێكی دیكەش خوای بەخشەر باسی بەخشین بە خزمانی كردوە، بۆ وێنە:

أ / لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ... ﴿٢٦﴾ ﴾الإسراء، واتە: هەروەها مافی خزم بدە، مافەكەی پێ بدە.

ب) هەروەها لە سووڕەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ... ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: مافەكە بدە بە كەسێك كە خزمەو نزیكەو، خاوەنی خزمایەتییە لەگەڵت دا.

٤- ﴿ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ ﴾، وەك چۆن خوا فەرمان دەكات بەو سێیانە، بە دادگەریی و، بە چاكەكاریی و، بە پێدان و بەخشین بە خزمان، ئەم سێ شتانەش قەدەغە دەكات: (ٱلْفَحْشَآءِ)، (وَٱلْمُنكَرِ)، (وَٱلْبَغْىِ).

(الفَحْشَاء: إِسْمٌ جَامِعٌ لِكُلِّ قَولٍ أَو فِعلٍ تستفظِعُهُ النُّفُوسُ لِفَسادِهِ)، (فَحْشَاء) ناوێكی كۆكەرەوەیە، بۆ هەر قسەو كردەوەیەك كە نەفسەكان پێیان شتێكی ناقۆڵاو خراپ و دزێوە، لەبەر خراپیی.

٥- ﴿ وَٱلْمُنكَرِ ﴾، (المُنكر: هُوَ مَا تَستنكرهُ النُّفُوسُ المُعْتَدِلَةُ، وَتَكرهُهُ الشَّرِيعَةُ، مِن فِعْلٍ أَو قَول)، (مُنكر)یش هەر شتێكە كە نەفسە هاوسەنگەكان و، شەریعەت بە خراپی بزانێ، لە قسە یان كردەوە.

٦- ﴿وَٱلۡبَغۡيِ﴾، (البَغي: هُوَ الإعْتِدَاءُ فِي المُعَامَلَة)، بریتیە لە سنوور شکێنیی، سنوور بەزێنیی {دەستدرێژیی بە هەموو شێوەکانیەوە} لە هەڵسوکەوت دا.

٧- ﴿يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، خوا ئامۆژگارییتان دەکات، بەڵکو بێتەوە بیرتان، بەڵکو چاو بەخۆتاندا بگێڕنەوە، (التَذَكُّر: مُرَاجَعَةُ الْمَنسِيِّ المَغْفُولِ عَنْهُ)، (تَذَكرّ) بریتیە لە چاو پێداگێڕانەوەی شتێ کە لە بیر کراوەو ئاگات لێبڕاوە، وەبیر خۆتی بێنیەوە.

## کورتە باسێك: چوار سەرنج لەبارەی ئەم ئایەتەوە: (النَّمل: ٩٠):

**سەرنجی یەکەم:** گرنگیی و گەورەیی ئەم ئایەتە:

**١-** لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: (**هَذِهِ أَجْمَعُ آية فِي القُرْآنِ لِخَيرٍ يُمْتَثَل، وَلشَرٍّ يُجْتَنَب**)[١].

واتە: ئەم ئایەتە کۆکەرەوەترین ئایەتی قورئانە، بۆ هەر چاکەیەك کە ئەنجام بدرێ و، هەر خراپەیەك کە دووریی لێ بکرێ.

هەروەها (**القُرطبي**)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[٢] هەمان دەقی هێناوە.

**٢** - هەروەها هەر لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە خوا لێی ڕازی بێ، وەك تەفسیری (**المَرَاغِي**)، کە هەر بە ناوی خاوەنەکەیەوەیەتی، دەڵێ:

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: أَعْظَمُ آيةٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢٥٥﴾ البَقَرَة، وَأَجْمَعُ آية فِي كِتَابِ اللَّهِ لِلْخَيرِ وَالشَّرِّ، الآية الَّتِي فِي النَّحْل: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾، وَأَكْثَرُ آيةٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَفوِيضاً: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ... ٣﴾ الطلاق، وَأَشَدُّ آيةٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ رَجَاءً: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِ... ٥٣﴾ الزمر}[٣].

---

(١) جامع البيان للطبري، ج ١٤، ص ١٦٩، رقم: ٢١٧٩٩.

(٢) الجامع لأحكام القرآن، ج ١٠، ص ١٣٦.

(٣) ج ٥، ص ١٣٠. ئەمە پاڵی داوەتە لای صەحیحی بوخاریی و ئیبنو لمونزیرو ئیبنو لجەریری تەبەریی و حاکیم و بەیهەقیی، بەڵام من لە تەفسیری (الطبري)دا تەنیا ئەو قسەیەی دەربارەی ئایەتەکەی سوورەتی: (النحل)ە، بینیم کە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی، ڕەنگە لە سەرچاوەکانی دیکەدا، لەبارەی هەر (٤) چوار ئایەتەکەوە، قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، خوا لێی ڕازی بێ، هاتبێ.

واتـە: عەبدوڵڵای كـوڕی مەسـعوود خـوا لێـی ڕازی بـێ گوتوویـەتی: مەزنتریـن و گەورەتریـن ئایـەت لـە كتێبـی خـوادا: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ... (٢٥٥) ﴾ە، ئـەوە لـە صەحیحـی بوخارییشـدا هاتـوە، كـە پێغەمبـەر ﷺ بـە گەورەتریـن ئایـەتی ناونـاوە، كۆكەرەوەتریـن ئایەتیـش بـۆ چاكـەو خراپـە ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (النَّحـل)ە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ... ﴾ هەروەهـا ئایەتێـك كـە لـە هەمـوو ئایەتانـدا زیاتـر كاری خـۆ بـە خـوا سـپاردنی تێدایـە، ئـەو ئایەتەیـە: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا (٢) ﴾، {كـە لـە سـوورەتی (الطلاق)دایـە، واتـە: هـەر كەسـێك پارێـز لـە خـوا بـكات، خـوا دەرووی لـێ دەكاتـەوە}، هەروەها ئایەتێـك كـە ئومێـد بەخشـترین ئایەتـە لـە كتێبـی خـوادا، ئایەتەكـەی سـوورەتی (الزمَـر)ە، ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ... (٥٣) ﴾.

**سەرنجی دووەم:** دانرانی ئەم ئایەتە (**النحل: ٩٠**) لە لایەن (**عمر بن عبدالعزیز**)ەوە لە شوێنی جنێو گوتران بە (**علي بن أبي طالب**) لەسەر دوانگە:

ئەمـە (**جَـمَال الدِّيـن القَاسِـمِي**) و، تەفسـیرەكانی دیكـەش، كـەم و زۆر باسـیان كـردوە، (**جمال الدِّيـن القاسـمي**) لـە (**محاسـن التَّأويـل**)دا[1]، دەڵـێ: (**كَانَ بَنُـو أُمَيَـة يَسُـبُّون عَلِيـاً عَـلَى الْمَنَابِـرِ، فَلَـمَّا آلَ الأَمْـرَ إِلَى عُمَـرَ بْـنَ عَبـدُ العَزِيـز، وَضَـعَ هَـذِهِ الآيَـة مَـكَانَ السَّـبِّ**).

واتـە: بەنـو ئومەییـە عادەتیـان وابـوو لەسـەر مینبـەران، قسـەیان بـە عەلـی كـوڕی ئـەبی تاڵیـب (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەگـوت، كاتێـك كـە كاری حوكمڕانیـی كەوتـە دەسـتی عومـەری كـوڕی عەبدولعەزیـز خـوا لێـی ڕازی بـێ، ئـەم ئایەتـە موبارەكـەی لـە شـوێنی قسـە گوتـن و جنێـودان بـە عەلـی كـوڕی ئـەبی تاڵیـب خـوا لێـی ڕازی بـێ دانا، (كـە حوكمڕانـە ستەمكارەكانی بەنـو ئومەییـە، ئەوەیـان كـرد بـوو بـە عادەتێـكی خـراپ).

ئنجـا لـە (**محاسـن التَّأويـل**)دا دەڵـێ: بـەڵام ئـەو جنێودانـە لـە سـەردەمی موعاویـەوە نەبـووە، بـەڵام لـە هەنـدێ سـەرچاواندا دەڵـێ: موعاویـە شـتەكەی داهێنـاوە، كـە ئەگـەر وابـێ، ئـەوە یەكێـك بـووە لـە هەڵـەكانی و، هەڵـەی دیكـەشی بـوون و، ئـەوەش یەكـێ بـووە لـە هەڵـەكانی، بـەڵام بێگومـان وەك چـۆن هەڵـەی هەبـوون، چاكـەشی هەبـوون، خـوا لێـی خـۆش بـێ لەوانـەدا كـە نەیپێـكاوەو، پاداشتیشـی بداتـەوە لەسـەر چاكـەكانی.

چونكـە گرفتـی شـیعان لەگـەڵ موعاویـەو، لەگـەڵ هەنـدێ لـە هـاوەڵان دا، ئەوەیـە كـە هـەر تەماشـای خاڵـە ڕەشـەكانیان دەكـەن، هـەر تەماشـای هەڵـەو كـەم و كوڕییەكانیـان

(١) ج ١٠، ص ١٥١.

دەکەن، کە ڕەنگە هەندێ شتیشیان هەڵەو کەم و کوڕییش نەبێ، بەڵام بە چاوی ئەوان هەڵەو کەم و کوڕیی بێ، ئنجا بێگومان هاوەڵانیش بەشەر بوون، پارێزراو نەبوون لە هەڵە، ئەگەرنا دەیانبەینە ڕیزی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئینصاف وا دەخوازێ، وەك گوتراوە: (**مِن فَضَائِلِ الرِّجَالِ أَن تُعَدَّ مَعَائِبُهُم**)، گەورەییە بۆ پیاوان و پایە بەرزییە بۆ پیاوان، کە عەیبەکانیان بژمێردرێن.

واتە: هاوەڵە، یان هەر کەسێك هەیە، بڵێی ئەو کەم و کوڕییەی بوو، ئەوەشی بوو، ئەوەشی بوو، مادام بژمێردرێن و سنووردار بن و، لە بەرانبەر ئەو هەڵەو کەم و کوڕییە سنووردارانەدا، چاکەی زۆریشی هەبن، ئەوە بۆیان بە فەزیلەت دادەندرێ، بە پێگەی بەرز، نەك بە ناتەواویی، بەڵام تۆ بێنی وەك مێشە ڕەشە تەنیا عەیب و کەم و کوڕییەکان ببینی، یان ئەو شتانەی کە تۆ بە عەیب و کەم و کوڕییان دەزانی، ئەوە پێچەوانەی دادگەریی و ئینصافە، ئنجا لەگەڵ هاوەڵاندا ئاوا مامەڵە بکەی، یان لەگەڵ هەر کەسێکی دیکەدا، هەروایە.

**سەرنجی سێیەم:** زێدە ڕوونکردنەوەی واتای:

١- **الإحسان.**

٢ - **إيتاء ذي القربى.**

٣- **الفحشاء.**

٤- **المنكر.**

٥- **البغي:**

بەڕێزان:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم ئایەتە بەپێزە دادگەریی (**عَدل**) کردوە بە سەرڕشتەی خۆی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ ﴿٨٨﴾﴾، ئێمە پێشترو لە سەرەتاوە تیشکی باشمان خستە سەرچەمك و واتایەکەی، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە، بەڵام سەرو تیشك دەخەینە سەر پێنج وشەکەی دیکەی ئەم ئایەتە:

١) **الإحسان.**

٢) **إيتاء ذي القربى.**

**٣) الفحشاء.**

**٤) المنكر.**

**٥) البغي.**

**١- الإِحسان:** (اَلإِحْسانُ: مَصْدَرُ أَحْسَنَ يُحْسِنُ إِحْساناً، لَهُ مَعْنَيانِ أَحَدُهُمَا: مُتَعَدٍّ بِنَفسِهِ، أَحْسَنتُ كَذَا، أَي: حَسَّنْتُهُ وَكَمَّلْتُهُ، وَهُوَ مَنقُولٌ بالهَمْزَةِ مِن: حَسُنَ الشَّيء، وَثَانِيهُمَا: مُتَعَدٍّ بِحَرْفِ جَرٍّ: أَحْسَنتُ إِلى فُلَانٍ، أَي: أَوْصَلْتُ إِلَيْهِ مَا يَنْتَفِعُ بِهِ).

واتە: (إِحْسان) چاوگی (أَحْسَنَ يُحْسِنُ إِحْساناً)ە، لەو (فعل)ەوە هاتوە، دوو واتای هەن: یەكێكیان: بۆخۆی تێپەڕ دەكات بۆ بەركار (**مفعول بە**)، دەگوترێ: (**أَحْسَنتُ كَذَا**)، ئەو شتەم چاك كرد، یانی: چاكم كردو، تەواوم كرد، كە لە ئەسڵدا بە هەمزە (أ) لە (**حَسُنَ الشَّيء**)، وە هاتوە، ئەو شتە چاك بوو، جوان بوو، ڕێك بوو، بەڵام كە دەڵێی: (**أَحسَنتُ هَذَا الشَّيء**)، واتە: من چاكم كردو، ڕێكم كرد، واتە: بە هەمزە بۆخۆی بەركار (**مفعول بە**) دەخوازێ.

مانای دووەمی: ئەوەیە كە بە پیتی ژێردارکەر (**حرف جرّ**) بەركار دەخوازێ، وەك: (**أَحسَنتُ إِلى فُلَانٍ**)، چاكەم لەگەڵ فڵانكەسدا كرد، واتە: شتێكم پێگەیاند كە لێی بەهرەمەند دەبێ.

پوختەی مەبەست: (**فَالإِحسانُ: هُوَ إِتقَانُ العَمَلِ وَإِجَادَتُهُ، وَإِيصَالُ النَفعِ للأَخِرِين وَإِفَادَتِهِم**)، (**إِحسان**): بریتیە لەوەی كارێك لە خودی خۆیدا بە چاكیی بكرێ و بە ڕێكیی ئەنجام بدرێ، ئەوە واتایەكی.

واتایەكی دیكەی: یانی: سوود گەیاندن بەوانی دیكەو، بەهرەمەند كردنیان.

**٢- البَغِي:** كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْيِ﴾، با لەوبارەوە ئەو دوو فەرموودەیە بێنین:

**أ** - پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**لا ذَنْبَ أَسْرَعُ عُقُوبة مِن البَغِي**} (**أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ**: ٤٩٠٢، **وَالتِّرمِذِيُّ**: ٢٥١١، **وَابنُ مَاجَهْ**: ٤٢١١ **وَصَحَّحَهُ الأَلبَاني فِي** «**صَحِيح الجَامِع**»: ٥٧٠٤).

واتە: هیچ گوناهێك سزای خێراتر نیە لە (**بَغِي**) واتە: سنوور شكێنیی و ستەمكردن و ماف پێشێلكردنی ئەوانی دیكە.

ب - {مَا من ذَنبٍ أَجدَرُ أَن يُعَجِّلَ اللَّهُ تَعَالى لِصَاحِبِهِ العُقُوبة فِي الدُّنيا، مَعَ مَا يَدَّخِرهُ لَهُ فِي الأخِرَة، مِنَ البَغْي وَقَطِيعَةِ الرَّحِيمِ} (صحَّحهُ الألباني فِي «صحيح الجامع»: ٥٧٠٤).

واتـە: هیـچ گوناهێـك شایسـتەتر نیـە لـەوە کـە خـوای بـەرز سـزای دنیایـی بـۆ پێـش بخات، وێـڕای ئـەو سـزایەی کـە لـە دواڕۆژدا بـۆی هەڵدەگـرێ، لـە دەسـتدرێژیی و سنوورشـكێنیی و، پچڕانـدنی پەیوەندیـی خزمایەتیی.

**٣- إيتاء ذي القربى:** لەوبارەشەوە ئەم فەرموودەیە دێنین:

{إنَّ اللَّـه خَلَـقَ ٱلخَلـقَ حَتَّـى إِذَا فَـرَغَ مِنهُـم قَامَـت الرَّحِـمُ، فَقَالـت: هَـذَا مَقَـامُ العَائِـذِ بِـكَ مِـنَ القَطِيعَـة، قَـالَ: نَعَـم، أَمَـا تَرضَيْنَ أَن أَصِـلَ مَـن وَصَلَـكِ، وَأَقطَـعَ مَـن قطَعَـكِ؟ قَالَـت: بَـلى، قَـالَ: فَذَلِـكِ لَـكِ} (أَخْرَجَـهُ البخـاري: ٤٨٣٠، ومسـلم: ٢٥٥٤).

پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: دوای ئـەوەی خـوای بەرزی مەزن دروسـتكراوەكانی دروسـتكردنی، تـەواوی كـردن، خزمایەتیـی، هەڵسـا گـوتی: مـن لێـرە پەنـا بـە تـۆ دێنـم، لـەوە كـە بپچڕێندرێم، خـوا فەرمـووی: بەڵـێ: {ئـەو مافـە بـە تـۆ دەدەم}، ئایـا ڕازی نـابی كـە هـەر كەسـێك تـۆی گەیانـد، بیگەیەنـم و، هـەر كەسـێك تـۆی پچڕانـد، بیپچڕێنـم؟ خزمایەتییش گـوتی: بـا، خـواش ﷻ فەرمـووی: تـۆ ئـەو مافـەت هەیـە { كـە هـەر كەسـێك خزمایەتیـی پچڕانـد، خـوا بەزەیـی خـۆی لـێ بپچڕێنـێ و، هـەر كەسـێك خزمایەتیـی گەیانـد، خـواش بەزەیی خـۆی پـێ بگەیەنێ}.

**٣و٤- (الفحشاء) و (المنكر)** : ئەم دوو وشەیە مانایان زۆر لێك نزیكە، بەڵام من وای تێدەگەم كە وشەی (فَحشَاء) زیاتر سەرنجی ناشرینیی و دزێوییەكەی دەدرێ، واتە: هەموو ئەو كردەوەو قسانەی كە ناقۆڵان و ناشیرین و دزێوو و قێزەونن، (**مُنكر**)یش هەموو ئەو كردەوەو قسانەن، كە سەرنجی لایەنە خراپییەكەیان و زیانەكەیان دەدرێ، هی (**فَحشَاء**) سەرنجی ئەوە دەدرێ، كە لە خودی خۆیاندا ناشیرین و ناقۆڵاو قێزەونن، بەڵام (**مُنكر**) سەرنجی زیان و خراپییەكەیان دەدرێ بۆ كۆمەڵگا.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە:

أ - (**الفَحْشَاء: يُعَبِّرُ عَنِ الإنحرَاف فِي مَجَال القُوَّة الشهوَانية**)، وشەی (**فَحْشَاء**) تەعبیر دەكات لە لادان لە بواری هێزی ئارەزوو و، لایەنی جینسیی دا.

ب - (**المُنكر: يُعبِّرُ عَنِ الإنْحِرَافِ فِي مَجَال القُوَّة العَقْلية**)، وشەی (مُنْكر) تەعبیر دەكات لەو گوناهو هەڵانەی، كە مرۆڤ لە ڕووی عەقڵییەوە، تووشی لادان دەبێ.

**ج** - (**البَغْي: يُعَبِّرُ عَنِ الإنْحِرَافِ فِي مَجَال القُوَّة الغَضَبِيَّة**): وشەی (بَغْي) تەعبیر دەكات لەو گوناهانەی كە لە بواری هێزی تووڕەیی دا ڕوو دەدەن، ئەو هێزەی خوا لە مرۆڤدا دایناوە، كە بەرگریی پێ لە خۆی بكات.

**سەرنجی چوارەم:** لە كۆتاییی توێژینەوەمان دا، لەبارەی ئەم ئایەتە (**النحل - ٩٠ -**) وە، دەڵێین:

ئەم ئایەتە خوا لە سەرەتاكەیەوە وشەی (إِنَّ)ی هێناوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ ...﴾، یانی: بێگومان، بە جەختكردنەوە خوا فەرمان دەكات بەو سێ شتانەو، ڕێگرییش دەكات لەو سێ شتانەی دیكە، فەرمان دەكات بە:

**١)** دادگەریی (**عدل**)، كە وادەكات وڵات بۆ هەموو لایەك فراوان بێ، لەسەر ئاستی حوكمڕانان و كۆمەڵگا، لەسەر ئاستی ماڵ و خێزان، وا دەكات هەموو لایەك خۆشنوودو شادمان بن، لەسەر ئاستی مرۆڤ خۆی كە ئینسان ئەگەر دادگەر بوو لەگەڵ خۆیدا، وا دەبێ: حەقی جەستەی بدات، حەقی ڕووحی بدات، ئاگای لە عەقڵی بێ، ئاگای لە عاطیفەی بێ، ئاگای لە مافی خوا بێ، ئاگای لە مافی خەڵك بێ، ئاگای لە ڕواڵەت و دیوی دەرەوەی خۆی بێ، ئاگای لە دیوی پەنهانی خۆی بێ، ئاگای لە دنیای خۆی بێ، ئاگای لە دواڕۆژی خۆی بێ، دادگەریی (**عدل**) لەسەر ئاستی تاك و، لەسەر ئاستی خێزان و، لەسەر ئاستی كۆمەڵایەتیی و، لەسەر ئاستی حوكمڕانیی، پێویستە.

**٢)** پاشان چاكەكاریی (**إحسان**)، قۆناغێكە لە دادگەریی بەولاوەتر، جاری وایە هەندێ كەس بە عەدل مافەكەی ناكەوێ، بەڵام تۆ دەبێ بە چاكە لەگەڵ كردن (**إحسان**) مامەڵەی لەگەڵ دا بكەی، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ﴾، یانی: نابێ ئینسان لە دادگەریی بچێتە خوار، بەڵام دەبێ هەوڵیش بدات بەرەو ئیحسان و چاكەكارییش بچێ، بەپێی دادگەریی ئەوە مافەكەتە، بەڵام بەپێی چاكەكاریی (**إحسان**) ئەوەشت بۆ دەخەمە سەر، یاخود ئەگەر بە دادگەریی مامەڵەت لەگەڵدا بكەم، مافەكەت ناكەوێ، لەبەرئەوەی تۆ خاوەن حەق نی، بەڵام بە چاكەكاریی مامەڵەت لەگەڵدا دەكەم، مەرج نیە ئینسان تەنیا بە دادگەریی ئیكتیفا بكات، نابێ لە دادگەریی بچێتە خوار، چونكە لە دادگەریی بچێتە خوار، دەچێتە نێو ستەم و جەورەوە، بەڵام دەبێ هەوڵ بدات لە دادگەرییش بە پشتەوەتر بچێ كە (چاكەكاریی)یە.

**٣)** ئنجا (**وإيتاء ذي القربى**)، بەخشین بە نیزیكان (**إيتاء ذي القربى**) جۆرێكە لە چاكەكاریی، بەڵام جۆرێكی زۆر چاكە، چونكە خزمان زیاتر چاوەڕوانییان هەیە لە مرۆڤ، بۆیە پێویستە هاوكاریان بێ و، دەستبارگریان بێ.

بە نسبەت ئەو سێیانەشەوە، کە ڕێگریيان لێکراوە:

**١/ (الفحشاء)**: هەر قسەو کردەوەو ڕەفتارێکی ناشیرین و قێزەون و دزێوە، کە خەڵك بە شتێکی خراپی دادەنێن، بە شتێکی بەدفەڕو نابەرچاو تەماشای دەکەن، بۆیە دەبێ ئینسان خۆی لێ دوور بگرێ.

**٢/ (المنكر)** هەر شتێکە لە قسەو کردەوە کە ناپەسند بێ و، عەقڵ بە ناپەسندی بزانێ و، زیانی هەبێ بۆ خەڵك.

**٣/ (البغْي)**یش بریتیە لە سنوور شکێنیی و سنوور بەزێنیی و، پێشێلکردنی مافەکانی ئەوانی دیکە.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾، کەواتە: ئەمە ئامۆژگاریی خوای پەروەردگارە بۆ مرۆڤەکان و، ئەگەر ئەو ئامۆژگارییەی خوا وەربگرن، ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾، حاڵەتی (تَذَكُّر) واتە: چاو بە خۆداگێڕانەوەو، بەخۆداچوونەوە، کە لە ئەنجام دا، ڕاستییەکانیان دەکەوێتەوە بیر و پەند وەردەگرن.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ئامۆژگارییەکانی خوا کە لەم ئایەتە موبارەکەدا هاتوون و، لە هەموو قورئاندا هاتوون، بە باشترین شێوە وەربگرین و، لێشیان بەهرەمەند بین.

## مەسەلەی دووەم:

خوا فەرمان بە وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمان دەكات و، هەڵوەشاندنەوەی قەدەغە دەكات و، بابای پەیمان شكێن، بە ژنێك دەچوێنێ، كە ڕیسەكەی دەكاتەوە خوریی و ڕایدەگەیەنێ كە نابێ بە هیچ بیانوویەك پەیمان بشكێنرێ و، لە قیامەتیش دا كێشەكانیان بۆ ڕوون دەكاتەوەو، ئەگەر ویستباشی، دەیكردنە یەك كۆمەڵ و دواییش لێیان دەپرسێتەوە:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ ۚ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ ۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١- ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ ﴾، پەیمانی خواش جیبەجێ بكەن هەر كاتێك پەیمانتاندا، هەرچەندە خوا لێرەدا بە گشتی فەرموویەتی، بەڵام دوایی بۆمان دەردەكەوێ كە مەبەست پێی ئەو پەیمانانەیە، كە مرۆڤەكان، (تاكەكان)، یان توێژەكانی كۆمەڵگا، یان كۆمەڵگا جیاوازەكان لە بەینی خۆیاندا دەیاندەن، ئەو پەیمانانەی كە پێكەوە دەیانبەستن، بەڵام بۆچی پەیمانەكە پاڵدراوەتە لای خوا؟ دەڵێ: (إِضَافَةُ العَهْدِ إِلى اللّهِ، لِأَنَّ العَهْدَ يَتِمُّ باسْمِ اللّهِ تَعَالى)، بۆیە پەیمانەكە پاڵدراوەتە لای خوا، چونكە بە ناوی خواوە ﷻ ئەو پەیمانە دەبەسترێ و، ئەو بەڵێنە دەدرێ.

هۆكارێكی دیكەی ئەوەیە {بۆیە (بەڵێن و پەیمان) پاڵدراوەتە لای خوا ﷻ}، چونكە هەموو ئەو شتانەی كە باشن، هەموو بەها بەرزەكان خوای پەروەردگار فەرمانی پێكردوون، بۆیە خوا وەفاداریی و جێبەجێكردنی بەڵێن و پەیمان بەهی خۆی دەزانێ، چونكە هەموو چاكەكان لە خواوەن: خوا ﷻ نەهی لە هەموو خراپەكان كردووە، فەرمانی بە هەموو چاكەكان كردوە.

٢- ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾، سوێندەکان هەڵمەوەشێننەوە، دوای پتەوکردنیان، دەڵێ: (**النَّقْضُ: إبطَالُ المَحْلُوفِ عَلَيْهِ، لاَ إِبْطَالُ القَسَمِ، فَجَعَلَ إبطَالَ المَحْلُوفِ عَلَيْهِ إِبطَالاً لِلْقَسَمِ**).

{(ٱلْأَيْمَٰنَ) کۆی (يَمِين)ە، یانی: سوێند، (ٱلْأَيْمَٰنَ) سوێندەکان، ﴿بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾، (**التَّوكِيدُ: التَّوْثِيقُ**)، پتەوکردن، دەڵێ: (**هـذَا لُغَةُ الحِجَازِ، وَأَهْلُ نَجد: يَقُولُونَ أَكَّدَ يُؤَكِّدُ تَأكِيداً**).

بەڵام ئەهلی حیجاز کاتی خۆی لەهجەکەیان وابووە گوتوویانە: (**وَكَّدَ، يُوَكِّدُ، تَوْكِيداً**)، کە هەر یەك واتایان هەیە، واتە: سوێندەکان دوای ئەوەی داتانمەزراندوون مەحکەمتان کردوون هەڵیان مەوەشێننەوە}، واتە: لێرەدا هەڵوەشاندنەوەکە بۆ ئەو شتەیە کە سوێندی لەسەر خوراوەو، پەیمانی لەسەر دراوە، نەك خودی سوێندەکە، بەڵام خوا ﷻ ئەو شتەی کە پەیمانەکەی لەسەر دراوەو سوێندەکەی لەسەر خوراوە: (**مَحلُوفِ عَليهِ**) هەڵوەشاندنەوەکەی بەستۆتەوە بەوەوە، چونکە سوێندەکە لەسەر ئەو خوراوە، واتە: کەسێك کە بەڵێنێك بە کەسێك دەدات و سوێندیش دەخوات، خوا دەفەرموێ: سوێندەکە هەڵمەوەشێننەوە، واتە: ئەو شتەی سوێندەکەتان لەسەر خواردوە ئەوە هەڵمەوەشێننەوە، بەڵام پاڵی داوەتە لای سوێندەکە.

٣- ﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا﴾، لە حاڵێکدا کە خواتان بەسەر خۆتانەوە کردۆتە چاودێر و شایەد، ئەو سوێندانەی، یان ئەو پەیمانانەی، خواتان بەسەرەوە کردوونە کەفیل و شایەدو چاودێر، هەڵیانمەوەشێننەوە.

٤- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾، بێگومان خوا دەزانێ چی دەکەن، واتە: چاودێریی خوا بەسەر خۆتانەوە ببینن و، بزانن کە ئەگەر حیلە شەرعێکتان دۆزییەوە، فێڵ و فەرەجێکتان دۆزییەوە بۆ خۆ لێ دەربازکردنی پەیمانەکەتان و، قۆرت و پێچێکتان کرد، خوا هەموو شتێك دەزانێ، پەنهان و ئاشکرا.

٥- ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا﴾، خوا ﷻ بۆ قێزەونیی و ناشیرینیی خستنە ڕووی پەیمان شکێنیی، وێنەیەکی بۆ دێنێتەوە، چونکە خوا ﷻ عادەتی وایە لە قورئاندا بۆ دەرخستنی مانایەکان، وێنە دێنێتەوە، بۆ ئەوەی کە لە شێوەی وێنەیەکدا بەرجەستەی بکات، ئەوکاتە بە عەقڵ و چاو و گوێ و خەیاڵ و... هتد تێوەی ڕادەمێنین و باشتر تێیدەگەین، دەفەرموێ: وەك ئەو ژنە مەبن کە ڕیسەکەی خۆی دەکردەوە خوریی، دوای ئەوەی کە چنیبووی و ڕستبووی.

(غَـزْل) واتـە: ڕیـس، شـتێك کـە چنراوەو هۆنراوەتـەوە، ﴿ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ ﴾، واتـە: دوای ئـەوەی کـە چـاك هۆنـراوەو مەحکـەم کـراوە، چونکـە پێشـێ: ئنجـا خورییـە، موویـە، تووکـە، پێشـێ پـس پسـە، پچـڕ پچـڕە، بـەڵام دوایـی بەهـۆی هۆنـران و چنرانـەوە، مەحکـەم دەبـێ.

(أَنْـكاث: جَمْـعُ نِكْـثٍ بِمَعْنَـى: مَنْكُـوث، أَي: مَنْقُـوض وَنَظِـيرُهُ: نِقْـض وَأَنقَـاض)، (أَنـكاث): کـۆی (نِكـث)ە، (نِكـث) بـە مانـای (مَنكُـوث)، واتـە: هەڵوەشـێندراوە، وەك (نِقـض) بە مانـای (مَنقُوض)، کـە (نِقـض) بـە (أَنقَـاض) کـۆ دەکرێتـەوە، بـەڵام بـە مانـای (مَنقُـوض)ە، واتـە: هەڵوەشـێنراوە، بـەڵام دیـارە (نِكْـث) بـۆ شـتی چـنراوو هۆنـراو بـەکاردێ، بـەڵام (نِقْـض) زیاتـر بـۆ دەرو دیـوار (نَقْـضَ الجِـدَارَ) یـان بـۆ پەیـمان و بەڵێـن، بـەکاردێ.

زانایـان باسـیان کـردوە، کـە ئافرەتێـکی دیارییکـراو بـووە لـە مەککـە نـاوی: (رِيطَـة بِنـتِ التَمِيمِيـة كانَـت خَرقَـاءَ مُخْتَلّـةَ العَقـلِ) نـاوی (رِيطَـة) بـووە کچـی تەمیمییـە، ئافرەتێـکی لـە ڕووی هـۆش و گۆشـەوە، تـەواو نەبـووە، (گێـل بـووە)، گوتراوە: خـۆی و چەنـد کەنیزەکێـکی هەبوون، بـە تـەشی گـەورە ئەگـەر خوریـی بـووە، ئەگـەر مـوو بـووە، ئەگـەر تـووك بـووە، دەیانڕسـت، لـە بەیانـی ڕا تاکـو ئێـوارێ، لـە ئێـوارێ دا دەیگـوت: وەرن هەڵیوەشـێننەوە!! لەبەرئـەوەی عەقڵەکـەی تـەواو نەبـووە، ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ئەوانـەی کـە پەیـمان هەڵدەوەشـێننەوە، وەك ئـەو ژنـە گێـل و، کەوەدەنـە، یـان ژنـە شـێتە، وان، کـە ڕیسـەکەی خـۆی دەکـردەوە بـە خوریـی، واتـە: ئێـوەش ڕیـسی پەیمانەکانتـان کـە چنیوتانـەو هۆنیوتانەتـەوە، مەیکەنـەوە بـە خوریـی و، پـس پـسی مەکـەن.

٦- ﴿ تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ ﴾، کە سوێندەکانتان بکەنە مایەی فێڵ و فەرەج و موخەننەتیی لە بەینی خۆتاندا، واتە: کارێکی وا مەکەن.

(دَخَـل: اَلدَّخَـلُ: الفَسـادُ، وَالعَيـبُ، والـدَّاءُ، وَالرِّيبـة، وَالخَدِيعَـةُ، وَالخِيانـة) وشـەی (دَخَلْ)یـان بـە چەنـد واتایـەك هێنـاوە، خـۆی (دَخَـلْ) بریتیـە لـەوەی شـتێکی نامـۆ ڕەگـەڵ شـتێکی دیکـە بکـەوێ، لـە خـۆی نەبـێ ڕەگەڵـی بکـەوێ، بچێتـە نێـوی و، تێکیبـدات، بـۆ وێنـە: ئەگـەر خواردنێـکی پـاك و چاکـت هەیـە، شـتێکی پیـسی ڕەگـەڵ بکـەوێ، یاخـود خواردنێکـت هەیـە: جـۆرە خواردنێـکی دیکـەی ڕەگـەڵ بکـەوێ، تامەکـەی بگـۆڕێ و تێکیبـدات.

ئنجـا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: پەیمانەکانتـان مەکەنـە هـۆکاری شـتێکی خـراپ، کـە بیخەنـە نێـو پەیوەندییـەکانی نێوانتانـەوە، بـا پەیوەندییەکانتـان تێکنەچـن، بەهـۆی ئـەو پەیـمان و سـوێندانەوە، کـە پێیانـەوە وەفادارنیـن، بەڵکـو لـە ژێـر پـەردەی ئـەو پەیـمان و بەڵێنانـەدا،

ناپاکیی و موخەننەتیی لەگەڵ یەکدیدا دەکەن، کەواتە: ﴿دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ﴾، (أي: سَبَبَ فَسَاد بَيْنكُمْ)، هۆی تێکچوونی بەینتان.

٧- ﴿أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍ﴾، بەهۆی ئەوەوەو بە بیانووی ئەوە، یان بە پاڵنەری ئەوە، سوێندو پەیمانەکانتان بکەنە هۆکاری فێڵ و فەرەج لەگەڵ یەکدیداو، موخەننەتیی لەگەڵ یەکدی دا، کە کۆمەڵێك لە کۆمەڵێك زیاترن، واتە: ئەو کۆمەڵەی کە دەتانەوێ پەیمانیان لەگەڵ ببەستن، لەو کۆمەڵە کە پەیمانتان لەگەڵیاندا هەبووە، زیاتربن و پێتان وابێ: ئەوان زیاتر بەکەڵکتان دێن، مەچن یەکسەر پەیمان لەگەڵ ئەوان هەڵوەشێننەوەو، بەبێ ئاگادارکردنەوەیان، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پەیمان ببەستن، بەڵکو وەفادارو پابەند بە بەڵێن و پەیمانی خۆتانەوە و، چاوپۆشیی لەو بەرژەوەندییە بکەن، ئەگەر گریمان بەرژەوەندییش بێ، بەڵام زیانێکی گەورەی مەعنەویی لە خۆتان دەدەن، بەهۆی ئەوەوە کە بەڵێن و پەیمان لەگەڵ خەڵکێکی دیکەدا هەڵدەوەشێننەوە.

وشەی (أَرۡبَىٰ)، (أي أَزيَد، إسمُ تَفضِيلٍ مِنَ الرُبُوّ بوزْنِ العُلُوّ، أي: زِيادَة)، وشەی (أربى) یانی: زیاتر، ناوی (تَفضِيل)ە لە (رُبُو) لەسەر کێشی (علُو) یانی: زێدەیی، ئێمە دواتر لە پێشەوا (الطبري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەقێك دێنین، زیاتر ئەو چەمکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵام بە کورتیی مەبەست ئەوەیە کە کاتێ خۆی هەندێ لە هۆزە عەرەبەکان پەیمانیان بەستوە لەگەڵ کۆمەڵێك دا، دوایی تەماشایان کردوە، هۆزێکی دیکە زیاتر بوون، یەکسەر بەبێ ئەوەی ئەو هۆزە کە پەیمان و بەڵێنیان لەگەڵیان دا بووە، ئاگاداریان بکەنەوە، چوون پەیمانێکی دیکەیان لەگەڵ ئەوان بەستوە لە دژی ئەوانی دیکەو، پێیان وابووە مادام بەرژەوەندییان وا دابین بێ، ئاساییە کە پابەند نەبن بە بەڵێنەکانیانەوە !! ئەوە عادەتێکی نەفامیی بووە، لە سەردەمی پێش ئیسلام داو، خوای دادگەر ئەو کۆمەڵگایەی وردە وردە بەرەو ئیسلام هێناوە، هەر ئەوە نەبووە بڵێ: بڕوا بە خوا بێنن و، بڕوا بە ڕۆژی دوایی بێنن و، بڕوا بە پێغەمبەر بێنن ﷺ و تەواو! بەڵکو هاوکات لەگەڵ ئەوەدا: کارێکی کردوە کە: ئەو بەها مرۆییە مەزن و گەورانەش لە نێویاندا بچەسپێنێ و، ئەو عادەت و نەریت و بەها ڕزیو و بەکەڵك نەهاتووانەی کە لەنێویشیاندا بوون، {کە یەکێك لەوانە پەیمان شکێنیی بووە}، لە نێویاندا بژار بکات و لایبانبەرێ.

٨- ﴿إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ﴾، بێگومان خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوە، واتە: کە کۆمەڵێکی دیکە هەن، زیاترن لەوانی دیکەی کە پەیمانتان لەگەڵیان دا هەیە، خوا بەوە تاقیتان دەکاتەوە: ئایا ئێوە پابەندیی بە پەیمانەوە زاڵ دەکەن، بەسەر بەرژەوەندییەك دا کە دێتە بەرچاوتان؟ یاخود لەپێناو دابینکردنی بەرژەوەندیی خۆتاندا، گوێ نادەنە بەها بەرزەکان و، گوێ نادەنە بەڵێن و پەیمان ؟!

٩و١٠- ﴿ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، بە دڵنیاییەوەش و سوێند بە خوا، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، ئەوەی کە ئێستا تێیدا دەکەونە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە، خوا بۆتان ڕوون دەکاتەوە، واتە: ئەوەی کە ئێستا دەیکەن بە پاساوی موخەننەتیی و، پەیمان شکێنیی لە نێوان خۆتاندا، یاخود کۆی ئەو شتانەی کە تێیان دا دەکەونە ڕاجیایی، خوای دادوەر، بۆتان ڕوون دەکاتەوە.

١١- ﴿ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً ﴾، ئەگەر خوا ویستباشی دەیکردن بە یەك کۆمەڵ، واتە: یەك جۆر، کە هەمووتان لەسەر ڕێی ڕاست بن.

١٢و١٣- ﴿ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾، بەڵام (خوا) هەر کەسێکی بوێ، گومڕای دەکات و، هەر کەسێکیشی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

هەڵبەتە خوا کە خەڵك گومڕا دەکات، لە گۆترە نیە و، کە ڕاستە ڕێشییان دەکات، هەر لە گۆترە نیە، بەڵکو بەپێی ویستی کار بەجێیانەو دادگەرنەی خۆیەتی، کە ئەویش لەمیانی یاساکانی دا، جێبەجێ دەبێ، خوا چەند یاسایەکی داناون، لە ژیانی بەشەردا، کە هەر کەسێك بەو شێوەیە بکات و، بەو شێوەیە بەرەو خوا بچێ، خوا ڕاستە ڕێی دەکات و، هەر کەسێك ئەو کردەوانە ئەنجام بدات و، بەو شێوەیە ڕەفتار بکات و، بەو شێوەیە بیر بکاتەوە، گومڕای دەکات، بەپێی ئەو یاسایانەی کە لە ژیانی بەشەردا دایناون، گرنگ ئەوەیە بزاندرێ کە (يَهدِي) لێرەدا بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، چونکە خوا ویستوویەتی و، خەڵکی هەمووی ڕێنمایی کردوە، بەڵکو: ﴿ يَهْدِي ﴾، واتە: دەیخاتە سەر ڕاستەڕێ، دوای ئەوەی کە ڕێی پیشان داوە، هەر کەسێك بیەوێ، کە کەسانی شایستەن، خوا دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

١٤- ﴿ وَلَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، بەدڵنیاییەوەش لەوەی کە دەتانکرد لێتان دەپرسرێتەوە، ئنجا: کە لێتان بپرسرێ، مانای وایە، سزاو پاداشتیشتان دەبێ.

پێشەوا (الطبري) لەبارەی ئەم ئایەتانەوە دەڵێ: (وَالصَّوَابُ مِنَ القَوْلِ فِي ذَلِكَ أَنْ يُقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَمَرَ فِي هَذِهِ الآيَةِ عِبادَهُ بالوَفاءِ بعُهودِهِ الَّتِي يَجْعَلُونَهَا عَلَى أَنْفُسِهِم، وَنَهَاهُمْ عَنْ نَقْضِ الأَيْمَانِ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا عَلَى أَنْفُسِهِم لآخَرِينَ، بعُقُودِ تَكُون بَيْنَهُمْ بحَقٍ، مِمَّا لاَ يَكْرهُه اللَّه، وَجَائِزٌ أَنْ تَكُونَ نَزَلَتْ فِي الَّذِينَ بايَعُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بنَهْيِهِم عَنْ نَقْضِ بَيْعَتِهِم حَذَراً مِنْ قِلَّةِ عَدَدِ المُسْلِمِينَ وَكَثْرَةِ عَدَدِ المُشْرِكِين، وَأَنْ تَكُونَ نَزَلَت فِي الَّذِينَ أَرَادُوا الإنْتِقَالَ بحِلْفِهِم عَنْ حُلَفَائِهِم، لِقِلَّةِ عَدَدِهِم فِي آخَرِينَ

لِكَثْرَةِ عَدَدِهِم، وَجَائِزٌ أَنْ تَكُونَ فِي غَيْرِ ذَلِكَ، وَلاَ خَبَر تَثْبُتُ بِهِ الحُجَّة أَنَّهَا نَزَلَتْ فِي شَيء مِنْ ذَلِكَ دُونَ شيء، وَلاَ دِلاَلَةَ فِي كِتَابٍ، وَلاَ حُجَّةِ عَقْلٍ، أَيّ ذَلِكَ عُنِيَ بِهَا...)[1].

واتە: قسەی ڕاست ئەوەیە کە بگوترێ: خوای بەرز لەم ئایەتەدا {ئایەتی (٩١)} فەرمانی بە بەندەکانی کردوە، کە بەڵێنەکانیان جێبەجێ بکەن، ئەو بەڵێنانەی کە لەسەر خۆیانیان پێویست دەکەن و، لێی قەدەغە کردوون کە ئەو سوێند و پەیمانانە، دوای ئەوەی مەحکەمیان کردوون، بەڵێن و پەیمانیان بە ئەوانی دیکە داوە، بەهۆی ئەو گرێبەستانەوە کە لەبەینیان دا هەن، بە شێوەیەکی هەق کە خوا پێی ناخۆش نیە {بۆ شتێك پەیمانیان پێکەوە داوە}، نەهی لێکردوە کە ئەو پەیمانانە بشکێنن.

ئنجا دەگونجێ ئەمە لەبارەی کەسانێکەوە هاتبێتە خوار کە پەیمانیان بە پێغەمبەری خوا داوە ﷺ، (واتە: کە مسوڵمان بوون، بەڵێن و پەیمانیشیان پێداوە)، خوا نەهی لێکردوون کە ئەو بەیعەت و پەیمانە هەڵبوەشێننەوە، لە ترسی ئەوەی کە ژمارەی مسوڵمانان کەمەو ژمارەی هاوبەش بۆ خوا دانەران، زۆرە.

دەشگونجێ لەبارەی ئەوانەوە هاتبێتە خوار، کە ویستوویانە پەیمانەکەیان لە هاوپەیمانەکانیانەوە {لەبەرئەوەی ژمارەیان کەمە}، بگوازنەوە بۆ کەسانی دیکە، لەبەرئەوەی ژمارەیان زۆرە، کە دژی ئەو هاوپەیمانانەیان بوون.

هەروەها دەشگونجێ مەبەست پێ غەیری ئەوەش بێ، بەڵام هیچ هەواڵێك نیە، (واتە: فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ) بەڵگەی پێ بچەسپێ کە لەبارەی یەکێك لەوانەوە هاتۆتە خوارێ، هەروەها قوڕئانیش ئەوە ناگەیەنێ و، بەڵگەیەکی عەقڵییش لەوبارەوە نیە، کە کام لەوانە مەبەستە.

کەواتە: چەمك و واتای ئایەتەکە دەبێ بە گشتی و فراوانیی بهێڵرێتەوە، کە ئەمە عادەتی (**الطبري**)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە عادەتێکی زۆر چاکەو زۆر ڕاستە، هەمیشە چەمك و واتای ئایەتەکان بە فراوانیی دەهێڵێتەوە و، نایانبەستێتەوە بە شتی سنووردارەوە.

---

(١) جامعُ البَيان: ج١٤، ص١٧١.

**مەسەلەی سێیەم:**

**جارێکی دیکەش خوای کارزان، باسی ناڕەوایی پەیمان شکێنیی و موخەننەتیی دەکات و ڕایدەگەیەنێ: کە ئەو ڕەفتارە مایەی خلیسکانی مرۆڤە بەرەو زەلکاوی خیانەت و تاوان و، هۆکاری لادانی خەڵکە لە ڕێی خوا، (ئیسلامیان لە پێش چاو ناشیرین دەکات)، پاشان ئەو جۆرە ڕەفتارە بە گۆڕینەوەی پەیمانی خوا بە نرخێکی کەم دادەنێ و، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە: کە سامانی دنیا هەر بەشی بڕانە، بەڵام پاداشتی لای خوا دەمێنێتەوەو، خۆ ڕاگرانیش لەسەر وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمان، باشترین پاداشتیان هەیە.**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١- ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ﴾، واتە: سوێندەکانتان لە نێوان خۆتاندا، مەکەنە هۆکاری موخەننەتیی و ناپاکیی و فێڵ و فەرەج لەگەڵ یەکدی.

(دَخَلًا): (أَي: فَساداً وَخَدِيْعَةً)، وەك پێشتریش باسمان کرد، واتە: لە پەنای ئەو سوێندانەدا، کە لەسەر پەیمانە بەستراوەکان خواردووتانن و، ئەو پەیمانانەی کە بەهۆی سوێندەوە، مەحکەمتان کردوون، لە ژێر پەردەی ئەو پەیمانانەدا، مەچن، فێڵ و ناپاکیی و موخەننەتیی لەگەڵ یەکدی بکەن، بەهۆی سوێندەکانتان و بەهۆی پەیمانەکانتانەوە، پاشقول لە یەکدی مەگرن و، فێڵ لە یەکدی مەکەن و، موخەننەتیی بەرانبەر بە یەکدی مەکەن.

٢- ﴿فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا﴾، ئەگەر وا بکەن: پێیەك کە چەسپاوە دەخلیسکێ، یان لە ئەنجامی ئەوەدا: پێیەك کە چەسپاوە بخلیسکێ، دەگوترێ: (**زَلَّت قَدَمُهُ، يَزِلُّ زَلاًّ وَ زَلُولاً: أَي زَلِقَت، وَ زَلَّ فِي رَأْيِهِ: أَخْطَأَ**)، کەسێك پێ دادەنێ، دیارە پێی مەحکەم دەکات، دەگوترێ: (**زَلَّت قَدَمُهُ**)، ئەگەر پێی

خلیسکا هەروەها (زَلِقَت)، خلیسکا، هەروەك ئەمە بۆ بیروڕاش بەکاردێ، ئینسان لە ڕایەکدا بەهەڵەدا بچوو بێ، دەگوترێ: (زَلَّ فِي رَأْيِهِ أَي: أَخطَأَ)، واتە: نەیپێکا.

(الثبُوت: مَصْدَرُ ثَبَتَ كالثَّبات)، (ثُبُوت) وەك (ثَبات) هەردووکیان چاوگی (ثَبَتَ)ن، (ثَبَتَ، يَثبُتُ، ثُبُوتاً، وَثَباتاً)، (ثُبُوت) واتە: چەسپاویی، دامەزراویی، لێرەدا خوا ﷻ بەڵێن و پەیمانێك كە لە نێوان خەڵكدا دەدرێ، چواندوویەتی بە كەسێك كە پێ دادەنێ لە شوێنێك و پێی دەچەسپێنێ، هەروەها كەسێك كە پەیمانەكە دەشكێنێ، وەك ئەو پێیە چەسپاوە بخلیسكێ، وای تەشبیهكردوە، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا كە ئێوە بەهۆی سوێندەكانتانەوە، فێڵ لە یەكدی دەكەن و، پاشقول لە یەكدی دەگرن، ئەوە وەك ئەو حاڵەتە وایە، كە لە شوێنێك پێتان دانا بێ، بەڵام دوایی پێتان بخلیسكێ !

٣- ﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ ﴾، كە سەرەنجام بەهۆی ئەوەوە، كە خەڵكتان لەڕێی خوا لاداوە، سزای خراپ بچێژن، {هەروەها ئازارێكی مەزنیشتان هەبێ، لە ڕۆژی دوایی دا}، وەك دوایی باس دەكرێ ﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ ﴾، (الذَّوْقُ: مُستعَارٌ لِلإِحْساسِ القَوِيّ، وَالسُّوء: مَا يُؤْلِمُ)، (ذَوق): چێژتن، خوازراوەتەوە بۆ هەست كردنێكی بەهێزو، وشەی (سوء) هەر شتێكە، ئێش بگەیەنێ بە مرۆڤ.

٤- ﴿ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە:

أ - دەگونجێ لە (صَدَدتُم)ی (قَاصِر) یان (لازم) بێ، یانی: (بِمَا أَعرَضْتُم عَن سَبِيل اللّه)، یان (بِمَا انحرَفتُم عَن سَبِيل اللّه) بەهۆی ئەوەوە كە لە ڕێی خوا لاتانداوە، چونكە پەیمان شكێنیی بریتیە لە لادان لە ڕێی خوا، هەروەك وەفاداریی بریتیە لە پابەندیی بە ڕێی خواوە، بەڵێ ڕێی خوا هەمووی وەفایە و، پێچەوانەی ڕێی خوایە، مرۆڤ بێ وەفا بێ و، پەیمان شكێن و، بێ بەڵێن بێ.

ب - دەشگونجێ: ﴿ صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، لە (صَدَّ)ی تێپەڕ (مُتَعَدِّي) بێ، (أَي: مَنَعْتُمُ النَاسَ عَنْ دِيْنِ اللّه)، واتە: خەڵكتان لە دینی خوا گێڕاوەتەوە، چونكە لە ئەنجامی ئەوەدا كە كۆمەڵێك مسوڵمان بێ بەڵێن و بێ پەیمان دەبن، خەڵك ئەو ئایین و بەرنامەی خوایە، كە ئەوان بانگەشە دەكەن: شوێنكەوتوونی، لەبەر چاویان دەكەوێ، دەڵێن: دیارە ئیسلام پەیڕەوان و شوێنكەوتووانی خۆی، ڕێ لێناگرێ كە موخەننەتیی و ناپاكیی بكەن و، بێ بەڵێنیی و بێ پەیمانیی بكەن! سەرەنجام خەڵك ئەو ئایینەی لەبەرچاو دەكەوێ، كە بەو شێوەیە مومارەسە دەكرێ.

٥- ﴿ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، هەروەها ئازارێكی مەزنیشتان دەبێ، واتە: لە ڕۆژی دوایی دا.

کەواتە: ﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ ﴾، واتە: هەر لە دنیادا سزای خراپ دەچێژن، کە بریتیە لەوەی: کەسانی بێ بەڵێن و بێ پەیمان، خەڵك متمانەیان پێ ناکات و، لەکەدار و ناشیرین دەبن، هەروەها زۆرجار تووشی ئەوەش دەبن، ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ شکاندوون، تۆڵەیان لێ بکەنەوەو، سزایان بدەن و، خراپەیان بەسەر بێنن.

٦- ﴿ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴾، هەروەها بە نرخێکی کەم بە پەیمانی خوا مەکڕن، دەڵێ: (**الثَّمَنُ: العِوَضُ الَّذِي يأخُذُهُ المُعَاوِضُ**)، (**ثَمَن**) ئەو قەرەبووەیە بابایەك، کە شتێك دەدا لە بەرانبەریدا وەریدەگرێ، واتە: بەڵێن و پەیمانی خوا مەشکێنن، کە لە بەرانبەریدا نرخێکی کەم وەربگرن، نرخە کەمەکەش بریتیە لەو بەرژەوەندییە دنیاییەی کە دابینی دەکەن.

٧- ﴿ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾، بێگومان ئەوەی لەلای خوایە، بۆ ئێوە چاکترە.

ئەو ( إِنَّمَا )یە هەرچەندە بە سەریەکەوەو نووسراوە، لە ئیملای موصحەف دا، بەڵام دوو وشەیە: (إِنَّ + مَا) عِندَ ٱللَّهِ)، بێگومان ئەوەی کە لەلای خوایە، دەڵێ: (**كُتِبَتْ مُتَّصِلَةً مُرَاعَاةً لِلنُطقِ، وَإلاّ فَحَقُّهَا الفَصْلُ**)، بۆیە بەسەر یەکەوە نووسراوە، چونکە وا دەبێژرێ، وا گۆ دەکرێ، دەگوترێ: (إِنَّمَا)، کە لێرەدا (مَا) دەبێتە (**مَوصُولة**)ە، یانی: (**إِنَّ الَّذِي عِندَاللّه**)، ئەوەی کە لەلای خوایە، کە پاداشتی خوایەو، ڕەزامەندیی خوایە، باشترە بۆ ئێوە لەو تۆزە بەرژەوەندییە وەهمییە، یاخود لەو بەرژەوەندییە ڕاستەقینە ناشەرعییەی کە بەهۆی پەیمان شکێنییەوە، دابینی دەکەن.

٨- ﴿ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئەگەر ئێوە زانیباتان یانی: ئەگەر بزانن هەرگیز پاداشتی خوا و ڕەزامەندیی خوا، ئەوەی لەلای خوایە، نایگۆڕنەوە بە نرخ و بەهایەکی کەم، کە لە بەرانبەر پەیمان شکێنیی دا، یانی: دەستکەوتێکی کەم، کە بەهۆی پەیمانشکێنییەوە دەستگیرتان دەبێ.

دواییش خوا زیاتر ئەوە ڕوون دەکاتەوە.

٩- ﴿ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ ﴾، ئەوەی لەلای ئێوەیە دەبڕێ، کۆتایی دێ، دەڵێ: (**نَفِدَ: فَنِيَ، وَانقَضَى، نَفِدَ الشَيء يَنفَدُ، نَفَاداً، وَنَفَداً، وَنُفُوداً، ذَهَبَ وفَنِيَ**)، ﴿ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ ﴾ (**نَفِدَ الشَيءُ**) شتەکە بڕاو نەماو کۆتایی هات، {**يَنفَدُ**} کۆتایی دێ. (**نَفَاد ونَفَد و نفود**) چاوگ (**مصدر**)ن.

١٠- ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖ ﴾، بەڵام ئەوەی لەلای خوایە، ماوەیە، هەر دەمێنێ، بەردەوامە، نابڕێ.

١١- ﴿ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم ﴾، بە دڵنیاییەوەش ئەوانەی کە خۆیان ڕاگرتوە، پاداشتی خۆیانیان دەدەینەوە، لەسەر ئەوە کە خۆیان ڕاگرتوە لەسەر وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمان.

ئنجا ئایا بە چی پاداشتیان دەداتەوە ؟

١٢- ﴿ بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، بەپێی باشترینی ئەوە کە دەیانکرد.

وشەی ﴿ وَلَنَجۡزِيَنَّ ﴾ خوێندراویشەتەوە: (**لَيَجزِيَنَّ**)، یانی: خوا پاداشتت دەداتەوە، هی ئەوانەی کە خۆیان ڕاگرتوە لەسەر پابەندیی بە پەیمانەوە، بەپێی باشترین کردەوەیان، وشەی (أَجۡرَهُم ): (**مَنصُوبٌ عَلى المَفعُولِية الثانِية لِ(نَجزِيَنَّ) بِتَضمِينِ مَعنَى الإعطَاءِ المُتَعَدِّي إلى مَفعُولَين**)، (**جَزَاهُ أَجْرَهُ**)، تەنیا یەك بەرکار (**مفعول**)ی دەوێ، بەڵام لێرەدا: ﴿ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم ﴾، (أَجۡرَهُم ) (**مَنصُوب**)ە، کە بۆتە بەرکاری دووەم (**مَفعُول بِهِ الثاني**)، بۆ کردار (**فعل**)ی (**نَجزِيَنَّ**)، لەبەرئەوەی مانای (پێدان)ی خراوەتە نێو: (**أَعطَى مُحَمَّداً أجرَهُ**)، پاداشتەکەی موحەممەدی دایەوە، دوو بەرکار (**مفعول**)ی دەوێت، بەڵام (**جَزَى مُحَمَّداً**)، پاداشتی موحەممەدی دایەوە، هەریەك بەرکار (**مفعول**)ی دەوێ، بەڵام لێرەدا (**نَجزِيَنَّ**)، یاخود (**يَجزِيَنَّ**)، مانای بەخشینی خراوەتە نێو، بۆیە دوو بەرکار (**مَفعُول بِهِ**)ی، ویستوون، یەکەمیان (**الّذين**) و دووەمیان (**أَجرَهُم**).

## کورتە باسێک لەبارەی گرنگیی وەفادارییی بە پەیمان و خراپی پەیمان شکاندنەوە

بەڕێــــزان !

ئەم کورتە باسە لە دوو بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### بڕگەی یەکەم: پێنج تیشکی قورئـانی لەســەر: وەفــادارییی و خراپیی بێ پەیمانیی

**١ / ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾:**

پێشەوا (الطَّبَري) دەڵێ: (**يَقُولُ تَعَالَى ذِكرهُ: وَلَيُثِيبَنَّ اللَّـهُ الَّذِينَ صَبَرُوا عَلَى طَاعَتِهُم إِياهُ، فِي السَّراءِ وَالضرَّاءِ، ثَوَابَهُمْ يَوْمَ القِيامَةِ عَلَى صَبْرِهِم عَلَيْهَا، وَمُسارَعَتِهِم فِي رِضَاهُ، بِأَحْسَنِ مَا كانُوا يَعْمَلُونَ مِنَ الأَعْمَالِ دُونَ أَسوَئِهَا، وَلَيَغْفِرَنَّ اللَّهَ لَهُمْ سَيِّئَهَا بِفَضْلِهِ**)[١].

واتە: خوا ناوی بەرز بێ، دەفەرموێ: ئەوانەی کە خۆیان ڕاگرتوە لەسەر فەرمانبەریی بۆ خوا، لە خۆشیی و لە ناخۆشیی دا، پاداشتیان دەداتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، بەهۆی خۆڕاگرییان لەسەر طاعەتی خواو، بەهۆی خێرایی کردنیان بۆ ڕازییکردنی خوا، بە باشترینی ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد، نەك بەپێی خراپترینیان، {بەڵکو باشترینی کردەوەکانیان دەکرێنە پێوەر (تەرازوو)}، هەروەها خراپەکەشیان بە بەخششی خۆی، لێ دەسڕێتەوە.

**٢ / ﴿ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا ﴾:**

وشەی (قَدَمٌ) یانی: پێ، (تَزِلَّ) یانی: دەخلیسکێ، ﴿ بَعْدَ ثُبُوتِهَا ﴾، دوای چەسپانی، لێرەدا حاڵەتی پەیمان شکێنیی، چوێنراوە بە حاڵەتی کەسێك کە بە پێ چەسپاویی بە ڕێیەکدا دەڕوات، مەحکەم پێی خۆی دادەنێ، بەڵام لەناکاو دەخلیسکێ و دەکەوێ، هەر بۆیەش وشەی (قَدَمٌ) پێ، بە تاکیی هاتوە، چونکە مەبەست پێیەکی دیارییکراو، یان چەند

---

(١) جَامِعُ البَيَان: ج١٤، ص١٧٥.

پێیەك نیە، بەڵكو مەبەست تەشبیهكردنی بابای پەیمان شكێنە، بە كەسێك كە پێشێ پێ مەحكەم دادەنێ، بەڵام لەناكاو دەخلیسكێ، ئەویش بەهۆی پەیمان شكاندنەكەیەوە، كە وەك ئەوە وایە، خلیسكابێتە نێو باتلاغی موخەننەتیی و ناپاكیی، ئەمە وەك ئەو تەعبیرەیە كە لە زمانی عەرەبیی دا دەڵێ: یەكێك بە كۆمەڵێك دەڵێ:

(مَالِي أَرَاكُم تُقَدِّمُونَ رِجلاً، وَتُؤَخِّرُونَ أُخرَى؟ تَمْثِيلاً حَالَهم بِحَالِ المُتَرَدِّدِ فِي المَشيِ إِلَى شَيءٍ).

واتە: ئەوە چییە هەر پێیەك دێننە پێشێ و پێیەك دەبەنەوە دوایە؟ كە بێگومان مەبەست ئەوە نیە، لەو كاتەدا ئەوان پێیەك بێننە پێشێ و پێیەك ببەنە دواوە، بەڵكو حاڵیان دەشوبهێنێ بە حاڵی كەسێكەوە كە دوو دڵە لە ڕۆیشتنندا بەرەو شتێك، حاڵەكەیان بەوە دەشوبهێنێ، ئەگەرنا كۆمەڵێك خەڵك پێكەوە دانیشتبن، ئەو تەعبیرە بۆیان نەگونجاوە، بەڵام مەبەست ئەوەیە: حاڵتان وەك حاڵی ئەو كەسە وایە كە لە كاتی ڕۆیشتنێ دا، دڵ لە دڵ دەدات، دوو دڵە، ئایا بڕوات یان نەڕوات؟ بۆیە جارێك دەچێتە پێش و، جارێك دێتەوە دواوە.

٣ / دیارە ئەم ئایەتانە هەموویان بۆ جەختكردنەوە لەسەر: (پاراستنی بەڵێن و پەیمان) هاتوون، هەروەها پارێزگاریی كردن لەو سوێندانەی كە بەڵێن و پەیمانەكانیان پێ مەحكەم كراون، كە یەكێك لەو بەڵێن و پەیمانانە، ئەوە بووە، كە مسوڵمانان بە پێغەمبەری خوایان ﷺ دەدا كە كاتێك یەكێك مسوڵمان دەبوو، بەڵێنی بە پێغەمبەر ﷺ دەدا بەیعەتی پێ دەدا، هەر لە قۆناغی مەككەش دا هەر وابووە، پێش قۆناغی مەدینەش، چونكە: هەردووك پەیمانی یەكەم و دووەمیش كە لە عەقەبە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەستران، لەلایەن نوێنەرانی (**یثرب**)ەوە كە جارێكیان دوازدە (١٢) كەس و، جارێكیان حەفتاو پێنج (٧٥) كەس بوون، حەفتاو سێ (٧٣) پیاوو، دوو (٢) ئافرەت بوون، ئەو دوو پەیمانەش هەر لە مەككە بەستراون.

٤/ وشەی (ٱلسُّوٓءَ)، كە دەفەرموێ: ﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ ﴾، دەڵێ: (**كُلُّ مَا يَغُمُّ الإنسانَ، وَكُلُّ مَا يَقبُحُ، وَاسمٌ جَامِعٌ لِلآفَات**)، وشەی (**سوء**)، هەر شتێكە كە ئینسان نارەحەت بكات و، هەر شتێكە كە ناشیرین بێ، هەروەها ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ هەموو نەهامەتییەكان و تێكڕای خراپەكان.

٥/ ئنجا لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيْمَـٰنَكُمْ دَخَلَۢا بَيْنَكُمْ ﴾، دوایی سێ شت دادەنێ، واتە: سێ دەرهاویشتەی خراپ، سێ شوێنەواری خراپ:

یەكەم: ﴿ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا ﴾.

**دووەم:** ﴿ وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾.

**سێیەم:** ﴿ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کەسێك، بەڵێن و پەیمانەکەی خۆی ناپاکیی بخاتە نێو و، موخەننەتیی ڕەگەڵ بخات و، لە پەنای بەڵێن و پەیماندا، فێڵ و فەڕەج و پاشقول گرتن، بکاتە پیشە، بەرانبەر بەو کەسانەی کە پەیمانی لەگەڵ بەستوون، سێ شوێنەواری خراپ دێنە دی، لە ئەنجامی ئەو ڕەفتارەی دا:

**یەك:** پێی دەخلیسکێتە نێو باتڵاغی گوناهو تاوان و موخەننەتیی و ناپاکییەوە.

**دوو:** خراپە دەچێژێ، یاخود سزای خراپە دەچێژێ، بەوەی کە خەڵکی لە ڕێی خوادا لاداوە، کە ڕێی خوا بریتیە لە وەفاو، لادانە لە ڕێی خوا، کە پێچەوانەی وەفا بێ.

ئنجا ڕێی خواو شەریعەتەکەی کە فەرمان دەکات بە وەفاداریی و، بە بەڵێن و پەیمان بردنە سەر، بەڵام کەسێك مسوڵمان بێ، کەچی لە بن پەردەی ئیسلامدا، بێ بەڵێنیی و بێ پەیمانیی بکات، ئەوە خەڵك لەو ئیسلامە لادەدات و، ئیسلام لەبەرچاوی خەڵك دەخات.

**سێ:** ﴿ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾، سزایەکی مەزنیشتان دەبێ، کە بە تەئکید مەبەست پێی سزای دواڕۆژە.

چونکە وەك گوتمان: ئەو بەڵێن و پەیمان شکاندنە، درۆکردن و بێ پەیمانییە لە خزمەت خوادا، چونکە خوا هەر لە سەرەتاوە فەرموویەتی: ﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ ﴾، وەفاداربن، بە پەیمانی خوا، هەرکات پەیمانتان دا.

لێرەدا خوا پەیمانەکەی بە هی خۆی زانیوە، چونکە خوا لەگەڵ هەموو شتێکی چاك دایەو، شەریعەتی خوا لەگەڵ هەموو شتێکی باش و، لەگەڵ هەموو سیفەتێکی بەرزو جوان دایە، لەگەڵ هەموو بەهایەکی بەرز دایە، کە بە تەئکید بەڵێن و پەیمان بردنە سەرو، وەفادار بوون بە پەیمان، یەکێکە لەو بەها بەرزانەی شەریعەتی خوا، ئەو هەموو داکۆکییەی لەسەر دەکات و، لە زۆر جێی دیکەدا خوای پەروەردگار باسی ئەو مەسەلەیەی کردوە لە قورئاندا، بەڵام لە هیچ شوێنێك بە قەدەر ئەم چەند ئایەتەی سووڕەتی (النحل) داکۆکی لەسەر نەکراوەتەوەو، پێگەو بەهای وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمانەوە ئاوا ورد نەخراوەتە ڕوو.

## بڕگەی دووەم: چەند دەقێکی پەیوەندیداری سوننەت لەبارەی پابەندیی بە بەڵێن و پەیمانەوە

**١)** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ، وَأَيُّمَا حِلْفٍ كانَ فِي الْجَاهِلِية لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ إِلاَّ شِدَّةً} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٦٨٠٧، وَمُسْلِمٌ: ٢٥٣٠، وَأَبُو دَاوُدَ: ٢٩٢٥، وَالنَّسائِي فِي (الكبرى): ٦٤١٨، وَابْنُ حِبان: ٤٣٧١).

واتە: لە ئیسلامدا هیچ پەیمان بەستنێك نیەو، هەر پەیمانێك لە سەردەمی نەفامیی دا بوو بێ، ئیسلام هەر پتەوتری کردوە.

زانایان لێرەدا مشتومڕێکیان بووە، چونکە:

أ - پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانان بەیعەتیان پێداوە.

ب - پاشان پەیمانی بەستوە لەگەڵ قوڕەیشدا لە حودەیبییە.

ج - پەیمانی بەستوە لەگەڵ هۆزی خوزاعە.

د - پاشان پەیمانی بەستوە لەگەڵ (بَنو ضَمرَة)داو، ئەوە هەمووی چەسپاوە !!

لێکۆڵەرەوەو ساغکەرەوان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لەوە کە: هیچ پەیمان بەستنێك لە ئیسلامدا نیە، واتە: پەیمان بەستنێك کە پێچەوانەی ئیسلام بێ، یاخود بە زیانی ئیسلام بێ و بەڵێن و پەیمانێکی ناشەرعیی بێ، ئەگەرنا هەر پەیمانێك لە سەردەمی نەفامیی دا بوو بێ، مادام پەیمانێکی شەرعیی بوو بێ و، بۆ ئامانجێکی باش بوو بێ، ئیسلام هەر مەحکەمی دەکات و، ئەو پەیمانانەی بۆ شتی باش بەستراون، لە سەردەمی نەفامییشدا، ئیسلام هەڵیانناوەشێنێتەوە، مادام نێوەڕۆکەکەیان ناشەرعیی نەبێ.

**٢)** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَقَدْ شهدْتُ فِي دَارِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جُدْعَانَ حِلْفَاً مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهِ حُمْرَ النَّعَمِ، وَلَوِ أُدْعَى بِهِ فِي الإِسْلاَمِ لأَجَبْتُ} (أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ فِي (الكُبرى): ١٣٤٦١، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جودعاندا ئامادەی پەیمانێك بووم، حەز ناکەم لە قەرەبووی ئەو پەیمانەدا، حوشتری سوورم هەبێ، (واتە: پەیمانەکە هەڵبوەشێنمەوە حوشتری[1] سوورو سپییم لە بەرانبەردا بدەنێ)، ئەگەر لە ئیسلامیش دا بۆ پەیمانێکی ئاوا بانگ بکرێم، وەڵام دەدەمەوە.

---

(١) حوشتری سوور (حُمْرُ النَّعَمِ) سامانێکی زۆر بەقیمەت بووە.

کەواتە ئەوە کە دەفەرموێ: {لاحِلفَ فِي الإِسلامِ}، واتە: پەیمانێك کە بۆ ناهەقیی و ناشەرعیی و ستەم، لە خەڵکی دیکە بێ و، بۆ ئامانجێکی خراپ بێ.

**٣)** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِماً، أَوْ مَظْلُوماً قَالُوا: يا رَسُولَ اللَّهِ! هَذَا نَصْرُهُ مَظْلُوماً، فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِماً؟ قَالَ: تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ**} (**أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٣١٠١، وَالبُخَارِيُّ: ٢٤٤٤، وَالتِّرمِذِيُّ: ٢٢٥٥**).

واتە: برایەکەت سەر بخە! ستەمکار بێ، یان ستەم لێکراو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەوە ئەگەر ستەملێکراو بێ سەریدەخەین و پشتی دەگرین، بەڵام ئەگەر ستەمکار بێ، چۆن سەریبخەین؟ فەرمووی: دەستی بگرن لە ستەم کردن.

**٤)** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ الناسَ إِذَا رَأَوُا الظَّالِمَ فَلَمْ يأخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ، أوشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ**} (**أَخْرَجَهُ الحُمَيْدِي: ٣، وَأَبُو دَاوُدَ: ٤٣٣٨، وَالتِّرمِذِيُّ: ٢١٦٨، وَقَالَ: صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ: ٤٠٠٥، وَصَحَّحَهُ الأَلباني فِي صحيح سُنَن أَبِي دَاوُد**).

واتە: خەڵك کاتێ ستەمکاریان بینی و دەستیان نەگرت، نزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە، سزایەکی گشتییان بۆ بنێرێ.

**٥)** دەربارەی پەیمان شکێنیی، ئەم فەرمایشتە هەیە: {**عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى اللَّه عليه وسلم، قَالَ: إِنَّ الْغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيامَةِ فَيُقَالُ: هذِهِ غَدْرَةُ فُلَانٍ**} (**رواه البخاري: ٦١٧٨ و مسلم: ١٧٣٥، و أبوداود: ٢٧٥٦، و الترمذي: ١٥٨١**).

ئیبنو عومەر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر دەفەرموێ ﷺ: لە ڕۆژی هەڵسانەوە (ڕۆژی قیامەت)دا، ئاڵایەك دەچەقێنرێ، لە پاش هەر کەسێکەوە کە پەیمانی شکاند بێ و، بێ بەڵێن بوو بێ، دەگوترێ: ئەوە پەیمان شکاندن و ناپاکیی فڵان کەسە.

یانی: بۆ ئەوەی هەموو خەڵك تێی بگات و، لەوێ ئابڕووی بچێ، کە ئەوە بۆخۆی سزایەکی مەعنەویی و، ئەدەبیی زۆر خراپە، کە بابای ناپاك و موخەننەت و پەیمان شکێن، پێی سزا دەدرێ.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

خـوا ڕایگەیانـدوە کـە: هـەر کەسـێك بـڕوادار بـێ و کـردەوەی بـاش بـکات لـە نێـر و مـێ، بـە ژیانێـکی پـاك و چـاك دەیژیەنـێ لـە دنیـادا و، لـە دواڕۆژیشـدا بـە پێـی باشـترین کردەوەیـان پاداشـتیان دەداتـەوە:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ ﴾، هەر کەسێك کردەوەی باش بکات لە نیر و مێ و بڕواداریش بێ، یانی: بەبێ جیاوازیی ڕەگەز.

٢- ﴿ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ﴾، بە دڵنیاییەوە بە ژیانێکی پاك و چاك (**طَيِّب**) دەیژیەنین، (**الطَّيِّب: مَا يَطِيبُ ويَحْسُن، وَضِدُّهُ الخَبِيثُ وَالسَّيء**)، (**طَيِّب**) شتێکە کە خۆش بێ و، چاك بێ، بە تام و بە چێژ بێ، ڕێك بێ، پێچەوانەکەشی بریتیە لە (**خَبِيث**) واتە: زیانبەخش و پیس و خراپ و نارێك.

٣- ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، پاداشتەکەشیان دەدەینەوە بەپێی باشترینی کردەوەکانیان، کە دەیانکردن، کەواتە: ئیمان و کردەوەی باش، چی بۆ مرۆڤ بەرهەم دەهێنن، بۆ تاك و بۆ کۆمەڵگا ؟

**یەکەم:** ژیانێکی دنیایی باش و، ڕێك و پێك و بەختەوەرانەو چاك و پاك.

**دووەم:** باشترین پاداشتی ڕۆژی دوایی.

(**جـمال الدِّيـن القاسـمي**) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1]، پێناسـەیەکی جـوانی (**الحَيـاةُ الطَّيِّـبة**) دەکات، دەڵـێ: (**وَعِنـدِي أَنَّ الحَيـاةَ الطَّيِّبـة، هِـيَ الحَيـاة الَّتـي فِيهَـا تَلْـجُ الصُّـدُورِ بِلَـذَّة اليَقِـينِ، وَحَـلاوَةِ الإِيمَـانِ، وَالرَّغْبـة فِي المَوعُـودِ، وَالرِّضَـا بالقَضَـاءِ، وَعِتْـقِ الـرُّوحِ مِـمَّا كانُـوا يُسـتعبَدُونَ لَـهُ، وَالإِسـتكانة إِلى مَعبُـودٍ وَاحِـدٍ، وَالتَّنَـوُّرُ بِـسِرِّ الوُجُـودِ الَّـذِي قَـامَ بِـهِ، وَغَـيرُ ذَلِـك**).

---

(١) محاسنُ التَّأويل: ج ١٠، ص ١٥٦.

واتـە: (**الحَیـاةُ طَیِّبـة**) بریتیـە لـەو ژیانـەی کـە ئینسـان دڵ و سینەی فێنـك دەبێتـەوە، بـە چێـژی یەقیـن و، شـیرینایەتیی ئیـمان و، بـە ئارەزوومەنـد بـوون بـەوەی کـە خـوا بەڵێنی پێـداوەو، بـە ڕازی بـوون بـە بڕیـاری خـواو بـە نەخشـەی خـوا، هەروەهـا بـەوە کـە ڕووح ئـازاد دەبـێ، لـەوەی کـە (خەڵکـی بـێ ئیـمان) بـۆی دەبوونـە کۆیلـەو، بـەوە کـە خـۆی دادەبـڕێ بـەلای یـەك پەرسـتراودا، تەنیـا لـەو دەپارێتـەوە، تەنیـا بـۆ ئـەو ملکـەچ دەبـێ، هەروەهـا بـە ڕۆشـنبوونەوەی بـە نهێنیـی بـوون، کـە گـەردوونی پێـوە ڕاوەسـتاوەو، بـە جگـە لـەوەش کـە باسـکرا.

{نهێنیـی بـوون: بریتیـە لـە خاوەنداریێتیـی و، تەنیـا پەروەردگاریێتیـی و تەنیـا بەدیهێنەرایەتیـی و، تەنیـا پەرسـتراویێتیی خـوا لـە بوونـدا}[1].

مەبەسـتی ئەوەیـە کـە ئـەو (**الحَیـاةُ الطَّیِّبـة**)، ﴿ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗ ﴾، بـا کـەس وانەزانـێ کـە: ژیانێـکی دەبـێ: بـێ خـەم و بـێ گرفـت و بـێ ناڕەحەتیـی و بـێ دەردەسـەریی، یاخـود ژیانێـکی دەبـێ پـڕ عەیـش و نـۆش و گـوزەرانی خـۆش، نەخێـر مەبەسـت ئـەوە نیـە، چونکـە ئەصڵـەن خـوا ﷻ مەتاعـی دنیـا و لایەنـە ماددییەکـەی دنیـای پـێ هیـچ نیـە، بەڵکـو مەبەسـت لـەو ژیانـەی کـە خـوا بـە (**طَیِّبـة**)، نـاوی دەبـات، زیاتـر پەیوەندیـی بـە لایـەنی دەروونیـی و ئیمانیـی و، بەهـا بـەرزەکان و، بـۆ خـوا ژیـان و، پەیوەسـت بـوون بـە خـواوەو، بەندایەتیـی بـۆ خـوا کـردن و، پشـت بـە خـوا بەسـتن و، دڵخـۆش بـوون بـە پاداشـتی خـواوە، هەیـەو، ئـەو لایەنـە دەگرێتـەوە، قسـەکەشی جوانـەو هـەر وایـە.

ئەگەرنـا کەسـێك بـۆی هەبـوو بڵـێ: ئـەوە سـەدان و هـەزاران و بگـرە ملیۆنـان مسـوڵمان هـەن، ئیـمان و کـردەوەی باشیشـیان هەیـە، بـەڵام لـە کولەمەرگییـدا دەژیـن، لـە غـەم و ناسـۆرو ناڕەحەتییـدا دەژیـن، لـە زینـدانـداو لـە دەربەدەریـی دا دەژیـن !

کـە ئـەوە ڕاسـتە، بـەڵام دەگونجـێ مـرۆڤ لـە زیندانیـش دابـێ، یـان دەربەدەریـش بـێ، هەروەهـا هـەژارو نەداریـش بـێ، بـەڵام دڵێـکی ئاسـوودەو موڕتاحـی هەبـێ، دڵخـۆش و شـادمان بـێ، بـەوە کـە لـە دنیـادا بـە جۆرێـك دەژی، جۆرێـکی پـاك، گوناهبـاری لای خـوا نیـەو، عەیبـداری لای خەڵـك نیـە، دڵـی بـە ڕێـی خـۆی خۆشـە، دڵنیایـەو بەرچـاو ڕوونـە، (ئـەوەی پاکـە، بێباکـە)، (ئـەوەی پەرێـزی پاکـە، بەرچـاوی ڕووناکـە)، بێگومـان ئـا ئەوانەشـن کـە جێـگای گرنگیـی پێـدانی خـوای پـەروەردگارن و، ئـەوەش کـە لێـی بوەشـێتەوە خـوا بـە (**طَیِّبـة**)ی ناوبـەرێ، تەنیـا ئـەو جـۆرە ژیانەیـە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْت، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت (٨) ئایـەت پێکـدێ ، ئایەتـەکانی: (٩٨ - ١٠٥)، تـەوەری سەرەکییشـی بـاسی قورئانـە ، خوێنـدنی قورئـان ، سـەرچاوەی لێـوە هاتنـی قورئـان ، (کـە خوایـە) ئامانجـی دابەزێـنرانی قورئـان ، پاشـان بەرپەرچدانـەوەی تۆمـەتی نەیـارانی و ، سـزای چاوەڕوانکراویـان لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا.

﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئنجا (مادام قورئان ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە)، هەر کات ویستت قورئان بخوێنی، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی دەرکراو (٩٨) بە دڵنیایی ئەو دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا نیە، کە بڕوایان هێناوەو پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن (٩٩) بەڵکو بەس توانای بەسەر ئەوانەدا هەیەو ، پێیان دەوێرێ کە دۆستایەتیی دەکەن و، بەهۆیەوە هاوبەشدانەرن (بۆ خوا) (١٠٠) هەر کاتێکیش ئایەتێکمان لەجێی ئایەتێك دانا - هەر خواش زاناترە بەوەی دایدەبەزێنێ - (بێبڕوایەکان)، دەڵێن: بێگومان تۆ (ئەی موحەمەد!) هەڵبەستەری (قورئانی بەناوی خواوە)، بەڵکو (گرفتیان ئەوەیە) زۆربەیان نازانن (ئەگەرنا تۆ هەڵبەستەری قورئان نی)، (١٠١) بڵێ: گیانی پاك (جیبریل) لە پەروەردگارتەوە بە هەق دایبەزاندوە، تاکو ئەوانەی بڕوایان هێناوە (بەهۆیەوە) چەسپاویان بکات (لە دینداریياندا)، هەروەها ڕێنمایی و موژدەیە بۆ ملکەچان (بۆ خوا) (١٠٢) بە دڵنیاییش دەزانین کە دەڵێن: مسۆگەر (قورئان) بەشەرێك فێری (موحەممەدی) دەکات، بەڵام زمانی ئەو کەسەی بە لادانەوە ئاماژەی پێ دەکەن، عەجەمییە، کەچی ئەم قورئانە، بە زمانێکی عەرەبیی ڕۆشنە! (١٠٣) بێگومان ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن، خوا ڕاستەڕێیان ناکات و، ئازارێکی بەئێشیان هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) (١٠٤) تەنیا ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن، درۆ هەڵدەبەستن، (کە گوایە قورئان خوا داینەبەزاندوە !)و، هەر ئەوانەشن درۆزنانی تەواو (١٠٥)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ ): واتە: پەنا بە خوا بگرە، پەنا بەرە بەر خوا، (العَوْذُ: الإلتِجَاءُ إلى الغَيْرِ، وَالتَّعَلُّقُ بِهِ، عَاذ فُلاَنٌ بِفُلاَنٍ، عَوَّذَهُ: وَقَاهُ، وَالعُوذَةُ: مَا يُعَاذُ بِهِ مِنَ الشَّيء)، وشەی (عَوذ): بریتییە لە پەنا بردن بۆ یەکێکی دیکە و، پێوە پەیوەست بوونی، دەگوترێ: (عَاذَ فُلاَنٌ بِفُلاَنٍ) واتە: فڵان کەس پەنای بردە بەر فڵان کەس، هەروەها دەگوترێ: (عَوَّذَهُ: وَقَاهُ) واتە: پاراستی، (عُوذَة): یانی: دوعایەك، کەسێکی پێ بپارێزرێ لە خراپەیەك.

( ٱلرَّجِيمِ ): (الرِّجَامُ: الحِجَارَةُ، وَالرَّجْمُ: الرَّميُ بالحِجَارَةِ، رُجِمَ: فَهُوَ مَرْجُومٌ، وَالرَّجِيمُ: اَلمَطرُود)، (رِجَام): بەرد، یان وردەبەرد (رَجْم): بریتییە لەوە کەسێك بەردی بۆ بهاویشترێن، دەگوترێ: (رُجِمَ: فَهُوَ مَرْجُومٌ)، بەردباران کرا، ئەو بەردباران کراوە، (وَالرَّجِيمُ: المَطرُود)، هەروەها وێڕای ئەوە کە (ٱلرَّجِيمِ): مانای بەردباران کراو، دەگەیەنێ، بە مانای دەرکراویی و دوورخراوەییش دێ.

( سُلۡطَٰنٌ ): (السَّلاَطة: التَّمَكُّنُ مِنَ القَهْرِ، وَالسُّلطَانُ، يُقَالُ: فِي السَّلاَطة)، (سَلاَطة): بریتییە لەوە کە کەسێك مل بە کەسێك کەچ بکات، (سُلطَان)یش لەوەوە هاتووە، یانی: دەسەڵات، جاری وایە (سُلطَان) بە دەسەڵاتی مەعنەویی دەگوترێ، کە بەڵگەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ ﴿٢٣﴾ ﴾النجم، واتە: خوا هیچ بەڵگەی لەسەر دانەبەزاندوون، چونکە بەڵگە دەسەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵ و دڵی مرۆڤدا، جاری واشە (سُلۡطَٰنٌ) واتە: دەستڕۆیشتوویی بەگشتی.

( يَتَوَلَّوۡنَهُۥ ): واتە: سەر بەو دەبن، لەگەڵیدا دەبن، بە قسەی دەکەن، (تَوَلَّى: إذَا عُدِّيَ بِنَفسِهِ اقتَضَى مَعْنَى الوِلاَيَة)، (تَوَلَّى): ئەگەر بۆخۆی تێپەڕ (تعدِّي) بکات بۆ بەرکار (مَفعُول بِهِ) مانای سەرپەرشتییکردن دەخوازێ، کەواتە: (يَتَوَلَّوۡنَهُۥ): یانی: (يُطِيعُونَهُ)، بە قسەی دەکەن، پەیڕەویی لێدەکەن، فەرمانبەریی بۆ دەکەن.

( رُوحُ ٱلۡقُدُسِ ): (التَّقْدِيسُ: التَّطهِيرُ، رُوحُ القُدُسِ: جِبرِيلُ لأَنَّهُ يَنزِلُ بالقُدْسِ مِنَ اللّهِ، أَي: بِمَا يُطَهِّرُ بِهِ نُفُوسَنا، مِنَ القُرآنِ وَالحِكْمَةِ وَالفَيض الإلَهِي)، (تقديس)، یانی: پاککردنەوە، (رُوحُ ٱلۡقُدُسِ ): ناوە بۆ (جیبریل) یانی: گیانی پاککەرەوە، چونکە لەلایەن خواوە قودس

دادەبەزێنێ، واتە: شتێك كە نەفسەكانی ئێمەی پێ پاككەكاتەوە لە قورئان و حیكمەت و بەخششی خوایی.

( يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ ): واتە: بە لادانەوە ئاماژەی پێدەكەن، (اللَّحْدُ: حُفْرَةٌ مَائِلَةٌ عَنِ الوَسَطِ)، (لَحْد) بە كوردیی (لا گۆڕ)ی پێ دەڵێن، ئەویش ئەوەیە كە گۆڕەكە بە لایەكی دا هەڵبقەنرێ و جەنازەكە بخرێتە وێوە، چاڵێكە لە نێوەڕاستیەوە، لادەدرێ بە لایەكیاندا، دەگوترێ: (لَحَدَ القَبرَ: حَفَرَهُ وَكَذَا أَلْحَدَهُ، وَلَحَدَ بِلِسانِهِ: مَالَ، وَأَلْحَدَ فُلاَنٌ: مَالَ عَنِ الحَقِّ)، وەك گوتمان: (لَحَدَ القبرَ)، واتە: قەبرەكەی بەلاگۆڕ هەڵقەند، هەروەها (أَلْحَدَ القَبر)، یانی: قەبرەكەی هەڵقەند بە لا گۆڕ، (لَحَدَ بِلِسانِهِ، وَأَلْحَدَ)، واتە: لە هەقی لادا، زمانی ناهەقی گوت.

( أَعۡجَمِيٌّ ): (العُجْمَةُ: خِلاَفُ الإِبانة، وَالإِعْجَامُ: الإِبهَامُ، وَالعَجَمُ ، خِلاَفُ العَرَبِ، وَالعَجَمِيٌّ: المَنسُوبُ إِلى العَجَمِ، وَالأَعْجَم: مَنْ كانَ فِي لِسانِهِ عُجْمَةٌ عَرَبِياً، كانَ أَو غَيرَ عَرَبِي).

(عُجمَة)، پێچەوانەی (إبانة)یە، (إبانة)، یانی: ڕۆشنیی، (عُجمَة)، واتە: ناڕۆشنیی، (إعْجَامُ)، واتە: ناڕۆشنیی، عەجەمیش پێچەوانەی عەرەبە، (عَجَمِي)، كەسێكە پاڵ بدرێتە لای عەجەم، (أَعجَم)یش كەسێكە كە زمانی ناڕۆشنیی تێدابێ، ئنجا خۆی عەرەب بێ، یان غەیری عەرەب.

شایانی باسە: هەر وشەی عەرەب، یانی: كەسێك كە زمانی ڕۆشن بێ، چونكە گەلی عەرەب زمانی خۆیان پێ ڕۆشن بووەو هی عەجەمییش، چونكە تێی نەگەیشتوون پێیان ناڕۆشن بووە، دیارە عەجەمیش واتە: غەیری عەرەبیش، هەر كەسێك كە شارەزای زمانی عەرەبی نیە، ئەو زمانەیان پێ ناڕۆشنەو زمانی خۆیان پێ ڕۆشنە، بابایەكی كورد، كوردییەكەی خۆی، پێ ڕۆشنە و، زمانی عەرەبی پێ عەجەمییە، یانی: پێی نا ڕۆشنە، هەروەها فارسێك و ئینگلیزێك و توركێك، یانی: ئەوە شتێكی ڕێژەییە، گرنگ ئەوەیە: عەرەب زمانی غەیری خۆیان بە عەجەمیی ناوناوە، لەبەرئەوەی كە تێی نەگەیشتوون و بۆ ئەوان ناڕۆشن بووە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

بۆ هۆی هاتنە خواری ئەو ئایەتە كە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾.

ئەم گێڕراوەیە هاتوە:

{عَن عُبَيدِ بنِ مُسلِمٍ الحَضرَمي، قَالَ: كَانَ لَنا غُلاَمَانِ نَصْرانِيَّانِ مِنْ أَهْلِ عَيْنِ التَّمْر، يُسَمَّى أَحَدُهُمَا: يَسار، وَالآخَرُ: جَبر، وَكَانَ يَقْرآنِ كِتَاباً لَهُمَا، فَرُبَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَامَ عَلَيهِمَا، فَقَالَ: الْمُشْرِكُونَ: إِنَّمَا يَتَعَلَّمُ مُحَمَّدٌ مِنْهُمَا! فَأَنزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الآيَةَ:

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾}[(١)].

واتە: عوبەیدی كوڕی موسلیمی حەضرەمیی، دەڵێ: ئێمە دوو كۆیلەی نەصرانییمان هەبوون، خەڵكی (عَيْنِ التَّمْر) بوون، یەكێكیان ناوی یەسار بوو، ئەوی دیكە ناوی جەبر بوو، كتێبێكیان هەبوو دەیانخوێندەوە، {دەبێ كتێبی ئایینیی خۆیان بوو بێ}، ئنجا جاری وا هەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایاندا ڕەت دەبوو، {لە لایان ڕادەوەستاو، قسەی لەگەڵدا دەكردن، كە بە تەئكید بانگی كردوون بۆ ئیسلام}، هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان گوتیان: موحەممەد ﷺ لەوانەوە فێر دەبێ! خوای زاڵی پایە بەرزیش ئەم ئایەتە موبارەكەی دابەزاند: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾.

---

(١) أَخْرَجَهُ الطَّبَري: ج ١٤، ص ١٢٠، والوَاحِدي: فِي أَسبَاب النُّزُول: ص١٩٠، وَالبَيهَقِي فِي شِعَبِ الإِيمَان: ١٣٨، وابْنُ أَبِي حَاتَم، وأيضاً لبَاب النَقُول: ص ١٣٤.
هەردوو نووسەری (الإستيعاب فِي بَيَانِ الأسبَاب)، لە بەرگی (٢) لاپەڕە (١٢٢)، گوتوویانە: (قُلنَا: وَسَنَدُهُ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الحَافِظ فِي الإِصَابَة)، دەڵێین: سەنەدەكەی ڕاستەو، (الحافظ ابْنُ حَجَر) لە كتێبی: (الإِصَابَة)دا كە دەربارەی هاوەڵان نووسیویەتی، بە ڕاستی داناوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، لەم هەشت (٨) ئایەتەدا، کە هەموویان دەربارەی قورئان دەدوێن: دەیدوێنێ، ئەم (ف)ی سەر، ( فَإِذَا )، هەندێك دەڵێن: (فاء **الإستئنافية**)یە، یانی: بۆ دەستپێکردنە، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: نا، بەڵکو ئەم (ف)یە، ئەو قسەیەی کە دێ، پەیوەستی دەکاتەوە، بەو ئایەتە موبارەکەوە، کە فەرمووی: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾، پەیوەستی دەکاتەوە بەوێوە، واتە: مادام قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندوە، ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێك و، ڕێنماییە و، مایەی بەزەیی خوا و مژدەو دڵخۆشییە، بۆ ملکەچان بۆ خوا، کەواتە: قورئانێك وابێ، ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، هەر کاتێك قورئانت خوێند! پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی نەفرینلێکراوو دوورخراوە لە بەزەیی خوا، واتە: هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنی، پەنا بە خوا بگرە، نەك قورئانەکە بخوێنی، ئنجا بڵێی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین، کە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە، بەڵام بە تەئکید وانیە، بەڵکو: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، یانی: هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنی، ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی دەرکراوو دوورخراوە لە ڕەحمەتی خواو، بڵێ:

١- ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾.

٢- یان بڵێ: (**أَعُوذُ باللَّهِ السَّمِيعِ العَلِيمِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم**).

٣- یان بڵێ: (**أَعُوذُ باللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ**)، بە چەند شێوەیەك هاتوە، وەك دوایی باسی دەکەین، ئەمە بۆچی؟ بۆ ئەوەی کە تۆ قورئان دەخوێنی و فەرمایشتی خوا دەخوێنی، بە دڵێکی پاك و، بە ئاگا لەخۆبوونێکی چاك و بە هۆشیارییەوە، بیخوێنیی، چونکە شەیتان ئیشی ئەوەیە: کاری خێر لە مرۆڤی مسوڵمان تێکبدات، ئنجا تۆ بێنە، قەڵغانێك لەسەر سەری خۆت هەڵگرە، بۆ ئەوەی وەسوەسەو خوتخوتەی خراپی شەیتانت لێ دووربخاتەوە، لە کاتێکدا کە تۆ خەریکی ئەو کارە گەورەو گرنگەی، کە بریتیە لە خوێندنەوەی قورئان.

﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا، نیە کە بڕوایان هێناوەو، تەنیا پشتیش بە پەروەردگاریان دەبەستن.

ئەو جۆرە کەسانە شەیتان پێیان ناوێرێ و، بەڕوەستیان نایەت و لە بەرانبەریاندا دەستەپاچەیە، کەواتە: تۆش پەنا بە خوا بگرە، هەڵبەتە کەسێکیش پەنا بە خوا دەگرێ و، کەسێکیش قورئان دەخوێنێ، کە ئیمانی بە خوا بێ و، پشتی بە خوا قایم بێ، کەسێکیش وابێ، شەیتان زەفەری پێنابات و، پێی ناوێرێ، ئەدی شەیتان بە کێ دەوێرێ و بەسەر کێدا زاڵ دەبێ؟ ﴿ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾، بێگومان ئەو (شەیتان) تەنیا دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە، کە بە قسەی دەکەن و، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆ دەکەن و، شوێنی دەکەون، ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی کە بەهۆی ئەوەوە ، هاوبەش دانەرن بۆ خوا ﷻ واتە: بەهۆی شەیتانەوە بوونە هاوبەشدانەر، بوونە هاوبەشدانەر بۆ خوا ﷻ.

﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍ ﴾، هەروەها کاتێك ئایەتێك لە شوێنی ئایەتێك دابنێین، خواش زاناترە بەوەی کە دایدەبەزێنێ، (کافرەکان) دەڵێن: بێگومان تۆ هەر قسە هەڵبەستەری بە ناوی خواوە، واتە: تۆ هەڵبەستەری ئەم قورئانەی بە ناوی خواوە!

هەڵبەتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان وادەڵێن: دواتریش زیاتر ڕوونی دەکەینەوە کە مەبەست لە دانانی ئایەتێك لە شوێنی ئایەتێك، مەرج نیە بە مانای نەسخ بێ و، وەك هەموو تەفسیرەکان، هەر باسی نەسخییان کردوە، بەڵام لێرەدا باسی نەسخ نیە، ئایەتێك لە شوێنی ئایەتێك دانران، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، جوانی ڕوونکردۆتەوە، واتە: ئایەتێك دێ، باسی توندیی دەکات، ئایەتێکی دیکە باسی نەرمیی دەکات، ئایەتێك باسی لێپرسینەوە دەکات، ئایەتێك دەفەرموێ: پرسیاریان لێناکرێ، ئایەتێکی دیکە دەڵێ: لێیان دەپرسرێ، ئایەتێك باسی مەسەلەیەك دەکات، ئایەتێکی دیکە دێ بە ڕواڵەت لەگەڵ ئەودا تێکدەگیرێ، بۆیە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان کە بە سەرکێڵانە تەماشای قورئانیان کردوە، تەماشای ئایەتەکانیان کردوە، گوتوویانە: ئەو کابرایە (موحەممەد) هەر ڕۆژە قسەیەك دەکات! کەواتە: خۆی هەڵیدەبەستێ!

مەبەستیان پێی ئەوە بووە، نەك ئەوە كە نەسخ هەبێ، چونكە لە قۆناغی مەككەدا تەنانەت بەڕای ئەوانەش كە نەسخ هەیە لە قورئاندا هیچ ئایەتێك نەسخ نەبۆتەوەو، ئەم سووڕەتەش، سووڕەتێكی مەككەییە، بۆیە هیچ باسی نەسخ لە ئارادا نیە، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە زانایان بێ، هەندێكیان زۆرباش سەرنجی ئەوەیان نەداوە، كە ئاخر ئەم سووڕەتە مەككەییەو، نەسخ ئەصڵەن ئەگەر هەشبێ لە حوكمە شەرعییەكاندا هەیە، لەو ئایەتانەدا هەیە، كە حوكمە شەرعییەكانیان تێدان، كە ئایەتەكانی سووڕەتە مەدینەییەكانن! كە من پێموایە: نەسخ لە قورئاندا هەر نیە، بەڵام دیارە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هەیە شتێكی فەرمووە، دوایی لای بردوە، هەروەها لە قورئاندا هەیە، كە شتێك لە سوننەتدا هەبووە و خوا لایبردوەو نەسخی كردۆتەوە، وەك مەسەلەی گۆڕینی ڕووگە (**قبلة**) لە (**بيت المقدس**)ەوە بۆ (مزگەوتی حەڕام) لە مەككە، بەڵام ئەوە كە: لە قورئاندا ئایەتێك هەبێ، خوا شتێكی فەرمووبێ، دوایی لایبردبێ و، ئایەتەكەش مابێ، شتی وا لە قورئاندا نیە، وەك تاكو ئێستا هێناومانە، هیچ ئایەتێكمان لێ عاسێ نەبووە كە بڵێین: ئەو ئایەتە ئیشی پێناكرێ و مەنسووخە! بە هەر حاڵ ئێمە لە سووڕەتی (**البقرة**)دا بە تەفصیل باسی ئەو مەسەلەیەمان كردوە.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵكو زۆربەیان نازانن، واتە: زۆربەیان نازانن كە خوا شتێك دەفەرموێ، دوایی شتێكی دیكە دەفەرموێ، كە بە ڕواڵەت تێكدەگیرێن، تێكناگیرێن، بەڵام ئەوە بە دوو ئیعتیباری جیان، یاخود ئەوە پلە پلەییە، یاخود ئەوە لە ڕوویەكەوەیەو، ئەوی دیكە لە ڕوویەكی دیكەوەیە.

﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾، بڵێ: ﴿ رُوحُ ٱلْقُدُسِ ﴾، واتە: بڵێ: جیبریل لە پەروەردگارتەوە بە هەق دایبەزاندوە، یانی: بە هەق هاتووە، بە ناهەق نەهاتووە، یاخود كە هاتووە حەقی لەنێو خۆیەوە گرتووە، ﴿ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾، بۆ ئەوەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دامەزراو و چەسپاویان بكات، لەسەر ئەو ڕاستە شەقامەی خوا، هەروەها ڕێنمایی و شادمانیی و دڵخۆشییشە، بۆ ملكەچان، ئەوانەی كە بۆ خوا ملكەچ دەبن.

﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەزانین كە ئەوانە دەڵێن: مرۆڤێك فێری دەكات، بەشەرێك فێری دەكات، ﴿ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ ﴾، بەڵام زمانی ئەو كەسەی بەلادانەوە ئاماژەی پێدەكەن {كە

گوایە تۆی فێر كردوە} ئەعجەمییە، واتە: زمانێكی نارۆشنە، بەنسبەت ئێوەی عەرەبەوە، ﴿وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾، بەڵام ئەم (قورئان)ە، بە زمانێكی عەرەبیی رۆشنە ( لِسَانٌ ) لێرەدا بە مانای لوغەتە (لغة) بە زمانێكی عەرەبی رۆشنە، ئنجا كەسێك كە خۆی زمانی عەرەبی نەزانێ، چۆن دەتوانێ بە زمانێكی عەرەبی رۆشن قورئان فێری موحەممەد ﷺ بكات ؟!

لە كۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەكانی خوا نیە، خوا ڕاستە ڕێیان ناكات، نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست و، ئازارێكی بە ئێشیان بۆ هەیە.

واتە: هەر كەسێكت بینی، كە خوا ڕاستە ڕێی نەكرد بوو، ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە كە بڕوای بە ئایەتەكانی خوا نەبووە، یانی: هەر لە ڕێوە بڕیاری داوە بڕوا بە ئایەتەكانی خوا نەكات، بۆیەش خوا ﷻ خوا نایخاتە سەر ڕێی ڕاست، لێرەشدا (هدى) لە ﴿لَا يَهْدِيهِمُ﴾دا، بە مانای ڕێنمایی كردن نیە، چونكە خوا ڕێنمایی هەموو كەسی كردوە، بە چاك و خراپەوە، ڕێی بۆ هەمووان ڕۆشن كردۆتەوە، بەڵام بێگومان هەموو كەس ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، كەسێك كە دوای ئەوەی خوا ڕێیەكەی بۆ ڕۆشن كردۆتەوەو پێشانی داوە بەڵام ئەو نایەت ڕێی خوا بگرێ، بێگومان خوا ﷻ بە شایستەی ئەوەی نازانێ هیدایەتی بدات، (هیدایەتی تایبەت)، هیدایەتە گشتییەكەی داوە (ڕێی بۆ ڕۆشن كردۆتەوە)، بەڵام بە شایستەی ئەوەی نازانێ كە هیدایەتی تایبەتی بدات و، بیخاتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی.

﴿إِنَّمَا يَفْتَرِي ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾

بێگومان هەر ئەوانە درۆ هەڵدەبەستن، كە بڕوایان بە ئایەتەكانی خوا نیە و، تەنیا ئەوانەش درۆزنانن، واتە: تەنیا ئەوانە بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، كە بڕوایان بە ئایەتەكانی خوا نیە.

كەواتە موحەممەدێك ﷺ كە لە لووتكەی بەرزی هەموو ڕەوشت و ئاكارێكی پەسندو جوان دایە، لێی ناوەشێتەوە: درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستێ و، ئەوانەی كە درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن، هەر ئەوانە درۆزنی ڕاستەقینەن، كە ئەو بێبڕواو ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەن: درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن و دەڵێن: خوا هاوبەشی هەیە، بەڵام موحەممەد ﷺ ناگونجێ، بەناوی خواوە درۆ بكات! بۆیە یەكێك لە زانایان دەڵێ:

موحەممەد ﷺ و هەر کام لە پێغەمبەرانی دیکەی خوا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، هەر کەسێك بڵێ: من پێغەمبەرم، یان دەبێ خراپترین کەس بێ، یان دەبێ چاکترین کەس بێ، یانی چی؟ یانی: هەر کەسێك گوتی: من پێغەمبەری خوام، ئەگەر درۆ بکات، ئەوە دیارە خراپترین کەسە، چونکە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، ئەگەر پێغەمبەری خواش بێ، بێگومان ئەوە چاکترین کەسە، کەواتە: زۆر ئاسانە لێك جیاکردنەوەی کەسێك کە بەڕاستیی پێغەمبەرەو، کەسێك کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتیی دەکات، وەك موسیلیمەی کەذذاب و ئەسوەدی عەنسیی و سەجاعی یەمامەو، غولام ئەحمەدی قادیانیی و، هەموو ئەوانەی کە بە درۆ و دەلەسە لافی پێغەمبەرایەتییان لێداوە، بەڵام دوایی لەجیاتی ئەوەی پێی بەرز ببنەوە، زۆر عەیبدار و ناشیرین بوون و، فڕێ دراونە زبڵدانی مێژووەوە، ئەو کەسەش کە بەڕاستیی پێغەمبەری خوا بووەو، کە گوتوویەتی: من پێغەمبەری خوام، ڕاستی کردوە، ئەوە دەبینی کە خاوەنی ڕێز و حورمەت و پایەی بەرز و ناوازەن، بەتایبەتی موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی و ڕەوانەکراوی هەرەمەزنی خاتەمی خوا ﷻ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

خـوا فەرمـان بـە پێغەمبەرەکـەی دەکات ﷺ کـە هـەر کات ویسـتی قورئـان بخوێنـێ و، لـە خوتخوتـەی شـەیتان پارێـزراو بـێ، با پەنـا بـە خـوا بگـرێ، چونکـە شـەیتان دەسـتەڵاتی بەسـەر ئەوانـەدا ناشـکێ کـە بـڕوادارن و، پشـت بـە خـوا دەبەسـتن، بەڵکـو تەنیـا بەوانـە دەوێـرێ، کـە شـوێنی دەکـەون و دەیکەنـە هاوبـەشی خـوا، یـان بەهـۆی ئـەوەوە دەبنـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر:

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١- کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، هەر کاتێ قورئانت خوێند، واتە: هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنی.

ئەمـە وەك ئایـەتی ژمـارە (٦)ی سـوورەتی: (المائدة)یـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ﴿٦﴾ ﴾.

واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کاتـێ هەڵسـان بـۆ نوێـژ، دەم و چاوتان بشـۆن و، هـەردووك دەسـتتان لەگـەڵ ئانیشـکتان و، دەسـتی تـەڕ بەسـەرتاندا بێنـن و، پێیەکانیشـتان بشـۆن، تاکـو گوێزینـگان.

واتـە: هـەر کاتێـك ویسـتتان نوێـژ بکـەن، ﴿ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، واتـە: هـەر کاتێـك ویسـتتان بـۆ نوێـژێ هەڵسـن: (إِذَا أَرَدْتُـم القِيـامَ إِلى الصَّلَاةِ)، نـەك ئەگـەر هەڵسـای بـۆ نوێـژ،

چونکە لە میانی نوێژەکەدا، دەست نوێژ ناگیرێ و، پێشتر دەبێ دەست نوێژ بگری، لێرەشدا ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، واتە: ئەگەر ویستت قورئان بخوێنی، بڵێ: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی دوور خراوە لە ڕەحمەتی خوا.

کەواتە: ئەو مانا ڕوواڵەتییە ڕوو کەشییەی کە هەندێکیان، وەك: (**النَّخَعِي، وابنُ سِيرِين، وَدَاوُد الظَّاهِرِي**)، ڕەحمەتی خوایان لێبێ، گوتوویانە: (**الإستعَاذَةُ بَعْدَ القِرَآءَة**)، پەنا بە خوا گرتن دوای خوێندنە! یانی: دوای ئەوەی قورئان دەخوێنی، دەبێ بڵێی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾!! لە ڕاستییدا نەیانپێکاوە !

چونکە خوای کارزان کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، هەر بە سیاق و سەلیقە دیارە، یانی: ئەگەر ویستت قورئان بخوێنی....

ئەم (**ف**)ی سەر ( فَإِذَا ) کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، ئەمە ئەو دوو ئایەتانە پێکەوە پەیوەست دەکات، کە پێشتر دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾، واتە: مادام قورئانێك دابەزێنراوە بۆ سەر تۆ، کە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنی پەنا بە خوا بگرە، لە شەیتانی دوور خراوە، لە شەیتانی دەرکراو، کەواتە: هەرچی لە نێوان ئەو دوو ڕستەیەدا هاتوە، هەمووی لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، پێی دەگوترێ: (**جُمْلَة مُعْتَرَضَة**)، واتە: قسەیەکە کە نێواخن کراوە، لەگەڵ مەبەستە ئەصڵییەکەدا.

بەڵام (**إبْنُ عَطِية**) دەڵێ: {**الفَاءُ فِي (فَإِذَا) واصِلَةٌ بَيْنَ الكَلامَينِ، وَالعَرَبُ تَستعْمِلُهَا فِي مِثْلِ هَذَا**}، واتە: (ف) لە (فَإِذَا)دا بۆ پێکەوە بەستنەوەی دوو قسەکانەو، عەرەب ئەوە بەکاردێنن، تەنیا بۆ ئەوەی کە دوو قسە پێکەوە ببەستنەوە، واتە: مەرج نیە ئەو (ف)ە، بچێتەوە بۆ: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾، بە هەر حاڵ ئەمەشیان دەگونجێ و، ئەویش دەگونجێ.

**٢-** کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی دوور خراوە، یان دەرکراو، یان بەرد بارانکراو، ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾، واتە: (**إلتَجِئ إلى اللّه**)، پەنا بەرە بەر خوا، پەنا بە خوا بگرە، هانا بۆ خوا بەرە، (**عَاذَ، يَعُوذُ، عَوْذاً، وَعِياذاً: إلتَجَأَ إلَيه، وَاعتَصَمَ بِهِ، تَعَوَّذَ، وَاستعَاذَ: لَجَأَ وَاعتَصَمَ، العُوذَةُ: التَمِيمَةُ، وَالعَوذُ: المَلْجَأُ**)، (**عَاذَ، يَعُوذُ، عَوذاً، وَعِياذاً**)، (**عَوذاً، وَعِياذاً**) هەردووکیان چاوگن، واتە: پەنا پێبردن، (**عَاذ**) هانای بۆ برد، دەستی پێوەگرت، (**تَعَوَّذَ، وَاستعَاذَ**)،

هەردووکیان بە مانای (لَجَأَ، وَاعتَصَمَ)، پەنای پێبردو و، خۆی پێوە گرتەوە، (عُوذَة: التَّمِيمَةُ)، (عُوذَة) ئەو نوشتەیەی کە دەکرێ، (وَالعَوذُ: المَلجَأُ)، ( عُوذَة) یانی: پەناگە، حەشارگە، ئەو شوێنەی کە پەنای پێ دەبردرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، واتە: بڵێ: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، پەنا بە خوا دەگرم، لە شەیتانی دوور خراوە لە بەزەیی خوا، با لەوبارەوە ئەم دوو دەقە بێنین:

فەرموودەی یەکەم: {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ كَبَّرَ ثُمَّ يَقُولُ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ)، ثُمَّ يَقُولُ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، ثَلاَثاً، ثُمَّ يَقُولُ: (اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيراً)، ثَلاَثاً (أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ[1] وَنَفْخِهِ[2] وَنَفْثِهِ[3])}، (أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٧٧٥، وَصَحَّحَهُ الألباني فِي «صَحِيح سُنَن أَبِي داود»: ٧٤٨).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک شەو هەڵدەستایەوە بۆ نوێژێ (اَللَّهُ أَكْبَر)ی دەکرد، پاشان سێ جاران دەیفەرموو: پاکیی و ستایش بۆ تۆ ئەی خوایە! ناوت بەپێزو پێگەت بەرزە، هیچ پەراستراوێك نیە جگە لە تۆ، دواتر سێ جاران دەیفەرموو: خوا گەورەترە بە گەورەیی، دواتر سێ جاران دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوا، پەنا بە خوای بیسەری زانا دەگرم، لە شەیتانی دوور خراوە: لە خوتخوتەی و، فووی خۆ بەزلگریی پێداکردنی و، شیعرو قسەی نارێك فێرکردنی.

فەرموودەی دووەم: {عَنْ سُلَيمَانِ بنِ صُرَد ﷺ قَالَ: إستَبَّ رَجُلَانِ عِندَ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ عِندَهُ جُلُوسٌ، فَأَحَدُهُمَا يَسُبُّ صَاحِبَهُ مُغضَباً، قَدِ احمَرَّ وَجهُهُ، فَقَالَ النَّبيُّ ﷺ: إِنِّي لَأَعلَمُ كَلِمَةً لَو قَالَهَا: لَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ، لَو قَالَ: أَعُوذ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم. فَقَالُوا لِلرَّجُلِ: أَلا تَسمَعُ مَا يَقُولُ: رَسُولُ اللَّه ﷺ؟ قَالَ: إِنِّي لَستُ بِمَجْنُونٍ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٧٢٤٩، وَالبُخَارِيُّ: ٣١٠٨، وَمُسْلِمٌ: ٢٦١٠، وَأَبُو دَاوُدَ: ٤٧٨١، وَالحَاكِمُ: ٣٦٤٩).

---

(١) همز: خوتخوتە و دنەدان بۆ خراپە.

(٢) نفخ: فوو پێداکردن، فووی خۆ بەزلگریی.

(٣) نفث: شیعرو قسەی خراپ و نارێك فێرکردن.

واتە: سولەیمانی کوڕی صورەد ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، دوو پیاو لە خزمەتی دا {کە لە کۆڕەکە بوون}، قسەیان بەیەکدی گوت، یەکێکیان قسەی بەوی دیکە دەگوت و زۆر تووڕە بوو بوو، دەم و چاوی سوور هەڵگەڕابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ: ئەو حاڵەتە تووڕەیی و پەستییەی هەیەتی، نایمێنێ، ئەگەر بڵێ: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، پەنا بە خوا دەگرم، لە شەیتانی دوور خراوە.

بە کابرایەکەیان گوت: گوێت لێ نیە پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرموێ ؟

گوتی: ئنجا خۆ من شێت نیم!

کە لە ڕاستیی دا ئەو هەڵوێستەی، هەڵوێستێکی شێتانە بووە، پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگارییت بکات و ئامۆژگارییەکەی لێ وەرنەگری، بە بیانووی ئەوەی تۆ شێت نی، هەر ئەوە بۆخۆی هەڵوێستێکی شێتانەیە، کە ئینسان ئامۆژگاریی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەت بکاتەوە.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، بێگومان ئەو دەستەڵاتی نیە بەسەر کەسانێکدا کە بڕوایان هێناوەو، پشتیشیان بە پەروەردگاریان دەبەستن، تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

وشەی (سُلۡطَٰنٌ): (السُّلطَانُ: التَسَلُّطُ وَالإِستِيلاء)، بریتیە لە دەست بەسەرداگرتن و خستنە ژێر ڕکێفی خۆ، واتە: پێیان ناوێرێ، بەڕووەستیان نایە، زەفەریان پێ نابات، ئەو دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا نیە، کە بڕوادێنن و، تەنیا بە پەروەردگاریان پشت بەستوون، ئەدی شەیتان: دەستەڵاتی بەسەر کێ دایەو بە کێ دەوێرێ و زەفەر بە کێ دەبات ؟

٤- ﴿ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ ﴾، ئەو تەنیا دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە، کە شوێنی دەکەون، دۆستایەتیی دەکەن، فەرمانبەریی بۆ دەکەن، بە قسەی دەکەن، (**يَتَوَلَّوْنَهُ: أَي يَجعَلُونَهُ وَالِياً عَلَيْهِم: فَيُحِبُّونَهُ وَيُطِيعُونَهُ وَيَستَجِيبُونَ دَعْوَتَهُ**)، دەیکەنە سەرپەرشتیاری خۆیان، خۆشیاندەوێ و فەرمانبەریی بۆ دەکەن و، وەڵامی بانگەوازەکەی دەدەنەوە.

٥- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ﴾، هەروەها دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە، کە بەهۆی ئەوەوە، هاوبەش بۆ خوا دانەرن، دەڵێ: {(**الباء) لِلسَبَبِيّة: أَي أَشرَكُوا بِاللّٰهِ بِسَبَبِهِ، وَتَقدِيمُ المَجرُورِ:** ﴿ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ﴾، **لإِفَادَةِ الحَصرِ**}.

ئەم (ب)یە، ﴿ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾، بۆ هۆكارییە، واتە: بەهۆی شەیتانەوە، هاوبەشیان داناوە بۆ خواو، بوونەتە هاوبەش بۆ خوا دانەر، ئنجا كە **(الجارّ والمجرور)**ەكە ﴿ هُم بِهِۦ ﴾، پێش خراوە، لە جیاتی **(هُم مُشرِكُون بِهِ)**، فەرموویەتی: ﴿ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾، ئەوە كورت هەڵێنانە، واتە: تەنیا بەهۆی ئەوەوەیە: كە بوونەتە هاوبەش بۆ خوا دانەر.

هەندێكیش گوتوویانە: **(أي مُشرِكُونَ الشَّيطَانَ، وَيُشْرِكُونَهُ فِي أعمَالِهِم !)**، واتە: هاوبەش دانەری شەیتانن و، دەیكەنە هاوبەش لە كردەوەكانیاندا.

بەڵام **(الطبري)** ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: **(لَو كانَ مَعنَى الكَلَامِ مَا قَالَهُ الرَّبِيعُ، لَكانَ التَّنزِيلُ: الَّذِينَ هُم مُشرِكُون بِهِ)**[1]، ئەگەر ماناكەی وا بووایە كە ڕەبیع گوتوویەتی، ئایەتەكە بەم شێوەیە دەبوو: **(الَّذِينَ هُم مُشرِكُون بِهِ)**، بەڵام ئێستا دەفەرموێ: ﴿ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە بوونەتە هاوبەش بۆ خوادانەر، نەك ئەوان هاوبەش دانەری وی بن، بۆ خوا.



---

(١) جامع البيان: ج ١٤، ص ١٨١.

## کورتە باسێک لەبارەی ( إستعاذة )ەوە

(إسـتِعَاذَة): واتـە: گوتنـی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، ئێمـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەی کورتـدا، ئـەم کورتـە باسـە، پێشـکەش دەکەیـن:

**یەکەم: چەند بۆچوونێك لەبارەی گوتنی: (إستِعَاذَة)ەوە:**

**١)** زۆربەی زانایان دەڵێن: لە کاتی هەموو قورئان خوێندنێکدا، واتە: لە نێو نوێژداو، لە دەرەوەی نوێژدا، سوننەتەو، شتێکی پەسندە، کە (**إستِعَاذَة**) بکرێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، ئەو فەرمانە، سوننەت و پەسند دەگەیەنێ، لە نێو نوێژ و لە دەرەوەی نوێژیشدا، واتە: سوننەتە لە کاتێکدا کە قورئان دەخوێنی، ئنجا چ لە نێو نوێژدا، چ لە دەرەوەی نوێژ بڵێی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، لە سەرەتایەوە.

**٢)** بەڵام هەندێك لە زانایان ڕایان وایە کە: تەنیا لە کاتی قورئان خوێندن دا، واتە: لە دەرەوەی نوێژ، شتێکی پەسند و سوننەتە: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ بکرێ.

**٣)** زۆربەی زانایان ڕایان وایە، کە تەنیا لە سەرەتای قورئان خوێندنی ڕکاتی یەکەمدا، گوتنی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، شتێکی پەسندە.

**٤)** ڕایەکی دیکەش هەیە لەوبارەوە کە دەڵێ: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، (**الأَمرُ لِلوجُوبِ فِي قِراءَةِ الصَّلاةِ خَاصَّة**)، ئەو فەرمانە بۆ فەرزبوونە، تەنیا بۆ قورئان خوێندن لە نێو نوێژداو، تەنیا لەوێدا فەرزە ئینسان بڵێ: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، گوتوویانە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، واتە: کە نوێژت کرد، ئنجا ئەوەیان بە بەڵگەی ئەو ڕایە هێناوەتەوە، کە خوا لە سوورەتی: (**الإسراء**)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾، دەڵێن: قورئان لێرەدا مەبەست پێی نوێژە، لەبەرئەوە کە قورئانی تێدا دەخوێنرێ، کەواتە: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾، واتە: (**فَإِذَا قَرَأْتَ القُرآنَ فِي الصَّلاة**)، هەر کات لە نوێژێ دا قورئانت خوێند، ئەمە ڕای (**عطاء**)ە، کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین، کە تەنیا لە نوێژدا (**إستِعَاذَة**) دەکرێ، ئەویش واجبە لە سەرەتای قورئان خوێندنی نێو نوێژدا دەگوترێ.

**٥)** بەڵام (**سفيان الثوري**) دەڵێ: (**الإستِعَاذَةُ وَاجِبةٌ فِي قِراءَةِ الصَّلاَةِ وَغَيرِهَا**)، واتە: گوتنی: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾، فەرزە لە قورئان خوێندنی نێو نوێژو دەرەوەی نوێژیش دا.

٦) (إبنُ سِيرِين) دەڵێ: (تَجِبُ الإستِعَاذَةُ فِي العُمرِ مَرَّةً وَاحِدَة)، لە تەمەندا یەکجار: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، گوتن فەڕزە، واتە: یەکجار فەڕزە، بەڵام جارەکانی دیکە سوننەتە، (هەڵبەتە ڕایەکەی هیچ بە ڕاست ناچێ).

٧) مالیك ڕای وایە: (الإستِعَاذَةُ مَندُوبة لِلقِرَاءَةِ فِي غَيرِ الصَّلاَةِ، وَكرِهَهَا فِي قِرَاءَةِ صَلاَةِ الفَرِيضَة، وَأَبَاحَهَا بِلا نَدبٍ فِي قِرَاءَةِ صَلاةِ النافِلَه)، واتە: گوتنی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، لە قوڕئان خوێندنی دەرەوەی نوێژدا سوننەتە، - وەك پێشتریش باسمانکرد - بەڵام لە نوێژی فەڕزدا شتێکی ناپەسندە، ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ بکرێ و، لە نوێژی سوننەتدا نوێژێ کە مەندووبە، گوتوویەتی: ڕەوایە، (شتێکی ڕەوایە)، بەڵام سوننەت نیە، ئەوە هیچ کە واجبیش نیە[١].

**دووەم: ئایا گوتنی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، یان، (أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ العَلِيم مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم)، یان: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم مِن هَمْزِهِ وَنفخِهِ وَنَفثِهِ)، بە هەر کام لەو صیغانە کە پێشتر فەرمایشتەکانمان هێنان، لە پێش قوڕئان خوێندن، پێش دەستپێکردنی قوڕئان خوێندن، مەشڕووعە، - چ واجب بێ، چ سوننەت بێ، چ ڕەوا بێ - یان لە دوای قوڕئان خوێندن ؟**

پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ﴾، واتە: (فَإِذَا أَرَدْتَ قِرَاءَةَ القُرآنِ)، ئەگەر ویستت قوڕئان بخوێنی، بەڵام ڕایەکی بێ هێز هەیە کە هی: (**النخعي، وإبن سيرين، و داود الظاهري**)یە، ئەوان دەڵێن: نەخێر، دەبێ کە قوڕئانت تەواو کرد، ئنجا بڵێی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾.

کە لەگەڵ ڕێزم دا بۆ ئەو زانایانە، ئەو ڕایە ئەو پەندە کوردییەی بەسەردا دەچەسپێ کە دەڵێ: (پاش بارانان کەپەنەك)، مرۆڤ کە باران لێیدا، کەپەنەك[٢] بەخۆی دابدات یان نا، سوودی نیە!

گوتنی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، قەڵغانێکە لەسەر سەری خۆت ڕادەگری، کاتێك کە تۆ لەگەڵ شەیتاندا ڕووبەڕوو دەبیەوە، کاتێك کە دەست بە قوڕئان خوێندن، یان دەست بە نوێژەکەت دەکەی، بۆ سەرەتاکەیەتی نەك دوایی.

---

(١) ئەم ڕایانەم لە تەفسیری: (التَّحرِير وَالتَّنوِير)ی (محمد الطاهر بن عاشور)، ج ١٤، ص (٢٧٧ - ٢٧٨)دا، هێناون.

(٢) کەپەنەك: پۆشاکێکی ئەستووری لە خوریی پەستراو دروستکراوە، شوان لەبەر باران و سەرما بەخۆی دا دەدات.

**سێیەم: (إستعَاذَة) کردن لە غەیری کاتی نوێژکردن و قورئان خوێندن دا سوننەت نیە:**

زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، ئەوانەی کە لێکۆڵەرەوەو ڕۆچوون، دەڵێن: شتێکی ڕەواو نیەو مەشرووع نیە: ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾، بگوترێ: لە کاتێکدا ئایەتێك دەخوێنی، یان چەند ئایەتێك لە قورئاندا دەخوێنی بۆ فێرکردن، یان بۆ ئامۆژگاریی، یان لە کاتی وتار و لە کۆڕ و مەجلیسدا، چونکە هەندێك مەلا، بە تایبەتی ئەوانەی لەسەر تەلەفزیۆن و ڕادیۆ قسە دەکەن، هەر ئایەتێك بڵێن، دەڵێن: ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾، خوا وایفەرمووە! نا، ئەوە لە کاتێك دایە کە تۆ بە نیەتی قورئان خوێندن، قورئان بخوێنی، یان لە نوێژدا، بەڵام کە تۆ وەك فێرکردن و وتاردان، یان ڕستەیەك لە قورئان وەردەگری و (**إقتباس**)ی دەکەی و، بە بەڵگە دەیهێنیەوە، پێویست بە گوتنی: ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ ناکات.

**چوارەم: حیکمەتی ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ چییە ؟**

دەڵێین حیکمەتەکە هەر لە خودی ئایەتە موبارەکەکەدا هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾، بێگومان ئەو (شەیتان)ە دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا نیە، کە بڕوایان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

کەواتە: کە تۆ دەڵێی: ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾، یەکەم واتە: بڕوات بە خوا هەیە و، ئەوە تەعبیرکردنە لە ئیمان بە خوا، دیسان تەعبیرکردنیشە لە پشت بە خوا بەستن، چونکە کە تۆ دەڵێی: خوایە! پەنا بە تۆ دێنم، واتە: پشت بە خوا دەبەستی، ئنجا شەیتانیش دەستەڵاتی بەسەر کەسێکدا نیەو، بەسەر کەسانێکدا نیە، کە خاوەن ئیمانن و، خاوەنی پشت بە خوا بەستن.

ئنجا لە سوورەتی (ص)دا، شەیتان ئەوەی ڕاگەیاندوە: کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا هەیە، جگە لەوانەی کە بەندەی هەڵبژاردەی خوان: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾﴾، واتە: (ئیبلیس گوتی:) سوێند بە عیززەتی تۆ، تێکڕایان سەرگەردان و بێمراد و بێئاکام دەکەم، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت، کە خوێندراویشەتەوە: (**مُخلِصِين**)، واتە: ئەو بەندانەی کە خۆیان بۆ تۆ ساغ کردۆتەوە.

هەروەها لە سوورەتی (**الحجر**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ

(٤٢)، واتە: (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە منت بێمرادو بێئاکام کرد، گوناهەکانیان لەسەر زەوی بۆ دەڕازێنمەوەو، تێکڕایان بێمراد و بێئاکام دەکەم، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکانت، خوا فەرمووی: ئەوە ڕێیەکی ڕاستە لەسەر من، بەندەکانی من، تۆ دەستەڵاتت بەسەریاندا نیە، جگە لە بێمرادان و لە بەدبەختان کە شوێنت دەکەون.

**پێنجەم: ئایا گوتنی: ﴿ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾، یاخود بە صیغەکانی دیکە، تەنیا گوتنەکەی بەسە؟**

بێگومان نەخێر، بەڵکو پێویستە بە بیرلێکردنەوەو تێگەیشتنەوە بێ، ئنجا کاریگەریی دەبێ، هەڵبەتە ئەمە تەنیا بۆ (إستعَاذَة) کردن نیە، بەڵکو بۆ هەموو ئەو وشانەیە کە دەگوترێن: لە نوێژدا، ئنجا زیکرەکانی ڕکووع و سەجدە، قورئان خوێندنە، تەحییاتە، هەموو ئەوانە بە ئەندازەی ئەوەی کە ئینسان بیر لە واتاو ماناکەیان دەکاتەوەو، کارلێکیان لەگەڵدا دەکاو، لەگەڵیاندا ئاوێتە دەبێ، کاریگەریی لەسەر دادەنێن، ئەمما هەر گوتنی ڕووت بەس نیە، بۆ ئەوەی کە ئەو شوێنەوارەی هەبێ کە خوای زاناو شارەزا دەفەرمووێ.

**شەشەم: بەپێی فەرمایشتی خوا: ﴿ إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، ئەو دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا نیە، کە بڕوایان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن:**

مرۆڤی مسوڵمان بە ئەندازەی هەبوونی ئیمان و عەقیدە لە دڵ و دەروونی داو، هەبوونی پشت بە خوا بەستن، لە دڵ و دەروونی دا، شەیتانی لێ دوور دەبێ.

کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان لە خوا نزیکە، لە شەیتان دوورە، ئەوە هیچ گومانی تێدانیەو، ئەوە شتێکی جەڕبێنراوو سەلمێنراوە.

**حەوتەم: بەپێی فەرمایشتی خوا کە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ ﴾، ئەو تەنیا دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە بە قسەی دەکەن، شوێنی دەکەون، پەیڕەویی لێدەکەن، بە سەرپەرشتیاری خۆیانی دادەنێن، ئەوانەی کە بەهۆی ئەوەوە بوونەتە هاوبەش بۆ خوا دانەر:**

ئیبلیس تەنیا دەستەڵاتی لەسەر ئەوانەیەو، تەنیا لەوانەدا دەستەڵاتی کورتهەڵاتوە، کە شوێنی دەکەون و، خۆیان دەرفەتی بۆ دەڕەخسێنن و، خۆیان کەلێن دەدەن، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (مریشك بۆخۆی خۆڵ بەسەر خۆیدا نەکات، بە کەس پێیدا ناکرێ)!

لە ڕاستییدا ئەوانەش خۆیان شەیتانیان بەسەر خۆیان دا زاڵ کردوەو، کردوویانە بە ملۆزم.

**مەسەلەی دووەم:**

**خـوا دەفەرمـوێ: ئەگـەر ئایەتێـك بخەینـە شـوێن ئایەتێـکی دیکـە، کافـرەکان دەڵێـن، تـۆ هەڵبەسـتەری! {واتـە: هەڵبەسـتەری قورئـانی بـە نـاوی خـواوە}، بەڵکـو زۆربەیـان نازانـن، بڵـێ: گیـانی پـاك لـە پەروەردگارتـەوە بـە هـەق دایبەزانـدوە، تاکـو ببێتـە مایـەی چەسپاویی بـڕواداران و، بـۆ گەردنکەچانیـش ڕێنمایـی و موژدەیـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ﴾، هەر کاتێك ئایەتێکمان گۆڕی لە شوێن ئایەتێك، (الراغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (الإِبْدَالُ، وَالتَّبْدِيلُ، وَالتَّبَدُّلُ، وَالإِستبدَالُ: جَعْلُ شَيءٍ مَكانَ آخَر، وَهُوَ أَعَمُّ مِنَ العِوَضِ، فَإِنَّ العِوَضَ هُوَ أَن يَصِيرَ لَكَ الثَانِيَ باعطَاءِ الأَوَّل، وَالتَّبدِيلُ قَد يُقَالُ للتَغيِيرِ مُطلَقاً، وَإِنْ لَمْ يأْتِ بِبَدَلِهِ، قَالَ تَعَالَى: ﴿ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ ...﴿٥٩﴾ ﴾البقرة، وَقَالَ: ﴿ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ...﴿٥٥﴾ ﴾النور، وَقَالَ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ...﴿٧٠﴾ ﴾الفرقان، وَقَالَ: ﴿ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَ مَا سَمِعَهُۥ...﴿١٨١﴾ ﴾البقرة).

بـە ڕاسـتیی ڕاغیبـی ئەسـفەهانیی خـوا پاداشـتی بداتـەوە، جـوان شـیکردنەوە دەکات بـۆ مانـاو مەبەسـتی وشـەکانی فەرمایشـتی خـوا، دەڵـێ: هـەر کام لـە: (إِبـدَال و تَبدِيـل و تَبـدُّل و إِستبدَال) هـەر چواریـان، مانایـان ئەوەیـە کە شـتێك بخەیە شـوێنی شـتێك، کە ئـەوە ماناکەیەتی فراوانـترە لـە قەرەبـوو، چونکـە قەرەبـوو: ئەوەیـە کـە دووەم بـۆ تـۆ بـێ، لەبەرئـەوەی تـۆ یەکـەم دەدەی {دەڵێـی: مـن ئـەو شـتەت دەدەمـێ، تـۆش لـە بەرانبـەردا ئـەوەم بدەیـە}، بەڵام (تَبدِيـل، تَبَـدُّل، إِبـدَال، إِسـتبدَال)، بریتیـە لـە گۆڕینـی ڕەهـا، بەبـێ ئـەوەی کـە جێگرەوەیـەکی بـۆ بێنـی، وەك خـوای بـەرز لـە سـوورەتی (البقـرة) ئایـەتی: (٥٩)دا دەفەرمـوێ: ئەوانـەی سـتەمیان کـرد بـوو، قسـەکەیان گـۆڕی جگـە لـەوەی پێیـان گوتـرا بـوو، (واتـە: قسـەیەکی دیکەیـان لـە شـوێنی قسـەی خـوادا دانـا)، هەروەهـا لـە سـوورەتی: (النـور)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ

بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗا ﴿٥٥﴾﴾، واتە: لە دوای ترس، هێمنیی و ئاسایشیان بۆ دێنێ، هەروەها لە سووڕەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖ ﴿٧٠﴾﴾، واتە: ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێ، هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ... ﴿١٨١﴾﴾البقرة، {لە مەسەلەی وەصیەت دا،} هەر کەسێك گۆڕی دوای ئەوەی بیستوویەتی، (گۆڕی) واتە: بە قسەیەکی دیکە، بە جۆرێکی دیکە وەصیەتەکەی خستە ڕوو، جگە لەوەی کە بیستبووی، {جگە لەوەی کە بابای وەصیەتکەر گوتبووی}.

٢- ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ﴾، خواش زاناترە بەوەی کە دەینێرێتە خوار، (يُنَزِّلُ)، خوێنراویشەتەوە: (بِمَا يُنْزِل)، کە هەردووکیان لە مانادا هەر یەکن، واتە: بەوەی کە دەینێرێتە خوارێ، ئەمەش (**جملةٌ معترَضَةٌ**)، ڕستەیەکی نێواخنە خراوەتە نێوان، ڕستەی: کاتێك ئایەتێك بە ئایەتێك دەگۆڕین و، ڕستەی: گوتیان تەنیا هەڵبەستەری.

٣- ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭ﴾، گوتیان: تۆ بەس هەڵبەستەری، واتە: (**أَنْتَ مُتَقَوِّلٌ وَمُخْتَلِقٌ عَلَى اللَّه**)، تۆ هەر بە ناوی خواوە قسە دەکەی، بە ناوی خواوە قسە هەڵدەبەستی، (**أَصْلُ الإِفتِرَاءِ: الإِخْتِرَاعُ وَغَلَبَ عَلَى اختِرَاعِ الخَبَرِ ، فَساوى الكَذِبَ فِي المَعنَى**)، وشەی (إِفتِرَاءِ)، لە ڕیشەدا بریتیە لە پەیداکردن، بەڵام دوایی مانای: (پەیداکردنی هەواڵ) تێدا زاڵ بووەو، ئەو کاتەش لەگەڵ درۆدا یەکسان دەبێتەوە لە واتادا، (إِفتِرَاءِ)، واتە: درۆکردن، هەڵبەستنی درۆ.

٤- ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵکو زۆربەیان نازانن، واتە: نازانن کە خوا ﷻ شتێك دەفەرموێ: دوایی شتێکی دیکە دەفەرموێ: مەرج نیە تێکبگیرێن، بەڵام ئەوان وا دەزانن تێکدەگیرێ، یان وا دەزانن ئەوەی دوایی، ئەوەی پێشێی لابردوەو، خوا ئەوەی دوایی، لە شوێن ئەوەی پێشێ داناوە، (**أَي: لا يَفهَمُونَ وَضْعَ الكَلَامِ مَوَاضِعَهُ وَحَملَهُ مَحَامِلَهُ، وقال: (أكثرهم) وَذَلِكَ لأَنَّ بَعْضَهُمْ كانَ يَعلَمُ أَنَّ القُرْآنَ كَلامُ اللَّهِ حَقّاً، وَلَيسَ افتِرَاءً، وَلَكِنَّهُم يَقُولُونَ ذَلِكَ تَلْبِيساً وَبُهْتَاناً**).

واتە: نازانن و لە قسە تێناگەن، کە لە شوێنی خۆیدا دایبنێن، بۆیەش دەفەرموێ: (زۆربەیان) چونکە هەندێکیان دەیانزانی کە قورئان بەڕاستی فەرمایشتی خوایە و، هەڵبەستراو نیە، بەڵام بۆیە وایان دەگوت، تاکو چاو بەست لە خەڵکەکە بکەن و بە سەهوویان بەرن و، چەواشەیان بکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، مانایەکی زۆر جوان دێنێ، بۆ ئەم مەسەلەیەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ

أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، دەڵێ: (كانَ إذَا نَزَلَت آيةً فِيهَا شِدَّةٌ، ثُمَّ نَزَلَت ءَايةٌ أَلْيَنَ مِنهَا تَقُولُ كُفَّارُ قُرَيش: واللَّهِ مَا مُحَمَّدٌ إلاَّ يَسْخَرُ بأصْحَابِهِ، اليَومَ يأمُرُ بأمرٍ، وَغَداً يَنهَى عَنهُ، وَإِنَّهُ لا يَقُولُ هَذِهِ الأَشياء، إلاّ مِنْ عِنْدِ نَفسِهِ، فَأَنزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ﴾).

واتە: کاتێك ئایەتێك دادەبەزی توندییەکی تێدا دەبوو، دوایی ئایەتێکی لەو نەرمتر دادەبەزی، کافرەکانی قورەیش دەیانگوت: بە خوا موحەممەد هەر گاڵتە بە هاوەڵانی دەکات، ئەمڕۆ شتێکیان فەرمان پێدەکات، بەیانیش ئەو شتەی کە دوێنێ فەرمانی پێکردوە، قەدەغەی دەکات، ئەو شتانەی کە دەیانڵێ: بەس لە لای خۆیەوە دەیانڵێ! - بەو بۆنەیەوە - خواش ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾.

واتە: زۆربەیان نازانن و، لە قسە تێناگەن کەمێکیان تێدەگەن و، بڕواشیان بەو قسەیە نیە، بەڵام بۆ چەواشە کردن و کڵاو لەسەر نانی خەڵکە چەواشەکراوەکە، ئەو قسانە دەکەن.

## کورتە باسێک: پێنج سەرنج بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کە: ئایەتی (١٠١) مەبەست پێی نەسخ نیە

١/ ناگونجێ ئەم ئایەتە باسی نەسخ بێ، هەرچەندە زۆربەی یاخود سەرجەم تەفسیرەکان، وایان داناوە! بەداخەوە، چونکە نەسخ گەر هەشبێ لە یاساکان (**الأَحكام**) دایە و، لە قورئانی مەککەیشدا حوکمە شەرعییە دیارییکراوەکان کەمن و، ئەو حوکمە شەرعییانەش کە لە قورئانی مەککەیی دا هاتوون، نەسخیان بەسەردا نەهاتوە، یانی: ناتوانین نموونەیەك بێنینەوە لە ئایەتە مەککەییەکان، کە نەسخ کراوەتەوە، یان حوکمێك، چونکە لە قورئانی مەککەیی دا، ئەو حوکمە شەرعییانەی کە دەهاتن، چ پەیوەندییان بە بوونناسیی یەوە بووبێ، چ بە ئیمان و عەقیدەوە، چ بە عیبادەتەکانەوە، چ بە ڕەوشتەکانەوە، چ بە حەڵاڵ و حەڕامەوە، حوکمی گشتی بوون، نەك سنووردار و دیارییکراو، وەك لە قۆناغی مەدینەدا ئەو جۆرە حوکمانە هاتوونە خوار، بۆیەش ئەو حوکمە گشتییانە، پەیوەندییان بە هەر لایەکەوە بوو بێ، نەگونجاوە نەسخ و لابرانیان بێتە سەرێ.

٢/ بێگومان مەبەست لە (آية)، هەر ئایەتی خوێنراوەیە: (**الآية المَقرُوءةٌ**)، نەك موعجیزە، چونکە هەندێك لە زانایان بۆ ئەوەی خۆیان لەوە دووربخەنەوە کە نەسخ لە قورئاندا نیە و، هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نەسخ نەبۆتەوە، گوتوویانە: لێرەدا مەبەست لە ئایەت: موعجیزەو بەڵگەیە، بەڵام بۆیە ڕێی ئەوەمان نیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ ﴾، ئنجا مادام باسی دابەزاندن: (**يُنزِّل**)، کراوە، کەواتە: مەبەست پێی ئایەتی خوێنراوەیە، نەك ئایەتی موعجیزەو بەڵگە و، بە زۆر لەخۆکردن (**تَكَلُّف**)، دەگونجێ بڵێی: مەبەست موعجیزەیە، چونکە موعجیزەش هەر بە فەرمانی خوا دێ و، فەرمانەکەی خوای پەروەردگاریش لەسەرەوە دێت و دادەبەزێ!

٣ / ئەو ڕایەی زانایانیش کە گوایە ڕستەی: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾الإسراء، گوایە بە ڕستەی: ﴿ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾الحجر، نەسخ بۆتەوە، وەك (**محمد الطاهر بن عاشور**) بەهەق گوتوویەتی: ڕاست نیە، چونکە ئەو ڕێنماییانە هەموویان پەیوەستن بە قۆناغە جیاجیاکانی بانگەوازوە و، هیچیان نەسخ نەکراونەوە!

واتە: (**محمد الطاهر بن عاشور**) دەڵێ: ئەوەی کە لە کۆتایی سوورەتی: (**الإسراء**)دا، خوا دەفەرمویْ: نوێژەکەت یاخود پاڕانەوەکەت بە دەنگی بەرز مەڵێ و، زۆر بە دەنگی نزمیش مەیڵێ و، لەو نێوانەدا: ڕێیەك بدۆزەوە، واتە: با نە زۆر بەرز بێ، نە زۆر نزم بێ، گوایە بە ڕستەی: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾الحجر، یانی: بە دەنگی بەرز، ئەوەی فەرمانت پێکراوە، ڕایبگەیەنە و، پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بکە، گوایە ئەوەی (**الإسراء**) بەوەی (**الحجر**) نەسخ بۆتەوە!! ، (**محمد الطاهر بن عاشور**) قسەکەی جوانە، کە دەڵێ: ئەو ڕێنماییانە هەموویان پەیوەستن بە قۆناغە جیاجیاکانی بانگەوازەوەو، هیچیان نەسخ نەکراونەوە، قسەکەی جوانەو ئێمەش هەر ئەوەمان پێ ڕاستە.

٤ /ئەو قسەیەش کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هێنامان، باشترین تەفسیرە بۆ ئەو ڕستە قورئانییە، کە پێشتر باسمانکرد.

٥ /دەشگونجێ مەبەستی کافرەکان ئەو جۆرە ئایەتانە بووبن، بۆ وێنە:

**یەك)** خوا دەفەرمویْ: ﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ .. ﴿٥﴾ ﴾الشوری، واتە: فریشتەکان بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بۆ ئەوانەی لەسەر زەویین داوای لێبوردن دەکەن، (بۆ ئەوانەی لەسەر زەویین، واتە: بۆ هەموویان).

بەڵام لە سوورەتی (**غافر**)دا، دەفەرمویْ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... ﴿٧﴾ ﴾، ئەوانەی عەرشی خوایان هەڵگرتووەو، ئەوانەی لە دەوریشینی، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بڕوای پێ دێنن و، داوای لێبوردن بۆ ئەوانە دەکەن، کە بڕوایان هێناوە.

دەگونجێ گوتبێتیان: پێشێ دەفەرمویْ: فریشتەکان بۆ تێکڕای خەڵکی سەر زەوی داوای لێبوردن دەکەن، دوایی دەفەرمویْ: بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، ئەو دووەش تێکدەگیرێن!

بەڵام لە ڕاستییدا تێکناگیرێن، چونکە فریشتەکان ئەگەر {داوای لێبوردن کردن، بۆ مرۆڤەکان و جندیش} داوای هیدایەت و، داوای ئەوە بێ کە خوا بەزەیی بە بەندەکانی دابێ و هیدایەتیان بدات و، بەرنامەیان بۆ بنێرێ، ئەوە هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە: خوا لە گوناهیان ببوورێ و، هیدایەتی تایبەتیان بدات، بێگومان مەبەست پێی ئەوانەیە کە بڕوادارن، کەواتە: تێکگیران نیەو، هەر کامیان چەمکێکی جیاواز لەوی دیکەی هەیە.

بەڵام ڕای واش هەیە، کە نەخێر گوناهبار دەبێ و، سزای لەسەرە، چونکە ئەوە پەیوەندیی بە ئارەزوو جووڵانەوە هەیە، بەڵام ئەوانی دیکە دەڵێن: نا، جاری وا هەیە کابرا، کە دەشگونجێ ئارەزووشی بجووڵێت و، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناچارکراوە، ئنجا بە تەئکید ڕای ئەوانە ڕاسترە، کە دەڵێن: گوناهی لەسەر نیە و، سزای لەسەر نیە، چونکە ئەگەر بۆ کوفر گوتن، یان کوفرکردن مۆڵەت هەبێ، دیارە دەبێ بۆ ئەوەش، مۆڵەت هەبێ.

**برگەی شەشەم:** (**إِخْتَلَفَ العُلَمَاءُ فِي طَلَاقِ المُكْرَه وعِتاقِهِ، رَأْيُ الجُمْهُور أَنَّهُ لا يَلْزَمَهُ شَيءٌ، هَذَا رَأْي الشَّافِعِيُّ وأَصْحَابِهِ، وذَكَرهُ ابْنُ المُنْذِر، وابْنِ الزبَيْر، وابْن عُمَر، وابْنِ عَباس، وعَطَاء، وَطَاوُس، وَالحَسَن، والشُّرَيْح، وَقَاسِم، وَسالِم، وَمَالك، وَالأَوْزَاعِي، وَأَحْمَد، وَإِسْحَاق، وَأَبِي الثَّوْر، وَأَجَازَ طَائِفَةٌ طَلَاقَهُ، رُوِيَ ذَلِكَ عَنِ الشَّعْبِي، والنَّخَعِي، وَأَبِي قلابة، والزُّهري، وقَتَادَةَ، وَهو قَولُ الكُوفِيينَ، وَقَالَ أَبُو حَنِيفَةَ: طَلَاقُ المُكْرَه يَلْزَم**)[1].

واتە: ڕاجیایی لە نێوان زانایان دا هەیە، لەسەر ئەوە کە کەسێك ناچار بکرێ لەسەر تەڵاق دان، یاخود ئەگەر کۆیلەی هەبێ، ناچار بکرێ لەسەر ئازادکردنیان، ڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە: نە تەڵاقەکەی دەکەوێ، با بە تۆبزیی پێشی تەڵاق بدەن، نە بە ئازادکردنەکەشەوە پابەند دەکرێ، هەرچەندە تۆبزیی لێبکەن و کۆیلەکانی پێ ئازاد بکەن، ئەمە ڕای شافیعیی و هاوەڵاکانیەتی، (**ابْنُ المُنْذِر**) ئەو ڕایەی هێناوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە، (خوا لە خۆیان و بابیان ڕازی بێ)، هەروەها لە {(**عطاء**) و (**طاوس**) و (**حسن**) و (**شَرَيح**) و (**سالم**)ەوە، ئەوانەش هەموویان زانایانی تابیعینن}، خوا لێیان ڕازی بێ و، خوا لێیان خۆش بێ، هەروەها لە مالیك و ئەوزاعیی و ئەحمەد و ئیسحاق و ئەبی ثەورەوە، لە هەموویانەوە ئەو ڕایە هاتوە، بەڵام کۆمەڵێك گوتوویانە: تەڵاقی دەکەوێ، ئەمەش لە شەعبیی و نەخەعیی و ئەبی قولابەو زوهریی و قەتادەوە هاتوە و، قسەی کوفییەکانیشەو (**أبو حَنِيفَه**)ش، گوتوویەتی: بابای ناچارکراو، تەڵاقی دەکەوێ.

منیش دەڵێم: وایە فەرموودەی: {**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بالنِّياتِ**}[2]، واتە: کردەوەکان بەپێی نیەتن، بەڵگەیە لەسەریان و، پێم وایە قسەکەی (**القُرْطُبي**)، ڕاست و تەواوە، کەسێك نیەتی نیە، ژنەکەی تەڵاق بدات و، ناچار دەکرێ، یان نیەتی نیە، کوفر بکات و، ناچار دەکرێ، مولزەم ناکرێ و، پابەند ناکرێ بەو شتەوە، کە بە ناچاریی پێی دەکرێ و، پێی دەگوترێ.

---

(١) (الجامع لأحكام القرآن) ج ١٠، ص ١٥١.

(٢) رواه البخاري: ١، مسلم: ٩٠٧.

**برگەی حەوتەم:** (وَأَمَّا بَيْع المُكْرَه والمضْغُوطِ، فَلَهُ حَالَتَان:

الأُوْلَى: أَن يبيع مَالَهُ فِي حَق وَجب عَلَيْهِ، فَذَلِكَ مَاض سائغ لا رجُوع فيهِ عِنْدَ الفُقَهَاء، لأَنَّهُ يلزمه أَدَاء الحَقّ إِلى رَبِّه مِنْ غَيْرِ المبيع، فَلَمَّا لَمْ يفعل ذَلِكَ، كانَ بَيْعه اختياراً مِنْهُ فَلزِمَهُ.

الثانية: وَأَمَّا بَيْعُ المكره ظُلْماً أَوْ قَهْراً، فَذَلِكَ بَيْع لاَ يَجُوزُ عَلَيْهِ، وَهُوَ أَوْلى بِمَتَاعِهِ يأخذُهُ بلاَ ثَمَن، وَيُتْبِعُ المُشْتَرِيَ بالثَّمَنِ ذَلِكَ الظَّالِمَ)[١].

واتە: بەڵام زۆر لێكران، {كەسێك كە زۆری لێ دەكرێ} و، فشاری دەخرێتە سەر بۆ فرۆشتنی شتێك، ئەمە دوو حاڵەتی هەن:

**یەكەمیان:** ئەو شتە كە ناچار دەكرێ، بیفرۆشێ، بۆ هەقێك بێ، كە لەسەری پێویستە، {كابرا قەرزێكی لەسەرە، قەرزی كەسێك دێ، دەڵێ: دەبێ ئەو شتە بفرۆشی، (ئەو ماڵە، ئەو خانووە، ئەو سەیارە)، قەرزەكەم بدەیەوە}[٢]، ئەوە فرۆشتنەكەی مادام بە نرخی خۆی بێ و بەڕێ و جێ بێ، وەك شەرعزانان دەڵێن: فرۆشتنەكەی ڕەوایەو، نابێ تێیدا بگەڕێتەوە، چونكە بۆ دانەوەی هەقێك خاوەنەكەی شتەكە دەفرۆشێ، {كە قەرزاریەتی} كە بەبێ فرۆشتنیش پابەند بوو بیداتەوە، ئنجا كە ئەمەی نەكردوە، ئێستا فرۆشتنەكە بە هەڵبژاردنی خۆیەتی، مولزەمە كە ئەنجامی بدات.

**دووەمیان:** ئەوەیە كەسێك ناچار بكرێ بە فرۆشتنی شتێك، بە ستەم و ناچاركران، بێ ئەوەی هەقی كەسی لەسەر بێ، ئەو فرۆشتنە ئەو مامەڵەیەی كە بە تۆبزیی پێی دەكرێ، لەسەری تێناپەڕێ، {واتە: لەسەری حیساب ناكرێ} و، خۆی خاوەنی كەلوپەلەكەیەتی كە بە تۆبزیی پێی فرۆشراوەو، كەلوپەلەكەی خۆی، هەر كاتێك دەستی كەوت دەیباتەوە لای خۆی، بابای كڕیاریش كە پارەی پێداوە، پێی دەگوترێ: بچۆ پارەكەت لەو ستەمكارە بستێنەوە، كە كاتی خۆی شتەكەی لێ ستاندوە.

**برگەی هەشتەم:** هەر (القُرطُبي) باسی بابەتێكی دیكە دەكات، دەڵێ:

(وَأَمَّا نِكاح المُكْرَه، فَقَالَ سُحْنُون: أَجْمَعَ أَصْحَابُنا عَلَى إِبْطَالِ نِكاحِ المُكره وَالمُكْرَهَةِ، وَقَالُوا: لاَ يَجُوزُ المُقَامُ عَلَيْهِ، لأَنَّهُ لَمْ يَنْعَقِدْ، قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ سُحْنُون: وَأَجَازَ أَهْلُ العِرَاقِ نِكاحَ المُكْرَه، وَقَوْلُهُمْ خِلاَفُ السُّنّة الثَّابِتة فِي حَدِيث خَنْساءِ بنْتِ خِذَامِ الأَنْصَارِية، وَلأَمْرِهِ ﷺ بالإِستِئْمَارِ فِي أَبْضَاعِهِنَّ، فَلاَ مَعْنَى لِقَوْلِهِم)[٣].

---

(١) جامع لأحكام القرآن: ج ١٠، ص ١٥٢.

(٢) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە .

(٣) ج١٠، ص١٥٢.

واتە: بەڵام کەسێك کە بە تۆبزیی ژنێکی لێ مارە دەکرێ، یاخود ژنێك بە تۆبزیی مارە دەکرێ لە پیاوێك (**سُحْنُون**) گوتوویەتی: هاوەڵانی ئێمە هەموو یەکدەنگن لەسەر ئەوە، کە بابای ناچارکراو لەسەر هاوسەرگیریی، هاوسەرگیرییەکەی بە تاڵە، ئنجا چ پیاو بێ، بە زۆریی هاوسەرگیریی پێ بکرێ، چ ئافرەت بێ بە زۆریی بە شوو بدرێ و بە تۆبزی بەبێ ئەوەی ڕای خۆی لەسەر بێ، گوتوویانە: دروستیش نیە، لەسەر ئەو هاوسەرگیرییە بەردەوام بن، چونکە دانەمەزراوە، موحەممەدی کوڕی سوحنون، دەڵێ: بەڵام زانایانی عێراق هاوسەرگیریی بابای ناچارکراویان بە دروست داناوە، بەڵام قسەکەیان پێچەوانەی سوننەتی چەسپاوە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ، کە ئافرەتێك بە ناوی (**خَنْساء بِنْتِ خِذَام الأَنْصارِية**)یە {دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: بابم منی بە شوو داوە[1]، (واتە: منی داوە بە برازایەکی خۆی، کە دەکاتە ئامۆزای کچەکە، منیش پێم ناخۆشە)، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ئەوەی کە بابت کردوویەتی، هەڵمانوەشاندەوە}[2]، هەروەها لەبەرئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە، کە ئافرەتان ڕاوێژیان پێ بکرێ، دەربارەی بەشوودانیان و، هاوسەرگیرییان، بۆیە قسەکەیان هیچ مانایەکی نیە. {واتە: قسەی عێراقییەکان کە مەبەستی پێی مەزهەبی ئەبوو حەنیفەیە، هیچ واتایەکی نیە بگوترێ: کەسێك بە زۆریی هاوسەرگیری پێ کرابێ، هاوسەرگیرییەکەی لەسەر دەچەسپێ}.

ئەوە بە نسبەت ئەصڵی هاوسەرگیریی.

(**فَإِنْ وَطِئَهَا المُكْرَهُ عَلَى النِّكاحِ غَيْرَ مُكرهٍ عَلَى الوَطءِ وَالرِّضَا بالنِّكاحِ، لَزِمَهُ النِّكاحُ عِنْدَنا عَلَى المُسْمَّى مِنَ الصَّدَاقِ وَدُرِئَ عَنْهُ الحَدُّ، وَإِنْ قَالَ: وَطِئْتُها عَلَى غَيْرِ رِضَاً مِنِّي بالنِّكاحِ، فَعَلَيْهِ الحَدّ وَالصَّدَاق المُسَمَّى، وَتُحَدُّ المَرْأَةُ إِنْ أَقْدَمَت وَهِيَ عَالِمَة أَنَّهُ مُكْرَهٌ عَلَى النِّكاحِ، وَأَمَّا المُكرهَة عَلَى النِّكاحِ وَعَلَى الوَطءِ، فَلاَ حَدَّ عَلَيْهَا وَلَهَا الصَّدَاقُ، وَيُحَدُّ الوَاطِئُ**)[3].

واتە: ئنجا ئەگەر کەسێك کە ناچار کراوە لەسەر هاوسەرگیریی، {ئەگەر پیاوە، ئەگەر ئافرەتە}، ئەگەر چووە لای ئافرەتەکە و، لەگەڵی جووت بوو، بەڵام بۆ لەگەڵی جووت بوونەکە زۆری لێنەکرابوو، دواییش کە زۆری لێکرا، لەسەر هاوسەرگیرییەکە، ڕازی بوو بوو، ئەوە ئەو هاوسەرگیرییەی لەسەر حیساب دەبێ و، دەچێتە ئەستۆیەوەو، دەبێ ئەو ئەندازە

---

(١) {عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَدَّ نِكَاحَهُ} أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٤٨٤٥.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٣) ج ١٠، ص١٥٣.

مارەییەی کە ناوی هێنراوە، بیدات بە ئافرەتەکە، مارەییەکەشی دەکەوێتە ئەستۆ، بەڵام سزای لەسەر لادەچێ، بەڵام ئەگەر پیاوەکە بڵێ: من لەگەڵی جووت بووم، بەبێ ئەوەی کە من خۆم بە هاوسەرگیرییەکە ڕازی بم، (واتە: بە هاوسەرگیرییەکە ڕازی نەبووم، بەڵام بە ویستی خۆم لەگەڵی جووت بووم)، ئەوە سزاشی لەسەرە و، دەبێ مارەییەکەش بدات، هەروەها ئافرەتەکەش ئەگەر زانیبێتی: ئەو پیاوە ناچارکراوە لەسەر هاوسەرگیریی، بەڵام ئافرەتەکە خۆی دەست پێشخەر بێ بۆ جووت بوون، ئەویش دیسان سزا دەدرێ، {سزای شەرعیی دەکەوێتە سەرێ}، بەڵام ئافرەتێك کە ناچارکرا بێ لەسەر هاوسەرگیریی و، دواییش ناچارکرا بێ لەسەر جووت بوون، ئەوە سزای لەسەر نیە، بەڵام مارەیی خۆی دەکەوێ و، ئەو کەسەش کە لەگەڵی جووت بووە، دەبێ سزا بدرێ.

منیش هیچ ئیشکالێکم لەسەر ئەو ڕایە نیە و، پێم وایە لەگەڵ دەقەکان و ڕووحی شەریعەت دا، چاك دێتەوە.

**برگەی نۆیەم: ئافرەت ئەگەر بە زۆر زینای لەگەڵ بکرێ، سزای لەسەر نیە، لەبەر فەرمموودەی خوا: ﴿ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ ﴾، ئنجا ئەگەر لەسەر کوفر ناچار بکرێ، بۆی هەبێ کوفر بڵێ و، سزای لەسەر نەبێ، بێگومان ئەگەر ناچاریش بکرێ، زینای لەگەڵ بکرێ، سزا نادرێ:**

لەبەرئەوەی خوا لە سوورەتی (النور)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: کچەکانتان (کە لێرەدا مەبەست پێی کەنیزەکەکانە)، ئەگەر ویستیان خۆیان پاك ڕابگرن، ئێوە ناچاریان مەکەن، لەسەر داوێن پیسیی و، هەر کەسێك ناچاریان بکات، بێگومان خوا دوای ناچارکرانیان، لێبووردەی میهرەبانە.

هەڵبەتە خوا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە ئەوان داوێن پاکییان دەوێ و خۆ پاکڕاگرتنیان دەوێ، ئێوە داوێن پیسییان پێ مەکەن، بە ناچاریی، مانای وانیە کە ئەگەر ئەوان خۆیان بەدوای داوێن پیسییدا گەڕان، ئێوەش داوێن پیسییان پێ بکەن! نا، بەڵکو ئەمە بۆ دەرخستنی ناقۆڵایی و ناشیرینی هەڵوێستی کەسێکە، کە کەنیزەکەکەی خۆی، لە حاڵێکدا کە دەیەوێ خۆی پاك ڕاگرێ، کەچی ئەو ناچاری دەکات لەسەر داوێن پیسیی، بۆ ئەوەی ناشیرینی و ناقۆڵایی هەڵوێستەکەی ئەو دەربخات، ئەگەرنا بێگومان ئەوان ئەگەر نەشیانەوێ خۆیان پاك ڕابگرن، خاوەنەکەیان هەر بۆی نیە، داوێن پیسییان پێ بکات.

هەروەها لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّـهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي: الْخَطَأَ، وَالنّسْيانَ، وَمَا استكرهُوا عَلَيْهِ} (أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَهْ: ٢٠٤٣، وَصَحَّحَهُ الألباني في «صحيح الجامع»: ١٧٣١).

واتە: خوا چاوپۆشیی کردوە لە ئوممەتم، لەسەر شتێك كە بەهۆی هەڵەوە، یان بەهۆی لەبیرچوونەوەوە، یاخود بە ناچاریی پێیان دەکرێ، ئەنجامی بدەن.

(القُرطُبي) دەڵێ: (والعُلَمَاءُ مُتَّفِقُونَ عَلَى أَنَّهُ لاَ حَدَّ عَلَى امْرَأَةٍ مُستكرهة)[1]، واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن: کە ئافرەتێك زۆری لێکرابێ، سزای لەسەر نیە، واتە: زۆری لێکرابێ بۆ داوێن پیسیی.

**برگەی دەیەم:** (وَاخْتَلَفُوا فِي وُجُوبِ الصَّدَاقِ لِلْمُسْتَكْرَهَةِ: فَقَالَ عَطَاءُ وَالزُّهْرِيُّ: لَهَا صَدَاقُ مِثْلِهَا، وَهُوَ قَوْلُ مَالِك وَالشَّافِعي وَأَحْمد وَإِسْحَاق وَأَبِي ثَورِ، وَقَالَ الثَّوْرِيُّ: إِذَا أُقِيم الحَدُّ عَلَى الَّذِي زَنَى بِهَا بَطَلَ الصَّدَاقُ، وَرُوِيَ ذَلِكَ عَنِ الشعبي، وَبِهِ قَالَ: أَصْحَابُ مَالِك وَأَصْحَابُ الرَّأْيِ، قَالَ: ابْنُ المُنْذِر: القَوْلُ الأَوَّل: صَحِيحٌ).

واتە: زانایان ڕاجیان لەسەر ئەوە کە: ئایا ئافرەتێك ناچارکرا بێ لەسەر زینا، مارەیی دەکەوێ و، بۆی پێویست دەبێ یان نا؟ (عَطَاء والزُّهْرِي) دەڵێن: مارەیی هاو وێنە (مهر المثل)ی هەیە، (واتە: هاو وێنەی ئەو لە خزمانی کە هاوکوفی ئەون، چەندیان مارەیی بۆ دانراوە ئەویش دەبێ ئەوەندەی پێ بدرێ)، ئەمە قسەی (مالیك و ئیسحاق و شافیعیی و ئەحمەد و ئەبوو ئەورە)، بەڵام (الثوري) دەڵێ: ئەگەر ئەو کەسە کە زینای کردوە، لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا، کە ناچار کراوە، سزادرا، ئەو کاتە مارەییەکەش بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە سزای خۆی وەرگرتوە، ئەمە لە (الشعبي)یشەوە گێردراوەتەوەو، هاوەڵانی مالیك و خاوەنانی ڕەئیی، {واتە: ئەبوو حەنیفەو هاوەڵانی ڕەحمەتی خوایان لێ بێ}، ئەوانیش هەر بۆچوونیان وایە، بەڵام (إِبْنُ المُنْذِر) دەڵێ: قسەی یەکەم ڕاستە.

کەواتە: دەبێ بابای زیناکار بە زۆرکردن لە ئافرەتەکە، سزا بدرێ و، دەبێ مارەییش بدات بە ئەو ئافرەتەی بە زۆر زینای لەگەڵ کردوە.

**برگەی یازدەیەم:** (إِذَا أُكرِهَ الإِنْسَانُ عَلَى إِسْلاَمِ أَهْلِهِ لِمَا لَمْ يَحِلّ، أَسْلَمَهَا، وَلَمْ يَقْتُلْ نَفْسَهُ دُونَهَا، وَلاَ احْتَمَلَ أَذِيةً فِي تَخْليصها، وَالأَصْلُ فِي ذَلِكَ مَا خَرَّجَهُ البُخَارِيُّ:

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج ١٠، ص١٥٣.

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَاجَرَ إِبْرَاهِيمُ بِسَارَةَ، وَدَخَلَ بِهَا قَرْيَةً فِيهَا مَلِكٌ مِنَ الْمُلُوكِ، أَوْ جَبَّارٌ مِنَ الْجَبَابِرَةِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنْ أَرْسِلْ إِلَيَّ بِهَا، فَقَامَ إِلَيْهَا، فَقَامَتْ تَتَوَضَّأُ وَتُصَلِّي، فَقَالَتْ: أَللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ آمَنْتُ بِكَ وَبِرَسُولِكَ، فَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيَّ الْكَافِرَ، فَغُطَّ حَتَّى رَكَضَ بِرِجْلِهِ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٦٨٣٠، وَمُسْلِم: ١٦٩١)**[١].

واتە: ئەگەر كەسێك ناچار كرا: هاوسەری خۆی تەسلیم بكات بە كەسێكی دیكە، بۆ شتێك كە ڕەوا نیە، {مەبەستی پێ ئەوەیە: كە لەگەڵی ڕابوێرێ و داوێن پیسی لەگەڵ دا بكات}، ئەوە دەبێ تەسلیمی بكات، ئەگەر ناچار كراو، لەسەری پێویست نیە، خۆی بەكوشت بدات، {وەك بەرگریی لێكردنی} هەروەها لەسەریشی پێویست نیە، كە خۆی تووشی ئازارو ئەشكەنجە بكات، بۆ ئەوەی دەربازی بكات، بەڵگەو بناغەش لەوەدا ئەوەیە، كە بوخاریی هێناویەتی:

ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیبراهیم كۆچی كردو، سارای لەگەڵ خۆی بردو، چووە ئاوەدانییەكەوە كە پادشایەكی لێبوو، لە پادشایان (یاخود ستەمكارێك لە ستەمكارەكان)، وەڵامی بۆ ئیبراهیم نارد: ئەو ئافرەتەم بۆ بنێرە، ئەویش بۆی نارد (سارای بۆ نارد)، كابرا هەڵسا بۆی {واتە: هەڵسا بۆ سارا، دیارە بۆ خراپە لەگەڵ كردنی}، ساراش هەڵسا دەست نوێژی گرت و دەستی كرد بە پاڕانەوە، گوتی: ئەی خوایە! ئەگەر من بڕوام بە تۆ و بە پێغەمبەرەكەت هێناوە، ئەم كافرەم بەسەردا زاڵ مەكە، {مەهێڵە دەستدرێژیم لێ بكات}، ئیدی كابرا لە هۆش خۆی چوو، كەوتە پەلەكوتە.

(**القرطبي**) زۆربەی حوكمە شەرعییەكان لە (**إبن العربي**) وەردەگرێ، ئنجا ئەم بەسەرهاتە (**إبن العربي المالكي**) لە كتێبی: (**أحكام القرآن**)دا[٢]، ئەویش هێناویەتی.

بەڵام من دەڵێم: بە هیچ جۆرێك ئەوەم ناچێتە عەقڵ و دڵەوەو، بە زۆر لەخۆكردنیش پێم هەزم ناكرێ و، پێم وایە ئەم[٣] حوكمە، پێچەوانەی كۆی ئەو ئایەت و فەرموودانەیە كە فەرمان بە مرۆڤی بڕوادار دەكەن خاوەنی عیززەت بێ و، ملكەچیی قبووڵ نەكات و، زەبوونیی قبووڵ نەكات، ئەدی چۆن كەسێك تەعدای ناموسی لێ بكرێ! (**القرطبي**)یش

---

(١) جامع لأحكام: ج ١٠، ص ١٥٣.

(٢) ج ٣، ص ١٦٥.

(٣) ئەو حوكمەی (القرطبي) لە (ابن العربي) یەوە هێناویەتی.

بڵێ: لەسەری پێویست نیە، کە نەك خۆی لەنێو ببات، بەڵکو خۆی تووشی ئەزیەتیش بکات بۆ دەربازکردنی !!، بە ڕاستیی ئەمە قسەیەکی بێجێیەو، زۆریشم پێ سەیرە کە هەم (**إبن العربي**) هێناویەتی، هەم (**القرطبي**)یش! دواییش هەم ئەوانەی کە کتێبەکەی (**إبن العربي**)یان چاپ کردوە، هەم ئەوانەی کە تەفسیرەکەی (**القرطبي**)یان چاپ کردوە، واتە: (**مُحَقِّق**)ەکان، هیچ تەعلیقیان لەسەر ئەو قسەیە نەداوە !! کە بێگومان ئەوە حوکمێکی بێجێیە، ئنجا ئەوە کە بەسەرهاتەکەی ئیبڕاهیم دەکەنە بەڵگەی ئەو قسەیە، لەوبارەوە دەڵێم: یان دەبێ ئەو دەقە لە بنەڕەتەوە ڕەد بکەینەوەو بڵێین: پێغەمبەر ﷺ شتی وای نەفەرمووە، یان بڵێین ئیبڕاهیم عليه السلام بەڵێ چووە بۆ میسر - چونکە ئەو شوێنە مەبەست پێی میصرە، وەك لە بەسەرهاتی ئیبڕاهیمدا بە تەفصیل باسمان کرد -، هەروەها ساراخانیشی پێ بووەو، دەشگونجێ ئەو ستەمکارەش لە دوای نارد بێ، بەڵام خوا ﷻ دڵنیای کردۆتەوە کە سارا سەلامەت دەبێ و، سەربەرزانە دەردەچێ، بەڵکو بۆ ئیبڕاهیمیش بە خێر دەگەڕێ، کە (**هاجر**)یش وەك دیاریی و خەڵاتێك دەدات بە (**سارا**) و، دواییش لە (هاجەر)ە ئیسماعیلیشی دەبێ، واتە: ئیبڕاهیم عليه السلام دەبێ دڵنیا بووبێ لەوە، ئەگەرنا نە لە ئیبڕاهیم، نە لە مسوڵمانێکی عادەتیش ناوەشێتەوە، چ جای لە (**خليل اللَّـه**)!! کە بزانێ کەسێك تەماعی لە هاوسەری کردوە، کەچی - بەبێ دڵنیایی پێدان لەلایەن خواوە کە سەلامەت دەبێ - هیچ کاردانەوەیەکی نەبێ !

بۆیە بەڕاستیی زۆر لەسەر دڵم قورسە، کە مرۆڤ شتێکی ئاوا لەو تەفسیرانەدا دەبینێ، کە زانایانیش نەقڵیان کردوە، جیل بە جیل، تاکو گەیشتۆتە دەستی ئێمە، وەك گوتم: ئەوانەش کە تەفسیری (**القرطبي**)یان تەحقیق کردوە، هیچ هەڵوەستەیەکیان لە بەرانبەریدا نەبووە، هەروەها ئەوانەی (**أحكام القرآن**)ی (**إبن العربي**)شیان چاپ و تەحقیق کردوە، هیچ هەڵوەستەیەکیان لە بەرانبەر ئەو قسەیەدا نەکردوە !! کە بێگومان ئەو قسەیە شتێکی پێچەوانەیە لەگەڵ ڕووحی شەریعەتداو، لەگەڵ پایەی بەرزی پێغەمبەراندا (**عليهم الصلاة والسلام**) ئنجا ئیبڕاهیم عليه السلام ئەگەر بەرگریی لە هاوسەرو نامووسی خۆی نەکات و، لەسەری خۆی نەخاتە ئەزیەتیشەوە، چ جای خۆی بە کوشت بدات! پێموایە ئەوە ڕێك پێچەوانەی عیززەت و جوامێریی و نەفس بەرزییە، کە بۆ هەر بڕوادارێك پێویستە، چ جای بۆ پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**).

**بڕگەی دوازدەیەم:** باسی سوێند دەکات و، دەڵێ:

(وَأَمَّا يَمِينِ المُكرَه فَغيرُ لازِمَة عِنْدَ مَالِك والشَّافِعِي وَأَبِي ثَور وَأَكْثَرُ العُلَمَاء، سَوَاءٌ حُلِّف عَلَى مَا هُو طَاعَةٌ أَو مَعْصية، وَقِيلَ: إنْ حُلِّفَ مُكْرَهاً عَلَى مَا هُوَ مَعْصِية، أَو لَيْسَ فِيهِ طَاعَةٌ وَلاَ مَعْصِيةٌ فيهِ، ساقِطةٌ، وَإنَّ أُكرِهَ عَلَى اليَمِينِ، فِيمَا هُوَ طَاعَةٌ، مِثْلُ أَنْ يَأخُذ الوَالِي رَجُلاً فَاسِقاً فَيُكرِهَهُ عَلَى أَن يَحْلِفَ بالطَّلاَقِ: لا يَشْرَبُ خَمْراً، وَلاَ يَفسُقُ، وَلاَ يَغُشُّ فِي عَمَلِهِ، أَو الوالد يُحَلِّفُ وَلَدَهُ تَأْدِيباً لَهُ، فَإِنَّ اليَمِين تَلْزَمُ، قَالَ ابْنُ العَرَبِي: وَمِنْ غَرِيبِ الأَمْر أَنَّ عُلَمَاءَنا اخْتَلَفُوا فِي الإكراهِ عَلَى الحِنْثِ هَلْ يَقَعُ بِهِ، أَم لاَ؟ وَهَذِهِ مَسأَلَة عِرَاقِية سَرَتْ إلَينا مِنهُم... أَيُّمَا فَرْقٍ يا مَعْشَرَ أَصْحَابنا! بَيْنَ الإكراهِ عَلَى اليَمِينِ فِي أَنَّهَا لا تَلْزَمُ، وَبَيْنَ الحِنْثِ فِي أَنَّهُ لاَ يَقَعُ! فَاتَّقُوا اللَّه وَرَاجِعُوا بصائِرَكُمْ، وَلاَ تَغْتَرُّوا بهَذِهِ الرِّوَايةِ، فَإِنَّهَا وَصْمَةٌ فِي الدِّرَايةِ).

واتە: بەڵام سوێندی بابای ناچارکراو، کە بە زۆر سوێند دەدرێ، (پێی بگوترێ: سوێند بخۆ کە دەبێ ئاوا بکەی، یان سوێند بخۆ کە ئاوا ناکەی)، سوێندەکەی ناکەوێتە سەرو پێوەی پابەند ناکرێ لە لای: (مالك والشافعي وأبو الثور)و زۆربەی زانایان، یەکسانە ئەو سوێند پێ خورانە، لەسەر شتێك بێ، کە فەرمانبەرییە بۆ خوا و، لە سنووری شەرعدا دەبێ، یاخود شتێك بێ کە سەرپێچیی بێ، بەڵام هەندێك گوتوویانە: ئەگەر لەسەر شتێك سوێند درا بە ناچاریی کە گوناهە، یان شتێك بێ نە فەرمانبەریی بێ نەگوناهـ بێ، ئەوە سوێندەکەی ناکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر لەسەر شتێك ناچار کرا، سوێند بخوا، کە فەرمانبەرییە، بۆ وێنە: حوکمڕانێك پیاوێکی خراپەکار ناچار بکات کە سوێند بە تەڵاق بخوات: شەڕاب ناخواتەوە لەمەودوا، یاخود زینا ناکات، یاخود لەو کارەی کە پێی دەسپێردرێ، خیانەت و موخەننەتیی ناکات، یاخود باب ئەگەر منداڵەکەی خۆی سوێند بدات {کوڕ بێ، یان کچ بێ} بۆ ئەوەی تەمبێ (تأديب)ی بکات، ئەوە سوێندەکەیان دەکەوێتە سەر.

(إبن العربي) لە (أحكام القرآن)ەکەی خۆیدا کە (القرطبي) لێیەوە دەخوازێتەوە[1]، دەڵێ: شتێکی سەیر هەیە لێرەدا کە هەندێ لە زانایانمان ڕاجیاییان هەیە، لەوەدا کە کەسێك ناچار بکرێ لەسەر سوێند شکاندن، (سوێندی خواردوە لەسەر شتێ، ناچار بکرێ و سوێندەکەی بشکێنێ) ئایا سوێند شکاندنەکەی دەکەوێ، یان ناکەوێ؟ ئەمە مەسەلەیەکی عێراقییە، {واتە: لە ئەبوو حەنیفەو هاوەڵانیەوە} بۆ ئێمە هاتوە، ئەگەرنا

(١) ج ١٠، ص ١٥٤.

ئـەی هاوەڵانمـان! (واتـە: ئـەی شـوێنکەوتووانی مەزهـەبی مالیـك !)، جیاوازیـی چیـە لـە نێـوان ئـەوەدا کـە ئینسـان ناچـار بکـرێ لەسـەر سـوێند کـە پێیـەوە پابەنـد نەکـرێ، یاخـود پابەنـد بکـرێ، یـانی: لەسـەر شـکاندنی سـوێندەکەی: کـە ئایـا دەکـەوێ، یـان ناکـەوێ ؟

{منیـش دەڵێـم: قسـەکەی جوانـە: مـادام ڕاتـان وابـێ کـە: ئەگـەر ناچـار بکـرێ سـوێند بخـوات سـوێندەکەی نەکەوێتـە سـەر، دەبـێ ئەگـەر ناچاریـش بکـرێ تاکـو سـوێندێکی بشـکێنێ ئەنجامەکـەی نەکەوێتـە سـەرو پێویسـتی نەدەکـرد ڕاجیایـی بکـەن}، ئنجـا پارێـز لـە خـوا بکـەن و چـاو بـە عەقڵـی خۆتانـدا بگێڕنـەوەو، بـەو ڕیوایەتـە فریـو مەخـۆن، چونکـە ئـەوە پەڵەیـە بـە عەقـڵ و تێگەیشـتنەوە.

واتـە: وەرگرتنـی ئـەو ڕیوایەتـە، نوقسـانییە لـە عەقڵـی کەسـێکدا کـە بـڕوا بـە ڕیوایـەت و قسـەی ئـاوا دەکات، قسەکەشـیم پـێ جوانـە: چونکـە جیاوازیـی لـە نێـوان سـوێند پێخـوران بـە ناچاریـی و، بـە تۆبزیـی سـوێند پـێ شـکێنران دا نیـە.

**برگـەی سـیێزدەیەم:** (**إِذَا أُكـرِهَ الرَّجُـلُ عَـلَى أَنْ يَحْلِـفَ، وَإِلاَّ أُخِـذَ لَـهُ مَـالٌ، كَأَصْحَـابِ المَكْـسِ وَظَلَمَـةِ السُّعَاة وَأَهْل الإِعْتِـدَاء، فَقَـالَ مَالِكُ: لاَ تَقِيَّـةَ لَـهُ فِي ذَلِـكَ، وَإِنَّمَـا يَـدْرَأُ المَـرْءُ بِيَمِينـهِ عَـنْ بَدَنِـهِ لاَ مَالَـهِ، وَقَـالَ ابْـنُ المَاجشـون: لاَ يَحْنُـثُ وَإِنْ دَرَأَ عَـنْ مَالِـهِ، وَلَـمْ يَخَـفْ عَـلَى بَدَنِـهِ، وَقَـالَ ابْـنُ القَاسِـم بِقَـوْلِ مُطْـرَف، وَرَوَاهُ عَـنْ مَالِـك، وَقَالَـهُ ابْـنُ عَبْدالحَكَـم وَأَصْبَـغ، وَقَـوْلُ ابْـنُ المَاجشـون صَحِيـحٌ، لأَنَّ المُدَافَعَـة عَـنِ المَـالِ كَالمُدَافَعَـةِ عَـنِ النَّفْـس، وَهُـوَ قَـوْل الحَسَـنِ وَقَتَـادَة**).

واتــە: ئەگـەر پیاوێـك ناچارکـرا لەسـەر ئـەوەی کـە سـوێند بخـوات، دەنـا ماڵێـکی لـێ بسـتێنرێ، بـۆ وێنـە: ئەوانـەی کـە گومـرگ بـە زۆر دەسـتێنن، یـان ئەوانـەی بـە زۆر زەکات کـۆ دەکەنـەوە، یـان ئەوانـەی بـە زۆری دەسـتدرێژیی دەکەنـە سـەر کەسـێك {دەڵێـن: ئـەو سـوێندەمان بـۆ نەخـۆی ئـەو ماڵـەت لـێ دەسـتێنین}، (مالیـك) گوتوویـەتی: لـەوەدا نابـێ سـوێند بخـوات و، دەبـێ ماڵەکەییـان بداتـێ، چونکـە سـوێند خـواردنی بـە ناچاریـی، تەنیـا بـۆ ئـازار دوورخسـتنەوە لـە جەسـتەی، یاخـود مەترسـیی مـەرگ لـە خـۆی دووربخاتـەوە، ڕەوایـە، نـەك لـە مـاڵ و سـامانەکەی، بـەڵام (**إبـن الماجشـون**) دەڵـێ: ئەگـەر سـوێندیشی بـە ناچاریـی پێ بخـورێ بـۆ بەرگریـی کـردن لـە مـاڵ و سـامانەکەی، گوناهبـار نابـێ و، سـوێندیشی ناکەوێتـە سـەرێ، بـا لـە جەسـتەی خۆیـشی نەترسـێ، (**إبـن القاسـم**)یش هـەروەك موتـڕەف قسـە دەکات { کـە یەکێکـە لـە زانایـان} و، لـە مالیکیشـەوە گێڕاویەتـەوەو، (**إبـن عبدالحکـم**) و (**أصبـغ**) یـش، هەروایـان گوتـوە، (**القرطبي**)ش دەڵـێ: قسـەی (**إبـن الماجشـون**) ڕاسـتە، چونکـە بەرگریـی

کردن لە ماڵ و سامان، وەك بەرگریی کردنە لە نەفس و، ئەمە قسەی حەسەنی بەصڕایی و قەتادەشە، ڕەحمەتی خوایان لێبێ.

ئنجا لەوبارەوە ئەم فەرمووودەیەش دێنێ: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قَالَ: قَاتِلْهُ، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: فَأَنْتَ شهِيدٌ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: هُوَ فِي النَّارِ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ١٤٠).

واتە: ئەبوو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر پیاوێك هات ویستی ماڵ و سامانەکەم لێ بستێنێ چی بکەم؟ فەرمووی: ماڵ و سامانەکەتی مەدەیە، گوتی: ئەدی ئەگەر جەنگی لەگەڵ کردم؟ فەرمووی: تۆش شەڕی لەگەڵ بکە، گوتی: ئەدی ئەگەر ئەو منی کوشت؟ فەرمووی: تۆ شەهیدی، گوتی: ئەدی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: ئەو لە ئاگردایە، (واتە: ئەو بە هیلاك دەچێ).

کەواتە: ئەم فەرمایشتە ئەوە یەکلایی دەکاتەوە، کە لە بڕگەی سێزدەیەمدا هات و، مرۆڤ بە هەر جۆرێك ناچار بکرێ، چ لەسەر شتێك زیانی جەستەی تێدا بێ، چ زیانی ماڵیی تێدا بێ، ناچێتە ژێر باری ئەو ناچارکرانەو هیچی ناکەوێتە سەر، با سوێندیشی لەسەر خوارد بێ، یان سوێندیشی لەسەر شکاند بێ.

**بڕگەی چواردەیەم:** (أَجْمَعَ العُلَمَاءُ عَلَى أَنَّ مَنْ أُكرِهَ عَلَى الكُفرِ، فَاخْتَارَ القَتْلَ، أَنَّهُ أَعْظَمُ أَجْرَاً عِنْدَ اللَّهِ مِمَّن اخْتَارَ الرُّخْصَةَ، وَاخْتَلَفُوا فِيْمَن أُكرِهَ عَلَى غَيْرِ القَتْلِ، مِنْ فِعْلِ مَا لاَ يَحِلُّ لَهُ، وَهَذَا الحَدِيث دَلِيل مَنْ رَأَى أَنَّ العَزِيمَةَ وَاجِبٌ أَو أَفْضَل فِي الأَقَل: عَنْ خَبابِ بْنِ الأَرَتِّ ﷺ، قَالَ: شَكَوْنا إِلَى رسولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ متوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظِلِّ الكَعْبةِ، فقُلْنا: أَلاَ تَستنْصِرُ لَنا، أَلاَ تَدْعُو لَنا؟ فَقَالَ: قَدْ كانَ مَنْ قَبْلَكُمْ يُؤْخَذُ الرَّجُلُ فَيُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهَا، ثُمَّ يُؤْتَى بالمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ، فَيُجْعَلُ نصفَينِ، وَيُمْشَطُ بِأمْشَاطِ الحَدِيدِ، مَا دُونَ لَحْمِهِ وَعَظْمِهِ، مَا يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَاللَّهِ لَيُتِمَّنَّ اللَّهُ هَذَا الأَمْر، حَتَّى يَسيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَموتَ، لاَ يَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ وَالذِّئب عَلَى غَنَمِهِ، وَلَكِنَّكُمْ تَستعجِلُونَ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٣٦١٢).

واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ئەگەر کەسێك لەسەر کوفر ناچار بکرێ، ئەویش ئەوە هەڵبژێرێ کە بکوژرێ، بەڵام کوفر نەکات، ئەوە پاداشتی لەلای خوا زۆر مەزنترە، لە کەسێك کە مۆڵەت وەردەگرێ و، کوفر دەکات و خۆی دەرباز دەکات، بەڵام

کەوتوونە ڕاجیایی لە: جگە لە کوشتندا، ئەنجامدانی کارێك کە بۆی حەڵاڵ نیە، (واتە: ئەگەر بڵێن: زینا بکە، یان دزیی بکە، شتێك بکە کە گوناه بێ، بەڵام کوفر نەبێ)، ئایا وا باشە گوناهەکە نەکات و بکوژرێ، یاخود بۆ ئەوەی کوشتن لە خۆی دووربخاتەوە، گوناهەکە بکات؟ لەوەدا ڕاجیاییان هەیە، ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کارکردن بە عەزیمەت و وەرنەگرتنی مۆڵەت باشترە، بەلای کەمەوە.

خەببابی کوڕی ئەڕەت ﷺ دەڵێ: سکاڵامان بردە لای پێغەمبەر ﷺ کە لەو کاتەدا پاڵی وە بوردەیەکی دابوو، لە سێبەری کەعبەدا (عەبایەکەی کە بەسەر شان دادەدرێ، خڕی کردۆتەوە، وەك سەرینێك)، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا داوای یارمەتییمان بۆ لە خوا ناکەی، ئایا بۆمان ناپاڕێیەوە؟ ئەویش فەرمووی: لە (ئۆممەتەکانی ) پێش ئێوەدا پیاوی وا دەهێنرا، چاڵێکی لە زەوی بۆ هەڵدەقەنرا، لەو چاڵەدا دادەنرا، دوای مشار دەهێنرا لەسەر سەری دادەنراو، بە مشار لەتیان دەکرد، دەیانکردە دوو بەش، هی واش هەبوو کە بە شانەی ئاسن گۆشت و ئێسقانیان لێك جیادەکردەوە، {ئەشکەنجەدانێکی زۆر خراپ}، کە چی ئەوە لە ئایینەکەی هەڵینەدەگێڕایەوە، سوێند بە خوا، خوا ئەم ئایینە تەواو دەکات، تاکو سوارێك لە صەنعاوە دەچێتە حەزرەمەوت {ئەوانە دوو دەڤەری لێك دوورن و هەردووکیان لە یەمەنن} جگە لە خوا لە کەس ناترسێ و، مەگەر مەترسیی گورگیشی هەبێ لە مەڕەکەی، {واتە: ئاوا هێمنیی و ئاسایش سەقامگیر دەبێ}، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.

هەروەها ئەو ڕووداوەی موسەیلیەی درۆزن کە پێشتر هێنامان و (**القرطبي**)یش بە ژمارە: (٣٦٩٨)، هێناویەتی، ئەویش بەڵگەیە.

دوایی (القرطبي) دەڵێ: (**وَهَذِهِ حُجَّةُ مَنْ آثَرَ الضَّرْبَ وَالقَتْلَ وَالهَوَانَ عَلَى الرُّخْصَةِ وَالمُقَامِ بِدَارِ الجنان**).

واتە: ئەمە بەڵگەی ئەو کەسەیە کە لێدران و کوژران و سووکایەتیی پێکران، هەڵدەبژێرێ، بەسەر ئەوەدا کە مۆڵەت وەربگرێ، بۆ ئەوە کە نیشتەجێ بێ لە مەنزڵگای پڕ باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزاری بەهەشتدا.

واتە: ئەوە هەڵدەبژێرێ کە بەهۆی هەڵبژاردنی عەزیمەتەوە، لەوێدا نیشتەجێ بێ، نەك کار بە مۆڵەت بکات.

**برگەی پازدەیەم: سنووری زۆر لێکران:**

(القرطبي) دەڵێ: (**وَاخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ فِي حَدِّ الإِكْراهِ: فَرُوِيَ عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: لَيْسَ الرَّجُلُ آمِنٌ عَلَى نَفْسِهِ إِذَا أَخَفْتَهُ أَو أَوْثَقْتَهُ أَو ضَرَبْتَهُ، وَقَالَ النَّخَعِيُّ: القَيْدُ إِكراه، والسِّجْن إِكراه، وَهَذَا قَوْلُ مَالِك، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: وَالوَعِيدُ المَخُوف إِكراه، وَإِنْ لَمْ يَقَعْ، إِذَا تَحَقَّقَ ظُلْمُ ذَلِكَ المُتَعَدِّي وَإِنْفَاذُهُ، لِمَا يَتَوَعَّد بِهِ**)[1].

واتە: زانایان ڕایان جیایە لە بارەی سنووری زۆر لێکرانەوە، لە عومەرەوە ﷺ، گێردراوەتەوە گوتوویەتی: کەسێك لەخۆی ئەمین نەبێ {بکوژرێ}، ئەگەر بترسێنرێ، یاخود بگیرێ، یاخود لێی بدرێ.

{یانی: مادام لەخۆی دڵنیا نەبێ، هەر کامێك لەوانە: گیران و ترسێنران و لێدران، ئەوە بە زۆر لێکران دادەنرێ}.

(**النخعي**)ش گوتوویەتی: کەلەپچە کران، هەروەها گیران و زیندانیی کران، بە زۆر لێکران دادەنرێن، ئەمە قسەی مالیکیشە، بەڵام مالیك گوتوویەتی: هەروەها هەڕەشەلێکرانێکی مەترسییداریش، بە زۆرلێکران دادەنرێ، با ئەو شتەی هەڕەشەی پێ دەکات جارێ نەقەومابێ، مادام دڵنیا بێ لەوەی کە ئەو دەستدرێژکارە کە هەڕەشەکە دەکات، هەڕەشەکە جێبەجێ دەکات.

واتە: پێی بڵێ: ئەگەر ئەوە نەکەی، دەتکوژم، با جارێ هیچیشی لێ نەکردبێ، مادام دڵنیابێ لەوەی کە ئەنجامی دەدات، ئەوە بە زۆرلێکران دادەنرێ.

منیش ئەو قسەیەم پێ ڕاستە، کە مەرج نیە مرۆڤ بە کردەوە هێنرابێتە سەر کوژران، بەڵکو هەڕەشە لێکران، یاخود ئەو جۆرە فشار لێکرانانەی دیکە، ئەوانەش بە زۆر لێکران دادەنرێن.

بەڵام بێگومان ئەوەش هەر لە جێی خۆیەتی، کە مرۆڤ ئیش بە عەزیمەت بکات، باشترە لەوەی ئیش بە مۆڵەت بکات، ئنجا ئیشکردن بە مۆڵەتیش - وەك زۆربەی زانایان گوتوویانە - بۆ هەموو کەس نیە، هەرچەندە (**القرطبي**) باسی نەکردوە، بەڵام لە شوێنەکانی دیکەدا هاتوە، کە کەسێك خەڵك چاوی لێ بکات و پێشەواو پێشڕەوی خەڵك بێ و، سەرمەشقی خەڵك بێ، بۆی نیە ئیش بە مۆڵەت بکات و، دەبێ ئیش

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج ١٠، ص ١٥٧.

بـە عەزیمـەت بـكات، هەڵبەتـە ئەگـەر ئیـشی بـە مۆڵـەت كـرد، مـەرج نیـە گوناهبـار بـێ، بـەڵام گرنگـە ئەوەیـە: بـۆ كەسـێك كـە چـاوی لـێ دەكـرێ و دەكرێتـە سەرمەشـق، دەبـێ زیاتـر هـەوڵ بـدات ئیـش بـە عەزیمـەت بـكات و، لای قورسـیی بگـرێ، نـەك لای ئاسـانیی و سـووكیی.

بەسـەرهاتێكیش هەیـە لێـرەدا كـە خـاوەنی: (**محاسـن التأویـل**)[1]، تەفسـیرەكەیدا هێناویـەتی، ئەویـش ئـەوە دەگرێتـەوە كـە ئیشـكردن بـە مۆڵـەت بـۆ كەسـێكیش كـە جێـی تەماشـا بـێ، بـە مەرجـێ بزانـێ ئـەو ئیشـكردن بـەو مۆڵەتـە، سـوودێكی گـەورەی هەیـە، بـۆ خـۆی و بـۆ كۆمەڵێـك لـە مسـوڵمانان، ئـەوەش هـەر دروسـتە: (**الحافـظ ابْـنُ عَسـاكر**) لـە كتێبەكـەی خۆیـدا لـە بـاسی (**عبـد اللّـه بـن حذافـة السَّـهمي**)دا، كـە یەكێـك بـووە لـە هـاوەڵان و، خەڵـكی مەدینـە بـووە خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ:

ڕۆمـەكان كۆمەڵێـك دیـل دەگـرن لـە هـاوەڵان یەكێكیـان عەبدوڵـڵای كـوڕی حوزافـەی سـەهمیی دەبـێ، ئایـا هیرەقـڵ بۆخـۆی، یـان كەسـێك لەلایـەن هیرەقڵـەوە ڕاسـپێردراوە، داوا لـە عەبدوڵـڵا دەكات، دەڵـێ: ئەگـەر هەڵگەڕێیـەوە لـە ئیسـلام، مـن كچەكـەی خۆشـمت دەدەمـێ و، لـە حوكمڕانییشـدا بەشـدارت دەكـەم، ئەویـش دەڵـێ: نەخێـر مـن ئامـادە نیـم! ئنجـا لەبەرچـاوی وی، كەسـێك دەهێنـن و دەیخەنـە مەنجەڵێكـەوە، كـە لەسـەر ئاگـر دانـراوەو، دەكوڵـێ بـە كوڵینێـكی بەشـیددەت، یەكێـك لـە هـاوەڵان كـە لەگـەڵ وی گیـراوە، دەیخەنـە نێـو ئـەو مەنجەڵـە ئـاوە كـوڵاوەوە، یەكسـەر ئێسـقانەكانی لـێ جیـا دەبنـەوە، دوای ئـەوەی گۆشـتەكەی دەكوڵـێ و دادەماڵـرێ، دەڵێـن: تـۆش ئـاوا لێدەكەیـن، ئەگـەر هەڵنەگەڕێیـەوە! ئەویـش دەڵـێ: بێمنەتـم، دوایـی هـەر لەوێـدا بـە دارێكـەوە هەڵیدەواسـن، تیـری تێدەگـرن، لـە لای ڕاسـت و لای چەپـی دەدەن، بـۆ ترسـاندنی، ئەویـش هـەر لەسـەر قسـەی خـۆی دەبـێ، دوای دایدەبەزێنـن.

ئنجـا ئـەو هاوەڵـە بـەم شـێوەیە بـەرز دەكەنـەوە تاكـو بیخەنـە نێـو مەنجەڵێكـەوە، بـەڵام هـەر لەسـەر قسـەی خـۆی سـوور دەبـێ، {دیـارە ئەوانـەی بەرزیـان كردۆتـەوە بـە ئامرازێـك، تاكـو بیخەنـە نێـو مەنجەڵەكـەوە، چونكـە مەنجەڵێـكی گـەورە، هێنـدە ئـاوە بگـرێ و، بكوڵـێ خۆشـیان لێـی نزیـك نەكەوتوونەتـەوە}، ئنجـا كـە بـەرزی دەكەنـەوە بـۆ ئـەوەی بیخەنـە نێـو مەنجەڵەكـە دەگـری و، فرمێسـكی بـە چـاو دادێ، هـەواڵ دەدەنـە بەرپرسـەكە، دەڵێـن: ئـەوە

---

(١) ج ١٠، ص ١٦٥ - ١٦٦.

عەبدوڵڵا فرمێسكی بە چاو داهاتە خوارێ، بەرپرسەكە دەڵێ: دایگرن لەوانەیە پەشێمان بوو بێتەوە، بۆیە فرمێسكی بەچاو دادێ، لە ترسی مردنێ! دایدەگرن، دەڵێ: فەرموو: ئێستا دڵت نەرم بوو؟ دەڵێ: نەخێر، گریانەكەم بۆ ئەوە نەبوو، دەڵێ: بۆچی بوو؟ دەڵێ: گریانەكەم بۆ ئەوە بوو كە گوتم: من یەك نەفسم هەیە، ئێستا كە منتان خستە نێو ئەو ئاوەوە، نەفسەكەم دەڕوات! پێم خۆش بوو، چەند مووە بەسەرمەوە هەبوون، ئەوەندە نەفسەم هەبوونایە، هەموویان ئاوا لە پێناوی خوادا ڕۆیشتبان !!

كە بەرپرسەكە ئاوا دەیبینێ، دەڵێ: باشە من بەرت دەدەم، مادام تۆ هێندە ئازای، بەڵام یەك داوام هەیە، دەڵێ: چییە؟ دەڵێ: سەرم ماچ بكە! ئەویش بیر دەكاتەوەو، دەڵێ: باشە، بەڵام بە مەرجێك هاوەڵەكانیشم لەگەڵ بەربدەی، دەڵێ: هاوەڵەكانیشت بەردەدەم، ئەویش سەری حوكمڕانەكە ماچ دەكات و خۆی و هاوەڵەكانی بەردەدەن و، دەچێتەوە بۆ مەدینەو بەسەرهاتەكە دەگێڕێتەوە، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، (دیارە لە سەردەمی خەلیفایەتیی عومەری كوڕی خەتتابدا بووە)، دەڵێ: ئەوە من سەری عەبدوڵڵای كوڕی حوزافەی كوڕی سەهم ماچ دەكەم، ئێوەش لەسەرتان پێویستە سەری ماچ بكەن، لەبەرئەوەی بۆتە هۆی دەربازكردنی خۆی و هاوەڵەكانیشی و، ئەو پاڵەوانێتییەی نواندوە!

كەواتە: مۆڵەت وەرگرتنێك بۆ كەسێك، كە ببێتە هۆی هێنانەدی بەرژەوەندییەكی گشتی، بواری تێدا هەیە، ئنجا بەرپرس بێ، یاخود جگە لە بەرپرس.

**مەسەلەی دووەم:**

**خوای بەخشندە بەرانبەر بە کەسانێك کە بەهۆی ئازاردرانەوە، ناچاری کۆچکردن دەبن، پاشان تێکۆشان و خۆڕاگریی دەکەنە پیشە، لێبوردە و میهرەبانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ ﴾، دوایی پەروەردگارت بۆ کەسانێك کە کۆچیان کردوە.

(**ثُمَّ للتَرْتِيب الرُّتْبي**)، (**ثُمَّ**) بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە.

(**هَاجَـرُوا: فَارَقُـوا الوَطَـنَ وَالأَهْـلَ لأَجْـلِ المحَافَظَـةِ عَـلَى الدِّيـن**)، وازیان لە خزم و کەس و نیشتیمان هێناوە لە پێناوی ئایینەکەیاندا.

٢- ﴿ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ﴾، دوای ئەوەی ئازارو ئەشکەنجە دراون.

(**الفِتْنَـة العَـذَابُ وَالأَذَى المتَكـرِّر**)، (**فِتْنَـة**) بریتیە لە سزاو ئازارێکی بەردەوام و دووبارە بووەوە.

٣- ﴿ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ ﴾، دوایی تێکۆشانیان کردوەو خۆڕاگر بوون، (**المجَاهَدَةُ: المقَاوَمَةُ بالجُهْدِ أَي الطَّاقَةِ عَنْ أَنْ يَرُدُّوهُم إِلى الكُفْر**)، (**جَاهَدُوا**) واتە: تێکۆشاون و خۆڕاگر بوون، وزەیان سەرف کردوە، لە دژی ئەوە بگێڕدرێنەوە بۆ کوفر.

﴿ وَصَبَرُوٓا۟ ﴾، هەروەها خۆڕاگر بوون، دامەزراو نەلەخشاو بوون..

٤- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾، بێگومان پەروەردگارت دوای ئەوانە، واتە: دوای ئەشکەنجەدران و، کۆچ کردن و، تێکۆشان و، خۆڕاگریی، پەروەردگارت لێبوردەی میهرەبانە، ڕاناوی (ها) لە وشەی ﴿ مِنۢ بَعْدِهَا ﴾دا، دەگونجێ بچێتەوە بۆ هیجرەت (**مِنْ بَعْدِ الهِجْرَةِ**)، دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ کۆی ئەو کارانە (**تِلْكَ الأَعْمَالِ المذْكُورَة**)، کە من ڕای دووەمیانم پێ

ڕاستره، واته: دوای ئەوەی که ئەشکەنجەدراون و دەستبەرداری ئاینەکەییان نەبوون، هەروەها دوای ئەوەی کۆچیان کردووەو خۆڕاگر بوون، دوایی تێکۆشانیان کردوە، نەك بەس کۆچ بکەن و خۆیان دەرباز بکەن و، دەستەو ئەژنۆ دابنیشن، دوای هەموو ئەوانە، پەروەردگارت لێبوردەی میهرەبانە، کەواتە: لێبوردەیی و میهرەبانیی خوای پەروەردگار لەگۆتره نیه و، بۆ هەموو کەس نیه، بەڵکو بۆ کەسانێکه که شایستەی بن.

لەوبارەوە (إِبْنُ إِسْحَاق) لە (فِي السيرة النبويّة لإبن هِشام)دا، ئەمە باس دەکات، دەڵێ: **{فَلَمّا رَأَى رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ مَا يُصِيبُ أَصْحَابَهُ مِنَ الْبَلاَءِ، وَمَا هُوَ فِيهِ مِنَ الْعَافِيَةِ بِمَكَانِهِ مِنَ اللّهِ، وَمِنْ عَمّهِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَنّهُ لاَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يَمْنَعَهُمْ مِمّا هُمْ فِيهِ مِنَ الْبَلاَءِ، قَالَ لَهُمْ: لَوْ خَرَجْتُمْ إلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ، فَإِنّ بِهَا مَلِكاً لاَ يُظْلَمُ عِنْدَهُ أَحَدٌ، وَهِيَ أَرْضُ صِدْقٍ، حَتّى يَجْعَلَ اللّهُ لَكُمْ فَرَجاً، فَخَرَجَ عِنْدَ ذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ إلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ، مَخَافَةَ الْفِتْنَةِ وَفِرَاراً إلَى اللّهِ بِدِينِهِمْ}**[1].

واته: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینیی: هاوەڵانی تووشی چ گرفتاریی و ناڕەحەتیی و ئەشکەنجەو ئازارێك دەبن، خۆشی سەلامەت بوو بەهۆی پێگەی لای خواو، بەهۆی ئەبوو طاڵیبی مامیشیەوە، {یانی: لە چاو ئەوان سەلامەت بوو، ئازاری جەستەیی نەدەدرا، ئەگەرنا ئازاری دەروونیی و، قسە پێگوتران، کە ئەو شتانە لە ئازاری جەستەیی بۆ وی ناڕەحەتتر بوون}[2]، ئنجا نەشیدەتوانی، کە ئەوان بپارێزێ، لەو گرفتاریی و ناڕەحەتیی و بەلاو موصیبەتانەی کە کافرەکان بەسەریان دێنن، بۆیە پێی فەرموون: ئەگەر بچن بۆ سەرزەمینی حەبەشە، پادشایەکی لێیە، هیچ کەس لەلای وی ستەمی لێ ناکرێ، (دیارە ناوی بیستوە کە پیاوێکی دادگەرە)، ئەوێش سەرزەمینێکی باشە، {واتە: خێر و بێری لێیە و، لەوێ دەحەوێنەوە}، تاکو خوا دەروویێکی خێرتان لێدەکاتەوە، بحەسێنەوە تێیدا، لەو کاتەدا مسوڵمانان و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چوون بۆ سەرزەمینی حەبەشە، لە ترسی ئەشکەنجەدران و، بۆ ئەوەی کە ئایینەکەیان (یانی: دینداریيەکەیان) سەلامەت بکەن.

بەڵێ ئەم ئایەتە بێگومان باسی کۆچی مسوڵمانان بۆ حەبەشە دەکات، تاکو دڵیان بداتەوەو، وانەزانن کە ناتەواوییان هاتۆتە سەر، هەڵبەتە مسوڵمانان دوو جاران کۆچیان کردوە بۆ حەبەشە، جارێك کۆچیان کردوەو، جاری دووەم کە هەواڵیان بیست: قورەیش

---

(١) ج١، ص٣٢١.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

مسوڵمان بوون، هاتنەوە، بەڵام کە هەواڵەکە ڕاست نەبوو، دووبارە کۆچیان کردەوەو، ژمارەیەکی زیاتریشیان لەگەڵ چوونەوە.

ئنجا ئەم ئایەتە دڵدانەوەیە بۆیان، چونکە هەندێك لە هاوەڵان پێیان وابووە: ئەوانەی کۆچیان کردوە بۆ حەبەشە، پاداشتیان کەمترە لەوانەی کە ماونەوە لە مەککە، ئەم بەسەرهاتەش کە لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە ئەوە دەگەیەنێ:

{عَنْ أَبِي مُوسى ﵁، أَنَّ أَسْمَاء بِنْتِ عُمَيْسٍ، وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنا، دَخَلَتْ عَلَى حَفْصَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، زَائِرَةً، وَقَدْ كانَتْ هَاجَرَتْ إِلَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ، فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَى حَفْصَةَ، وَأَسْمَاءُ عِنْدَهَا، فَقَالَ عُمَرُ، حِينَ رَأَى أَسْمَاءَ: مَنْ هذِهِ؟ قَالَتْ: أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، قَالَ عُمَرُ: الْحَبَشِية هذِهِ الْبَحْرِية هذِهِ؟ قَالَتْ أَسْمَاءُ: نَعَم، قَالَ: سَبَقْناكُمْ بالْهِجْرَة، فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللّهِ ﷺ، مِنْكُمْ فَغَضِبَتْ، وَقَالَتْ: كَلاَّ وَاللّهِ كُنْتمْ مَعَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ، يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ، وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ، وَكُنّا فِي دَارِ، (أَوْ) فِي أَرْضِ الْبُعَدَاءِ الْبُغَضَاءِ بِالْحَبَشَة، وَذَلِكَ فِي اللّهِ وَفِي رَسُولِهِ ﷺ وَأَيْمُ اللّهِ لاَ أَطْعَمُ طَعَامًا، وَلاَ أَشْرَبُ شَرَاباً، حَتَّى أَذْكر مَا قُلْتَ لرَسُولِ اللّهِ ﷺ وَنَحْنُ كُنا نُؤْذَى وَنُخَافُ، وَسأَذْكر ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، وَأَسالُهُ، وَاللّهِ لاَ أَكْذِبُ، وَلاَ أَزِيغُ، وَلاَ أَزِيدُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، قَالَتْ: يا نَبِيَّ اللّهِ! إِنَّ عُمَرَ قَالَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَمَا قُلْتِ لَهُ؟ قَالَتْ: قلْتُ لَهُ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: لَيْسَ بأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ، وَلَهُ وَلأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، وَلَكُمْ أَنْتُمْ، أَهْلَ السَّفِينة، هِجْرَتَانِ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٣٩٩٠، وَمُسْلِمُ: ٦٥٦٧).

ئەبوو مووسا ﵁ دەڵێ: ئەسمائی کچی عومەیس کە یەکێ بووە لەوانەی کە لە سەرزەمینی حەبەشە گەڕاونەوە، چوو بۆ لای حەفصە، (کچی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، هاوسەری پێغەمبەر ﷺ)، عومەریش چووە لای حەفصە لە حاڵێك دا کە ئەسمائی لەلابوو، عومەر کە ئەسمائی دی، گوتی: ئەوە کێیە؟ (حەفصە) گوتی: ئەسمائی کچی عومەیسە، عومەر گوتی: حەبەشییەکە! دەریاییەکە ؟! گوتی: بەڵێ، پێی گوت: ئێمە پێش ئێوە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، ئێمە لە ئێوە نیزیکرو شایستەترین بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەسمائیش تووڕە بوو، گوتی: سوێند بە خوا وانیە، ئێوە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بوون، کەسێکتان برسی بووایە، خۆراکی بۆ پەیدا دەکرد و، ئامۆژگاریی نەزانەکانتانی دەکرد، {دەرسی پێ دەگوتن} بەڵام ئێمە لە سەرزەمینێکی دوور بووین، لە سەرزەمینی دوژمنان بووین، لە حەبەشە، ئنجا ئێمە لەوێ ئازار دەدراین و، دەترسێنراین، ئەوەش هەمووی لە پێناوی خواو ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ، سوێند بە خوا، نە خواردنێ دەخۆم، نە هیچ

دەخۆمەوە، تاکو ئەوەی باستکرد بۆ پێغەمبەری ﷺ باس نەکەم و پرسیاری لێ نەکەم بە خوا درۆ ناکەم، لە قسەکەت لانادەم و هیچی لێ زیاد ناکەم (وەك خۆی دەیگێڕمەوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە ماڵی حەفصە، ئەسمائیش {لەو کاتەدا دەبێ لەوێ بوو بێ}، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! عومەر ئاوا و ئاوای گوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی تۆ چیت پێ گوت؟ گوتی: منیش ئاواو ئاوام، پێ گوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو لە ئێوە لە من نزیکترو شایستەتر نیە، ئنجا عومەر خۆی و هاوەڵەکانی، یەك کۆچیان بۆ هەیە، (کۆچیان لە مەککەوە بۆ مەدینە کرد)، بەڵام ئێوە هاوەڵانی کەشتییەکە (بەسواری کەشتی چوون بۆ حەبەشە)، کە لە حەبەشەوە گەڕاونەوە، دوو کۆچتان هەن، (واتە: جارێك کە لە مەککەوە کۆچتان کردوە بۆ حەبەشە، جارێکی دیکە کە لە حەبەشەوە کۆچتان کردوە بۆ مەدینە).

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**خوا فەرموویەتی: ڕۆژێك دێ، كە ڕۆژی قیامەتە، هەر كەسە بەرگریی لە خۆی دەكات و مشتومڕ دەكات و، هەر كەسە چی كردوە، سزاو پاداشتی خۆی بەتەواویی دەدرێتەوە و، هیچ ستەمیان لێ ناكرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَـٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ ﴾، واتە: یادبكەوە! ئەو ڕۆژەی، هەر كەسێك دێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ ﴾، یانی: (**أُذكر يوم تأتي كل نفسٍ**)، یاخود پەیوەستە بە پێشووەوە، كە فەرمووی: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، كە (**یوم**) پەیوەست دەبێ بەوییەوە، واتە: پەروەردگارت لێبووردەی بە بەزەییە، لە ڕۆژێكدا كە هەر كەسێك دێ، بەرگریی لەخۆی دەكات و شەڕەقسە دەكات، بۆ بەرگریی لەخۆكردنی.

٢- ﴿ تُجَـٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا ﴾، مشتومڕ دەكات لەسەر خۆی، بەرگریی لەخۆی دەكات، شەڕەقسە دەكات.

دەڵێ: (**المجَادَلَةُ: دِفَاعٌ بالقَوْلِ للتخَلُّصِ مَنْ تَبِعَةِ فِعْلٍ**)، واتە: (**مُجَادَلَة**) بەرگریی لەخۆكردنە بە قسە بۆ خۆ دەربازكردن لە شوێنەواری كردەوەیەك.

٣- ﴿ وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ ﴾، هەر كەسەش چی كردوە، هەر نەفسە چی كردوە، بەتەواویی دەیدرێتەوە، یانی: سزا یان پاداشتی كردەوەكەی دەدرێتەوە، (**تُوَفَّى: أي تُعْطى كامِلاً**)، بە تەواویی دەیدرێتەوە، ئنجا هەرچەندە فەرموویەتی: كردەوەكەی دەدرێتەوە، بەڵام مەبەست پێی پاداشتی كردەوەكەیەتی، یاخود بەرانبەرو قەرەبووی كردەوەكەی دەدرێتەوە، ئەگەر چاك بێ، چاك و، ئەگەر خراپ بێ، خراپ، بۆیەش وشەی (**جزاء و عوض**) باس نەكراون، چونكە بە سیاق و سەلیقە زانراوە.

٤- ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ لە حاڵێك دا ئەوان ستەمیان لێ ناكرێ، چونكە (و) لە ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾دا بۆ حاڵە (**واو الحالية**)، ئنجا ئایا بۆچی فەرموویەتی:؟ (وَهُمْ - لَا يُظْلَمُونَ) كە (وَهُمْ) و (لَا يُظْلَمُونَ) هەردووكیان بۆ كۆ (**جمع**) دەگەڕێتەوە؟

وەڵامەكەی ئەوەیە كە: لە وشەی ﴿كُلُّ نَفْسٍ﴾دا، سەرنجی ماناكەی دراوە، نەك بێژە (**لفظ**)ەكەی: ﴿تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ﴾، چونكە: (كُلُّ) بۆ كۆیەو (كُلُّ نَفْسٍ) بە ئیعتیباری مانایەكەی یانی: كۆمەڵێك، یانی: ئەو خەڵكە هەمووی دێ، ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾، هەر كەسە بەپێی كردەوەی خۆی، سزا، یان پاداشتی دەدرێتەوەو، ستەمیشیان لێ ناكرێ، واتە: ئەم دوو ڕاناوە: (**هُم**) و (**لاَ يظْلَمُون**) پەیوەست دەبن بە مانای: (كُلُّ نَفْسٍ)ەوە، نەك بە (نَفْسٍ) ئەگەرنا دەبووایە فەرمووبای: (**لا تُظلم**)، ستەمیشی لێ ناكرێ، بەڵام تەماشای مانایەكەی كراوە، مانایەكەشی یانی: لە كۆی ئەو خەڵكە كە دێ و، هەركامێكیان خاوەنی نەفسێكە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان نـۆ (٩) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١١٢- ١١٩)، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم (٩) ئایەتـەش، بیرخسـتنەوەی چاکـەو نیعمەتـەکانی خوایـە، بـە تایبـەت بـۆ کافـرو هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکانی مەککـە و، بـە گشـتی بـۆ هەمـوو مرۆڤایـەتی، هـەر لـە دابینکـردنی هێمنیـی و ئارامیـی و بژیـوی باشـەوە، تاکـو دەگاتـە نـاردنی پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ.

ئنجـا بـەو بۆنەیەشـەوە: خـوا ﷻ بـاسی سـپڵەیی کافـران و، دەسـتکاریی کردنیـان بـۆ حـەڵاڵ و حەڕامـی خـواو، درۆ هەڵبەسـتنیان بـە نـاوی خـواوەی، کـردوە.

پاشـان ئاماژەیەکیـش بـەو خواردنانـە کـراوە، کـە کاتی خـۆی لـە جوولەکـەکان قەدەغـە کرابـوون.

لـە کۆتاییشـدا بـاسی لێبوردەیـی و بەزەیـی خـوا کـراوە، بـۆ کەسـانێك کـە بـە نەزانیـی تـووشی هەڵـەو لادان و تـاوان دەبـن و، دوایـی دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـواو، هەڵدەسـتن بـە چاککردنـەوەی ئـەوەی کـە پێشـتر تێکیـان داوە.

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾

﴿مَتَٰعٞ قَلِيلٞ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١١٧ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُۖ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٨ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ١١٩﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها خوا وێنەیەکی هێنایەوە: ئاوەدانییەك هێمن و ئارام و سەقامگیر بوو، لە هەموو لایەکەوە بژێوی خۆی بە فراوانیی بۆ دەهات، کەچی ناسوپاسیی کرد بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، خواش بەهۆی ئەو کردەوە (خراپ)انەوە، کە کارامانە دەیانکرد، لە پۆشاکی برسیەتیی و ترسی پێ چێژتن، (وەك پۆشاکێك برسیەتیی و ترس و لەرزی بە بەردا کردن) ﴿١١٢﴾ بە دڵنیاییش (ئەو ئاوەدانییە) لە خۆیان ڕەوانەکراوێکیان بۆ هات، کەچی بە درۆیان دانا، بۆیە لە حاڵێکدا کە ستەمیان لە خۆیان کرد بوو، سزای خوا گرتنی ﴿١١٣﴾ (ئەی خەڵکینە !) لەو بژیوە حەڵاڵ و چاك و سوودبەخشانەی خوا پێی داون، بخۆن و سوپاسی چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە ﴿١١٤﴾ بە دڵنیایی خوا تەنیا: مردارو، خوێن و، گۆشتی بەرازو، سەربڕاو بۆ جگە لە خوا (ناوی جگە لە خوا لەسەر هێنراو، لە کاتی سەربڕیندا)ی لێ قەدەغە کردوون، ئنجا هەر کەسیش تێگیراو (ناچار بوو، لێیان بخوات) لە حاڵێکدا کە ئارەزوومەندو خوازیاری لێ خواردنیان نیە و، لە سنووری (پێویستی)یش دەرناچێ، ئەوە بێگومان خوا لێبووردەی بە بەزەییە {بەرانبەر بە کەسانی ئاوا} ﴿١١٥﴾ هەروەها (ئەی هاوبەشدانەرەکان !) بە زمانی بە درۆوە مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، کە سەرەنجام درۆ بە ناوی خواوە (کە فلان شتەی حەڵاڵ و، فیسار شتەی قەدەغە کردوە)، بە دڵنیایی ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن ﴿١١٦﴾ گوزەرانێکی کەمیان (لە دنیادا) دەبێ و (لە ڕۆژی دوایی)دا ئازارێکی بە ئێشیان دەبێ ﴿١١٧﴾ ئەوەشمان لە جوولەکەکان قەدەغە کرد بوو، کە پێشتر بۆمان باسکردوون و، ستەمیشمان لێ نەکردن، بەڵکو ئەوان ستەمیان لە خۆیان دەکرد (و بەهۆی ستەم و خراپەیانەوە، هەندێك خواردنمان لێ قەدەغە کردن) ﴿١١٨﴾ ئنجا بێگومان پەروەردگارت لەگەڵ ئەوانەدا، کە نەزانانە خراپەیان کردوە، ئنجا دوای ئەوە گەڕاونەوەو چاکسازییان کردوە، بە دڵنیایی پەروەردگارت پاش ئەو گەڕانەوەو چاکسازییە، لێبووردەی بە بەزەییە لەگەڵیان ﴿١١٩﴾}.

## لێکدانەوەی هەندێک لە وشەکان

( ءَامِنَةً ): واتە: هێمن و بێ ترس، (أَصْلُ الأَمْنِ: طُمَأْنِينَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْفِ)، وشەی (أَمْن) لە ڕیشەدا، ئارامگرتنی نەفسەو، لاچوونی ترسە.

( مُّطْمَئِنَّةً ): (إِطْمَأَنَّ: سَكَنَ وَثَبَتَ وَاستقَرَّ، الطُّمَأْنِينَة: وَالإِطْمِئْنَانُ: الثِّقَةُ وَعَدَمُ القَلَقِ)، واتە: ئەو شتە چەسپاو داسەکناو سەقامگیر بوو، (طمأنينة، وإطمئنان)، بریتیە لە متمانەو، نەبوونی دڵەڕاوکەو ترس.

( رَغَدًا): (عَيْشٌ رَغَدٌ وَرَغِيد: طَيِّب وَاسِع)، دەگوترێ: (عَيْشٌ رَغَد، وَعَيْشٍ رَغِيد) هەردووکیان بە مانای ژیانێکی خۆش و فراوان و بەختەوەرانە و، پڕ نازو نیعمەت دێ.

( فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ )، خوا پۆشاکی برسیەتیی و ترسیی، پێ چێژتن، دەڵێ: (الذَّوْقُ: وجُودُ الطَّعْمِ بالفَمِ، وَآختِيرَ فِي القُرْآنِ لَفْظُ الذَّوْقِ، فِي العَذَابِ)، (ذَوق) بریتیە لە تامکردنی خواردن بە زمان (زار)، بەڵام لە قورئاندا: وشەی (ذَوق) واتە: چێژتن، بەکارهێنراوە بۆ سزا.

( يَصْنَعُونَ ): (الصُّنع: إِجَادَةُ الفِعْلِ، فَكُلُّ صُنْعٍ فِعْلٌ، وَلَيْسَ العَكْس) (صُنع) بریتیە لەوەی کە کارێك بە کارامەیی و لێزانیی بە وردەکاریی بکرێ، بۆیە هەموو (صُنع)ێك (فعل)ە، هەموو کارامەییەك کردەوەیە، بەڵام مەرج نیە هەموو کردەوەیەك، بە کارامەیی ئەنجام درابێ.

( غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ ): (أَي: غَيْرَ طَالِبٍ مَا لَيْسَ لَهُ طَلَبُهُ، وَلاَ مُتَجَاوِزٍ لِمَا رُسِمَ لَهُ)، خوازیاری شتێك نەبێ، کە بۆی نەبێ، لەو سنوورەش تێنەپەڕێنێ کە بۆی دیاریی کراوە، کەواتە: (غَيْرَ بَاغٍ ) واتە:

**یەکەم:** ئەو چوار خۆراکە قەدەغە کراوە: (مردار و، خوێن و، گۆشتی بەراز و، بۆ غەیری خوا سەربڕاو) کە بابای ناچار و تێگیراو، لێیان دەخۆن، مەبەستی لێ خواردن نەبێ، بە ئارەزووەوە.

**دووەم:** سنووری ئەوە کە پێویستیی پێیەتی و، پەكی لەسەر کەوتوە، پێی لە مەرگ دەرباز بێ، ئەو سنوورەش نەبەزێنێ و زێدەڕۆیی بکات.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە دوا دوای ئەو ئایەتە موبارەکانەدا، کە سوورەتی (**النحل**)یان لێ پێکدێ، کە وەك لە سەرەتاوە گوتمان، ئەم سوورەتە ناوێکی زۆر پڕ بە پێستە، کە پێی بگوترێ: سوورەتی نیعمەتەکان، (**سورة النحل**) چونکە خوا ﷻ زیاتر لە پەنجا - شەست (٥٠ - ٦٠) نیعمەتی سەرەکیی خۆی، لەم سوورەتە موبارەکەدا خستوونە ڕوو، ئنجا لە دوا دوای ئەم ئایەتە موبارەکانەدا، نموونە دێنێتەوە بە ئاوەدانییەك کە خوا نازو نیعمەتێکی زۆری بەسەردا ڕشتوە، کەچی خەڵکی ئەو ئاوەدانییە نا سوپاسیی و سپڵەیی دەکەن، بەرانبەر بە خواو، خوای دادگەرو کارزانیش سزایان دەدات، دەفەرموێ:

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرۡيَةً كَانَتۡ ءَامِنَةً ﴾، هەروەها خوا وێنەی هێنایەوە بە ئاوەدانییەك کە هێمن و سەقامگیر بوو، ﴿ مُّطۡمَئِنَّةً ﴾، خەڵکەکەی دڵ داسەکناوو بێ ترس و بیم بوو، ﴿ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ ﴾، ئەو بژیوەی کە پێویستیی پێیەتی، لە هەموو لایەکەوە بۆی دەهات، ﴿ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ ﴾، کەچی ئەو بەرانبەر بە چاکەکانی خوا سپڵەیی و ناسوپاسیی کرد، ﴿ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾، خواش ﷻ بەهۆی ئەوەوە کە زۆر کارامەو وردەکارییانە دەیانکرد، لە کردەوەی خراپ:

أ) هەم ئەو گوناهو تاوانانەی لە خودی خۆیان دا دەیانکردن.

ب) هەم ئەو گوناهو تاوانانەی لە دەرەوەی خۆیان دا دەیانکردن، وەك پێشێلکردنی مافی ئەوانی دیکەو، ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی پەیامی خوا لەسەر هەموو ئەو کردەوە خراپانەی کە لە خودی خۆیانداو، لەگەڵ دەوروبەری خۆیاندا، بە کارامەیی دەیانکردن.

خوا پۆشاکی برسیەتیی و ترسی پێ چێژتن، واتە: برسیەتیی و ترس بە جۆرێك پێیانەوە چەسپا، وەك چۆن کەسێك پۆشاکێك لەبەردەکات، بە بەدەنیەوە دەچەسپێ، ئەوانیش ئاوا برسیەتیی و ترس پێیانەوە چەسپاو، لێیان چێژت و، تامیان کرد، کە دوایی ئەم تەعبیرە، لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر شی دەکەینەوە.

ئنجا خوا ﷻ {وێڕای ئەو هەموو نازو نیعمەتە ماددییانە، کە لە هەموو لایەکەوە بۆ ئەو ئاوەدانییە دەهاتن، کەچی خەڵکەکەی ناسوپاس و سپڵە بوون بەرانبەریان}، باسی نیعمەتێکی دیکەی زۆر گەورەی خۆی دەکات، کە لە هەموو ئەو نیعمەتانە گەورەترەو، نیعمەتێکی مەعنەوییە، ئەویش بریتییە لەوە کە پێغەمبەرێکیان لە خۆیان بۆ لا نێردراوە: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ ﴾، هەروەها بە دڵنیاییەوە لە خۆیان، ڕەوانەکراو و پێغەمبەرێکیان بۆ هات، ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾، کەچی ئەوان بە درۆیان دانا، پێی بێبڕوا بوون، ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴾، سەرەنجام سزا گرتنی، لە حاڵێکدا کە ئەوان ستەمکار بوون، دیارە - لێرەدا سزای خوا تبارك و تعالى وەك دڕندەیەك کە بە دوای نێچیرێکەوەیە، وێناکراوە - ئەو سزایەی خوا گرتنی، لە حاڵێکدا کە ستەمیشیان لە خۆیان کرد بوو، واتە: سزا دران، بەهۆی ستەمەکەیانەوە، نەك ستەمیان لێ بکرێ.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا ﴾، خەڵکینە! ئەو بژێوەی کە خوا پێیداون، لە حاڵێکدا کە حەڵاڵ و ڕەوایە لە ڕووی شەرعییەوەو، سوودبەخش و بەتام و خۆشیشە، لە خودی خۆیدا، لێی بخۆن، لێی بەرهرەمەند بن.

﴿ وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴾، سوپاسی چاکەی خواش بکەن، ئەگەر تەنیا ئەو دەپەرستن، ئەگەر ئێوە دەتانەوێ بەتەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، سوپاسی چاکەکانی خوا بکەن، یاخود: ئەگەر ئێوە خواپەرستن، سوپاسی چاکەکانی خوا بکەن، کەواتە: بەندایەتیی کردن بۆ خواو، سوپاسکردنی چاکەکانی خوا، دوو شتی تێکهەڵکێشن، ئەگەر خوا پەرست بی، سوپاسگوزاریش دەبی بۆ خوا، هەروەها ئەگەر سوپاسگوزارییش بکەی بۆ خوا، بەندایەتیی بۆ خوا دەکەی، ئەم دووانە شتی تێکهەڵکێشن و لێك جیانابنەوە، واتە: ناگونجێ مرۆڤ بەندایەتیی بۆ خوا بکات و، بۆشی سوپاسگوزار نەبێ، دیسان ناگونجێ مرۆڤ سوپاسگوزار بێ بۆ خواو، بەندایەتیشی بۆ نەکات.

ئنجا باسی ئەوە دەکات: کە ئایا خوا چی لێ قەدەغە کردوون؟ ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾، بێگومان (خوا) تەنیا: مردارەوە بوو و، خوێن و، گۆشتی بەرازو، ئەوەی بۆ جگە لە خوا سەربڕاوەو، بۆ جگە لە خوا دەنگی لەسەر بەرز کراوەتەوەو، ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنراوە، تەنیا ئەوەی لەسەر قەدەغە کردوون، ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بە نسبەت ئەو چوارانەشەوە، هەر کەسێك ناچارکرا و تێگیرا، با لێیان بخوات، بەڵام بە دوو مەرجان:

أ) مەبەستی نەبێ و عەودالی لێخواردنی یەکێ لەو چوار شتانەی نەبێ.

ب) سنووریش نەبەزێنێ لە لێخواردنیاندا، واتە: بە ئەندازەی ئەوە کە زۆر پێویستیی پێیەتی و پەکی لەسەری کەوتوەو، پێی لە مەرگ دەرباز دەبێ، لەو ئەندازەیە تێنەپەڕێنێ، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، هەر کەسێك ئاوا بە ناچاریی و بە تێکگیراویی لە: یەکێك لەو چوارانە، یان زیاتریش بخوات، بەو دوو مەرجە کە باسمان کردن:

**یەکەم:** مەبەستی لێخواردن نەبێ و، بە ئارەزووەوە نەبێ، یانی: لەبەرئەوە لێیان نەخوات کە عەودال و تامەزرۆیە.

**دووەم:** لە سنوور تێنەپەڕێنێ، لە سنووری: پەك لەسەر کەوتن و پێویستیی.

بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە، بەرانبەر بە کەسێکی ئاوا.

ئنجا خوا ﷻ ڕوو لە کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات، کە هەر لە خۆوە پۆلێنی بژیوەکان دەکەن، پۆلێنی ئەو شتانە دەکەن، کە خوا بۆ مرۆڤەکانی داناون و، هەر لەخۆوە دەڵێن: ئەوە حەلاڵەو ئەوە حەڕامە، دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ﴾، هەر بەوە کە زمانتان وەسفی دەکات، مەڵێن: ئەوە حەلاڵەو، ئەوە حەڕام و قەدەغەکراوە، ﴿ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ ﴾، کە سەرەنجام درۆ بە ناوی خواوە بکەن، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴾، بێگومان ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، سەرفراز نابن، لە زمانی کوردیی دا ئەم تەعبیرە ئاوا بەکاردێ: (بە زمانی بەدرۆ)، واتە: زمانێك کە زۆر بە درۆ ڕاهاتوە، لێرەش خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ ﴾، بەوە کە زمانتان بە درۆ وەسفی دەکات، مەڵێن: ئەمە حەلاڵەو ئەمەش حەڕامە! کە سەرەنجام درۆ بە ناوی خواوە بکەن.

دوایی دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، سەرفراز نابن، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ، ئەدی بۆچی کەسانێك هەن بە درۆ بە ناوی خواوە دەکەن و، دەستکاریی حەلاڵ و حەڕامیش دەکەن، بەلام لە ژیان و گوزەرانێکی خۆشیش دان، لە ڕووی دنیاییەوە؟

بۆیە دەفەرمووێ: ﴿ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئەوانەش کە بە ڕواڵەت بەختەوەرو کامەرانن، هەرچەندە بێ فەرمانیی خوا دەکەن و، دەستکاریی حەڵاڵ و حەرامەکانی خوا دەکەن، ئەوە گوزەرانێکی کەمە و، ئەوانە دوایی ئازارو سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە: ئایا جوولەکەکان چییان لێ قەدەغە کراوە؟ چونکە جوولەکەکان جار جار مسوڵمانەکانیان سەغڵەت دەکرد و دەیانگوت: فڵان شتەش قەدەغەیەو، فڵان شتەش قەدەغەیەو، فڵان شتەش قەدەغەیە، ئەدی ئێوە بۆچی بە قەدەغەیان دانانێن؟ خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە، هەم لێرەدا هەم لە سوورەتی (**النساء**)داو، هەم لە سوورەتی (**آل عمران**)یش دا، کە: بەڵکو خوا ﷻ هەندێ شتی لە جوولەکەکان قەدەغە کردوە، لەسەر ستەمکاریی و لادانی خۆیان، ئەگەرنا ئەو شتانە لە ئەسڵدا قەدەغە نین و، پیس و زیان بەخش نین، تاکو مسوڵمانان مولزەم بن، بەوەی خۆیان لە بەکارهێنانی ئەو شتانە بە دوور بگرن، کە لە جوولەکەکان قەدەغە کراون، بە تایبەت کە بەهۆی لادان و تاوان و ستەمی خۆیانەوە، خوا لێی قەدەغەکردوون، نەك لە خودی خۆیاندا خراپ و پیس و زیانبەخش بن، تاکو خوا قەدەغەیان بکات، دەفەرمووێ:

﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ ﴾، هەروەها لەسەر ئەوانەی کە گەڕاونەوە، ئەوەمان لێ قەدەغە کردبوون، کە پێشتر بەسەرت دا خوێندوومانەتەوەو، بۆمان گێڕاویەوە.

(هَادُواْ) واتە: جوولەکەکان، ئەویش لەوەوە هاتوە، کاتێ خۆی جوولەکان گەڕاونەوە بۆ لای خوا {إنا هُدْنا إِلَيْك: إنا رَجَعْنا إِلَيْك} {یانی: ئێمە بۆ لات گەڕاینەوە} ئەو ناوەیان لەوەوە بۆ هاتوە.

کە دەفەرمووێ: ئەوەی لە جوولەکانمان قەدەغە کردبوو، پێشتر بەسەر تۆماندا خوێندۆتەوە، لە کوێدا؟ لە سوورەتی (**الأنعام**)دایە، وەك دوایی باسی دەکەین: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ١٤٦ ﴾الأنعام.

هەروەها لە سوورەتی (**النساء**) (١٦٠ - ١٦١)یش دا، هۆکاری ئەوە کە لێیان قەدەغە کراوە، ڕوونکراوەتەوە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ ﴾، واتە: ئێمە ستەممان لێ نەکردبوون، کە ئەو شتانەمان لێ قەدەغە کردن، چونکە لە خودی خۆیاندا پیس و زیانبەخش نین، ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، {ئێمە ستەممان لێ نەکردن}، بەڵکو ئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد و، لە ئەنجامی ئەم ستەم و تاوان و خراپانەیاندا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ ... ﴿١٦١﴾ ﴾ النساء، واتە: بەهۆی ستەمێك کە جوولەکەکان دەیانکرد، هەندێك لەو ڕزقە بەتام و خۆش و سوودبەخشانەمان، لێ قەدەغە کردن، هەروەها بەهۆی ئەوەوە کە خەڵکیان لەڕێی خوا لادەدا، هەروەها بەهۆی ئەوەوە کە سوودیان دەخوارد، {مامەڵەیان بە ڕیبا دەکرد}، کە لێشیان قەدەغە کرا بوو.

دوایی خوا ﷻ دێتە سەر بابەتی کۆتایی لەم دەرسەماندا، ئەویش بریتیە لەوە کە کەسانێك بە نەزانیی و نەفامیی، گوناهو تاوان و خراپەیەك بکەن، بەڵام دوایی بگەڕێنەوە و، چاکسازیی بکەن، بێگومان خوا میهرەبانیی و لێبوردەیی هەیە بەرانبەریان: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، ئنجا بە دڵنیایی پەروەردگارت بۆ کەسانێ کە خراپە دەکەن، بە نەفامیی، دوای دەگەڕێنەوە و چاکسازیی دەکەن، {چییان خراپ کردوە و تێکداوە، چاکی دەکەنەوە} بە دڵنیایی پەروەردگارت دوای ئەوە، واتە: دوایی ئەو گەڕانەوە بۆ لای خواو چاکسازیی کردنە، یان ﴿ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، لێبووردەی میهرەبانە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

خـوا وێنەیـەكی هێناوەتـەوە كـە وەك پەندێـك عیبـڕەتی لـێ وەربگیـرێ: ئاوەدانییـەكی هێمـن و ئـارام و سـەقامگیرو گـوزەران خـۆش، بەهـۆی ناسوپاسـیی بەرانبـەر بـە چاكـەكانی خـوا و، بێبڕوایـی بەرانبـەر بـە پێغەمبـەری خـواوە، خـوای دادگـەر، تـرس و برسـیەتی پـێ چێژتـن و، وەك پۆشـاكێك تـرس و برسـیەتیی بـە بەرداكـردن و پێیانـەوە چەسـپا:

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١- ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً ﴾، خوا وێنەیەكی هێناوەتەوە بە ئاوەدانییەك.

{قَرْيَـةً: بَـدَلٌ ل (مَثَـلاً)} وشـەی ﴿ قَرْيَةً ﴾ جێـدار (بـدل)ە، بـۆ: ﴿ مَثَلًا ﴾، واتـە: ئاوەدانییـەكی بـە وێنـە هێناوەتـەوە، ئـەوە لـە ڕووی ڕێزمـانی عەرەبییـەوە، یاخـود: {ضُمِّـنَ (ضَرَبَ) مَعْنَـى (جَعَـلَ)}، وشـەی (ضَرَبَ) مانـای (جَعَـلَ)ی خراوەتـە نێـو، چونكـە: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ﴾، (ضَرَبَ) تەنیـا یـەك بـەركار (مفعـول)ی دەوێ، بـەڵام ئەگـەر (ضَرَبَ) مانـای (جَعَـلَ)ەی بخرێتـە نێـو، ئـەو كاتـە (ضربَ) دوو بـەركاری دەوێـن، ئـەو كاتـە دەڵێـی:

(ضَرَبَ)، (فعْلٌ مَاضٍ).

(ألله) ﷻ (فاعل).

﴿ مَثَلًا ﴾، یـان: (المفعـول بـهِ الأول)ەو، لـە شـوێنی خۆیـەتی و، ﴿ قَرْيَةً ﴾ (المفعول بـهِ الثاني)یە، یاخـود ﴿ قَرْيَةً ﴾، (المفعـول بـە الأول)ەو دواكەوتـوەو، ﴿ مَثَلًا ﴾، (المفعـول بـە الثاني)یـەو، پێـش

کەوتوە، زانایان هەردووك ڕایەکەیان هەن، کەواتە: خوا ئاوەدانییەکی هێناوەتەوە بە نموونە، وەك پەند و عیبرەتێك خستوویەتە بەرچاو، ئنجا با بزانین ئەو ئاوەدانییە چۆن بوو ؟

٢- ﴿ كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً ﴾، هەم بەهرەمەند بوو لە هێمنیی و ئاسایش و، هەم لە ئۆخژن و دڵ ئارامیی.

(**الأَمْنُ: السَّلاَمَةُ مِنْ تَسَلُّطِ العَدُوّ**)، (**أَمْن**) بریتیە لە پارێزراویی لەوە کە دوژمن بەسەریدا زاڵ بێ، سەلامەت بێ، لەوەی دوژمن بەسەریدا زاڵ بێ، بەڵام لێرەدا: (**الإطْمِئْنان: الدَّعَةُ وَهُدُوءِ البالِ**) بریتیە لە خۆشگوزەرانیی و بێ باکیی و بێ خەمیی، واتە: ئەو ئاوەدانییە، هەم لە ڕووی دوژمنی دەرەکییەوە بێ ترس بوو، هەم لە نێو خۆیدا، بەهرەمەند بوو، لە حاڵەتی خۆشگوزەرانیی و بەختەوەریی و بێ گرفت و کێشەیی.

٣- ﴿ يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ ﴾، بژیوی خۆی بۆ دەهات لە هەموو شوێنێکەوە، واتە: لە زۆر جێگایانەوە (**أي: مِنْ أَمْكِنة كَثِيرَة**) یاخود لە هەر چوار لاوە، کە - وەك دوایی باسی دەکەین - زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لێرەدا شاری مەککەیە، چونکە مەککە لەپێش ئیسلامیش دا لە هەموو لاوە خەڵك ڕووی تێکردوە، ئنجا کە خەڵك هاتوون بۆ مەککە، هەم بەرهەم و بەروبوومی خۆیان هێناوە بۆ بازرگانیی و ساغکردنەوەو، هەم هاتوون لەوێ دا بەندایەتییان بۆ خوا ئەنجام داوەو، مەسرەفیان کردوە، بۆیە ئەوێ بۆتە شوێنێکی گرنگی بازرگانیی و مامەڵەو کارو کەسابەت و، خەڵکەکەی بەهرەمەند بوون و، لە هەموو جۆرە ڕزق و بژیوێکیشی لەملاولا بۆ هاتوە.

(**الرَّغَد: الوَافِرُ الهَنِيء**)، (**رغَد**) بریتیە لە شتێك کە زۆر بێ و، مایەی خۆشگوزەرانییش بێ، هەروەها (**رغد**)، بە مانای ڕزقێکی فراوان و چاك و پاکیش دێ.

٤- ﴿ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ ﴾، کەچی: خەڵکی ئەو ئاوەدانییە، بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، نا سوپاس بوون، (**الأَنْعُم: جَمْعُ نِعْمَة**) (**أَنْعُم**) کۆی (**نِعْمَة**)یە، ئنجا (**نِعْمَة**) هەم بە (**نِعَم**)و، هەم بە (**أَنْعُم**)یش کۆدەبێتەوە.

لێرەدا کە باسی ئاوەدانییەکە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَكَفَرَتْ ﴾، بەڵام ئەوە مەجازە ئەگەرنا: خانوو و بەرەکانی بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، سپڵە نەبوون، بەڵکو واتە: خەڵکی ئەو دێیە، وەك لە ئایەتی (٨٢)ی سوورەتی (**یوسف**)دا هاتوە: ﴿ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِي كُنَّا فِيهَا ﴾، لە ئاوەدانییەکە بپرسە! واتە: لە خەڵکی ئاوەدانییەکە بپرسە!

سپڵەیی بەرانبەر بە چاکەکانی خواش، بریتیە لە سپڵەیی بەرانبەر بە بەخشەری چاکەکان، (الكُفْرُ: بِانْعُمِ اللّـهِ هُوَ الكُفْرُ بالمُنْعِم)، ناسوپاسیی بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، ناسوپاسییە بەرانبەر بە چاکەکارێك کە چاکەو نیعمەتەکانی ڕەخساندووە.

٥- ﴿ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ ﴾، خوا پۆشاکی برسیەتیی و ترسی پێ چێژتن.

وشەی (الذوق)یش: (الذَّوْقُ: إِحْساسُ اللّسان بأَحْوَالِ الطَّعُوم، وَهُنا استعِيرَ لإِحْساسِ الأَلَمِ وَالأَذَى إِحْساساً كَتَمَكُّنِ ذوق الطَّعَامِ مِنْ فَمِ ذَائِقِهِ، لا يَجِدُ لَهُ مَدْفَعَاً)، (ذَوق)، بریتیە لە هەستکردنی زمان بە حاڵەتەکانی خواردن، بە تامەکانی خواردن و، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ هەستکردن بە ئازارو ناڕەحەتیی، وەك هەستکردنی کەسێك کە خواردنێك دەچێتە نێو زاری، چۆن تامی لێدەکات، بە بێ ئەوەی کە بتوانێ لە خۆی دووری بخاتەوە، [کە خواردنەکە چۆتە نێو زاری، تازە تامی دەکات، بەدەست خۆی نیە]، ئەوانیش بە هەمان شێوە، خوا برسیەتیی و ترسی و پێ چێژتن، لێرەدا ترس و برس و تەشبیهکراون بە پۆشاکێك کە بەبەر کەسێك دا دەکرێ و، بە جەستەیەوە دەنووسێ و دەچەسپێ، واتە: ئەو ترس و برسیەتییە وا پێیانەوە چەسپا، کە لێیان نەبێتەوە، وەك چۆن پۆشاکێك بە جەستەی خاوەنەکەیەوە دەچەسپێ و لێی نابێتەوە، بەڵام ئایا خوای کارزان، بۆچی وای پێکردن ؟

٦- ﴿ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە بە کارامەیی ئەنجامیان دەدا، لە کاری خراپ، ئنجا ئەو کارە خراپە:

أ) چ لە خودی خۆیاندا، وەك ئەو قەتڵ و زیناو مەیخۆریی و خراپەکارییەی کە لە خودی خۆیاندا کردوویانە.

ب) یاخود دەرەوەی خۆیاندا، وەك ماف پێشێلکردنی ستەملێکراوان و چەوسێنراوان و، ڕێگرتن لە پەیام و بەرنامەی خوای پەروەردگار، کە بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺدا ناردوویەتی.

٧- ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ ﴾، بە دڵنیایی لە خۆشیان پێغەمبەرێکیان بۆ هات، ڕەوانەکراوێکیان بۆ هات، ئەگەر مەبەست مەککە بێ، دیارە کە ڕەوانەکراوەکە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، بەڵام ئەگەر مەبەست هەر ئاوەدانییەك بێ، کە خوا ناوی نەهێناوە، بێگومان هیچ ئاوەدانییەکی گەورە نەبووە، هیچ کۆمەڵگایەکی بەرچاوو قەڵەباڵغ نەبووە، کە پێغەمبەرێکی بۆ نەنێرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ فاطر، واتە: هیچ

کۆمەڵگایەك نەبووە، ترسێنەرو ورياكەرەوەيەك {كە مەبەست پێی پێغەمبەرانە (**عليهم الصلاة والسلام**)} تێيدا ڕانە بردبێ و نەهاتبێ.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ ﴾، واتە: هەر لە خۆيان، لەلايەن خواوە پێغەمبەرێكيان بۆ هات، يانى: جگە لە خۆيان نەبوو، تاكو دەمارگيرييان بۆ كۆمەڵگاو خەڵكى خۆيان وايان لێ بكات، كە بڕواى پێ نەهێنن، بەڵكو پێغەمبەرەكە لە خۆيان بوو، لە ڕووى ڕەچەڵەكەوە لە خۆيان بوو، هەروەها لە ڕووى زمانەوە، ئنجا لە نێو خۆياندا گەورە بوو بوو و، لە نزيكەوە دەياناسى و بە نەسەب و ڕەچەڵەكى ئاشنا بوون، لە نەتەوەى خۆشيان بوو: قازانجى وى، قازانجى وان بوو، زيانى وى زيانى وان بوو !

٨- كەچى ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾، واتە: بەدرۆيان دانا، (**نَسَبُوهُ لِلْكَذِبِ**) واتە: بە خاوەن درۆيان دانا، پاڵيان دايە لاى درۆ.

٩- ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾، لە ئەنجامى ئەوەش دا، سزا گرتنى، (**الأَخْذُ: اسْتِعِيرَ لِلإِهْلاَكِ**)، گرتن خوازراوەتەوە بۆ فەوتێنران، لێرەدا سزاو ئازارێك كە خوا دەينێرێ، تۆڵەو سزايەك كە خوا دەينێرێ، تەشبيهكراوە بە دڕندەيەكەوە، كە دەگەڕێ بە دواى نێچيرێك دا و دەيگرێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾، (ال)ى سەر (**العذاب**) بۆ ناساندن (تعريف)ە و، مەبەست پێی ناساندنى جينسە، يانى: جينسى سزايەك كە خوا بۆ ئەو جۆرە كەسانەى داناوە، گرتنى، چونكە پێشتر باسى ئەو سزايە نەكراوە، تاكو بڵێين: بۆ عەهدە و، يانى: سزايەكە[1] گرتنى، بەڵكو دەبێ بڵێين: ئەو سزايەى كە خوا دايناوە بۆ ئەهلى كوفر، ئەوە گرتنى.

١٠- ﴿ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾، لە حاڵێكدا كە ئەوان ستەمكار بوون، (و) لە: (**وهم كافرون**) دا، (**واو الحالية**) يە، يانى: سزاى پڕ بە پێست دياريكراو لە لايەن خواوە گرتنى، لە حاڵێك دا كە ستەمكار بوون.

---

(١) پێشتريش گوتوومانە: (أل)ى (العهد) لە زمانى كورديى دا ( كە)يە، وەك: (الكتاب) كتێبەكە.

## وەڵامی ئیشكالێك و پرسیارێك:

### ئیشكالێك و وەڵامەكەی:

لەبارەی ئەو ڕستە موبارەكەوە، كە دەفەرمووێ: ﴿فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ﴾، خوا پۆشاكی برسیەتیی و ترسی پێ چێژتن، ئەم دەقە هەیە: (رُوِيَ أَنَّ ابْنَ الرَاوَنْدِي الزِّنْدِيق قَالَ: لِإِبْنِ الأعْرَابِي إِمَام اللُّغَةِ وَالأَدَب: هَلْ يُذَاقُ اللِّبَاسُ؟ فَقَالَ لَهُ ابْنُ الأَعْرَابِيِّ: لاَ بَاسَ أَيُّهَا النَّسْنَاس! هَبْ أَنَّ مُحَمَّداً مَا كانَ نَبِيّاً، أَمَا كانَ عَرَبِيّاً؟!)[1].

واتە: گێڕدراوەتەوە كە ئیبنو ڕاوەندیی [شاعیرو فەیلەسووفێكی زەندیق بووە، بڕوای بە ئیسلام نەبووە، بەڵام لە نێو كۆمەڵگای ئیسلامیشدا بووەو، ڕێگاشی پێدراوەو، قسەی خۆی كردوە}، ڕۆژێك بە ئیبنو لئەعڕابیی، كە پێشەوای زمان و ئەدەب بووە، لە ڕۆژگاری خۆیدا، دەڵێ {وەك ڕەخنە گرتن لە قورئان}:

ئایا پۆشاك دەچێژرێ؟ تام دەكرێ؟ ئەویش (وەڵامێكی ددان شكێنی دەداتەوە)، دەڵێ: ئەی ئەو كەسەی خوتخوتە دەكات! یان ئەی ئەو كەسەی بە ناهەق موناقەشە دەكات! گریمان موحەممەد پێغەمبەر ﷺ نەبووە، ئەدی عەرەب نەبووە؟ واتە: ئەگەر پێغەمبەریش نەبوو بێ و، ئەو فەرمایشتەی لە خواوە بۆ نەهاتبێ، خۆ عەرەب بووە و زمانی عەرەبی چاك زانیوە، ئنجا ئەگەر ئەم جۆرە تەعبیرە لە زمانی عەرەبی دا نەهاتبایە، لێرەدا نەدەهات، كە بە عەقیدەی وی، دەڵێ: موحەممەد ﷺ بۆخۆی قورئانی داناوە! ئنجا گریمان قورئانیشی لە خواوە بۆ نەهاتبێ، بەڵام خۆ عەرەبی زانیوە، ئنجا ئەگەر ئەم تەعبیرە لە زمانی عەرەبیدا بەكارنەهاتبایە، بەكاری نەدەهێنا !

دیارە ڕەخنەكەی ئیبنو ڕاوەندیی بەو جۆرە بووە: {طَعَنَ فِي الآيَةِ بِأَنَّ المناسِبَ أَنْ يُقَالَ: فَكَسَاهَا اللَّهُ لِبَاسَ الجُوعِ وَالخَوْفِ}، تانەی لە ئایەتەكەداوە كە: وا گونجاوتر بوو، ئەو ڕستەیە بەو شێوەیە بووایە: (فَكَسَاهَا اللَّهُ لِبَاس الجُوْعِ وَالخَوْف) واتە: خوا پۆشاكی برسیەتیی و ترسی بە بەرداكردن، لە جیاتی بفەرمووێ: (فَأَذَاقَهَا) پێیچێژتن، بەڵام (محي الدين الدرويش) دەڵێ: (وَقَدْ أَجَابَ عُلَمَاء البَلاَغَةِ أَنَّ هَذَا مِنْ تَجْرِيد الإِستِعَارَة، وَذَلِكَ أَنَّهُ استعَارَ اللِّبَاسَ لِمَا غَشِيَ الإِنْسَانَ مِنْ بَعْضِ الحَوَادِثِ، كَالجُوعِ وَالخَوْفِ، لاشْتِمَالِهِ عَلَيْهِ اشْتِمَالَ

---

(١) إعراب القرآن و بيانه، محي الدين الدرويش: ج ٥، ص ٣٧٨.

**الثَّوْبِ عَلَى اللاَبِسِ، ثُمَّ ذَكَر الوَصْفَ مَلاَئِماً لِلْمُستَعَارِ لَهُ، وَهُوَ الجُوعُ وَالخَوْفُ، لأَنَّ إِطْلاَق الذَّوقِ عَلَى إِدْرَاكِ الجُوعِ وَالخَوْفِ، جَرَى عِنْدَهُم مَجْرَى الحَقِيْقَةِ، فَيَقُولُونَ ذَاقَ فُلانٌ البُؤْسَ وَالضُّرَّ، وَأَذَاقَهُ غَيْرَهُ، فَكَانَتِ الإِستِعَارَة مجردة، ولو قال: فكساها كانت مُرَشَّحَة).**

واتە: زانایانی ڕەوانبێژیی گوتوویانە: ئەم تەعبیرە لە زاراوی ڕەوانبێژییدا پێی دەگوترێ: (**تَجرِيد الإِستِعَارَة**)[1]، لێرەدا وشەی (لباس) پۆشاك، خوازراوەتەوە بۆ شتێك كە مرۆڤ دادەپۆشێ لەو ڕووداوانەی بەسەری دێن، وەك: برسیەتیی و ترس، چونكە ئەو ڕووداوە كە بەسەر مرۆڤ دێ، ئنجا ترسە، یان برسیەتییە، خاوەنەكەی دادەپۆشێ، وەك چۆن پۆشاك ئەو كەسە دادەپۆشێ كە لەبەری دەكات، دوایی وەسفێك كە گونجاوە، لەگەڵ ئەوەی كە بۆی خوازراوەتەوە، ئەوەی هێناوە كە بریتیە لە ترس و برسیەتیی، چونكە هەستكردن بە برسیەتیی و ترس و، چێژتنی، ئەمە لە زمانی عەرەبیدا بەكاریان هێناوە، وەك حەقیقەت، نەك وەك وشەیەك كە خوازراوەتەوە، بەڵكو وەك وشەیەك كە بەڕاستیی بۆ ئەو واتایە بەكاردێ، گوتوویانە: (**ذَاقَ فُلاَنٌ البُؤْس وَالضر**)، فڵانكەس هەژاریی و ناخۆشیی چێژت، هەروەها گوتوویانە: (**وَأَذَاقَهُ غيرهُ**) فڵانكەس هەژاریی و ناخۆشیی بە فڵان كەس چێژت، ، ئنجا لێرەدا بۆتە: (**الإِستِعَارَة المُجَرَّدة**)ە، بەڵام ئەگەر فەرمووبای: (**كَسَاهَا اللَّهُ**) ئەو كاتە دەبوو بە جۆری: (**الإستِعَارَة المُرَشَّحة**)[2]، كە ئەوانەی شارەزای ڕەوانبێژیین زیاتر لە وردەكارییەكانی ئەوە تێدەگەن.

### پرسیارێك و وەڵامەكەی:

كە دەفەرموێ: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرۡيَةً ﴾، ئایا مەبەست لەو ئاوەدانییە، كوێیە ؟

(**الشوكاني**) لە (**الفتح القدير**)[3]دا، دەڵێ: ئایا ئەم ئاوەدانییە، ئاوەدانییەكی دیاریی كراوە، یاخود دیاریی نەكراوە؟ زۆربەیان گوتوویانە دیاریی كراوەو، مەبەست پێی شاری مەككەیە، چونكە پێغەمبەر ﷺ كاتی خۆی تووڕە و قەڵس بووە، لە خەڵكی مەككە و تووكی لێكردوون، نزای لێكردوون و، فەرموویەتی: {**أَللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، أَللَّهُمَّ اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ**}، (**أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٤٠٨١، وَمُسْلِمٌ: ٢١٥٦**).

---

(١) (إستعارة) دیارە خواستنەوەی وشەیەكە لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێكی دیكە كە لەوێدا بەكارنایەت، بەڵام دەخوازرێتەوە لەبەر حیكمەتێك یان زیاتر، كە بە واتایەكی دیكە بەكاربهێندرێ، (تجريد)یش، واتە: ڕووتكردنەوە، یانی: یەكلاكردنەوەو، ساغكردنەوەی بۆ ئەو مەبەستە.

(٢) {(الإستعارة المرشَّحة) (عند البيانيين): ذكرُ ما يُلائمُ المُشبَّه بهِ تقويةً لها}.

(٣) ج ٣، ص ٢٣٩.

واتە: ئەی خوایە! سزای خۆت توند بکە لەسەر (**مضر**)، {واتە: ئەو بەشە عەرەبەی کە لەو ناوچەیەن، چونکە عەرەب دەبنەوە بە دوو بەشی سەرەکیی (**ربيعة، ومضر**)} بارودۆخیان لەسەر قورس بکە، وەك ئەوە ساڵانەی کە لە بەسەرهاتی یوسفدا هاتوون، [ئەو حەوت ساڵەی گرانیی و قات و قڕیی بەسەر خەڵکی میسردا هاتن، خوایە! ئاوا لە ڕووی ئابوورییەوە، سەغڵەتیان بکەو تەنگ دەستیان بکە، با لووتیان بشکێی و چی دیکە لەخۆبایی و ملهوڕ نەبن، لە بەرانبەر خەڵك و خوادا].

هەڵبەتە ئەمە لە چەند شوێنێکی دیکەش، لە قورئاندا هاتوە، کە خوا ﷻ خەڵکی مەککەی زۆر ڕەچاو کردوە بەهۆی کەعبەوە، بەهۆی ئەوە ماڵە تایبەتەی خۆیەوە، کە لەوێیە، خوا خاتری خەڵکەکەشی گرتوە، بۆیە لە سوورەتی (القصص)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾﴾، واتە: ئایا ئێمە حەرەمێکیی هێمن و ئاراممان بۆ نەڕەخساندوون، کە لە میوەو بەروبوومی هەموو شتێکی بۆ دێتەوە، [هەموو ئەو شتانەی کە خوا ﷻ کردوونی بە بژێو و بۆ خەڵك]، وەك ڕزقێك لەلایەن ئێمەوە، بەڵام زۆربەیان نازانن.

هەروەها سوورەتی (**القريش**)یش هەر لەوبارەوەیە: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾﴾، واتە: بەهۆی خووگرتنی قورەیشەوە، خوو گرتنیان بە سەفەری هاوینەو زستانە، [هاوینان بەرەو شام دەچوون، زستانان بەرەو یەمەن دەچوون، بەهۆی ئەوەوە کە خوا ئەوەی بۆ ڕەخساندوون، ئەو سەفەری هاوینەو زستانە بەرەو شام و یەمەن]، با پەروەردگاری ئەو ماڵە بپەرستن، کە لە برسیەتیدا، خۆراکیی بۆ ڕەخساندوون، [برسیەتییەکەی لێ لابردوون]، هەروەها ترس و بیمیشی بۆ گۆڕیوون بە هێمنیی و ئاسایش.

## مەسەلەی دووەم:

خوای بەخشەر فەرمان بە مرۆڤەکان دەکات کە لەو بژێوە حەڵاڵ و بە سوودانەی پێیداون بخۆن و، سوپاسی چاکەی خوا بکەن، ئەگەر دەیانەوێ خوا بپەرستن، پاشان پێیان ڕادەگەیەنێ کە: تەنیا چوار جۆرە خواردنی سەرەکیی لێ قەدەغە کردوون: مردارو، خوێن و، گۆشتی بەراز و، بۆ جگە لە خوا سەربڕاو، کە ئەوانیش بۆ بابای تێگیراو، هەر ڕەوان، مادام بە ئارەزووەوە لێیان نەخوات و، سنووری بە ناچاریی لێخواردن نەبەزێنێ:

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَـٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١- ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، دەجا بخۆن لەوەی خوا پێیداون، لەو بژیوەی خوا بۆی ڕەخساندوون.

٢- ﴿ حَلَـٰلًا ﴾، لە حاڵێکدا کە حەڵاڵ بێ:

أ - (**الحَلَالُ: المَأْذُونُ فِيهِ شَرْعَاً**)، حەڵاڵ ئەوەیە کە لە ڕووی شەرعییەوە مۆڵەتی درابێ، یانی: بە شێوەیەکی حەڵاڵ وەدەستهێنرابێ.

ب - ﴿ طَيِّبًا ﴾، (**الطَّيِّبُ: مَا يَطِيبُ للناسِ طَعْمُهُ وَيَنْفَعُهُمْ قُوْتُهُ**)، (**طَيِّبُ**) ئەوەیە کە خواردنەکەی بۆ خەڵك سوودبەخش بێ و، هێزو پێزییان پێ بدات.

یانی هەر شتێك لە خواردن، کە بە شێوەیەکی حەڵاڵ و ڕەوا بەدەستتان هێناوە و، لە خودی خۆشیدا سوودبەخشە و، خۆش و بەتامە، لێی بخۆن.

٣- ﴿ وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها سوپاسی چاکەی خواش بکەن، واتە: سوپاسی جینسی چاکەی خوا بکەن، چونکە شارەزایانی زمان گوتوویانە: هەرچەندە (**نعمة الله**) لێرەدا تاك (**مفرد**)ە، بەڵام مەبەست پێی تێکڕای چاکەو نیعمەتەکانی خوایە.

٤- ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾، ئەگەر ئێوە تەنیا هەر ئەو دەپەرستن.

ئەمە وەك پێشتریش باسمان کرد: ئەوە دەگەیەنێ، کە تەنیا خواپەرستیی، خوازیاری سوپاسکردنە بۆ خوا، سوپاسکردنیش بۆ خوا، خوازیاری خوا پەرستییە بە تەنیا، کەسێك خوا بپەرستێ، سوپاسی دەکات و بۆ چاکەکانی سوپاسگوزار دەبێ، کەسێکیش سوپاسگوزاربێ بۆ خوا و، چاکەکانی خوا بەسەر خۆیەوە ببینێ، بێگومان تەنیا خواش دەپەرستێ، واتە: شوکرو عیبادەت، دوو شتی تێکهەڵکێشن، هەر کامێکیان ئەوی دیکە پەلکێش دەکات، هەر کامێکیان خوازیاری ئەوی دیکەیە.

٥- ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾، بێگومان (خوا) تەنیا ئەوانەی لێ قەدەغە کردوون: مردارو، خوێن و، گۆشتی بەرازو، بۆ جگە لە خوا سەربڕاو، یاخود ناوی غەیری خوا لەسەر هێنراو.

کە ئەم ڕستەیە: بە تۆزێك گۆڕانکارییەوە لە چوار شوێناندا هاتوە:

١/ سووڕەتی (البقرة) ئایەتی: (١٧٣).

٢/ سووڕەتی (المائدة) ئایەتی (٣).

٣/ سووڕەتی (الأنعام)دا ئایەتی (١٤٥).

٤/ سووڕەتی (النحل) ئایەتی (١١٥).

واتە: لە چوار شوێندا ئەم ڕستەیە دووبارە بۆتەوە، ئنجا هەر ڕستەیەك و، هەر ڕاستییەك لە یەك ئایەتدا هاتبێ، ئەوە تەنیا بۆخۆی: ئەو حوكمەی دەیگرێتە نێوخۆی، بۆ هەموو لایەك یەكلاییكەرەوەیە، بەڵام شتێك كە خوا لە چوار شوێن دا هێناویەتی یان كەمتر یان زیاتر، بێگومان بایی ئەوەندە كە دووبارە دەبێتەوە، لە شوێنە جۆرا و جۆرەكاندا و، لە ئایەتەكاندا، دیارە خوا ویستوویەتی: بایی ئەوەندە گرنگیی و بایەخی پێ بدات و، ئێمە بزانین كە ئەمە بەلای خوای پەروەردگار و كارزانەوە، ئەو ڕاستییە بەو ئەندازەیە جێی گرنگیی و بایەخە، ئنجا جێی سەرنج و ڕامانە: ئەم ڕاستییە لە دوو سووڕەتی مەككەیی: (النحل و الأنعام)و، لە دوو سووڕەتی مەدینەییشدا: (البقرة و المائدة)دا هاتووە، ئێمە كاتی خۆی لە تەفسیركردنی ئایەتی ژمارە (١٤٥)ی سووڕەتی (الأنعام)دا، زۆر بە تەفصیلْ بابەتێكمان هێناوە لەبارەی ئەو چوار جۆرە گۆشت و خواردەمەنییانەوە، كە خوا قەدەغەی كردوون، بۆیە لێرەدا لەوە زیاتر بەدوای ناكەوین.

٦- ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ ﴾، کەسێکیش کە تێگیرا، بە مەرجێك عەوداڵ و خوازیاری لێخواردنی یەکێ لەو چوار شتانە نەبێ و، بە ئارەزووەوە لێیان نەخوات، ﴿ وَلَا عَادٖ ﴾، هەروەها سنووریش نە بەزێنێ، سنووری ئەوەندەی پەکی لەسەر کەوتوە.

أ / ﴿ غَيۡرَ بَاغٖ ﴾ (أي: غَيْرَ طَالِبٍ لِلْمُحَرَّمِ، لِلَذَّةٍ أَوِ استِئْثَارٍ)، واتە: عەوداڵی ئەو قەدەغەیە نەبێ، بۆ چێژ لێوەرگرتن، یان چونکە بەلایەوە شتێکی چاك و پەسەندو هەڵبژێردراوە.

ب / ﴿ وَلَا عَادٖ ﴾ (وَلاَ مُتَجَاوِزٍ مَا يَسُدُّ الرَّمَق)، هەروەها تێنەپەڕێنێ لەو ئەندازەیەی پشتی پێوەی ڕاوەستابێ و، پەکی لەسەر کەوتبێ تاکو لە مەرگ ڕزگاری بکات، ئەگەرنا: مادام پەکی لەسەر نەکەوتبێ و پێویستی پێی نەبێ و هەڕەشەی مەرگی لەسەر نەبێ، بۆی نیە لەو چوارانە بخوات.

کەواتە: کەسێك ناچاربێ و تێبگیرێ، بەو دوو مەرجەوە: نە مەبەستی لەززەت وەرگرتن بێ و، نە لە سنووری پەك لەسەر کەوتنیش تێپەڕێنێ، کەسی بەو شێوەیە:

٧- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بە دڵنیایی خوا (بەرانبەری) لێبوردەی بە بەزەییە.

أ - ( غَفُورٞ ) لێبوردەیە، ئەگەر ئەو کەسە لەو بوارەدا: هەڵەو کەمتەرخەمییەکی بووبێ.

ب - ( رَّحِيمٞ ) بە بەزەییە، چونکە لە کاتی ناچاریی و سەغڵەتیی دا، ئەو چوار خۆراکە پیس و زیانبەخشەی: بایی دەربازبوونی لە مەترسیی مەرگ، بۆ ڕەوا کردوون.

## تیشکێک لەسەر چەمکی: ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾

ئـەم تەعبیـرە لێـرە، {لـە سـوورەتی (**النحـل**)دا} و، لـە سـوورەتەکانی (**المائـدة، والأنعـام**) یشـدا هـەر بـەو جـۆرە هاتـوە: ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾، واتـە: ئـەوەی کـە سـەربڕاوەو، نـاوی جگـە لـە خـوای لەسـەر هێـنراوە، چونکـە (أَهَـلَّ) یـانی: دەنگـی بـەرز کـردەوە، ئـەو وشـەیەش لـەوەوە هاتـوە عـەرەب کـە (هِلَال)یـان بینیـوە گوتوویانـە: (**هَـذَا هِـلَال هَـذَا هِـلَال**) کاتێـك مانگـی یـەك شـەوەیان بینیـوە، کـە مانـگ تـازە بۆتـەوە، دوایـی هـەر دەنـگ بەرزکردنەوەیەکیـان ناونـاوە (**إهـلال**)، ئنجـا کاتێـك شـتێکیان سـەربڕیوە، ئەگـەر خواپەرسـت بووبـن، نـاوی خـوا، ئەگەرنـا نـاوی بتەکانیـان لەسـەر هێنـاوە، ئەگـەر بـت پەرسـت بـوو بـن، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾، ئـەو ئاژەڵـەی کـە سـەردەبڕدرێ و، نـاوی جگـە لـە خـوای لەسـەر دەهێـنرێ و، دەنگـی پـێ بەرزدەکرێتـەوە، قەدەغەیـە.

شـایانی باسیشـە تەنیـا لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿... وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيۡرِ ٱللَّهِۖ ... ١٧٣﴾، بـەڵام لـە سـێ شـوێنەکەی دیکـەدا، دەفەرمـوێ: ﴿... وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ...﴾، واتـە: لـە یـەك شـوێن دا (**البقـرة - ١٧٣**) ڕانـاوی سـەربڕاو (**مذبوح**)ەکـە، کـە بـۆ جگـە لـە خـوا سـەربڕاوە، پێشـخراوە: ﴿... وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ ... ١٧٣﴾ بـەڵام لـە سـێ شـوێناندا: (**الأنعـام ١٤٥- و النَّمـل - ١١٥ - و المائـدة - ٣ -**) ئـەوەی کـە سـەربڕاوەکەی بـۆ سـەربڕاوە (**مذبـوح لـه**) پێشـخراوە، کـە بریتیـە لـە (**غیر اللّه**): ﴿... وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ...﴾، چونکـە: ئـەوەی زیاتـر جێـی بایـەخ و گرنگیـی پێدانـە: بـۆ سـەربڕاوەکە (**مذبـوح له**)یـە، نـەك خـودی سـەربڕاو (**مذبوح**)ەکـە، هـەر بۆیـەش:

ئەگـەر جارێـك گرنگیـی بـە، سـەربڕاوەکە دراوە، سـێ جـاران گرنگیـی بـە، بـۆ سـەربڕاوەکە دراوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خـوا ﷻ بـە کافـرەکان دەفەرمـوێ: هـەر لەخـۆڕاو بـە زمـانی بـە درۆوە مەڵێـن: ئەمـە حەڵاڵـەو ئەمـە حەڕامـە، کـە سـەرەنجام درۆ بـە نـاوی خـواوە بکـەن و، ئەگـەر وا بکـەن سـەرفراز نابـن، ژیانـی بـێ بڕوایانیـش گوزەرانێکـی دنیایـی کەمـە و، پاشـان گیـرۆدەی سـزاو ئـازاری بـە ئێـش دەبـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١-** ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ ﴾ واتە: هەروەها (ئەی بێبڕواینە !) بەوەی کە زمانتان بە درۆ باسی دەکات، مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە قەدەغەیە.

**(الكَذِب مَنْصُوبٌ عَلَى المَفْعُول المُطْلَق، أَي: وَصْفاً كَذِباً)، (الكذِب) (منصوب)ە و، لـە حاڵەتـی بـەرکاری ڕەهـا (المفعـول المطلـق) دایـە، کەواتـە:** ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ ﴾ یانـی: (وَصفاً كَذِباً)، زمانتـان بـە وەسـفێکی درۆ، وەسـفی دەکات.

**٢-** مەڵێن: ﴿ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ ﴾، ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەڕامە، (هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ: هِيَ مَقُول: تَقُولُوا)، ئەم ڕستەیە: گوتراوی ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ ﴾.

**٣-** ﴿ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ﴾ واتە: کە سەرەنجام درۆ بە ناوی خواوە بکەن.

ئـەم (ل)ەی سـەر: ﴿ لِّتَفْتَرُوا۟ ﴾، **(لِتَفتَروا: عِلَّة ل(تقولوا) باعْتِبَارِ كَوْنِ الإفْتِرَاءِ حَاصِلاً، لاباعتِبَارِ كَوْنِهِ مَقْصُوداً للقَائِلِيْنَ، فَهِيَ لَامَ العَاقِبَة، وَلَيْسَت لَامَ العِلَّة).**

﴿ لِّتَفْتَرُوا۟ ﴾، ئـەم (ل)ە، **(لام التعلیل)**ە، بـەڵام مەبەسـت پێـی سـەرنجام **(عاقبة)**ە، واتە: کە سـەرەنجام ئـاوای لـێ بکەوێتـەوە، بـەو ئیعتیبـارەی کـە درۆ هەڵبەسـتنەکە، لـە ئەنجامـی ئـەو قسـەیەدا پەیـدا دەبـێ، نـەك بـەو ئیعتیبـارەی کـە ئەوانـە ئـەو قسـەیە دەکـەن، مەبەسـتیان

بێ، ئامانجیان بێ درۆ هەڵبەستن، بەڵکو بە ئیعتیباری ئەوە کە ئەگەر ئەو قسەیەتان کرد، سەرەنجام درۆ هەڵبەستن پەیدا دەبێ.

کەواتە: ئەم (ل)ە، هەرچەندە (ل)ی (عِلّة)یە، بە ڕواڵەت، بەڵام لە ڕاستییدا دەبێتە **(لام العاقِبة)**، ﴿لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾، چونکە سەرەنجام ئەوەی لێ دەکەوێتەوە.

٤- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن، درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوە، یانی: دەستکارییکردنی حەڵاڵ و حەڕامی خواو، دەستکارییکردنی شەریعەتی خوا ﷻ، ئەوەش سیفەتێکی زۆر خراپ و، کردەوەیەکی زۆر خراپە و، وەك خۆ بردنە ئاستی خوایە ﷻ.

٥و٦- ﴿مَتَٰعٞ قَلِيلٞ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾: واتە: ژیانی دنیای وان: گوزەران و ڕابواردن و خۆشیی وەرگرتنێکی کەمە و، دوایی سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿مَتَٰعٞ قَلِيلٞ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، ئەم ڕستەیە لێرەدا: **(جَوَابٌ لِسُؤَالٍ مُحْتَمَلٍ: كَيْفَ لَا يُفْلِحُونَ، وَكَثِيرٌ مِنْهُم فِي حَالَةِ فَلَاحٍ؟ فَأُجِيبَ: بِأَنَّ هَذَا تَمْتِيعٌ قَلِيلٌ وَقَصِيرُ الأَجَلِ)**.

واتە: ئەمە وەڵامی پرسیارێکی چاوەڕوانکراوە، کە یەکێ بڵێ: چۆن سەرفراز نابن، کە زۆرێك لە کافرەکانیش لە حاڵەتی خۆشگوزەرانیی و بەختەوەریی و کامەرانیی دان ؟!

وەڵام دراوەتەوە، کە ئەمە پێ گوزەراندن و پێ ڕابواردنێکی کەم و ماوە کورتە، بەڵام دوایی سزاو ئازارێکی بە ئێش چاوەڕێیان دەکات.

## کورتە باسێک لە دوو بڕگەدا

### بڕگەی یەکەم: تیشکێکی زیادە بۆ سەر چەمك و واتای: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ ﴾

ئەم رستە موبارەکە: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ ﴾، کە پێشتریش هەر قسەمان لێکرد، لێرەش جارێکی دیکە قسەی لێدەکەینەوە: (محي الدين الدرويش)، دەڵێ:

(المَعْنَى: وَلاَ تقولوا هذا حلال، وهذا حرام، لِوَصْفِ أَلْسِنَتِكُم الكَذِبَ، أَي: لِتَعَوُّدِهَا عَلَيْهَا وَجَرَيانِهَا بِهِ، أَي: لاَ تُحَلِّلوا وَلاَ تُحَرِّمُوا، لأَجْلِ قَوْلٍ تَنْطِقُ بِهِ أَلْسِنَتِكُمْ، وَهُوَ قَوْلٌ مَدْفُوع لاَ تَقُوم بِهِ حُجَّة، ووَصْفُ الأَلسنة للكَذِبِ، تَعْبِير عَرَبِيٌّ مُبِين للمُبالَغَة: جُعِلَتِ الأَلْسِنة لإِستساغَتِهَا الكَذِبَ وَجَرَيانِهِ عَلَيْهَا وَتَرَدُّدِهِ فِيمَا تَنْطقُ بِهِ دَائِمَاً، كأَنَّهَا تَصِفُهُ وَتُجَسِّدُهُ للسامِعِ، وَمِنْ ذَلِكَ قَوْلُهُم:

وَجهها يَصِفُ الجَمَالُ وَعَيْنُهَا تُوحِي بالسِّحْر

أَو كانَّ الكَذِبَ أَمْرٌ مَجْهُولٌ، وَعَلَيْهِم تِبيانُهُ للناسِ، وَكَشْفُ الغِطَاءِ عَنْ خوافِيهِ، فَهُوَ مَجَازٌ عَقْلِيٌّ)[1].

واتە: ماناکەی ئاوایە کە دەفەرموێ: مەڵێن: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، بەهۆی ئەوەوە کە زمانتان باسی درۆ بکات، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە زمانتان خووی گرتوە، بە درۆ کردنەوەو، زۆر بە درۆ کردنەوە ڕاهاتوە، ئەوە مەڵێن، یانی: شت حەڵاڵ مەکەن و شت قەدەغە مەکەن، هەر بەهۆی ئەوەوە کە زمانتان دەیڵێ، بە بێ ئەوەی ئەو قسەیەی دەیکەن: بەڵگەیەکی لەسەربێ، بەڵکو بەس بەسەر زمانتان دادێ.

ئەوەش کە زمانەکان وەصفی درۆ بکەن، ئەمە دەربڕینێکی عەرەبی زۆر ڕۆشنە، بۆ زێدەڕۆیی کردن: زمانەکان وا وێناکراون، کە لە ئەنجامی ئەوەدا، درۆ بە ڕەوا دەزانن و، بە درۆوە ڕاهاتوون و، زۆر درۆیان بەسەردا دێ، ئەو زمانانە وەسفی درۆ دەکەن و، بۆ بابای بیسەر، درۆ بەرجەستە دەکەن، وەك لەوبارەوە گوتراوە: (**وجهها يصف الجمال**) ڕووی

---

(١) إعراب القرآن و بيانه: ج ٥، ص ٣٨٠ - ٣٨١.

ئەو ئافرەتە وەسفی جوانیی دەكات، یان گوتراوە: (وعینُها توُحي بالسحر)، چاوی ئەو ئافرەتە ئاماژە دەكات بە جادوو.

یاخود وەك: (درۆ كردن) شتێكی نەزانراو بێ و، لەسەر وان پێویست بێ كە ڕوونی بكەنەوە بۆ خەڵك و پەردەی بەسەر لابدەن و، دیوە حەشار و پەنهانەكانی ئاشكرا بكەن، ئنجا ئەوان بەهۆی زمانیانەوە، درۆ پێناسە و وەسف دەكەن و، بەرجەستەی دەكەن، ئەمەش لەو حاڵەتەدا دەبێتە مەجازێكی عەقلیی.

(محمد متولي الشعراوي) لە تەفسیرەكەیدا بە ناوی: (خواطر الشعراوي)[1]، دەڵێ: (مَعْنَى: {تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الكَذِبَ}: تُظْهِرُهُ عَلَى أَوْضَحِ وَجُوهِهِ، فَلَيْسَ كَلاَمُهُمْ كَذِباً فَقَط، بَلْ يَصِفُهُ، فَمَنْ لاَ يَعْرِفِ الكَذِبَ، فَلْيَعْرِفْهُ مِنْ كَلاَمِ هَؤُلاَءِ): بێگومان ئەم تەعبیرە پوختتر مەبەستەكە بەدەستەوە دەدات، دەڵێ: ﴿لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ﴾، واتە: بە جوانترین شێوە درۆ دەردەخات، قسەكەیان نەك هەر درۆ بێ، بەڵكو وەسفی درۆ دەكات، كەسێك كە نەزانێ درۆ چییە؟ با لە قسەی وانەوە بیزانێ.

## بڕگەی دووەم: هۆشیاری دان بە مسوڵمانان: كە بە بێ بەڵگەی شەرعیی ڕوون، باسێ قەدەغەكردن نەكەن:

ئەم ئایەتە ئاگاداركردنەوەیە بۆ مسوڵمانان، وەك (القرطبي) دەڵێ: (الآيةُ تَحْذِيرٌ لِلمُسْلِمِينَ أَن يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ، مَا لَمْ يَقولُهُ بنَصٍّ قَاطِعٍ وَاضِحٍ فِي مجَالِ التحْريم)، ئەم ئایەتە ئاگاداركردنەوە و ترساندنی مسوڵمانانە، كە نەكەن شتێك بە ناوی خواوە بڵێن، كە نەیفەرمووبێ، بە دەقێكی یەكلاییكەرەوەی ڕۆشن، لە بواری قەدەغەكردندا {بۆیان نیە لەوبارەوە قسە بكەن، مەگەر خوا زۆر جوان نوختەی تێدا خستبێتە سەر پیت}.

ئنجا (القرطبي) لە تەفسیرەكەی خۆی (الجامع لأحكام القُرْآن)[2]دا، دەڵێ: (أَسْنَدَ الدَّارِمِيُّ... عَنِ الأَعْمَش قَالَ: مَا سَمِعْتُ إِبْرَاهِيم قَط يَقُولُ: حَلاَلٌ وَلاَ حَرَام، وَلَكِنْ كانَ يَقُولُ: كانُوا يَكرهُون، وَكانُوا يَستحِبُّون، وَقَالَ ابْنُ وَهَبْ قَالَ مَالِك: لَمْ يَكُنْ مَنْ فُتيا الناسِ أَنْ يَقُولُوا: هَذَا حَلاَلٌ وَهَذَا حَرَام، وَلَكِنْ يَقُولُوا: إِياكُمْ كَذَا وَكَذَا، وَلَمْ أَكُنْ لأَصْنَعُ هَذَا، وَمَعْنَى هَذَا: أَنَّ

(١) ج ١٣، ص ٨٢٦٢.

(٢) ج ١٠، ص ١٦٢.

**التَّحْلِيْلَ وَالتَّحْرِيمَ إِنَّمَا هُوَ للهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَلَيْسَ لأَحَدٍ أَنْ يَقُولُ أَو يُصَرِّحَ بِهَذَا، فِي عَيْنٍ مِنَ الأَعْيانِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونُ البارِئُ تَعَالى يُخْبِرُ بِذَلِكَ عَنْهُ، وَمَا يُؤَدّي إِلَيْهِ الإِجْتِهَاد فِي أَنَّهُ حَرَامٌ، يَقُولُ: إِنِّي أَكْرهُ كَذَا، وَكَذَلِكَ كانَ مَالِك يَفْعَل، اقْتِدَاءً بِمَنْ تَقَدَّم مِنْ أَهْلِ الفَتْوَى)**.

واتـە: داریمیـی لـە موسـنەدەکەی خۆیـدا، ئـەم قسـەیەی پاڵداوەتـە لای (أعمـش)، {ئەعمـەش یەکێکـە لـە زانایانـی تابیعیـن}، گوتوویەتـی: هەرگیـز گوێـم لـە ئیبراهیـم نەبـووە، {ئیبراهیـم یەکێکـە لـە زانایانـی تابیعیـن و ئەعمـەش زانیاریـی لـێ وەرگرتـوە} بڵـێ: ئـەوە حەڵاڵـەو ئـەوە حەرامـە، بەڵکـو هـەر دەیگـوت ئەوەیان پـێ ناخـۆش بـووە و، ئەوەیـان پـێ چـاك و پەسـند بـووە، هەروەهـا (**ابْنُ وَهَبْ**) گوتوویەتـی: مالیـك گوتوویەتـی: کاتـی خـۆی خەڵـك لـە فەتوادانیانـدا عادەتیـان نەبـووە بڵێـن: ئەمـە حەڵاڵـەو ئەمـە حەرامـە، بەڵکـو عادەتیـان وابـوو، دەیانگـوت: خۆتـان لـەو شـتەو لـەو شـتە بپارێـزن! مـن ئـەو شـتە ناکـەم، ئەوەندەیـان دەگـوت.

(**القرطبي**) دەڵـێ: ئـەوەش مانـای وایـە: بـە حـەڵاڵ دانـان و بـە قەدەغـە دانـان، تەنیـا هـی خـوای زاڵـی پایـە بـەرزەو، هیـچ کەسـێك بـۆی نیـە لـە شـتێك لـە شـتەکاندا بـە ڕاشـکاویی بڵـێ: ئـەوە حەڵاڵـەو ئـەوە حەرامـە، مەگـەر خـوای بـەرز لەوبـارەوە هەواڵـی دابـێ، واتـە: دەقێکـی یەکلاییکـەرەوەی ڕوونـی بـێ چەنـد و چـوون هەبـێ، ئەگەرنا ئـەوەی بە ئیجتیهـاد و بە تێرامـان و هەڵهێنجانـی زانایـان دەردەکـەوێ، کـە قەدەغەیـە، دەبـێ تەنیـا بڵـێ: مـن ئـەوەم پـێ ناخۆشـە، ئـەوە بـە ناپەسـند دەزانـم، مالیکیش هـەر وایدەکـرد، وەك چاولێکـردن و شـوێنکەوتنی ئەهلـی فەتـوا لـە پێـش خۆیـدا.

ئنجـا بـە ڕاسـتیی ئەمـە ڕێـك پێچەوانـەی عادەتـی ژمارەیـەك لـە وتاربێـژو قسـەکەرانە بـە نـاوی ئیسـلامەوە، - کـە زۆرێکیـان شـۆرەتی سـەلەفییان هەڵگرتـوە - لـەم ڕۆژگارەمـان دا - کـە زمانیـان زۆر بـەوەوە ڕاهاتـوە، هـەر ئـەوەی ڕێـك پێچەوانـەی ئایەتەکـەی خوایـە: ئـەوە حەڵاڵـەو، ئـەوە حەرامـە، بەتایبەتـی لـە بـواری قەدەغەکردنـدا، زۆرجـار دنیـا لـە خەڵکـی دەکەنـە چەرمـی چۆلەکـە! لـە حاڵێکـدا کـە خـوا لـە چەنـدان ئایەتـدا دەفەرموێ: خـوا هەرچـی لەسـەر زەوییـە، بـۆ ئێـوەی دروسـت کـردوە، بەڵکـو دەفەرمـوێ: هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەوی دایـە، بـۆ ئێـوەی ڕام و دەسـتەمۆ کـردوە.

کەواتـە: لـە ئەسـڵدا هەمـوو شـتێك ڕەوایـە، زانایـان گوتوویانـە: (**الأَصْلُ فِي الأَشْياء الإِباحَة، والأَصْلُ فِي الأَشْياء الحلِّيةُ، وَالأَصْلُ فِي الأَشْياءِ الطَّهَارَة**)، یانـی: بناغـە و بنـەڕەت لـە شـتەکاندا، ڕەوایـی و

حەڵاڵی و، پاکییە، یانی: دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر پیسیی و، لەسەر ناڕەوایی و، لەسەر قەدەغە بوون، کەچی هەندێك کەس وادەزانن: بناغە بریتیە لە: قەدەغە کران و، ناڕەوایی و، پیسیی و، دەبێ بەڵگە هەبێ بۆ ئیسپاتی: پاکیی و ڕەوایی و حەڵاڵیی: کە ئەوە ڕێك پێچەوانەی ئایەتەکانەو، پێچەوانەی عادەتی پێغەمبەریشە ﷺ، کە زۆر پێی ناخۆش بووە، پرسیاری لێ بکەن، نەوەك لە ئەنجامی پرسیارکردنی ئەوان دا شتێك قەدەغە بکرێ لە مسوڵمانان، زۆر گرنگە ئینسان خۆی لە شوێنکەوتنی ئارەزوو و لاساییکردنەوەی کوێرانە، بپارێزێ، دینداریی نابێ، بە پێی میزاج و سروشتی خۆت بێ، بەڵکو دەبێ ملکەچی شەریعەت بی، بەتایبەت لە بواری بە قەدەغەدانانەدا، نابێ ئینسان دنیا لە خەڵك بکاتە چەرمی چۆلەکە[١] نەتوانن بە هیچ لایەکدا خۆیان بجووڵێنن، ئەوە قەدەغەیەو، ئەوەش قەدەغەیە...هتد، چونکە: بەبێ بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوە و ڕوون و بێ چەند و چوون، بۆت نیە، بڵێی: ئەوە قەدەغەیە، لەبەرئەوەی ئەصڵ لە هەموو شتەکاندا، بریتیە لە حەڵاڵ بوون و، ڕەوا بوون، پاك بوون، چونکە خوا لە ئەصڵدا هەموو شتەکانی بۆ مرۆڤەکان هێناونە دی، کەواتە: هەر شتێك کە بۆ مرۆڤەکان سوودبەخش بێ و، لێی بەهرەمەند بن و، بە چاکی بزانن و، بەرژەوەندییان بۆ دابین بکات، بۆیان ڕەوایە و حەڵاڵە، چونکە لە ئەصڵدا خوا شتەکانی بۆ ئەوان خوڵقاندوون:

أ - ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة، واته: ئەو (خوا) کەسێکە هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوەی دروستکردوە.

ب - ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾الجاثية، واته هەروەها (خوا): هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەمووی تێکڕا لەلایەن خۆیەوە، بۆ ئێوە ملکەچ و دەستەمۆ کردوە.

کەواتە: دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر قەدەغە بوون، ئەگەر نا ئەصڵ لە شتەکاندا بریتیە لە ڕەوا بوون و حەڵاڵ بوونیان.

---

(١) دنیای لێکردن بە چەرمی چۆلەکە: یانی دنیای لێ تەنگ و تەسك کردەوە و سەغڵەتی کرد.

## مەسەلەی چوارەم:

خوا ﷻ هەواڵ بە پێغەمبەرەکەی خۆی دەدات، کە ئەوەی لە جوولەکەکانی قەدەغە کردوە، پێشتر لە {سووڕەتی (الأنعام)دا}، بۆی باسکردوە و تەنیا خۆشیان ستەمیان لە خۆیان کرد و، بوونە هۆکاری لێ قەدەغە کرانی ئەو شتانە، نەك خوا ستەمی لێکردبن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُۖ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١- ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ ﴾، لەسەر جوولەکەکانمان قەدەغە کرد بوو، ئەوەی کە پێشتر بۆ تۆمان گێڕاوەتەوەو، بۆمان باسکردووی، ئەوەمان لە جوولەکەکان قەدەغەکردبوو، بێگومان لێرەدا مەبەست ئایەتی (١٤٦)ی سووڕەتی (الأنعام)ە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾، واتە: هەروەها لەسەر جوولەکەکانمان قەدەغە کردبوو، هەر خاوەن نینۆکێك و، لە ڕەشەوڵاخ و لە مەڕ و بزنیش، بەز و پیوەکەنیانمان قەدەغە کرد بوو، مەگەر ئەوەی کە بە پشتیانەوە نووسا بوو، یاخود لەگەڵ ڕیخۆڵەکانیان تێکەڵ بوو بوو، یاخود لەگەڵ ئیسقانیان ئاوێتە بوو بوو، ئەوەش بەهۆی ستەم و دەستدرێژییانەوە، ئاوا سزامان دان و، ئێمە لە ڕاستانین.

ئنجا لە سووڕەتی (النساء) - ١٦٠، ١٦١- دا، خوا ئاماژەی بەو دەستدرێژیی و سنوورشکێنییەی جوولەکەکان کردوە، کە بەهۆیەوە هەندێك شتیان لێ قەدەغە کراوە، لەو دوو ئایەتەدا خوا ﷻ ئەوەی ڕوون کردۆتەوە: ﴿ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦١﴾ ﴾، واتە: بەهۆی ستەمێك لەلایان ئەوانەوە کە جوولەکە بوون، (بووبوونە جوولەکە)، هەندێك بژیوی چاك و پاك، کە خوا پێشتر بۆی حەڵاڵ کردبوون، لێمان قەدەغەکردن، هەروەها بەهۆی ئەوەوە

کە خەڵکیان زۆر لە ڕێی خوا لادەدا، هەروەها بەهۆی ئەوەوە کە سوود (ربى)یان وەردەگرت، لە حاڵێکدا کە لێی قەدەغە کرا بوون، دیسان بەهۆی ئەوەوە کە ماڵ و سامانی خەڵکیان بە ناهەق و بە ناشەرعیی دەخوارد، {بەهۆی هەموو ئەو شتانەوە، هەندێك لەو ڕزق و بژێوە پاك و چاکانەی لە ئەصڵدا ڕەوان، لێمان قەدەغە کرد بوون} و، بۆ بێبڕوایان، لەوان، ئازار و سزایەکی بەئێشمان ئامادە کردوە.

٢- دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾، ئێمەش ستەممان لێ نەکردن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

لە ئەنجامی ئەو ستەم و دەستدرێژیی و ئەو خراپەکارییانەی خۆیاندا، خوا ﷻ هەندێك لەو ڕزق و ڕۆزییە پاك و چاك و سوودبەخشانە، کە لە ئەصڵدا ڕەوان، لە جوولەکەکانی بەتایبەت قەدەغە کردبوون، بەڵام بۆ خەڵکی دیکە، هەر حەڵاڵ و ڕەوان و، ئەوان وەك: سزایەك، ئەو شتانەیان لێ قەدەغە کرابوون.

جوولەکەکان هەمیشە گوتوویانە ئەو شتانەی کە لە ئێمە قەدەغە کراون، هەر لە ئەصڵدا لەلای خوا قەدەغەن، زۆرجار لەوبارەوە موناقەشەو شەڕەقسەیان لەگەڵ مسوڵمانان دا کردوە، بۆیە خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو شتانەمان بەهۆی هەڵەو تاوان و لادانی خۆتانەوە - کاتی خۆی - لێ قەدەغە کردوون، ئەگەرنا لە ئەصڵدا ڕەوان، چونکە سوودبەخش و باشن، خوای پەروەردگاریش هیچ کاتێ شتی سوودبەخش و بەکەڵك و خۆش و بەتام، قەدەغە ناکات.

## وشەی: ﴿هَادُواْ﴾ لە چییەوە هاتوە ؟

(الهَوْدُ: الرّجُوْعُ برِفْق، وَمِنْهُ: التهْوِيدُ، وَهُوَ مَشِيٌ كالدَّبِيبِ، وَصَارَ الهَوْدُ فِي التَّعَارُفِ التَّوْبَة، قال تعالى: ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ١٥٦﴾ الأعراف، أَي: تُبْنا، قَالَ بَعْضُهُمْ: يَهُود فِي الأَصْلِ مِنْ قَوْلِهِم: هُدْنا إِلَيْكَ، وَكَانَ اسْمَ مَدْحٍ، ثُمَّ صَارَ بَعْدَ نَسْخِ شَرِيْعَتِهِم، لاَزِماً لَهُمْ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَعْنَى المَدْحِ، كَمَا أَنَّ النَّصَارَى فِي الأَصْلِ مِنْ قَوْلِهِ: ﴿مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ١٤﴾ الصف، ثُمَّ صَارَ لاَزِماً لَهُمْ بَعْدَ نَسْخِ شَرِيْعَتِهِم، وَيُقَالُ: هَادَ فُلاَنٌ: إِذَا تَحَرَّى طَرِيقَةِ اليَهُودِ فِي الدِّينِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾)[1].

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص ٨٤٦ و ٨٤٧.

واتە: وشەی (هَود) واتە: گەڕانەوە بە نەرمیی، وشەی (تَهْوید)یش لەوەوە هاتوە، (وَهُوَ مَشْيٌ كالدَّبيبِ) ڕۆیشتنێکە زۆر بە لەسەرخۆیی، ئنجا وشەی (هَود) لە باوی زانایانی شارەزایی زماندا بە مانای (التوبة)یە، کە جوولەکەکان گوتوویانە: ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ﴾، ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاینەوە، (أَي: تُبْنا) واتە: گەڕاینەوە و پەشێمان بووینەوە، زانایان هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (يَهود) لە ڕیشەدا لەوەوە هاتوە، کە گوتوویانە: ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ﴾، کەواتە: (يَهود) یانی: ئەوانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، گەڕاونەوە بۆ لای خوا، کە لە ئەصڵدا ناوی مەدح و ستایش کردن بووە، بەڵام دوای ئەوەی شەریعەتەکەیان نەسخ کراوەتەوە، وشەی (يَهود) بۆتە ناوێکی پەیوەست بە جوولەکەکانەوە، بەڵام مانای مەدح ناگەیەنێ، {چونکە ئێستا نەگەڕاونەوە بۆ لای خوا، بەڵکو ئێستا لە خوا هەڵگەڕاونەوە، لە پێغەمبەری کۆتایی خوا هەڵگەڕاونەوە و، پشتیان لە شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کردوە، بەڵام هەر ناوەکەیان وا هاتوە، تازە ناوەکە بۆتە نازناوێك، نەك مانای مەدح بگەیەنێ}[1]، هەروەك چۆن (نَصارَى)لە ڕیشەدا لە قسەی خواوە ﷻ هاتوە، کە کاتی خۆی مەسیح ﷺ گوتی: ﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ ١٤﴾ الصف، کێن پشتیوانانی من، بۆ لای خوا؟ {(نصارى) ئەوانەن کە پشتیوانییان لە مەسیح کرد، بەڵام دوایی بۆتە وەصفێك کە بەوانەوە پەیوەستە، وەك نازناوێك، بەڵام دوای ئەوەی شەریعەتەکەیان نەسخ کراوەتەوە، ئێستا مانای مەدح ناگەیەنێ بۆ ئەوان، [چونکە ئەوانیش کاتێك بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ناهێنن، مانای وایە لە تەعلیمات و ڕێنماییەکانی عیساش هەڵگەڕاونەوە، هەر وەك جوولەکەکان ئەگەر بڕوا بە عیسا و بە موحەممەدیش نەکەن، مانای وایە لە تەعلیمات و بەرنامەکەی مووساش هەڵگەڕاونەوە][2]، دەگوترێ: (هَادَ فُلاَنٌ)، ئەگەر خەفتا لەوەی، کە بزانێ ڕێبازی جوولەکەکان چۆنە لە دینداریی دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾، بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و ئەوانەی کە بوونە جوولەکە، {بوونە یەهوودیی}.

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خوای پەروەردگار یەکجار لێبوردەی بە بەزەییە، بەرانبەر بە کەسانێك کە بە نەزانیی خراپە دەکەن، پاشان دەگەڕێنەوەو چاکسازیی دەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١- ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟﴾، ئنجا بێگومان پەروەردگارت بۆ کەسانێك کە خراپە بە نەفامیی دەکەن، بە نەفامیی و بە نەزانیی خراپە دەکەن، دوای ئەوە دەگەڕێنەوە و چاکسازیی دەکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَـٰلَةٍ﴾، زانایان چەند واتایەکیان بۆ وشەی (بِجَهَـٰلَةٍ) لێکداوەتەوە:

١/ (الشعراوي) لە (الخواطر)ەکەی خۆیدا، دەڵێ: (أي: بطَيْشٍ وَحُمْقٍ وَسَفَهٍ)[1]، واتە: بە نەزانیی و بە نەفامیی و بە کەوودەنیی {هەڵەیەك دەکەن}.

٢/ (راغب الأصفهاني) لەبارەی چەمك و واتای وشەی (الجَهْل)ەوە، دەڵێ:

{الجَهْلُ عَلَى ثَلاَثَة أَضْرِبٍ:

الأَوَّلُ: وَهُوَ خُلُوُّ النَّفْسِ مِنَ العِلْمِ، هَذَا هُوَ الأَصْل.

والثَّانِي: اعْتِقَادُ الشيء بِخِلاَفِ مَا هُوَ عَلَيْه.

والثَّالِث: فِعْلُ الشيءِ بِخِلاَفِ مَا حَقُّهُ أَنْ يُفْعَلَ، سَوَاءٌ اعْتَقَدَ فِيهِ اعْتِقَاداً صَحِيْحاً أَو فَاسِداً، كَمَنْ يَتْرُكُ الصَّلاَةَ مُتَعَمِّداً، وَعَلَى ذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالى: ﴿قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾البقرة، فَجَعَلَ فِعْلَ الهزْوِ جَهْلاً}[2].

---

(١) ج ١٣، ص ٨٢٧٧، المكتبة الشاملة.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٢٠٩.

واتە: وشەی نەزانین (**جهل**) سێ جۆرە:

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە نەفس زانیاریی تێدا نەبێ، واتە: بێئاگایی و نەزانیی، ئەوە ئەصڵەکەیەتی.

**دووەمیان:** ئەوەیە کە بڕوابێنی بە شتێك، بە پێچەوانەی حاڵەتی خۆیەوە، کە لەسەریەتی.

**سێیەمیان:** بریتیە لە ئەنجامدانی شتێك، کارێك بکرێ بە پێچەوانەی ئەوەوە کە شایستەیەتی، ئەو کارەی دەکرێ، چ ئەو کەسە بڕوایەکی ڕاستی بەرانبەری هەبێ، چ بڕوایەکی خراپ، وەك کەسێك کە بە ئانقەست نوێژ ناکات، {جا چ بە بڕوا پێ بوونەوە، چ بە بڕوا پێ نەبوونەوە} ئەوە نەفامیی و نەزانیی کردوە. وەك فەرموودەی خوای بەرز: کاتێك مووسا ﷺ بە بەنی ئیسرائیلی گوت: مانگایەك سەرببڕن، گوتیان: ئایا گاڵتەمان پێ دەکەی؟ ئەویش گوتی: پەنا بە خوا دەگرم کە من لە نەفامان {واتە: گاڵتەکردن بە خەڵك، کردەوەی نەفامانە} گاڵتە بە خەڵك کردنەکەی بە نەفامیی داناوە.

کەواتە: یەکێك لە ماناکانی نەفامیی و نەزانیی، بریتیە لە کردەوەی خراپ.

**٣/** (**إِبْنُ كَثِير**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا {خوڵاصەی تەفسیرەکە}[١] دەڵێ: (**قَالَ بَعْضُ السَّلَفِ: كُلُّ مَنْ عَصَى اللّٰه فَهُوَ جَاهِلٌ**)، هەندێك لە زانایانی پێشین گوتوویانە: هەر کەسێك بێ فەرمانیی خوا بکات { و سەرپێچیی لە بەرنامەو شەریعەتی خوا بکات}، ئەوە نەفام و نەزانە.

**٢-** ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾... ئنجا بێگومان پەروەردگارت بۆ کەسانێك کە بە نەفامیی خراپەیان کردوە، پاشان دوای ئەوە گەڕاونەوەو چاکسازییان کردوە، بە دڵنیایی پەروەردگارت دوای ئەوە، لێبوردەی بە بەزەییە.

هەردووك ئنجا ﴿ ثُمَّ ﴾ەکان، بۆ ڕیزبەندیی پلەپلەیی(**للترتيب الرتبي**)ن، لە نزمییەوە بۆ بەرزیی دەچێ، پیشێ خراپە دەکەن، بەڵام دوایی دەگەڕێنەوە، پەروەردگاریشت لەگەڵیان لێبوردەی میهرەبانە.

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ ﴾، ئەوەش دیسان هەر بۆ ڕیزبەندیی پلەپلەییە، واتە: ئنجا لە دوای ئەوە {یانی: (**مِن بعد فعل السوء بجهالة**)} دەگەڕێنەوەو چاکسازیی دەکەن، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ ﴾، بێگومان پەروەردگارت لە دوای ئەوە، لێبوردەی بە بەزەییە.

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص٧٤٨.

بۆیەش پێشێ دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾، واتە: لە دوای ئەو گوناهانە کە کردوویانن، بەڵام دوایی دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِهَا﴾، چونکە ڕاناوی (ها)ی سەر ﴿مِنۢ بَعۡدِهَا﴾ دەگەڕێتەوە بۆ (توبة) کە لە مانای وشەی ﴿ثُمَّ تَابُواْ﴾ وەرگیراوەو فامراوەتەوە.

دوای ئەوەی کە گەڕاونەوەو چاکسازییان کردوە، پەروەدگارت (بەرانبەریان) لێبوردەی بە بەزەییە چونکە: پێشتر سەرپێچییان کردوە، خۆشیان و خەڵکیشیان خراپ کردوە، بەڵام دوایی لەجیاتی سەرپێچیی، دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بۆ فەرمانبەریی و، لەجیاتی تێکدان و خراپەکاریی، چاکسازیی دەکەن، هەم لە خودی خۆیاندا، خۆیان چاك دەکەن، هەم ئەو خەڵکەش کە تێکیانداون و سەریان لێ شێواندوون، هەوڵدەدەن بیانگێڕنەوەو ڕاستیان بکەنەوەو، واتە: هەرچی خراپیان کردوە، هەوڵدەدەن چاکی بکەنەوەو بنیادی بنێنەوە، لە خودی خۆیان و لە خەڵك و دەوروبەریان دا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان، نـۆ (٩) ئایەتـە، ئایەتـەکانی: (١٢٠ - ١٢٨) دەگرێتـە خـۆی، کـە ئایەتـەکانی کۆتایـی سـوورەتی (النحـل)ن، ئـەم نـۆ ئایەتـەش دوو تـەوەری سـەرەکیی دەگرنـە خۆیـان:

**یەکەم:** باسی پێشەوایەتیی ئیبراهیم (خلیل اللّٰه) ﵇، بۆ مرۆڤایەتیی بە گشتی و، بۆ ئەهلی ئیمان و ئیسلام بەتایبەت و، باسی ژمارەیەك لە خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکانی ئیبراهیم کراوە و، باسی ئەوە کە شەممە هیچ پەیوەندیی بە ئیبراهیمەوە نەبووە، بەڵکو تایبەتە بە جوولەکەکانەوەو کە کاتی خۆی تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی و دووبەرەکێ وە.

**دووەم:** باسی شێوازی بنەڕەتیی بانگەوازی خەڵکە، بۆ لای خوا و، هەروەها میکانیزمە گرنگەکانی و، چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ نەیاران و دوژمن و ناحەزاندا، بە تایبەت لە بەرانبەر خراپەکاریی و ئازاریان دا، کە بابای بانگەوازکار کاتێك خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، دەبێ چۆن مامەڵە بکات.

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئیبراهیم ئوممەتێك بوو (بۆخۆی)، فەرمانبەر و ملکەچی خوا بوو، لە ناهەق دوورو عەودالی هەق بوو و، لە هاوبەش (بۆ خوا) دانەران نەبوو (١٢٠) سوپاسگوزاری چاکەکانی (خوا) بوو، ئەویش هەڵیبژارد و خستیە سەر ڕاستە ڕێ (١٢١) لە دنیاشدا چاکە (یەکی مەزن)مان پێداو، لە دواڕۆژیشدا لە بەندە چاك و پەسەندەکانە (١٢٢) ئنجا سروشمان بۆ تۆ کرد (ئەی موحەممەد ﷺ !) کە بە پاکیی و چاکیی شوێن بەرنامە و ڕێبازی ئیبراهیم بکەوە و، ئەو (بە پێچەوانەی قسەی هاوبەشدانەرەکانە وە) لە هاوبەش دانەران (بۆ خوا) نەبوو (١٢٣) بە دڵنیایی (ڕۆژی) شەممە (کە پشوو بێ و کاری تێدا نەکرێ) بۆ ئەوانە دانرا کە تێیدا کەوتنە ناکۆکیی و ڕاجیاییەوە، مسۆگەر پەروەردگاریشت لەوبارەوە کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، دادوەرییان لە نێواندا دەکات (١٢٤) بە حیکمەت و لێزانیی و ئامۆژگاریی باش، بانگەواز بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت بکەو (ئەوانەش کە لەگەڵتدا تێك دەگیرێن) بە باشترین شێواز، شەڕەقسەیان لەگەڵدا بکە، بێگومان پەروەردگارت خۆی بەوانەی لە ڕێی وی لایان داوە زاناترەو، هەر ئەویش بە ڕێی ڕاستگرتووان، زاناترە (١٢٥) هەر کاتێکیش سزاتان چەسپاند (بەسەر نەیارەکانتان دا لەبەر ئازاریان ) تەنیا بارتەقای ئەوەی پێی سزا و ئازار دراون، سزایان بدەن و، ئەگەر خۆڕاگریش بن ( و چاوپۆشیی لە خراپەیان بکەن) بە دڵنیایی ئەوە بۆ خۆڕاگران باشترە (١٢٦) کەواتە: خۆڕات بگرە ( و چاوت لە تۆڵەو سزادان نەبێ) و خۆڕاگرییشت، تەنیا بە (یارمەتی) خواوە ، بۆ مەیسەر دەبێ و، بەهۆی (ئازارو خراپەی) ئەوانەوە، خەمبار مەبەو، مەکەوە سەغڵەتییەوەش بەهۆی پیلان گێرانیانەوە (١٢٧) بە دڵنیایی خوا لەگەڵ ئەوانە دایە کە پارێزیان کردووەو، ئەوانەی چاکەکاریشن (خوایان لەگەڵدایە بە لەگەڵدابوونێکی تایبەت) (١٢٨)}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( أُمَّةً ): (أَي: كانَ أُمَّـةً وَحْـدَهُ إِذْ كانَ عِنْدَهُ مِـنَ الخَـيْرِ مَـا كانَ عِنْـدَ أُمَّـةٍ بِأَسْرِهَـا، أَو: كانَ مُنْفَـرِداً بالإِيْمَـانِ فِي وَقْتِـهِ مُـدَّةً مَـا)[1]، واتـە: ئیبراهیـم بۆخـۆی كۆمەڵـك بـوو، هێنـدەی چاكـە لـە لابـوو، هێنـدەی سـیفەتی بـاش لـەلای خـۆی كۆكردبوونـەوە، كـە لـە نێـو كۆمەڵـگاو ئۆممەتێكـدا كۆدەبنـەوە، یاخـود لـە كاتێكـدا كـە ئـەو پێغەمبـەر بـووە، خـۆی بـە تەنیـا ئەهـلی ئیـمان بـووەو، بۆتـە پێشـەوای ئیمانـداران.

( قَانِتًا ): (القُنُـوتُ: لـزُومُ الطَّاعَـةِ مَـعَ الخُضُـوعِ)، (قنـوت) بریتیـە لـە: فەرمانبەریـی لەگـەڵ ملكەچییـدا، یـان ملكەچیـی لـە ناخـەوە.

( حَنِيفًا ): (الحَنَـفُ: هُـوَ مَيْـلٌ عَـنِ الضَّـلاَلِ إِلى الإِسْـتِقَامَةِ، وَالجَنَـفُ عَكْسُـهُ، وَجَمْعُـهُ: حُنَفَـاء)، (حَنَـف) بریتیـە لـە لادان لـە گومڕاییـەوە بـەرەو ڕێـك وەسـتاویی، بـە پێچەوانـەی (جَنَـف)ەوە، [كـە بریتیـە لـە: لادان لـە ڕاسـتە ڕێ وە بـەرەو ڕێـی چـەوت]، كـۆی (حَنِيف)یـش (حُنَفَـاء)ە، واتـە: ڕێـی ڕاسـتگرتووان، یاخـود لادەران لـە ڕێـی چـەوت، بـەرەو ڕێـی ڕاسـت.

( بِٱلۡحِكۡمَةِ ): (الحِكْمَـةُ: إِصَابَـةُ الحَـقِّ بالعِلْـمِ وَالعَمَـل، أَو مَعْرِفَـةُ المَوجُـودَاتِ وَفِعْـلُ الخَـيْرَات)، (حِكْمَـة) یەكێـك لـە پێناسـەكانی بریتیـە لـەوە كـە تـۆ لـە هـەق بـدەی (پێـكانی هـەق) لـە ڕووی زانیاریـی و لـە ڕووی كـردەوەوە، هـەم وەك ناسـین، هـەق بناسی، هـەم كردەوەشـت بـە پێـی ئـەو ناسـینە ڕاسـتە بێ.

هەروەها ئاواش پێناسە كراوە: زانیاریی و ناسینی دروستكراوەكان و، ئەنجامدانی چاكەكان.

دواتریش زیاتر تیشك دەخەینە سەر چەمك و واتای وشەی (حِكْمَة).

( وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ): (الوَعْـظُ: زَجْـرٌ مُقْـتَرِنٌ بتخْوِيـف)، (وَعْـظ) تێـوە خوڕیـن و سەرزەنشـتێكە، كـە جـووت بـێ لەگـەڵ ترسـاندندا، هەندێكیـش گوتوویانـە: (هُـوَ التَّذْكِير بالخَـيْرِ فِيـمَا يَـرِقُّ لَـهُ القَلْـبُ)، بریتیـە لـە بیرخسـتنەوەی چاكـە بـۆ كەسـێك، بـە شـێوەیەك كـە دڵـی بـۆی نـەرم بـێ، واتـە: هەسـت و نەسـتی بجووڵێنـێ.

---

(١) (صفوة البيان لمعاني القرآن)، ص ١٥٨.

( وَجَٰدِلۡهُم ): واتە: شەڕە قسەو مشت و مڕیان لەگەڵدا بکە، دەگوترێ: (**جَدِلَ الرَّجُلُ جَدَلاً، فَهُوَ جَدِلٌ، إِذَا اشْتَدَّتْ خُصُومَتُهُ**)، ئەگەر کەسێك زۆر مشتومڕ بکات و شەڕەقسە بکات، ناوی (**جَدِلْ**) بۆ بەکاردێ: (**جَادَلَ مُجَادَلَةً وَجِدَالاً: إِذَا خَاصَمَ بِمَا يَشْغُلُ عَنْ ظُهُورِ الحَقِّ وَوُضُوحِ الصَّوَابِ**)، (**جَادَلَ مُجَادَلَةً وَجِدَالاً**) ئەوەیە کەسێك شەڕەقسە بکات و مشتومڕ بکات، بە شێوەیەك کە ڕێ بگرێ لەوەی هەق دەربکەوێ و، ڕێ بگرێ لەوەی ڕێك و ڕاستیی ئاشکرا بێ، چونکە لە ئەنجامی شەڕەقسەدا، عاتیفەو سۆزو ئارەزوو، دێنە ئاراوەو، هەق و ناهەق تێکەڵ دەبن.

( ضَيۡقٖ ): (**ضَاقَ الشيءُ ضَيْقاً وَالإِسْمُ: ضَيِّق، وَضَاقَ صَدْرُهُ: حَرِجَ**)، واتە: شتەکە تەنگ بوو، تەسك بوو، ناوەکەشی بریتیە لە (**ضَيِّق**) واتە: تەنگ، تەسك، (**ضَاقَ صَدْرُهُ**)، یانی: دڵ و سینەی هاتەوە یەك و، سینەی سەغڵەت بوو.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار کۆتایی سوورەتی (**النحل**)، بەم چەند ئایەتە دێنێ، کە سەرەتا باسی ئیبراهیم عليه السلام دەکات و، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئیبراهیم کۆمەڵێك بوو، ملکەچ و گەردنکەچ بۆ خوا، لادەر و وازهێنەر لە ڕێی گومڕایی و چەوت و، هاتوو بەرەو ڕێی ڕاست و، لە هاوبەش (بۆ خوا) دانەران نەبوو.

لەم چەند ئایەتەدا خوای پەروەردگار چەند مەدح و ستایشێکی زۆر بەرزی ئیبراهیم دەکات، ئیبراهیم: دۆستی تایبەتیی خوا، خۆشەویستی تایبەتیی خوا، کە وایێدەچێ: لە دوای پێغەمبەری خۆمان موحەممەد ﷺ، لە هەموو پێغەمبەران پایە بەرزتر ئیبراهیم بێ، چونکە: ئەو مەدحانەی کە خوا بۆ ئیبراهیم کردوونی، بۆ هیچ لە پیغەمبەرانی دیکە بەو ڕێژەیەو بەو ئەندازەو بەو ئاستە، ئەو مەدحانەی نەکردوون.

ئنجا لەسەر پێناسەکردنی ئیبراهیم و، باسی سیفەتە بەرزەکانی، بەردەوام دەبێ، ﴿ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، شوکرانە بژێرو سوپاسگوزار بوو، بۆ چاکەکانی خوا، بۆیە خوا هەڵیبژارد و خستیە سەر ڕاستە شەقامی خۆی.

﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ﴾، لە دنیادا چاکەیەکی مەزنمان پێدا، بێگومان چاکەی مەزنی خوا، کە بە ئیبراهیمی داوە، ئەو خستنە سەر ڕاستە ڕێیەیە، ئەو بەندایەتییە ساغ و بێ خڵتەیە کە بۆ خوای کردوە، ئەو پێشەوایەتییەتی لە دوای خۆی بۆ ئەهلی ئیمان، ﴿ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، هەروەها لە ڕۆژی دواییشدا لە ڕیزی چاکان دایە، ئەو بەندانەی کە لە لای خوا چاك و پەسندن.

﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ﴾، دوایی (ئەی موحەممەد!) سروشمان بۆ تۆ کرد کە شوێن ڕێبازی ئیبراهیم بکەوە، بە پاکیی، بە وازهێنانەوە لە ڕێی چەوت و هەڵەو، گەڕاوە بۆ ڕێی ساغ و ڕاست، ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، ئەویش لە هاوبەش (بۆ خوا) دانەران نەبوو.

ئەمە بە تەوس و توانجەوەیە، توانج گرتنە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و کافرەکان، کە دەیانگوت: ئێمە لەسەر ڕێبازی (ئیبڕاهیم)ین، نەخێر، ئیبڕاهیم هاوبەش بۆ خوا دانەر نەبوو، تەنیا خوا پەرست بوو.

ئنجا خوا ﷻ باسی مەسەلەیەکی دیکە دەکات کە هەر پەیوەستە بە مشتومڕی نێوان جوولەکەکان و ئەهلی کیتابەوە بەگشتی، لەگەڵ مسوڵمانان دا، کە مەسەلەی شەممەیە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ ﴾، بێگومان شەممە تەنیا لەسەر ئەوانە دانرا، کە تێیدا کەوتنە ناکۆکیی و ڕاجیایی {کە جوولەکەکانن} ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴾، بێگومانیش پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا، دادوەرییان لە نێوان دەکات، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە.

واتە: جوولەکەکان ئەو ڕۆژە بە پیرۆز دەزانن، کە ڕۆژی شەممەیە و، نەصرانییەکان ڕۆژی یەك شەممە بە ڕۆژی مۆڵەت و، ڕۆژێکی پیرۆز دەزانن، مسوڵمانانیش ڕۆژی هەینی، ئنجا جوولەکەکان چاویان لەوە بووە، کە مسوڵمانان شوێنیان بکەون لە پیرۆزکردنی ڕۆژی شەممەدا، بۆیە خوا دەفەرموێ: ڕۆژی شەممە تەنیا لەسەر جوولەکەکانە، کە لەویش دا کەوتنە ڕاجیایی و مشتومڕەوە، تەنیا بۆ ئەوان دانرا بوو.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر تەوەری دووەم کە لەم چەند ئایەتەدا هاتووە، دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾، بانگەواز بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت بکە، بە لێزانیی و کارامەیی و وەستایی و دانایی.

﴿ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾، هەروەها بە ئامۆژگاریی چاك، قسەیەك كە هەست و نەستیان بجووڵێنێ و عاتفە و سۆزیان بجووڵێنێ، بەڵام بەرە و خێر و چاکە و بە شێوەیەکی چاك، با ئامۆژگارییەکە بە شێوەیەکی چاك بێ.

﴿ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾، هەروەها مشتومڕو شەڕە قسەشیان لەگەڵدا بکە، بەڵام بە باشتین شێوە.

حیکمەت پێویستی نەکردوە بە هیچ وەسفێك وەسف بکرێ، چونکە حیکمەت، یانی: دانایی و لێزانیی و وەستایی و کارامەیی، بەڵام ﴿ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ﴾، بە وەسفی باش ﴿ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾، وەسفکراوە، چونکە دەگونجێ ئامۆژگاریی بکرێ، بەڵام ئامۆژگارییەکی باش نەبێ، بۆ وێنە لە نێو خەڵکی دابێ، یان شکاندنەوەی تێدا بێ، یان دڵ بریندار کردنی

تێدابێ، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾، ئامۆژگاریی پەیوەست کردوە بەوەوە، کە دەبێ بە شێوەیەکی چاك بێ، بەڵام شەڕەقسەو مشتومڕی پەیوەست کردوە، بەوەوە کە دەبێ بە باشترین شێوە بێ، چونکە شەڕەقسەو مشتومڕ، شوێنی تووڕە بوون و تێکگیرانە، بۆیە دەبێ باشترین شێوازی بۆ هەڵبژێردرێ، لەلایەن ئەهلی ئیمانەوە، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾، بێگومان پەروەردگارت زاناترە بەوەی لە ڕێی وی لایداوە، ﴿ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾، هەروەها زاناتریشە بەڕێی ڕاستگرتووان.

کەواتە: لە کەس نائومێد مەبە، هەر خوا دەزانێ، کێ گومڕایەو نایەتەوە سەر ڕێ، لە کەس نائومێد مەبەو، بە هەموو کەس ئومێدەوار بە، کاتێك کە بانگەواز دەکەی، بە گەشبینییەوە، بە کراوەییەوە، بە متمانە بەخۆبوونەوە، بە ئومێدی خێر بە خەڵك بوونەوە، بانگەواز بکە.

﴿ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ ﴾، ئەگەر سزاتان چەسپاند (بەسەر کەسانێکی نەیارو دژو خراپەکاردا) تەنیا وەك ئەوەی پێی سزادراون، سزایان بدەن.

کەسێك قسەیەکتان پێ دەڵێ، یان ئازارێکتان دەدات، هەر ئەوەندە مۆڵەتە، کە بە ئەندازەی خۆی سزاو ئازاری بدەنەوە.

وەك لە ئایەتی (٤٠)ی سووڕەتی (**الشورى**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴾، سزای هەر خراپەیەکیش خراپەیەکی وەك خۆیەتی، نابێ تێپەڕێنی! ﴿ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر خۆتان ڕابگرن لە بەرانبەر سزاو ئازاریان دا، ئازاریان نەدەنەوە، ئەوە بۆ خۆڕاگران باشترە، وەك لە سووڕەتی (**الشورى**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: هەرکەس لێ ببووریٰ و چاکسازیی بکات، پاداشتی لەسەر خوایە، قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات.

هەروەها لە سووڕەتی (**الشورى**) دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴿٤٠﴾ ﴾، سزای هەر خراپەیەك، {یانی قسەیەکی ناشیرین، کردەوەیەکی بەدو زیانبەخش} خراپەیەکی وەك خۆیەتی، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ ﴾. هەر کات سزاشتان چەسپاند، تەنیا بە ئەندازەی ئەوە کە پێی سزا دراون، سزا بدەنەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴾، ئەگەر خۆڕاگربن، ئەوە باشترە بۆ خۆڕاگران.

یانی: خۆڕاگربن لەسەر ئەوەی: ئێوە قسەی وەك هی وان نەڵێن و چاوپۆشییان لێ بکەن و، لێبوردنیان لەگەڵدا بکەن، ﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾، خۆڕاگریش بە، خۆڕاگرتنیش تەنیا بە خوا دەبێ، دەبێ خوا دڵت بەهێز بکات و، یارمەتییت بدات و کارئاسانییت بۆ بکات، کە لە بەرانبەر خراپەی خراپەکاران دا خۆڕاگربی و، لەگەڵ ئەواندا نەچیە تەرازووەوە و نەچیە ئاستی نزمی ئەوانەوە، ﴿ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾، بە هۆیانەوە خەمبار مەبە و، خەمیان لێ مەخۆ، واتە: هێندە خەمبار و دڵتەنگ مەبە، کە لەگەڵ بانگەوازکارێك دا نەگونجێ، کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات، کەسێك خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، دەبێ زۆر سینگ فراوان و دڵ گەورە بێ و، نابێ دڵی وەك شارە مێرووله وابێ، بە دڵۆپە ئاوێك وێران بێ، دەبێ وەك بەحر بێ و، بە ئاسانیی شلوێ نەبێ، ﴿ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ١٢٧ ﴾، هەروەها لە سەغڵەتییدا مەبە، بەهۆی ئەو پیلانگێڕییەوە کە لە دژی تۆ و، لە دژی پەیام و بەرنامەکەت، دەیکەن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨ ﴾، بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە کە پارێزیان کردووە، لەگەڵ ئەوانەشدایە کە چاکەکارن.

پارێزیان کردوە، وەك نێوان خۆیان و خواو، چاکەکارن، وەك و نێوان خۆیان و خەڵك.

هەڵبەتە ئەم لەگەڵدابوونەی خوا، لەگەڵدابوونێکی تایبەتە، ئەگەر نا، خوا لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانی دا هەیە، بە زانیاریی خۆی و بە دەسەڵاتی خۆی و، بە ویستی خۆی و، بە سەرپەرشتییکردنی خۆی، بەڵام ئەم لەگەڵدابوونەی بۆ ئەوانەی کە ئەهلی پارێزکاریی و ئەهلی چاکەکارییـن، لەگەڵدابوونێکی تایبەتە **(مَعيّة خاصّة)**

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە خوا بە شێوەیەکی تایبەت لەگەڵماندا دەبێ و، لە خزمەتی دابین و، بە جۆرێك بین کە بۆخۆی: سەرپەرشتییمان دەکات و، ئاگای لێمان دەبێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

بە دڵنیایی ئیبراهیم پێشەوایەك بوو، بارتەقای ئۆممەتێك بوو، ملکەچی خوا بوو، عەوداڵی پاکیی و چاکیی بوو، هاوبەشدانەر نەبوو، سوپاسگوزاری خوا بوو لەسەر چاکەکانی، خوا هەڵیبژارد بوو و، خستبوویە سەر ڕێی ڕاست و، لە دنیادا چاکەی هەرە مەزنی پێدا بوو، لە دواڕۆژیش دا لە ڕیزی بەندە پەسندەکانی خوادایە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً ﴾، بە دڵنیایی ئیبراهیم ئۆممەتێك بوو، واتە:

أ- لە جێی کۆمەڵێکی گەورە بوو، یانی: پێشەوا بوو لە ئیمان هێنان و لە دینداریی و چاکەکاریی دا، گوتراوە: (كَانَ فِي الفَضْلِ وَالكَمَالِ بِمَنْزِلَةِ أُمَّةٍ كامِلَةٍ)، لە چاکەکاریی و تەواویی دا، وەك ئۆممەتێکی تەواو بوو.

ب- یاخود: ئەو کاتە لە دینداریی دا بە تەنیا خۆی بوو، خوا بە یەکگر و خواپەرست و، بوو بە پێشەوای خواپەرستان، بەڵێ: لەو کاتی دا کە ئەو ڕەوانەکرا، لە ڕۆژگاری ئەودا، هیچ خوا بە یەکگرێکی دیکە، کە تەنیا خوا بپەرستێ، نەبوو جگە لەو.

٢)- ﴿ قَانِتًا لِّلَّهِ ﴾، (القَانِتُ: المُطِيعُ الخَاضِعُ)، (قَانِت) واتە: فەرمانبەری ملکەچ بۆ خوا، بۆ خوا ملکەچ بوو، هەم دەری و هەم دەروونی، هەم ڕواڵەتی و هەم پەنهانی، بۆ خوا ملکەچ بوو.

٣)- ﴿ حَنِيفًا ﴾، (الحنيف) (المُجَانِبُ للباطِلِ وَالمَائِلُ نَحْوَ الحَقِّ)، (حَنِيف) کەسێکە خۆی لە باطیڵ دوور بگرێ و بە لای هەقدا بشکێتەوە و، ڕوو لە هەق بکات.

٤)- ﴿ وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾، له هاوبەش (بۆ خوا) دانەران نەبوو، ئەمە توانج دانە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە لافی ئەوەیان لێدەدا: ئەوان شوێنکەوتووی ئیبراهیم عليه السلامن، لەسەر ڕێبازی ئیبراهیمن، ئنجا خوا دەفەرموێ: نەخێر ئەو لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبوو، یانی: هیچ شتێك و هیچ کەسێکی لە هیچ شتێکدا، کە تایبەتە بە خواوە، نەدەهێنایە ئاستی خوا سبحانه وتعالى چونکە شیرك وەك لە باسێکی سەربەخۆدا لە کۆتایی سوورەتی (یوسف)دا گوتوومانە: کرۆك و جەوهەری شیرك ئەوەیە: کە غەیری خوا بهێنرێتە ئاستی خوا، لە شتێك لەو شتانەدا کە تایبەتن بە خواوە، وەك لە سوورەتی (الشعراء)دا، موشریکەکان دەڵێن: ﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾.

واتە: سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییان دا.

بەڵێ: شیرك یەکسانکردنی جگە لە خوایە لەگەڵ خوادا، هەر کات کەسێك، یان دروستکراوێك، لە شتێکدا یاخود لە چەند شتێکدا، یەکسان بکرێ لەگەڵ خوادا، ئەوە پێی دەگوترێ: شیرك {هاوبەش بۆ خوا دانان}.

٥)- ﴿ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ﴾، ئیبراهیم سوپاسگوزار بوو بۆ چاکەکانی خوا، شوکریش وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە، بە سێ شتان دەکرێ:

**یەکەم:** بە عەقڵ و دڵ دەکرێ، کە چاکەکان لە خوا بزانی: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ.. ﴿٥٣﴾ ﴾النحل، واتە: هەر چاکەیەك لە ئێوەدا هەیە لە خواوەیە.

**دووەم:** هەروەها بە زمان دەکرێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾الضحى، واتە: چاکەی پەروەردگارت باس بکە، یانی: چاکەکە بۆ خوا بگێڕەوە، بە زمان.

**سێیەم:** هەروەها بە ئەندامەکان دەکرێ: ﴿ اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، واتە: ئەی بنەماڵەی داوود! شوێنکەوتوانی داوود! سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام بدەن، کەواتە: شوکر بە کردەوەش دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە نیعمەتەکانی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێن.

٦)- ﴿ اجْتَبَاهُ ﴾، (خوا) هەڵیبژارد بوو، (الإجْتباء: الإخْتيارُ، إفْتِعَالٌ مِنْ جَبَى، أَي: جَمَعَ)، (إجْتباء) لەسەر کێشی (إفْتِعَالٌ)ە، یانی: هەڵبژاردن، لە (جبى)وە هاتوە، یانی: کۆی کردەوە.

(**جابية**) بە حەوزی ئاو دەگوترێ کە ئاوی تێدا کۆ کرابێتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ ﴿١٣﴾ ﴾سبا، دەفرە زلەکان، وەك حەوزە گەورەکانی ئاو، کەواتە: (**إجْتباه**) یانی: خوا هەڵیبژاردبوو و، گوڵبژێری کردبوو، لەبەرئەوەی شایستە بوو.

٧)- ﴿ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، خستبووشیە سەر ڕێی ڕاست، (**جَعَلَهُ عَلَى الصِّرَاطِ المُستقِيم**).

٨)- ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ﴾، لە دنیادا چاکەیەکی هەرە مەزنمان پێدا بوو، ئەو چاکە هەرە مەزنەش، ئەوە بووە، کە خوا هەڵیبژارد بە پلەی پێغەمبەرایەتیی (**نبوّة**)، دوایی پلەی ڕەوانەکراوێتیی (**رسالة**) و، دوایی پلەی دۆستی تایبەت (**خُلّة**)، چونکە ئیبراهیم دۆست و نزیك و خۆشەویستی خوای پەروەردگار بووە، پاشان ئەو هەموو نیعمەتانەی دیکە کە پێی داون.

٩)- ﴿ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بێگومان ئەو لە دوارۆژیشدا لە چاکانە.

(**الصَّلاَحُ: تَمَامُ الإِستِقَامَةِ فِي دِينِ الحَقِّ**)، (صَلاَح) بریتیە لەوە کە بە ڕێکیی و بە تەواویی ئینسان پابەندبێ بە پەیام و بەرنامەی هەقەوە.

ئنجا ئەمە قبووڵ و وەڵامدانەوەی دوعایەکەیەتی کە لە سوورەتی (**الشعراء**)دا، دەڵێ: ﴿ رَبِّ هَبْ لِى حُكْمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارم! حیکمەتم پێ بدە و بمخە گەڵ صالحان، بە چاکانەوەم پەیوەست بکە.

ئێمە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهيم**)دا، باسی ژیان و بەسەرهات و، هەڵوێستەکان و، پێگە و تایبەتمەندییەکانی، ئیبراهیمان کردوە، بۆیە لێرەدا ئاوا بە خێرایی بەسەر ئەو وەسفە گەورانەی دا تێپەڕین، کە خوای پەروەردگار ئیبراهیمیان پێ پێناسە دەکات.

**مەسەلەی دووەم:**

**خوا فەرموویەتی: دوایی ئەی موحەممەد ﷺ! سروشمان بۆ كردی، كە بە پاكیی و بە چاكیی پەیڕەویی لە ڕێبازی ئیبراهیم بكەو، بە دڵنیایی ئەو لە هاوبەشدانەرانیش نەبوو.**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٢٣ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

۱)- ﴿ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾، دوایی سروشمان بۆ لای تۆ كرد، پەیاممان بۆ لای تۆ نارد بە شێوەی پەنهان، بە دڵنیایی لێرەدا دوێنراو (**خاطب**) پێغەمبەری خاتەمە، موحەممەد ﷺ، چونكە هەموو قورئان سەرەتا پێغەمبەری خاتەمی پێ دوێنراوە، بۆیە بە پێی سیاق و بە سەلیقەش دیارە، ئەو كەسەی وەحیی بۆ كراوە، كە بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم بكەوێ، بێگومان ئەو كەسەیە كە قورئانی بۆ دابەزیوە.

۲)- ﴿ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، كە بە ساغیی و پاكیی بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم بكەوە، پێشتر باسی مانای: (**حَنِيْف**)مان كرد، كە بریتیە لەوەی كەسێك لە باتیڵ بەرەو هەق بێتەوەو، واز لە چەوت و لاریی بێنێ و، بێتە سەر ڕاستە شەقام.

(**راغب الأصفهاني**) گوتوویەتی:

**(المِلَّةُ كالدِّيْنِ، وَهُوَ اسْمٌ لِمَا شَرَعَهُ اللَّهُ تَعَالَى لِعِبادِهِ عَلَى لِسانِ الأَنْبياءِ ليتوصَّلُوا بهِ إلى جوَارِ اللَّهِ، وَالفَرْقُ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الدِّيْنِ، أَنَّ المِلَّةَ لاَ تُضَافُ إلاَّ إلى النَّبيّ الَّذي تُسْنَدُ إليْهِ).**

واتە: (**مِلَّة**) وەك دین وایە، ناوە بۆئەوەی خوا لەسەر زمانی پێغەمبەران بۆ بەندەكانی كردوویەتە بەرنامە، تاكو بەهۆیەوە بگەنە نزیكیی خوا، جیاوازیی نێوان (**دین**) و (**مِلَّة**)یش ئەوەیە كە (**مِلَّة**) تەنیا پاڵ دەدرێتە لای ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە پێیەوە تایبەت كراوە.

بەڵام دین پاڵدەدرێتە لای خوای پەروەردگار، دەگوترێ: (**دین اللە**)، بەڵام دەگوترێ: (**مِلَّة إبرهيم**) و (**مِلَّة مُحَمَّد**)، یان (**مِلَّة عيسى**) واتە: ئەو ڕێبازەی كە ئەو پێغەمبەرە ﷺ گرتوویەتەبەر.

منیش دەڵێم:

لە ڕاستییدا (**دین**) بریتییە لەو هەقە موتڵەقەی، خوا بە شێوە تیۆریی (**نظري**) دەینێرێ و، (**ملّة**)یش هەر ئەو هەقەیە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پراکتیزەی دەكات لەسەر ئەرزی واقیع، كە دوای جێبەجێكرانی پێی دەگوترێ: ڕێباز (**مِلّة**) هەر وەك سوننەتیش، لەگەڵ قورئان دا بە هەمان شێوەیە، سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بە مانا ڕاستییەكەی، ئەو ڕێبازەیە كە پێغەمبەر ﷺ لەسەری ڕۆیشتوە، دینی خواش كە لە قورئان دا بەرجەستەیەو، لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ جێبەجێ كراوە، پێی دەگوترێ: سوننەت[1].

ئنجا میللەتی هەر پێغەمبەرێك (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام): نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، موحەممەد - واتە: ئەو ڕێبازەی كە پێیدا ڕۆیشتوون - هەر بریتی بووە لە دینی خوا ﷻ، بەڵام ئەگەر پاڵبدرێتە لای پێغەمبەرێك، ئەوە پێی دەگوترێ: ئەو ڕێبازە، ئەو ئایینە پراكتیزەو جێبەجێكراوە، لە لایەن ئەوە پێغەمبەرەوە ﷺ، و كاتێك پاڵدەدرێتە لای خوای پەروەردگار، پێی دەگوترێ: (دین) ئایین و بەرنامە.

كە دەفەرموێ: ﴿ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗا ﴾، واتە: لە هێڵە گشتییەكاندا بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم بكەوە، نەك لە وردەكارییەكانداو، لەو شتانەدا كە تایبەتن بە ژینگەو بارودۆخێك كە ئیبراهیم تێیدا ژیاوە، هەر لێرەشدایە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ﴿٤٨﴾ ﴾المائدة، واتە: بۆ هەركامێكتان بەرنامەو شێوازێكمان داناوە، بۆ هەر كام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) بە پێی حاڵەتی ژینگەیی و جوگرافیی و، بە پێی بارودۆخی كۆمەڵایەتیی و سیایی و، ئەو قۆناغ و حاڵەتەی كە ئەوان تێیدا ژیاون، لە وردەكارییەكاندا، جیاوازیی هەبووە، لە نێوان بەرنامەكانیاندا، بەڵام لە هێڵە گشتییەكانیاندا، هەموویان یەك بوون.

**٣)- ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾**، هەروەها ئیبراهیم لە هاوبەش دانەران نەبوو، ئەمە جارێكی دیكەش توانج گرتنە لە كافرەكان و هاوبەش بۆ خوادانەرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ كە بانگەشەی ئەوەیان دەكردو لافی ئەوەیان لێدەدا: كە بە دوای ڕێبازی ئیبراهیم ﷺ كەوتوون، بۆیە هەمیشە خوا جەخت لەوە دەكاتەوە، كە ئیبراهیم لە هاوبەش دانەران نەبوو، لە حاڵێكدا كە ئەوان هاوبەشیان بۆ خوا دادەنا، مەنات و لات و عوززاو هوبەل و، ئەو بت و صەنەمانەیان

---

(١) بۆ زانیاریی زیاتر لەوبارەوە، دەتوانێ سەرنجی كتێبی:{پێناسەو گرنگیی و پێویستیی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ} بدەی، چاپی دووەم / ٢٠١٨ ز.

دەپەرست، هەواو ئارەزووی خۆیان دەپەرست، زۆربەی دروستکراوەکانی خوا ﷻ، کەم و زۆر لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا، وەك خۆرو مانگ و ئەستێرەو دارو بەردو پەیکەرو طاغووتەکان، دەپەرستران، وەك هەموو گەلانی دیکەی دنیا، بەڵام ئیبراهیم ﷺ جگە لە خوا، هیچ کەس و هیچ شتێکی دیکەی نەپەرستوە.

کەواتە: ئەو کەسەی بەڕاستیی بەرگریی لە ڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ دەکات و، بەڕاستیی ڕێبازی ئەوی گرتوە، کەسێکە کە جگە لە خوا هیچ شتێکی دیکە پەرستراوی نەبێ.

زۆرجاری دیکەش گوتوومانە، پەرستراوە (**معبود / إله**) کەسێکە ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕی بە گەورەگرتن و، ئەوپەڕی شەرم و، ئەوپەڕی سام و هەیبەتی بۆ دەربڕین و، ئەوپەڕی پشت پێبەستن و، ئەوپەڕی مل بۆ کەچکردن و، ئەوپەڕی لێترسانی بەرانبەر ئەنجام بدرێ، واتە: هەر کەسێك و، هەر شتێك، ئەوپەڕی خۆشویستنت بۆی هەبێ، یان ئەوپەڕی بەگەورە گرتنت بۆی هەبێ، یان ئەوپەڕی بە بەرزگرتنت بۆی هەبێ، یان ئەوپەڕی پشت پێبەستنت بۆی هەبێ، یان ئەوپەڕی سام و هەیبەتت لێی هەبێ، ئەو کەسە، یان ئەو شتە پەرستراوی تۆیە !

بەڵام خوا ﷻ بە تاکەپەرستراو (**الإلـه الوحيـد**)ی تۆ دانانرێ، تاکو هەموو ئەوانەت وێکڕاو تێکڕا بۆی نەبێ، وێکڕا: پێکەوە، تێکڕا: هەموویان.

**مەسەلەی سێیەم:**

**شەممە تایبەتە بەو جوولەکانەوە، کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی و ناکۆکیی و، هیچ پەیوەندیی بە ئیبراهیمەوە نەبووەو، خواش دادوەرییان لە نێواندا دەکات، لە ڕۆژی دوایی دا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ﴾، بێگومان شەممە تەنیا لەسەر ئەوانە دانرابوو کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیاییەوە.

{عُدِّيَ (جَعَلَ) ب (عَلَى) لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى: فُرِضَ}، واتە: (جعل) بە (على) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای پێویستبوو (فُرِضَ)ەی بخرێتە نێو، (جُعِل) یانی: گێڕاو، دانرا، بەڵام کاتێك کردارێك بە پیتێکی دیکە، کە لە حاڵەتی ئاسایی دا بەرکاری پێناخوازێ، بەرکار دەخوازێ، مانای وشەیەکی دیکەشی دەخرێتە نێو، وێڕای مانا ئەسڵییەکەی خۆی.

ئنجا ئێستا لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ... ﴾، یانی: بێگومان شەممە فەڕز کراوەو پێویست کراوە لەسەر ئەوانەی کە تێدا کەوتوونە ڕاجیایی، واتە: هیچ پەیوەندیی نیە بە ئیبراهیم ﷺەوە، تاکو مسوڵمانانێك کە شوێنکەوتووی ئیبراهیم ﷺن و، پێغەمبەری خاتەم ﷺ یش، مولزەم بن، بە ڕەچاوکردنی شه ممە !

٢)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، بێگومانیش پەروەردگارت لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، دادوەرییان لە نێواندا دەکات.

٣)- ﴿ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە.

## حیکمەت و چۆنیەتی پەیوەست بوونی ئەم ئایەتە، بە ئایەتەکانی پێش خۆیەوە چیە ؟

دوای ئەوەی پێشتر بەرپەرچی هاوبەشدانەرەکان درایەوە، کە ئیبراهیم لەوان نەبووە! ئەمجارە بەرچی جوولەکەکان دەدرێتەوە، کە لافی پەیڕەویی لێکردنی ئیبراهیم لێدەدەن.

پێشتر خوا ﷻ فەرمووی: ئیبراهیم هاوبەش بۆ خوا دانەر نەبووە، ئەمجار بەرپەرچی جوولەکەکان دەداتەوە، کە نەخێر، ئیبراهیم ﷺ وەك ئێوە بانگەشە دەکەن، وانەبووە، بەڵکو ڕێبازەکەی جیابووە لە ڕێبازی ئێوە، بە بەڵگەی ئەوە کە: شەممە کە تایبەتمەندییەکی زەقی جوولەکەکانە، هیچ پەیوەندیی نەبووە بە ئیبراهیم ﷺەوە، بەڵکو تایبەت بووە بە جوولەکەکانەوە.

هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (١٦٣ - ١٦٦)دا، بە تەفصیل باسی بەسەرهاتی شەممە شکاندنی جوولەکەکانمان کردە، ئەمەش دەقی ئەو چوار ئایەتە موبارەکەیە:

﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ ﴾.

خوڵاسەی ئەو بەسەرهاتەش، بەمجۆرەیە بوو:

جوولەکەکان داوایان لە مووسا ﷺ کردوە، کە ڕۆژێکیان لە حەفتەدا بۆ داوا لە خوا بکات، تاکو پشووی تێدا بدەن و هیچ کارێك نەکەن، ئەویش ڕۆژی شەممەی بۆ داناون، بەڵام خەڵکی ئەو ئاوەدانییە، کە شارێکە گەورە بووە، لەسەر دەریایەك بووە، ئیشیان بریتی بووە لە ڕاوە ماسیی، کە دەبووایە ڕۆژانی شەممە ئیش نەکەن، خواش ﷻ وەك تاقیکردنەوەی ئەوان وای کردبوو، کە لە ڕۆژانی شەممەدا ماسییەکان دەهاتن،

سەریان دەردەهێنا، بەڵام لە ڕۆژەکانی دیکەی حەفتەدا دیار نەدەمان، ئەوانیش هەڵسان حیلە شەرعێکیان کرد، گوتیان: ڕۆژی شەممە ڕاو ناکەین، بۆ ئەوەی شەممە نەشکێنین، بەڵام ڕۆژانی شەممە ماسییەکانیان دەهێنایە تەنکاوان، دوایی بەربەستیان دروست دەکرد، بۆئەوەی مەجالیان نەبێ بگەڕێنەوە نێو دەریا، ئنجا ڕۆژانی دیکەی هەفتە دەچوون، بە کاوەخۆ[1] ماسییەکانیان دەگرت، کە ئەوەش بۆ شکاندنی شەممە فێڵێك بوو، بۆیە خوا لەسەر ئەوە سزای دان، وەك لە درێژەی ئایەتەکان دا دەفەرموێ: خوا سزای دان و کردنی بە مەیموون.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە:

گەورەکانیان بوون بە بەرازو، گچکەکانیشان بوون بە مەیموون، بەراز ئاژەڵێکە زۆر ئارەزوو بازو، چڵێسە، مەیموونیش زۆر لاساییکەرەوەیە، ئنجا گەورەکانیان بوونە بەراز، چونکە بەهۆی تەماع و چڵێسییەوە، بێ فەرمانییان کردوەو فێڵبازانە شەممەیان شکاندوە، گەنجەکانیشیان لەبەرئەوەی شوێن گەورەکانیان کەوتن و، لاساییان کردنەوە، وەك چۆن مەیموون لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە، ئەوانیش بەوە سزادران کە کران بە مەیموون.

دەربارەی بەرپەرچدانەوەی هاوبەش پەیداکەرو، جوولەکە و نەصرانییەکان، کە ئیبراهیم ڕێبازەکەی جیابووە لە جوولەتیی و گاورایەتیی، خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ آل عمـران.

لێرەدا خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی گلەیی و سەرزەنشت ئاڕاستەی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات و، دەفەرموێ: ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی لەبارەی ئیبراهیمەوە مشتومڕ دەکەن؟ خۆ تەورات و ئینجیل لە دوای وی دابەزیون، ئایا نافامن، ئەوە دامانـا ئێوە لەبارەی شتێکەوە کە زانیارییتان هەیە مشتومڕو موناقەشە دەکەن، بەڵام شتێك کە زانیارییتان

---

(١) بەکاوەخۆ: بە شێنەیی، بە بێ پەلەپەل کردن .

لەبارەیەوە نیە بۆچی موناقەشە دەکەن ؟.... ئیبراهیمیش ﷺ نزیکەی بە لای کەمەوە پێنجسەد، شەشسەد (٥٠٠ - ٦٠٠) ساڵ پێش مووسا ﷺو بەلای کەمەوە هەزارو پێنجسەد (١٥٠٠) ساڵ پێش عیسا ﷺ ژیابێ و، خوا (صُحُف)ی بۆ ناردبێ، هیچ مەعقووڵ نیە، بڵێن: ڕێبازەکەی ئەو هی ئێمە بووە، چونکە بێگومان ئەو ڕێبازو بەرنامەی تایبەت بەخۆی بووەو، گونجاو بووە لەگەڵ بارودۆخ و هەلومەرجی ئەو کاتەدا.

پاشان ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبەرێکی نێو دەوڵەتیی و نێو نەتەوەیی بووە، لەو شوێنانە بووە: (عێراق، شام، میسر، حیجاز)، بەڵام هەر کام لە مووساو عیسا (علیهما السلام)و پێغەمبەرەکانی دیکەی بەنی ئیسرائیل، پێغەمبەری هۆزو نەتەوەیەکی دیارییکراو بوون، کە گەلی {بەنی ئیسرائیل} بووە، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَحْنُ الآخِرُونَ السابِقُونَ يَوْمَ الْقِيامَةِ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنا، وَأُوتِيناهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، ثُمَّ هَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِي فَرَضَهُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، فَاخْتَلَفُوا فِيهِ، فَهَدَانا اللَّهُ لَهُ، الناسُ لَنا فِيهِ تَبَعٌ، الْيَهُودُ غَداً، وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ}** (**أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٧٠٣ وَمُسْلِمٌ: ٨٥٥**).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێمە دوایەمینە پێشکەوتووەکانین لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، هەرچەندە ئەوان لە پێش ئێمەدا کتێبیان پێدرابوو و، ئێمە دوای ئەوان کتێبمان پێدرابوو، کەچی ئەوە ڕۆژەکەیانە (واتە: ڕۆژی هەینی) کە لەسەریان پێویست کرا، بەڵام ئەوان تێیدا کەوتنە ڕاجیایی، بەڵام خوا ئێمەی بۆ ڕێنمایی کرد، بۆیە خەڵك (واتە: خاوەن کتێبەکان) شوێنکەوتووی ئێمەن: جوولەکە بەیانی و، نەصرانییەکانیش دوای بەیانی.

چونکە هەینی، دێ، ئنجا شەممەو یەك شەممە دێن، کە ڕۆژانێکن بۆ پشوودانی شوێنکەوتووانی سێ ئایینە ئاسمانییەکان:

{جوولەکایەتیی، نەصرانییەت، ئیسلام}[1].

---

(١) لە ڕاستیی دا تەنیا یەك ئایینی خوایی و ئاسمانیی هەیە کە ناوی (ئیسلام)ە، بەڵام هەندێك جاران بە مەبەستی حاڵییکردن وشەی (ئایینە ئاسمانییەکان) بەکار دێنین .

### مەسەلەی چوارەم:

خوا فەرمان دەكات بە بانگەوازكردن بۆ ڕێبازی خۆی بە لێزانیی و، ئامۆژگاریی باش و، مشتومڕو قسەكردن بە باشترین شێوازو، ڕایدەگەیەنێ، كە هەر خۆی زاناترە بە گومڕایان و ڕێی ڕاستگرتووان، پاشان لەبارەی بەرپەرچدانەوەی خراپەی نەیارانەوە، لە كاتی بانگەوازدا فەرمانبەر بە خۆڕاگریی و سینە فراوانیی و پارێزكاریی و چاكەكاریی دەكات، بۆ سەرجەم بانگەوازكاران، بەتایبەت سەرەوەریان موحەممەد ﷺ:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾:

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

لە دوو توێی ئەم چوار ئایەتەدا، خوا ﷻ پازدە (١٥) ڕاستیی ڕادەگەیەنێ، كە ئێمە لە پازدە بڕگەدا دەیانخەینە ڕوو:

١)- ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ﴾، بانگەواز بكە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت، خەڵك بانگ بكە، واتە: ئەو كەسەی كە خاوەنی تۆیە، پەروەردەكەری تۆیە، ژیێنەرو بژیودەری تۆیە، مرێنەری تۆیە، خەڵك بۆ لای ڕێبازی ئەو پەروەردگارەت بانگ بكە، بەڵام ئایا چۆنیان بانگ بكات ؟!

٢)- ﴿ بِٱلْحِكْمَةِ ﴾، بە حیكمەت.

پێشتر تۆزێك پێناسەی حیكمەتمان كرد، ئێستاش دەڵێین:

أ/ (الحِكْمَةُ: المَعْرِفَةُ المُحْكَمَةُ الصَّائِبَة المُجَرَّدَةُ عَنِ الخَطَأ)، (حِكْمَة) بریتیە لە زانستێكی پتەوی ڕاستی ڕووت لە هەڵە، {هیچ هەڵەو پەڵەی ڕەگەڵ نەكەوتبێ}.

ب/ هەروەها بۆ پێناسەی (**حِكْمَة**) گوتراوە: (**الحِكْمَةُ: اسْمٌ جَامِعٌ لِكُلِّ كَلاَمٍ أَوْ عِلْمٍ يُرَادُ فِيهِ إِصْلاَحُ حَالِ الناسِ إِصْلاَحَاً مُستمِرّاً لاَ يَتَغيَّر**)، (**حِكْمَة**) بریتیە لە ناوێکی کۆکەرەوە بۆ هەر قسەیەك و، هەر زانیارییەك کە چاککردنی کاروباری خەڵکی تێدا ڕەچاو کرابێ، حاڵەکەیان بە شێوەیەك چاك بکرێ، کە بەردەوام بێ و نەگۆڕێ.

پێشتریش گوتمان: (**حِكْمَة**) بە مانای زانایی، دانایی، لیزانیی، دێ، هەروەها (**حِكْمَة**) ئەوەیە کە ئینسان لە ڕووی زانیاریی و، کردەوە، ئامانج بپێکێ.

٣)- ﴿ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ﴾، هەروەها بە ئامۆژگاریی باش بانگەواز بۆ ڕێی پەروەردگارت بکە.

(**الوَعْظُ: القَوْلُ الَّذِي يَلِينَ نَفْسُ المَقُولِ لَهُ لِعَمَلِ الخَيْرِ**)، (**وَعْظ**) قسەیەکە کە بابای قسەلەگەڵکراو، دڵی نەرم بێ بۆ کاری چاکە و، بە دەم بانگەوازکارەوە بێ.

حیکمەت زیاتر دواندنی عەقڵ و هۆشە، بەڵام (**موعظة**) زیاتر جەختکردنەوەیە لەسەر هەست و نەست و دڵ و دەروون و حاڵەتی سۆزداریی مرۆڤ.

٤)- ﴿ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾، هەروەها بە شێوازێك کە باشترە، شەڕە قسەو مشتومڕیان لەگەڵ دا بکە، واتە: لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە کاتی بانگردنیان دا تێکدەگیرێن، (**الجدَالُ: الإِحْتِجَاجُ لِتَصْوِيبِ رَأْيٍ، وَإِبْطَالِ مَا يُخَالِفُهُ أَوْ عَمَلِ ذَلِكَ**)، (**جدَال**) بریتیە لە بەڵگە هێنانەوە بۆ سەلماندنی ڕاستیی ڕایەك، یاخود پووچەڵکردنەوەی ڕایەك کە پێچەوانەی ئەو ڕایە ڕاستەیە، یاخود ئەنجامدانی ئەوە.

٥)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت زاناترە بەو کەسەی کە لە ڕێی وی لایداوە، ون بووە، سەرگەردان بووە.

واتە: لە کەس نا ئومێد مەبەو، هەمیشە گەشبین و ئومێدەواربە و، هەمیشە خێر لە خەڵك چاوەڕێ بکە.

٦)- ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾، هەر ئەویش زاناترە بە ڕێی ڕاست گرتووان، ئەوانەی کە ڕێی ڕاست دەگرن، هەر خوا زاناترە پێیان، کەواتە: هەر لە ڕێوە: زەڕب (x) بەسەر کەسدا مەهێنەو، هەر لە ڕێوە: کەس حوکم مەدە، بەوە کە گومڕایەو نایەتە سەر ڕێ!

٧)- ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ ﴾، ئەگەر سزاتاندا، واتە: کەسانی لاڕێ و نەیاری دەستدرێژکار، (**المُعَاقَبة: الجَزَاء عَلَى فِعْلِ السُّوءِ**)، (**مُعاقَبة**) بریتیە لە سزادان لەسەر کردەوەی خراپ، بە شێوەیەك کە ئەنجامدەری خراپەکە، بۆی خراپ بێت و حاڵی پێی تێکبچێ، خوا دەفەرموێ: ئەگەر خەڵکتان سزادا ...

٨)- ﴿ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ ﴾، بەو شێوەیە کە پێی سزادراون، سزا بدەن.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لە کاتی بانگ کردن و بانگەوازدا، جاری وایە لەگەڵ کەسانێك دا تێکدەگیرێی، کە بە شێوەیەکی ناشایست مامەڵە دەکەن، ڕەفتارو گوفتارێکی ناشایستیان لێ دەبیستی و دەبینی، ئنجا خوا دەفەرموێ: وەك خۆیان مامەڵە بکەنەوە، چونکە سزای خراپە، خراپەیەکی وەك خۆیەتی ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ ﴾الشوری.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ ﴾، ئەوە بۆ (**مُشَاكَلَة**)یە و، وەك ئەو ئایەتەیە کە لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ١٩٤ ﴾، واتە: ئەگەر یەکێك دەستدرێژیی کردنە سەر، بە وێنەی ئەوە کە دەستدرێژیی کردوونە سەر، دەستدرێژیی بکەنەوە سەر.

هەروەها یان وەك ئایەتەی سوورەتی (**الشورى**)یە کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠ ﴾، واتە: سزای خراپەیەك خراپەیەکی وەك خۆیەتی، کە بێگومان کەسێك کە لە بەرانبەر دەستدرێژیی دا، خۆی بێدەنگ ناکات و، دەستدرێژییەکە پاڵ پێوەدەنێ، کارەکەی بە دەستدرێژیی دانانرێ، هەروەها کەسێك کە خراپەیەکی لەگەڵ دەکرێ، ئەویش سزای بابای خراپەکار دەدات، سزادانەکەی وی بە خراپە لە قەڵەم نادرێ، کەواتە: لێرەش کە دەفەرموێ: (فَعَاقِبُواْ ) دیسان بەرپەرچدانەوەی سزا، بە سزا دانانرێ، بەڵکو بە بەرپەرچدانەوەی سزا دادەنرێ، بەڵام بنچینەیەك هەیە لە زمانی عەرەبیی دا، پێی دەگوترێ: (**المُشَاكَلَة**) واتە: وشەیەك، تەعبیرێك کە لە پێشەوە دێ، تەعبیرەکەی دواییش لەبەرئەوەی کە وێك دەچن، {واتە: لە ڕواڵەتدا وێك دەچن، با لە نێوەڕۆکیشدا جیابن}، دروستە هەمان وشە بەکاربێتەوە، بۆ وێنە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ٣٠ ﴾الأنفال، واتە: ئەوان فێڵ دەکەن و، خواش فێڵ دەکات! بە تەئکید فێڵی ئەوان بریتیە لە پیلان و تەڵەکەو خراپەکارییەك کە دەکرێ بەرانبەر بە مسوڵمانان، بەڵام ئەوەی خوا سزادانی ئەو خراپەکارییەی ئەوانە.

یان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ١٥ وَأَكِيدُ كَيۡدٗا ١٦ ﴾الطارق، واتە: ئەوان فێڵ دەکەن و، منیش فێڵ دەکەم! کە بێگومان ئەوەی خوای بەرزو مەزن تەنها لە ناوو

شێوەو فۆڕمداو بە ڕواڵەت وەك فێڵ دەچێ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا بریتیە لە نەخشەو پلاندانان بۆ هەڵوەشاندنەوەی فێڵ و پیلانی کافرانێك کە ستەم لە بڕواداران دەکەن.

لێرەدا هەندێك لە زانایان مەسەلەیەکیان باسکردوە بە ناوی: (**مسألة الظَّفر**) واتە: پرسی زەفەر پێبردن، لێهەڵکەوتن، قۆستنەوە، بۆ وێنە:

ئەگەر کەسێك ستەمی لێکردی، دوایی تۆ زەفەرت پێبردەوە، ئایا دروستە: هەقێك کەوتۆتە لای وی، وەری بگریەوە، ئەگەر بە پەنامەکیی، یان دزییش بێت ؟

قسەی ڕاستتر ئەوەیە: بەڵێ، بۆت هەیە، بە مەرجێك کە عەیبداریی و ناشرینیی تێدا نە بێ.

بەڵام مالیك و کۆمەڵێك دەڵێن: نەخێر دروست نیە[1].

٩)- ﴿ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر خۆڕابگرن، ئەوە باشترە بۆ خۆڕاگران، واتە: باشترە لە دنیاو دواڕۆژدا.

لێرە ئاوا دەفەرموێ، لە سوورەتی (**الشورى**)ش دا، دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴿٤٠﴾ ﴾، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك چاوپۆشیی کردو چاکسازیی کرد، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، بێگومان ئەو ستەمکارانی خۆشناوێن.

کەواتە: لێرەشدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴾، واتە: ئەگەر لەجیاتی ئەوەی خراپە لەگەڵ بابای خراپەکار بکەنەوە و سزای بدەنەوە، خۆتان ڕاگرت و، چاوپۆشییتان کرد، لێتانبورد، ئائەوە بۆ خۆڕاگرانێك کە چاکسازیی دەکەن، خۆڕاگرانێك کە لێبوردن دەکەنە پیشە، باشترە بۆیان لە دنیاو دواڕۆژدا.

ئنجا لە ئایەتی دواتردا، خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ پابەند (**مُلْزَم**) دەکات، بە خۆڕاگرییەوەو، دەفەرموێ:

١٠)- ﴿ وَٱصْبِرْ ﴾، خۆت ڕابگرە، {ئەوە بۆ تۆ شایستەیە}.

١١)- ﴿ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾، خۆڕاگریی تۆش تەنیا بە خوایە، یانی ئەگەر خوا یارمەتییت بدات و بۆت ئاسان بکات، دەتوانی خۆت ڕابگری، چونکە صەبر پێش هەموو شت پەیوەندیی

---
(١) أضواء البيان ج ٢، ص ٤٦٧، للشنقيطي.

بە دڵ و دەروونەوە هەیە، دەبێ ئینسان باخەڵی فراوان بێ و، حەوسەڵەی زۆر بێ، ئەوەش دەبێ، خوا وات لێ بکات کە سینەت فراوان بێ، دڵت گەورە بێ، هەر بۆیە مووسا ﷺ دوای ئەوەی خوا داوای لێکرد: بچێ بۆ لای فیرعەون، پێش هەموو شتێك ئەو داوایەی کرد: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ ﴾طه، فەرمووی: پەروەردگارم! سینەم فراوان بکە، دوایی، فەرمووی: ﴿ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ ﴾طه، کاریشم ئاسان بکە، چونکە ئینسان کە سینەی فراوان بوو، کاریشی ئاسان دەبێ، ئنجا دوایی فەرمووی: ﴿ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ ﴾طه، گرێیەك کە لە زمانم هەیە بیکەوە، تاکو لێم تێبگەن.

چونکە ئینسان ئەگەر سینەی فراوان بوو، کاری ئاسان دەبێ و، ئەگەر کاریشی لەبەر ڕۆیشت و، کارەکەی لەبەر ئاسان بوو، زمانەکەشی باشتر دێتە گۆ، قسەی باشتری بۆ دەکرێ.

١٢)- ﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ ﴾، خەمیان لێ مەخۆ، بەهۆی ئەوانەوە پەژارەدارو، خەمبار مەبە.

١٣)- ﴿ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴾، هەروەها بەهۆی ئەو پیلان و فێڵ و تەڵەکەیەوە، کە سازی دەکەن لە دژی تۆو پەیامەکەت و، لە سەغڵەتیی دا مەبە و، با پشووت سوارو سینەت تەنگ نەبێ.

(الضَّيْق: مَصْدَر، ضَاقَ)، (ضَيق) و (ضِيق) هەرووکیان خوێنراونەوە، بە مانای سەغڵەتیی و ناڕەحەتیی، لە (ضَاقَ، يَضيق، ضَيْقاً وضيقاً)ەوە هاتوە، (ضَيِّق)یش ناوەکەیەتی، یانی: تەسك و تەنگەبەر.

١٤)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ﴾، بێگومان خوا لەگەڵ ئەوەنەدایە، کە پارێزیان کردوە، واتە: لە ڕابردوودا پارێزیان کردوە، لە گیرۆدە بوون بە شیرك و کوفرو نیفاق و ئیلحادەوە، خۆیان لەوانە پاراستوە.

١٥)- ﴿ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾، هەروەها لەگەڵ ئەوانەش دایە، کە چاکەکاران، واتە: لە چاکەکاریی دا چەسپاوو دامەزراون.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾، بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە کە پارێزیان کردوەو، لەگەڵ ئەوانەش دایە کە چاکەکارن، مەبەست پێی لەگەڵدابوونی تایبەتە، ئەگەرنا لەگەڵدابوونی گشتیی، خوا لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانی خۆیەتی، بە زانیاریی و دەسەڵات و ویست و، مشوورخۆریی خۆی و،

هەموویـان لـە ژێـر هەیمەنـەو ڕكێفـی دەسـتەڵاتی بێسـنووری خـوای پـەروەردگاردان و، لەسـەر هەموویـان بـە توانایـە و، هیچیـان لـە ژێـر چەتـری لوتـف و دەسـتەڵاتی بێسـنووری خـوا دەرناچـن.

## ئایا بۆچی خوا باسی: ١/ (حِكْمَة) و ٢/ (مَوْعِظَة الحَسَنة) و ٣/ (مُجَادَلَة)ی كردوە ؟

زانایانی كۆمەڵناس دەڵێن:

خەڵكی كۆمەڵگاكان بە گشتی سێ بەش و سێ جۆرە:

**یەكەم:** ئەهلی عەقڵ و ئینصافە: ئەوانە دەبێ، بە حیكمەت بدوێنرێن.

**دووەم:** ئەهلی دڵ و ویژدانن: ئەوانە دەبێ، بە ئامۆژگاریی باش بدوێنرێن.

**سێیەم:** ئەهلی ناكۆكیی و مشتومڕن: ئەوانە: دەبێ، بە باشترین شێوە، مشتومڕو شەڕە قسەیان لەگەڵ بكرێ.

ئێمە لێرەدا كۆتاییمان بە تەفسیركردی ئایەتەكانی سوورەتی (النحل) هێنا، بەڵام بەباشمانزانی، لە كۆتایی تەفسیركردنی چوار ئایەتی كۆتایی دا كورتە باسێك بكەین بەناوونیشانی:

كورتە باسێك لەبارەی: بنەما گرنگەكانی بانگەوازەوە.

## کورتە باسێک[1] لەبارەی
## بنەما گرنگەکانی بانگەواز (الأصول المهمة للدعوة)ە وە

بەڕێـــزان !

دەگونجێ زۆر شت وەك بنەما و، پایەی گرنگی بانگەواز بخەینە ڕوو، بەڵام ئێمە دە (١٠) دانەمان هێناون، لەو بنەما گرنگانەی کە پێویستە لە بانگەواز کردندا، بۆ لای خوا ﷻ و ئایین و، بەرنامەی خوا، ڕەچاو بکرێن:

١ - نیاز و مەبەستی ساغ (الإخلاص).

٢ - شارەزایی بە ئایین و، ئاشنایی بە ژین.

٣ - سێ کوچکەی: هەبوونی نەخشە و بەرنامە + کاری دامەزراوەیی + ڕاوێژکردن.

٤ - ڕەچاو کردنی: پلە پلەیی و، دیارییکردنی لە پێشترەکان (مراعاة التدرّج وتحديد الأولويات).

٥ - دڵخۆشکردن و ئاسانکردن (التبشير والتيسير).

٦ - ئیقناع کردنی عەقڵ و جووڵاندنی دڵ.

٧ - بیرخستنەوەی چاکەکانی خوا (التذكير بِنِعَمِ اللّه).

٨ - هۆشداریی پێدان و ترساندن.

٩ - جەختکردنەوە لەسەر واقیعی ئێستای خەڵك و، پێویستیی خەڵك لە ئێستادا.

١٠ - جەستاندنی پەیام و بەرنامەی خواو، بوونە سەر مەشق بۆ خەڵك.

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە لە کتێبی یازدەمی مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه} سوودمەندبووم، کە کاتی خۆی لە سجنی (کروپر)ی ئەمریکادا نووسیومە، شایانی باسیشە لە کتێبی (بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن)دا بە درێژیی باسی بانگەوازمان کردوەو، ئەم کورتە باسەش (تەوەری حەوتەم)ی ئەو کتێبەیە.

## یەکەم: نیاز و مەبەستی ساغ (الإخلاص):

برا و خوشکە خۆشەویستەکانم !

گرنگترین و یەکەمین پایەو بنەما، بۆ ئەنجامدانی بانگەوازێکی ئیسلامیی ڕاست و ڕەسەن، بریتیە لە نیاز و مەبەستی ساغ (الإِخْلَاص)، وشەی (إخلاص)یش لەسەر کێشی (إِفْعَال)ە، (أَخْلَصَ يُخْلِصُ إِخْلَاصاً) واتە: دەربازی کرد، دەربازی دەکات، دەربازکردن، واتە: کردەوەکانی خۆت دەربازبکەی، لەوە کە بەشی غەیری خوایان پێوەبێ، خاڵیصیان بکەیەوە، ساغیان بکەیەوە، بەشی غەیری خوایان پێوە نەهێڵی.

ئێمە کە کتێبە فیقهییەکان دەخوێنین، مەگەر چۆن دەنا هەموو کتێبێکی فیقهیی بە: (**كتاب الطَّهَارة**) (باسی پاك و خاوێنیی) دەست پێدەکات، چونکە بۆ هەموو پەرستشەکان (بەتایبەت نوێژ)، دەبێ جەستەت خاوێنبێ، پۆشاکت خاوێنبێ، شوێنت خاوێن بێ، ئەوجار وەبەردەکەون، ئنجا بۆ کردەوەکانیش بە هەمان شێوە، دەبێ دڵ دەروونت خاوێن بێ، ئنجا خوای پەروەردگار لێتیان وەردەگرێ و، قبووڵیان دەکات، با تەماشای چەند دەقێکی شەریعەت بکەین:

١) خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (**البينة**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: (خەڵك) فەرمانیان پێ نەکرا بوو، مەگەر بەوە کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، بە پاکیی و، نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن، ئا ئەوەش ئایینی کۆمەڵێکی ڕێك و ڕاستە.

وشەی (دین) لە ڕستەی: ﴿ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾دا، بە مانای ئیسلام نیە، بەڵکو لێرەدا (دین) بە مانای ملکەچیی دێ، یانی: تاعەتی خۆیان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، واتە: وەك بۆ خوا ملکەچ و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرن، ئەو جۆرە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵییە، بۆ کەسی دیکە نەکەن.

(﴿ حُنَفَآءَ ﴾) کۆی (**حنيف**)ە، واتە: کەسێك وازی لە بەتاڵ پووچ هێنابێ و، بەرە و هەق گەڕابێتەوە[1].

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٤٩، المطبعة العصرية، ٢٠١٢ م.

﴿وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، نوێـژ بەرپـا بکـەن و زەکات بـدەن، ﴿وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾، ئـا ئـەوە ئایینـی ئۆممەتێـکی ڕێـك و ڕاسـتە.

**٢)** لە سووڕەتی (**الزمر**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ٣﴾.

واتـە: ئێمـە کتێبـمان بـۆ تـۆ دابەزانـدوە بـە هـەق، بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـە، ملکەچـی خـۆتی ساغ بکـەوە، ئاگاداربـن! ملکەچیـی ساغ تەنیا بۆ خوایە (یان: تەنیا ملکەچیـی سـاغ بـۆ خوایـە)، واتـە: تاعەتێـك کـە سـاغ نەکرابێتـەوەو، خڵتـەی ڕیـا و ڕوودەربایـسی پێوەبـێ، خـوا نایـەوێ.

پێغەمبەریـش ﷺ لـەم فەرمایشـتەدا دەفەرمـوێ: {**إِنَّمَـا الأَعْـمَالُ بالنِّيـاتِ، وَإِنَّمَـا لِكُلِّ امْـرِئٍ مَـا نَـوَى...**}[1].

واتـە: بـە دڵنیایـی کـردەوەکان تەنیـا بـە پێـی نیـاز و مەبەسـتەکانن و، هـەر مرۆڤێـك بەپێـی نیـاز و مەبەسـتەکەی نێـو دڵـی کـە هەیبـووە، کردەوەکـەی بـۆ بەردەکـەوێ.

بـەڵام ئایـا ئەگـەر کەسێك کردەوەیـەکی خـراپ بـکات، بـەڵام نیـەتی بـاشی لـێ بێنـێ، بـۆی حیسـابە؟ نەخێر، «**إِنَّمَا الأَعْمَالُ**» وشـەی «**الأَعْمَال**» ئەلیف و لام (أل) تەعریفی لەسـەرەو مەبەسـت پێـی (عهـد)ە، یـانی (**جنـس الأعـمال الصالحـة**)، هەمـوو ئـەو کردەوانـەی کـە لـە شـەریعەتدا بـە چـاك دەزانرێـن، نـەك هـەر کردەوەیـەك چـاك بـێ، یـان خـراپ بـێ! یـانی: کـردەوە چاکـەکان بـە پێـی نیەتـن، ئەگەرنـا کـردەوەی خـراپ، هـەر خراپـەو، نیەتیشـت چـاك بـێ، هیـچ نیـە، بەڵکـو کـردەوەی چاکیـش، ئەگـەر نیـەتی ساغ و چـاك نەبـێ، وەرناگیـرێ و قبـووڵ ناکـرێ.

ئنجـا بـا تەماشـا بکەیـن: ئایـا لـە ئەنجامـی ئیخـلاص و تەنیـا خوا پـێ مەبەسـت بـوون و، دڵـی خـۆ بـۆ خـوا سـاغکردنەوەدا، چیـمان دەسـت دەکـەوێ؟ سـێ بەرهەمـی گرنـگ و مەزنمـان دەسـتگیر دەبن:

**١** / بەرەکەت دەکەوێتە کارمان و، خوا کارەکەمان لێ قبووڵ دەکات.

**٢** / خوا ڕێنماییمان دەکات و سەر ڕاستمان دەکات.

**٣** / کارمان ئاسان دەکات، دەرووی خێرمان لێدەکاتەوە.

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٦٥٥٣، وَمُسْلِم: ١٩٠٧.

بەم بەڵگانەی خوارێ:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾﴾المائدة، واتە: خوا تەنیا لە پارێزکاران قبووڵ دەکات.

پارێزکار: کەسێکە پێش هەموو شتێك خۆی لە شیرك و ڕیا بپارێزێ، دڵی خۆی ساغ و ساف بکات بۆ خواو، دڵەکەی جگە لە خوا ڕازیی کردن و، غەیری خۆ لە خوا نزیککردنەوەی، تێدا نەبێ و، هیچ هاندەرێکی دیکەی نەبێ.

٢- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾﴾العنكبوت، واتە: ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین و، بە دڵنیاییەوە خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە.

کەواتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە ساغیی لە پێناوی خوا تێبکۆشی، خوا ڕاستە ڕێت دەکات و لەگەڵتدا دەبێ و، پشتت دەگرێ.

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾﴾الطلاق، واتە: هەر کەسێك پارێز لە خوا بکات، خوا کاری بۆ ئاسان دەکات.

پارێز لە خوا کردنیش پێش هەموو شتێك، بناغەکەی بریتیە لە ساغیی (إخلاص).

(**أحمد ابن عطاء اللّه الأسكندري**) کە عاریفێکی گەورەیە، کتێبێکی بچووکی هەیە بە ناوی (**الحِكَمْ**)، کە بە (**الحِكَمُ العَطَائِية**) مەشهوورە، قسەی زۆر نەستەق و جوانی تێدان، یەکێك لە قسەکانی ئەوەیە دەڵێ:

(**الأَعْمَالُ أَشْبَاحٌ أَرْوَاحُهَا وَجُودُ سِرِّ الإِخْلَاصِ فِيْهَا**)، واتە: کردەوەکان وەك تارمایی و کەلەشێك وان، ڕووحی کردەوەکان، بریتیە لە هەبوونی ئیخلاص لەو کردەوانەدا.

ئنجا وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتان پێتان دەڵێم: بڕوا بکەن، نهێنیی بەرەکەت لە ژیانی مرۆڤدا، ئەوە کە خوا لەگەڵ ئینساندابێ و، پشتی بگرێ و کاری بۆ ئاسان بکات، ئەوەیە کە ڕووی دڵی بکاتە خوا، ئێمە چۆن دەست بە نوێژ کردن دەکەین؟ یەکێك لە دوعایەکانی دەستپێکردنی نوێژ (**أدعية الإستفتاح**)، ئەوەیە: {**وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ**}[1]، واتە: بە پاکیی و ساغیی ڕووی خۆم (ڕووی

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٥٠٦٤، وَأَبُو دَاوُد: ٢٧٩٥، وَابْنُ مَاجَة: ٣١٢١، وَالحَاكِمُ: ١٧١٦، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

دڵی خۆم) کردە ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونەدی و، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

(وَجْهِي) یانی: ڕووی دڵی خۆم، چونکە تۆ ڕووی جەستەت دەکەیە قیبلە! بەڵام کە دەڵێی: ڕووی خۆم، واتە: ئەو نوێژ و تاعەتە، کە دەیکەم، تەنیا مەبەستم پێی ئەوەیە: کە خوا لێم ڕازی بێ.

ئنجا پایەو بنەمای یەکەمی سەروبەرگرتن و، بەرەکەت تێکەوتنی کاری بانگەواز، ئەوەیە کە ئیخلاص و خوا پێ مەبەست بوون، هەوێن و هەناوو هاندەری بێ.

## دوو: شارەزایی بە ئایین و ئاشنایی بە ژین:

ئایا ئەگەر ئینسان لە ئایین و بەرنامەی خوا شارەزانەبێ، خەڵکی بۆ کوێ بانگ دەکات؟ با وەك شتێکی خۆش بۆتان بگێڕمەوە، جار جار قسەیەکی خۆشتان بۆ بکەم باشە:

دەگێڕنەوە کاتی خۆی مسوڵمانێك تەماع لە ماڵ و سامانی جوولەکەیەکی بازرگان دەکات، لە ڕێگادا بۆسەی بۆ دادەنێ و، دەڵێ: ڕووتبەوەو کەلوپەلەکان دابنێ! ئەویش دەڵێ: بۆچی؟ مسوڵمانەکە دەڵێ: یان دەبێ ڕووت بی، یان دەبێ مسوڵمان بی !

کابرای جوولەکەش دەڵێ: دەی باشە، مەمکوژە کاکە، مسوڵمان دەبم.

مسوڵمانەکە دەڵێ: دەی مسوڵمان بە !

جوولەکەکە دەڵێ: باشە، چی بڵێم ؟

مسوڵمانەکە دەڵێ: وەڵڵا نازانم!

یانی: بۆخۆی نازانێ مسوڵمانەتیی چییە، تاکو ئەو مسوڵمان بکات !

بە تەئکید، ئینسان دەبێ بۆخۆی بەرچاوڕوون و شارەزا بێ بە دین، ئنجا دەتوانێ خەڵکی بۆلا بانگ بکات، (**إبن البنا السرقطي**) لە شیعرێکی دا کە (**إبن عجيبة**) شەرحی دەکات، زۆر جوان دەڵێ:

وَإِنَّمَـــا القَــوْمُ مُســـافِرونَ
لِحَضْرَةِ الحَـــقِّ وَظَـــاعِنُونَ

فَـــافْتَـقِـروا فِـيهِ إلـى دَلِيــلِ

ذَي بَصَـرٍ بالسـَــيْرِ وَالْمَقِيـــلِ

قَـدْ سَـــلَكَ الطَّرِيقَ ثُمَّ عَـادا !

لِيُخْبِرَ القَـــوْمَ بِـمَـا اسـتفَادَا

باسی ئەوانە دەكات كە دەیانەوێ لە خوا نزیك ببنەوە، دەڵێ:

ئەوانـە ڕێبـوارن، بـەرەو لای پـەروەردگاری هـەق دەچـن و، لـە هەنـدێ شـوێن دەبـێ بارگـەو بنـە بخـەن.

پێویسـتییان بـە ڕێ پێشـاندەرێك هەیـە، كـە شـارەزا بـێ لـە كـوێ بـڕۆن و لـە كوێـش قەیلوولـە بكـەن و پشـوو بـدەن ؟!

كەسـێك كـە ڕێیەكـەی بڕیـوەو گەیشـتۆتە ئەوسـەری، ئنجـا گەڕاوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی هـەواڵ بـە خەڵـكی دیكـە بـدات و، خەڵـكی لەگـەڵ خـۆی بـەرێ.

عـادەت وایـە: ئـەو كەسـەی كـە دەبێتـە دەلیـل و ڕێ پێشـاندەر، دەبـێ بۆخـۆی بـە هەموو ڕێیەكانـدا شـارەزا بێـت، كەواتـە: بەبـێ شـارەزایی لـە دیـن، ئینسـان ناتوانـێ بانگـەواز بـۆ بـكات.

ئنجـا ئاشـنایی بـە ژیـن، مەبەسـتم پێـی ئەوەیـە: كـە ئینسـان لـەو كۆمەڵگایـەدا كـە تێیـدا دەژی، دەبـێ بـە خێـرو شـەڕی ئـەو كۆمەڵگایـە، بـە تەوژمـە فیكرییـەكانی و لایەنـە سیاسـییەكانی، ئنجـا پاشـخانی فیكریـی و سیاسـیی ئـەو خەڵـك و كۆمەڵگایـە، كـە دەیـەوێ قسـەیان بـۆ بـكات و، بـەرەو خوایـان بهێنێـت، دەبـێ شـارەزای هەمـوو ئەوانـە بێـت.

ئەمیش ئایەتێكی موبـاڕەك كـە هەردووكیـان دەگرێتـە خـۆی: خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾یوسـف، واتـە: تـۆ بفەرمـوو: ئـەوە ڕێبـازی منـە، لەبـەر ڕۆشـنایی دا خەڵـك بـۆ لای خـوا بانـگ دەكـەم، خـۆم و شـوێنكەوتووانم و، پاكیـی بـۆ خـوا، مـن لـە هاوبەشـدانەران نیـم.

یەكێـك لـە سـیفەتەكانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، ئەوەیـە كـە بـە نەزانیـی و بـە لاسـاییكردنەوەی كوێرانـە، شـوێن شـتان دەكـەون.

وشەی: (عَلَىٰ بَصِيرَةٍ) واتە: لەبەر ڕۆشنایی دا، یانی:

۱- شارەزای خۆم و شوێنکەوتووانم.

۲- لە واقیع شارەزام.

۳- لە ڕێبازەکەم شارەزام، هەموویان دەگرێتەوە.

## سێیەم: هەبوونی نەخشەو بەرنامە + کاری دامەزراوەیی + ڕاوێژکردن:

۱- بۆ بەڵگەی ئیسپاتی پێویست بوونی هەبوونی نەخشەو کار بە بەرنامە، تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکە بکەن: خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٦٩﴾ العنكبوت، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین.

لە هەموو قورئانـدا، وشـەی (سُـبُل) پاڵدرابێتـە لای خـوا، لێرەدایـە، ئەگەرنـا هەر بە (سَـبيل) هاتـوە، چونکـە کارکـردن بـۆ ئایینـی خـوا، چۆنیەتیـی و شـێوازو ئامـرازی زۆر و جـۆراو جـۆری هـەن، هەڵبەتـە مەبەسـت لـە (سَـبيل) لـە قورئانـدا: ئیسـلامە، کـە یـەك ڕێبـازەو کۆناکرێتـەوە، بـەڵام مەبەسـت لـە (سُـبُل) لێـرەدا: شـێوازەکانی بانگەوازکردنـە، یـانی: ئـەو شـێوازانەی کـە بـە ڕەزامەندیـی ئێمەیـان دەگەیەنـن، هـەر کەسـێك بـە ئیخلاصـەوە لەپێنـاوی ئێمـەدا تێبکۆشـێ، لـەو شـێوازانەی شـارەزا دەکەیـن.

۲- کاری بە دامەزراوەیی:

پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: {إِنَّ اللَّـه يُحِـبُّ إِذَا عَمِـلَ أَحَدُكُـمْ عَمَـلاً أَنْ يُتْقِنَـهُ}[1]. واتـە: بـە دڵنیایـی خـوا حـەز دەکات، هـەرکات یەکێـك لـە ئێـوە کارێـکی کـرد، بـە وردەکاریـی بیـکات.

۳- ڕاوێژکردن:

خـوای زانـاو شـارەزا فەرموویـەتی: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ۝٣٨﴾ الشـوری، واتـە: کاروبـاری بـڕواداران بـە ڕاوێـژە، کاروبـاری سیاسـیەتیان، هـی بانگەوازیـان، هـەر جموجـۆڵ و چالاکییەکیـان.

(۱) أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي شعب الإيمان: ٥٣١٢، وَأَبُو يَعْلَى: ٤٣٨٦.

ئێستاش با ئەو سێکوچکەیە: {نەخشەو بەرنامە + دامەزراوە + ڕاویژ} تۆزێك شی بکەینەوە:

**یەکەم:** مەبەستمان لە: (کار بە نەخشەو بەرنامە)، واتە: کاری بانگەواز، ئەوەیە کە نەخشەو بەرنامەیەکی وردو واقیع بینانە دابنرێ، یانی: ئێمە وەك تەوژمی ئیسلامیی، ئایا دەبێ هەر کەسێکمان لە ڕاست خۆی هەڵسێتەوەو، چی پێ باش بێت باسی بکات؟ نەخێر، بەڵکو:

پێویستە سەرەتا لەسەر بناغەی ڕاوێژ، نەخشەو بەرنامەیەك دابنرێ، قۆناغ بە قۆناغی ئەم کاری بانگەوازە، دیاریی بکرێ، پێشێ خەڵك بانگ بکرێ بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندیان، ئنجا دوایی هۆنینەوەو ئامادەکردنیان، نەك هەر قسەی خێر بۆ خەڵك بکەی و بڕۆی، ئەوە وەك ئەوە وایە، کەسێك دەغڵێك دا بچێنێ، بەڵام دوایی لێی نەپێچێتەوە، داخۆ بزن و مەڕی خەڵك دەیخوات، ملە لێی دەدات، چۆلەکە دەیخوات، چی لێ دێت ؟! ئاوا نابێت، پێغەمبەری خواش ﷺ وا نەبووە ئامۆژگاریی خەڵك بکات و دوایی وازیان لێ بێنێ! چونکە هەندێك کەس ئەوە لە ئێمە بە ڕەخنە دەگرن، دەڵێن: ئێوە ئامۆژگاریی خۆتان بکەن و بڕۆن، نەخێر، دەبێ دواتر کاریان لەسەر بکرێ، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بانگ کرد، هۆشیاری کردنەوە، دوایی ئەوانەی کە هۆشیار بووبوونەوە، مشووری لێخواردن و پەروەردەی کردن و ئامادەی کردن، ئەگەرنا دوای خۆی، پێغەمبەری خاتەم ﷺ کێ بوو بە هاوکاری؟ هەڵبەتە ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی بوون، ئنجا ئەگەر پەروەردە نەکرابان و تێنەگەیەنرابان و پێنەگەیەنرابان، چۆن درێژەیان بە کاروانەکەی دەدا؟! ئنجا ئەمە چەمکی کار بە نەخشەو بەرنامەیە.

**دووەم:** مەبەستیشمان لە: (کاری دامەزراوەیی) ئەوەیە کارەکان بەسەر پسپۆڕان و شارەزایان دا دابەش بکرێن، نەك بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی و کەس ئاگای لە کەس نەبێت.

بۆ وێنە: ئێستا ئێمە کەسانێکمان هەن کە بە تایبەت خەڵك فێری قورئان بکەن و، هەندێك بە تایبەت خەریکی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرن و، هەندێکی دیکە خەریکی فێرکردنی زانستە شەرعییەکانن، هەندێکی دیکە خەریکی کاری ڕاگەیاندنن، ئنجا ئەوە دەبێ زیاتر تۆخی بکەینەوە.

هەم نەخشەو بەرنامەکە وردتر دابنێین، هەم دامەزراوەکانی کاری بانگ کردنمان بۆ لای خواو بۆ لای ئیسلام، باشترو تۆکمەترو پسپۆڕانەترین.

سێیەم: مەبەستیشمان لە ڕاوێژکردن، ئەوەیە کە لە هەمو کارو قۆناغەکان بکۆڵرێتەوە، لەسەر بناغەی ڕاوێژکردن و، بڕیاری تاکەکەسیی و سەرپێی و نەکوڵێنراوو کرچ و کاڵ، نەدرێ، کە ئەوەش لە ڕاستیی دا، ئەگەر بویستری هەقی خۆی پێبدرێ، وەك مسوڵمانەتیی و دینداریی، دەبێ لە کەوڵ و چوارچێوەی حیزبێکی دیارییکراو بێینە دەرێ، چونکە خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾ الشورى، خوا نەیفەرمووە: با کاروباری (فلان لایەن و فلان حیزب) بە ڕاوێژبێ، بەڵکو مەبەست هەموو مسوڵمانانە، بەتایبەت لە بواری بانگەوازو خەڵك هۆشیارکردنەوەدا، دەبێ زیاتر کار بکەین و هاوکاربین، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکەن، پێویستە هاوکاریی و لێکتێگەیشتنمان هەبێ، پشتی یەکدی گرتنمان هەبێ.

هەندێ جار هەندێ کەس قسان دەکات، پێموایە ئیسلام زۆر لەسەری قەرزدار دەبێتەوە، پێموایە ئەو کەس و بەرنامانە دانراون، بۆ ئەوەی بەلبەلە بنێنەوەو، دڵەڕاوکە بخەنە دڵی مسوڵمانانەوە، بەرانبەر بە ئایینەکەیان، کە هەر جارە بابەتێك دەورووژێنن، بە نەزانیی و ناشایستەیی، کە بە شایانی ئەوەیان نازانم: نە ئاماژە بە بابەتەکان بکەم، نە ئاماژە بە کەسەکان بکەم، کە پێموایە زۆرزانانە، یان نەزانانەو کڵاو لەسەرنراوانە بە کرێ گیراون و، دەستیان لە پشت دەدرێ، ئەگەرنا ئەو هەموو بابەتانەی ئیسلام هەن، ئەو هەموو ئایەتانەی قورئان و فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ، کە مسوڵمانان پێویستیانە بۆیان باس بکرێن، کابرا! چیت داوە لە دوو سێ مەسەلە، کە مشتومڕێکیان لەسەرە، یاخود باسکردنیان بەو شێوازە ناشێیە، بۆ مسوڵمانان دەبێتە ئیشکالێك، ئەگەر ڕاستە مەبەستت ئەوەیە خەڵك لە دین تێبگات !

ئنجا لەو قسەیەم دا کە دەڵێم: پێویستە بۆ کاری بانگەواز ڕاوێژ هەبێ، مەبەستم ئەوانە نیە، بەڵکو مەبەستم هەندێ کەسی دیکەیە، کە بە نەزایی و ناشێیی، لە ئەنجامی شارەزا نەبوون لە دین و ئاشنا نەبوون بە ژین و، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ڕاوێژکردن نیە و، کاری دامەزراوەیی نیە، هەڵەو پەڵەو کرچ و کاڵیی زۆر پەیدادەبێ.

## چوارەم: ڕەچاوكردنی پلەپلەیی و، دیارییكردنی لەپێشترەكان:

ئەمەش بنەمایەكی زۆر گرنگەو، دەبێ لە كاری بانگەوازماندا: هەم پلەپلەیی ڕەچاو بكرێ، هەم دیارییكردنی لەپێشترەكان، گرنگیی پێبدرێ، ئایا چ شتێك لە پێش چ شتێكەوەیە؟ هەرچەندە جاری دیكەش باسمان كردوە، بەڵام ئەو مەسەلەیە هەرچەندە باسی بكەین، هەر دەیهێنێ، ئەمەش حەوت نموونە لە ئایەتەكانی قورئان و، دەقەكانی سوننەت، كە زۆر بە ڕوونیی پێویستبوونی هەر كام لە:

أ / ڕەچاوكردنی پلەپلەیی.

ب / دیارییكردنی لەپێشترەكان.

تێیاندا دەدرەوشێنەوە:

١) لە سووڕەتی (**الأعراف**) لە ئایەتەكانی: (٥٩ و ٦٥ و ٧٣ و ٨٥)دا هەر كام لە {نووح و هوودو صاڵح و شوعەیب} (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) یەك ڕستە دووبارە دەكەنەوە، دەڵێن: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ﴿٥٩﴾﴾، واتە: ئەی گەلەكەم! بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، جگە لەو هیچ پەرستراوێكی دیكەتان نیە.

پێغەمبەران هەموویان لێرەوە (لە خوا بە یەكگرتن و تەنیا خواپەرستن (توحید)ەوە} دەستیان پێكردەوە، ئەوە بناغەیە: خەڵك بانگ كردن بۆ تەنیا خواپەرستیی، بناغەو جەوهەری بەرنامەو پەیامی خوای پەروەردگارە.

٢ - {**عَنْ عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ أَخْبَرَنِي رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: رَبِيعَةُ بْنُ عَبَّادٍ مِنْ بَنِي الدِّيلِ وَكَانَ جَاهِلِياً، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْجَاهِلِيَةِ فِي سُوقِ ذِي الْمَجَازِ وَهُوَ يَقُولُ: يا أَيُّهَا النَّاسُ! قُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ تُفْلِحُوا**}[1].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺم بینی لە بازاڕی زیلمەجاز (كە بازاڕێكی سەردەمی نەفامیی بووە) بەسەر خەڵكەوە دەگەڕا، دەیفەرموو: ئەی خەڵكینە! بڵێن: تەنیا خوا پەرستراوە، سەرفراز دەبن.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٦٠٢٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره وهذا إسناد حسن من أجل عبد الرحمن بن أبي الزناد.

پێغەمبەری خوا (**محمد**)یش ﷺ، هەر بەوە دەستی پێکردوە.

**٣ - {عَنْ عَائِشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: فُرِضَتْ الصَّلاةُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ هَاجَرَ النَّبِيُّ ﷺ فَفُرِضَتْ أَرْبَعَاً، وَتُرِكَتْ صَلاَةُ السَّفَرِ عَلَى الأُولَى}**[1].

واتـە: دایکـمان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ نوێـژ کـە فـەڕز کـرا، دوو ڕکات دوو ڕکات بـوو، بـەڵام دوایـی کـە پێغەمبـەر ﷺ کۆچـی کـرد بـۆ مەدینـە، نوێـژە چـوار ڕکاتییـەکان فـەڕز کـران، بـەڵام نوێـژی سـەفەرێ هـەر لەسـەر حاڵـەتی پێشـێی مایـەوە.

**٤ - {عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذاً ؓ عَلَى الْيَمنِ، قَالَ: إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلى قَوْمٍ أَهْلِ كِتَابٍ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ عِبادَةُ اللَّهِ، فَإِذَا عَرَفُوا اللَّهَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَواتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذا فَعَلُوا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكاةً مِنْ أَمْوالِهِمْ، وَتَرِدُّ عَلى فُقَرائِهِمْ}**[2].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: کاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ موعـازی کـوڕی جەبـەلی ؓ نـارد بـۆ یەمـەن پێـی فەرمـوو: تـۆ دەچیـە لای کۆمەڵـە خەڵکێـك، کـە خـاوەن کتێـبن، بـا یەکەمیـن شـتێك کـە ئـەوانی بـۆ بانـگ دەکـەی، ئەوەبـێ کـە خـوا بپەرسـتن (کـە پێشـتر بـە هەڵـە پەرسـتوویانە)، ئنجـا ئەگـەر خوایـان ناسـی، پێیـان ڕابگەیەنـە کـە خـوا پێنـج نوێـژی لـە ڕۆژوو شـەوێکدا لەسـەر پێویسـت کـردوون، ئنجـا ئەگـەر ئەوەشـیان کـرد، هەواڵیـان پێبـدە کـە خـوا زەکاتی لـە مـاڵ و سـامانیاندا لەسـەر پێویسـت کـردوون، کـە بگێڕرێتـەوە بـۆ هەژارەکانیـان.

**٥ - {عَنْ عَائِشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: إِنَّما نَزَلَ أَوَّلَ مَا نَزَلَ مِنْهُ: سُورَةٌ مِنْ الْمُفَصَّلِ فِيهَا ذِكر الْجَنة وَالنارِ، حَتَّى إِذَا ثَابَ الناسُ إِلَى الإِسْلاَمِ، نَزَلَ الْحَلاَلُ وَالْحَرَامُ وَلَوْ نَزَلَ أَوَّلَ شَيْءٍ: لاَ تَشْرَبوا الْخَمْرَ، لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الْخَمْرَ أَبَدَاً، وَلَوْ نَزَلَ لاَ تَزْنُوا، لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الزِّنا أَبَدًا}**[3].

(ڕۆژێـك پیاوێـكی عیراقیـی چـووە بـۆ لای دایکـمان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، گـوتی: دایـكی بـڕواداران موصحەفەکـەی خۆتـم پێشـان دەدەی؟ گـوتی: بۆچیتـە ڕۆڵـە؟ گـوتی: دەمـەوێ نوسـخەکی لەبـەر بگرمـەوە، ئەویـش گـوتی: لـە کوێـوە بیخوێنیـەوە هـەر تـەواوە)، دوایـی

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ: ٣٩٣٥.

(٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ: ١٤٥٨.

(٣) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيّ: ٤٩٩٣.

گوتی: یەکەمین شتێك کە خوا دایبەزاند لە قورئان، سوورەتە کورتەکان بوون، کە باسی دۆزەخ و بەهەشت ( و بابەتە عەقیدەییەکان) دەکات، هەتا کاتێك خەڵك بۆ ئیسلام گەڕایەوە (واتە: بووناسیی و ئیمان و عەقیدەیان بۆ دروست بوو) ئنجا باسی حەڵاڵ و حەڕام دابەزی، ئەگەر یەکەمجار خوا فەرمووبای: شەڕاب مەخۆنەوە، دەیانگوت: هەرگیز وازی لێناهێنین، هەروەها ئەگەر یەکەمجار فەرمووبای: زینا مەکەن، دەیانگوت: هەرگیز وازی لێناهێنین.

بەڵام پێشێ بووناسیی و ئیمان و عەقیدە، لە دڵ و عەقڵیاندا جێگیر بوو، ئنجا دوایی تەکلیفە شەرعییەکانی دیکە دابەزین.

**٦ - {عَنْ وَهْبٍ قَالَ سأَلْتُ جَابِرًا عَنْ شَأْنِ ثَقِيفٍ إِذْ بايَعَت قَالَ: اشْتَرَطَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنْ لاَ صَدَقَةَ عَلَيْهَا وَلاَ جِهَادَ، وَأَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ يَقُولُ: (سَيَتَصَدَّقُونَ وَيُجَاهِدُونَ، إِذَا أَسْلَمُوا)}**[١].

واتە: وەهبی کوڕی مونەببیە دەڵێ: پرسیارم لە جابر کرد دەربارەی هۆزە سەقیف کاتێ پەیمانیان بە پێغەمبەردا ﷺ، کە مسوڵمان بوون چۆن بوو؟ گوتی: لەسەر پێغەمبەریان ﷺ بە مەرج گرت، زەکاتێ نادەن و، جیهادیش ناکەن، پێغەمبەریش ﷺ، لێی قبووڵ کردن، بەڵام دوایی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر مسوڵمان بوون، زەکاتیش دەدەن و جیهادیش دەکەن.

کە بێگومان هەر واش بوو.

**٧ - {عَنْ نَصْرِ بْنِ عَاصِمٍ اللَّيْثِيِّ عَنْ رَجُلٍ مِنْهُمْ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَسْلَمَ عَلَى أَنْ يُصَلِّيَ صَلاتَيْنِ، فَقَبِلَ مِنْهُ}**[٢].

واتە: نەصری کوڕی عاصیمی لەیثیی لە پیاوێك لە خۆیانەوە، دەگێڕێتەوە، کە چۆتە لای پێغەمبەر ﷺو، مسوڵمان بووە، بەو مەرجە، تەنیا دوو نوێژان بکات، (شەو و ڕۆژێك دوو نوێژان بکات)، پێغەمبەریش ﷺ، ئەوەی لێ قبووڵ کردوە !

خوشك و برا بەڕێزو خۆشەویستەکانم !

بێگومان هیچ کەسێك، بۆی نیە موزایەدەی دینداریی بەسەر پێغەمبەرەوە ﷺ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خوای زاناو شارەزا پێی فەرمووە، بڵێ: ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٦٣﴾ الأنعام، واتە: من یەکەمی مسوڵمانانم، بەڵام تەماشا دەکەین، پێغەمبەر ﷺ، لە هۆزی

---

(١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ: ٣٠٢٥، وَصَحَّحَهُ الْأَلبَانِي فِي «الصَّحِيحَة»: ١٨٨٨.
(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٢٠٣٠٢.

سەقیفی قبووڵ کردوە، زەکات نەدەن و جیهاد نەکەن، هەروەها لەو پیاوەی قبووڵ کردوە، کە گوتوویەتی: تەنیا دوو نوێژان دەکەم! لەوانەیە کابرا گوتبێتی: تەنیا ئەو دووانە دەکەم، ئنجا ئەگەر دەڵێی مسوڵمان دەبم، ئەگەرنا مسوڵمان نابم؟ ئەویش فەرموویەتی: مسوڵمان بە، بۆچی؟ چونکە با مسوڵمان بێ، ئەگەر تەنیا دوو نوێژانیش بکات، باشترە لەوەی مسوڵمان نەبێ و نوێژ نەکات و، سەجدە نەبات و ڕکووع بۆ خوای بەرزو بێ هاوتا نەبات!

ئنجا ئێمە لەم دەقانە هەروەها لەوانی دیکەش، ئەوەیان لێوەردەگرین، کە لە بواری بانگەوازدا، دەبێ هەم پلەپلەیی ڕەچاو بکەین، هەم لە گرنگترەوە بۆ گرنگتر چوون، واتە چ شتێك لەپێش چ شتێکەوەیە؟ هەروەها چ شتێك ئەسڵی دینە و، چ شتێك فەرعی دینە؟ بەبێ ئەوە لە کارەکەماندا سەرکەوتوو نابین و، لەوبارەشەوە، هەڵە و پەڵەی زۆر هەیە، کە پێویستی بە شوێنی تایبەت دەکات[1].

## پێنجەم: دڵخۆشکردن و ئاسانکردن:

خەڵك بانگکردن بۆ لای خوا، بە کەسێك دەکرێ، بە ڕاستیی بتوانێ: هەم خەڵکی دڵخۆش بکات، هەم بۆیان ئاسان بکات، سەرنجیان ڕابکێشێ و، وایان لێبکات، کە متمانەیان پێی بێ و، وایان لێبکات، ئەوان، ئەو بە دڵسۆز بزانن، ئەگەر وانەبێ، گوێی بۆ ناگرن و، قسەی لێوەرناگرن:

با لەوبارەوەش سەرنجی چەند دەقێکی شەریعەت بدەین:

١) خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (النساء)دا، ناوی دوازدە (١٢) لە پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**) دێنێ و، هەمووشیان بە دڵخۆشکەرو ترسێنەر (**مبشِّر ومُنْذِر**) وەسف دەکات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ١٦٥ ﴾ النساء.

---

(١) لە تەوەری نۆیەمی کتێبی: {بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن}دا، لەوبارەوە، ڕوونکردنەوەی باشمان داوە.

واتە: ئێمە سروشمان بۆ لای تۆ ناردوە، وەك چۆن سروشمان بۆ لای نووح و پێغەمبەرانی دوای ویش نارد، هەروەها سروشمان کرد بۆ لای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباط و عیسا و ئەییوب و یونوس و هاروون و سولەیمان ناردو، زەبووریشمان بە داوود دا، هەروەها پێغەمبەرانێك کە پێشتر بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا خوێندۆتەوەو، پێغەمبەرانێك کە بەسەرهاتیانمان بەسەرتدا نەخوێندۆتەوە و، خوا بە قسەکردن فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کرد، پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن، تاکو دوای هاتنی پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ و، خوا زاڵی کارزانە.

واتە: ئەوانە پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەر و ترسێنەر بوون، یاخود: موژدە دەر و ورياکەرەوە بوون، بۆچی؟ تاکو لە دوای هاتنی پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا.

کەواتە: پێغەمبەران هەموویان **(علیهم الصلاة والسلام)**، سیفەتی بنچینەییان ئەوە بووە، خەڵك دڵخۆش بکەن، بە پاداشتی خوا، خەڵك دڵخۆش بکەن، بەوە کە دینداریی لە دنیادا، بەرهەمی باشی دەبێ و، دڵخۆشیشیان بکەن بەوەی کە خواپەرستییەکەیان لە دوارۆژیشدا، بەرهەمی باشی دەبێ، ئایا دەزانن، پێغەمبەر ﷺ، کە قورەیشییەکانی بۆ ئیسلام بانگ دەکرد، چی پێ دەفەرموون: کاتێك مامی پرسیاری لێکرد، چی لێیان دەوێ؟ دەیفەرموو: {**يا عَمِّ! أُرِيدُهُمْ عَلَى كَلِمَةٍ تَدِينُ لَهُمْ بها الْعَرَبُ وَتُؤَدِّي إِلَيْهِمُ الْعَجَمُ الْجِزْيَةَ، قَالَ: مَا هِيَ؟ قَالَ: شَهادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ**} (**أخرجه الترمذي: ٣٢٣٢، قال: حسن، والبيهقي في الكبرى: ١٩١٢٠، وضعَّفَهُ الألباني**).

واتە: ئەی مامە گیان! تەنیا وشەیەکم لێیان دەوێ، کە حکومڕانیی بەسەر گەلی عەرەبدا، پێدەکەن و، عەجەمیش سەرانەیان دەدەنێ و بۆیان ملکەچ دەبن.

واتە: ئەم دینە، هەرچەندە بەرهەم و بەرەکەتەکەی، بە شێوەی سەرەکیی، لە دوارۆژدایە، چونکە ژیانی دنیا شتێکی وا نیە، لەچاو دوارۆژداو شتێکی کەمۆکەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨﴾ التوبة، واتە: ڕابواردنی ژیانی دنیا، لەچاو هی دوارۆژدا کەمۆکەیە.

بەڵام ئەم دینە، وەك چۆن دوارۆژمان باش دەکات و، دنیاشمان باش دەکات، لە دنیاشدا خێر و بەرەکەتی پێوەیە بۆ خەڵك، بانگەوازکار دەبێ لێی بزانێ و، خەڵك دڵخۆش بکات، بۆ وێنە: بڵێ فڵانکەس وەرە مسوڵمان بە، هەم خوا لێت ڕازیی دەبێ،

هەم لە دنیاشدا لەشت ساغ دەبێ، ماڵ و خێزانت چاك دەبێ، لە عەیبداریی دوور دەبی، لە گوناهباریی دوور دەبی، ساغ و سەلامەت دەبی... هتد.

هەروەها ئاگادارکردنەوە و ترساندنی خەڵکیش، ئەویش بە تەئکید، یەکێکە لە لایەنە ئەساسییەکانی دینداریی.

**٢)** دیسان خوا عز وجل دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و، زەحمەتی بۆتان ناوێ، ئەم ئایەتە لە سیاقی باسی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزاندا هاتوە، کە لە کاتی نەخۆشیی و سەفەردا، بۆتان هەیە، ڕۆژوو نەگرن و، دوایی بیگێڕنەوە، لەو سیاقەدا، خوا دەفەرموێ: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ، زەحمەتی بۆتان ناوێ.

کەچی - وەك دوایی باس دەکەین - هەندێك کەس هەمیشە ئەگەر مەسەلەیەکی شەرعیی، دوو باری هەبن، بارێکی زەحمەت و بارێکی ئاسان، تەنیا ملی بارە زەحمەتەکە دەگرن، کە ئەوە ڕێك پێچەوانەی ئەم ئایەتەیە، هەروەها پێچەوانەی ئەوەشە کە، دایکمان عائیشە، خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری ﷺ دەگێڕێتەوە:

**٣)** {**مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ أَحَدُهُمَا أَيْسَرُ مِنَ الآخَرِ، إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْماً، فَإِنْ كَانَ إِثْماً، كَانَ أَبْعَدَ النَاسِ مِنْهُ**}[١].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ، هیچ کات سەرپشك نەکراوە، لە نێوان دوو ئیشاندا، کە یەکێکیان لەوی دیکەیان سێناتر بووبێ، مەگەر کامەی ئاسانە، ئەوی هەڵبژاردوە، ئەگەر گوناح نەبووبێ، بەڵام ئەگەر گوناح بووبێ، لە هەموو کەس لێی دوورتر بووە.

بۆ وێنە: ئافرەت بۆی هەیە، نیقاب بکات و، بۆشی هەیە نەیکات و، دەموچاوی دیار بێ، کەچی ئەوان دەڵێن: هەر دەبێ پێچە (**نقاب**) بکات.

بە ڕاستیی سەیرە !

لە هەندێك وڵاتانی عەرەبییدا، شتی بچووکی وەك پێچەگرتنەوە (**إنتقاب**) و، دامێن هەڵپێچان (**تشمير الثوب**) زۆر بە سەختیی دەگرن، بەڵام شتی گەورە گەورەیان، زۆر ئیهمال کردوە، بۆ نموونە: ئایا حوکمڕانیی شووڕاییە، وەك قورئان فەرموویەتی و پێغەمبەری خوا کردوویەتی، یان بنەماڵەیی و، میراتییە، وەك ڕۆژگاری نەفامیی ؟! هیچ لەوە ناپێچنەوە.

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ: ٣٥٦٠، وَمُسْلِمٌ: ٢٣٢٧.

برای موفتی! ئەگەر بە تەنگ دینی خواوەی، بۆچی لەوەش ناپێچیەوە، کە چارەنووسی عیبادو بیلادی پێوە گرێدراوە ؟!

٤) هەروەها پێغەمبەر ﷺ، زۆر بە ڕوونیی و بە ڕاشکاویی، دەفەرموێ: {**بَشِّرُوا ولا تُنَفِّروا، ويَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا**}[١].

واتە: خەڵك دڵخۆش بكەن و مەیانسڵەمێننەوە، {خەڵك مەسڵەمێننەوە، خەڵك دوور مەخەنەوە} هەروەها ئاسان بكەن و، وەزەحمەت مەخەن، {واتە: دینداریی بۆ خەڵك ئاسان بكەن و لێیان وەزەحمەت مەخەن و لەسەریان قورس مەكەن}.

## شەشەم: ئیقناع كردنی عەقڵ و جووڵاندنی دڵ:

پێشتر باسمان كرد، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴿١٢٥﴾ ﴾النحل، حیكمەتەكە بۆ عەقڵ، ئامۆژگاریی چاكیش بۆ دڵ و دەروون، مرۆڤ هەم عەقڵەكەی دەبێ ئیشباع و تێر بكرێ و، ئیقناع بكرێ، هەم دڵ و دەروونەكەی، پێویستە بجووڵێنرێ، چونكە جاری وایە، مرۆڤ بە عەقڵ شتێك دەزانێ، بەڵام هەتا ئەو زانیارییە، لە عەقڵەوە تەحویل نەبێ بۆ دڵ، نایجووڵێنێ، پێغەمبەر ﷺ، دەربارەی خەواریج دەفەرموێ: {**يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ حَناجِرَهُمْ**}[٢] واتە: قورئان دەخوێنن، بەڵام، لە گەروویان، ئەودیو نابێ، واتە: نایەتە نێو دڵ و دەروون، نەبۆتە هۆی ئەوەی دڵ و دەروونیان: ڕووناكیی ئیمان و، تامی تەقوا و، تەزووی بەهاو ئاكارە بەرزەكانی، وەك: میهرەبانیی و بەزەیی و پەرۆش و... هتدی تێكەڵ بێ، هەروا بە وشكیی، ئایەتەكانیان گرتوون.

هەڵبەتە، ئیقناعكردنی عەقڵ و، جووڵاندنی دڵ، نەك هەر مەنهەجی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، بووبێ، بەڵكو هەموو پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، وا بوون، بۆ وێنە:

لە سوورەتی (**إبراهیم**)دا، كە خوا سبحانە و تعالی، لە یەك شوێنداو پێكەوەو وێكڕا، باسی هەموو پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، دەكات، دەفەرموێ: ﴿ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ ﴿١٠﴾ ﴾إبراهیم.

---

(١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ٦٩، وَمُسْلِمٌ: ١٧٣٤.

(٢) أَخْرَجَهُ البُخَاري: ٦٥٣١، وَمُسْلِمٌ: ١٠٦٦.

کە لێرەدا هەم عەقڵیان، دەدوێنن، هەم دڵیان دەجووڵێنن:

أ / عەقڵیان دەدوێنن و، ئیقناع دەکەن، بەوە کە دەفەرموون: (أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ)، واتە، ئایا دوو دڵیی هەیە لە خوادا، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە؟ واتە: ئاشکرایە کە ئەم ئاسمان و زەوییە، وەدیهاتوون و، دەبێ بەدیهێنەرێکیان هەبێ، ئنجا ئایا لەم ڕاستییەدا، دوو دڵیی هەیە؟ ئەدی نابێ هەموو پەیداکراوێك، پەیداکەرێکی هەبێ، ئەوە بۆ عەقڵ.

ب/ بۆ دڵیشیان دەفەرموون: (يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ)، ئەو پەروەردگارەتان، بانگتان دەکات، تاکو لە گوناهەکانتان بتانبووڕێ، یانی: کە بانگتان دەکات، بۆ بەرژەوەندیی خۆتانە و، هیچ ئیشی خۆی بە ئێوە نیە، بەڵکو ئیشی خۆتانی بە خۆتانە.

## حەوتەم: بیرخستنەوەی چاکەکانی خوا:

برا و خوشکەکانم !

پێویستە ئەم بنەمایەش زۆر زۆر گرنگیی پێبدەین، چونکە خوا لە قورئاندا سبحانە و تعالی، زۆر گرنگیی پێداوەو، زۆری باس کردوە، بۆ وێنە:

١) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣﴾ فاطر.

واتە: ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە، بەسەر خۆتانەوە، ئایا جگە لە خوا، بەدیهێنەرێکی دیکە، لە ئاسمان و زەوی، {واتە: لە سەرو خوارەوە}، بژیوتان دەدا؟ (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ)، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە و، هەر ئەو پەرستراوە، (فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ)، بۆ کوێ لادەدرێن! یانی: کۆنترۆڵی خۆتانتان، لەدەست داوە.

٢) ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗ... ٢٠﴾ لقمان.

واتە: خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردوەو، چاکەکانی خۆی، بە ئاشکراو پەنهان، لەسەر ئێوە تەواو کردوون.

**٣)** هەروەها بەڕێزان! تەماشای ئەم سێ ئایەتە بكەن، چەند ڕاچڵەكێنەرن! خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ۝٨﴾ الإنفطار.

واتە: ئەی مرۆڤ! (من، تۆ، هەموومان، چ مسوڵمان، چ كافر) چ شتێك، لە بەرانبەری پەروەردگاری بەخشندەتدا، تۆی بوغڕا كردوە، {(غَرَّكَ)، یانی: فریوی داوی، بوغڕای كردووی، لە كەوڵی خۆتی دەرچواندووی؟} ئنجا ئەو پەروەردگارە، بەخشندە و بەڕێزەت، چی كردوە؟

**١** – قۆناغی یەكەم: (ٱلَّذِي خَلَقَكَ)، تۆی بەدیهێناوە، تۆی هێناوەتە دی و، بوونی پێداوی.

**٢** – قۆناغی دووەم: (فَسَوَّىٰكَ)، ڕێكی خستووی، چونكە دەگونجێ، مرۆڤ پارچە گۆشتێك بێ، بەڵام خوا ئەندامەكانی بۆ دروست كردووی.

**٣** – قۆناغی سێیەم: (فَعَدَلَكَ)، ئنجا، هاوسەنگی كردووی، دەگونجێ، دەستێكت لە دەستێكت، یان قاچێكت لە قاچێكت، درێژتر بێ، یان چاوێكت لە چاوێكت گەورەتر بێ، بەڵام خوا تەعدیلی كردووی !

**٤** – قۆناغی چوارەم: (فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ)، لە هەر وێنەیەكدا، لە هەر دیمەنێكدا، كە ویستوویەتی، تۆی پێكهێناوە، كەواتە: خوا بە چوار قۆناغ، تۆی هێناوەتە دی، بۆچی بەرانبەر بە پەروەردگارت، ئاوا لەخۆبایی؟ یاخود ئاوا فریو دراوی ؟

بەڵێ نیعمەت و چاكەكانی خوا، گرنگە ئینسان بیانخاتەوە بیر خەڵك، لە هەر شوێنەو، لە هەر مەقامە، بە شێوازی گونجاوی خۆی.

## هەشتەم: هۆشداریی پێدان و ترساندنی خەڵك:

ئەوانەی بۆ لای خوا بانگ دەكرێن، وێڕای دڵخۆشكردن، پێویستە هۆشدارییان پێ بدرێ و، بشترسێنرێن، بە دڵنیایی من كە دەڵێم: دەبێ دڵیان خۆش بكرێ، ناڵێم: حەرامیان بۆ حەڵاڵ بكرێ، هەروەها كە دەڵێم ئاسانكاریی بكرێ، مەبەستم ئەوە نیە، سنوورەكانی شەرعیان بۆ ببەزێنرێن، چونكە ئەسڵەن تۆ بۆ لای شەریعەتیان بانگ دەكەی، ئنجا ئەگەر سنوورەكانی شەرع، لەبەر وان ببەزێنی، مانای وایە هیچت نەكرد، پێغەمبەر ﷺیش، كە لەو پیاوەی قبووڵ كردوە، ڕۆژێ دوو نوێژان بكات، نەیفەرمووە: تەنیا دوو نوێژی فەڕزن، فەرموویەتی: پێنج (٥) نوێژی فەڕزن، بەڵام تۆ تەنیا دووان دەكەی و، فەرموویەتی: دووانیش بكات، باشترە لەوەی هەر مسوڵمان نەبێ! یان هۆزی سەقیف كە گوتوویانە: زەكات نادەین و جیهادیش ناكەین و، لێی قبووڵ كردوون، نەیفەرمووە: ئەوانە فەڕز نین، دەبێ وریا بین! كەواتە: وێڕای خەڵك دڵخۆشكردن و، دینداریی ئاسانكردن بۆ خەڵك، كە ئەوە بنەمایەكی بانگەوازە، هۆشداریی پێدانی خەڵك و ترساندنیشیان، ئەویش دیسان، یەكی دیكەیە، لە بنەماكانی خەڵك بانگكردن بۆ لای خوا، با تەماشای ئەم ئایەتە موبارەكە بكەین:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿٥﴾ ﴾ فاطر.

واتە: ئەی خەڵكینە! بە دڵنیایی، بەڵێنی خوا ڕاستە و، مسۆگەر بن، بەڵێنی خوا ڕاستە، كە دەفەرموێ: زیندوو دەبنەوە و، لێپرسینەوە هەیە، (فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا)، ئنجا با ژیانی دنیا، فریوتان نەدا، (وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ)، هەروەها با فریودەر، بەرانبەر بە خوا، فریوتان نەدات، فریودەر كێیە؟ شەیتانە.

لێرەدا شتێكم هاتەوە یاد:

لە سوورەتی (**الذاریات**)دا، خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، هەندێك لە زانایان دەڵێن: (وَمَا تُوعَدُونَ)، پەیوەست نابێتەوە بە پێشەوەی، تاكو ماناكەی ئاوای لێ بێ: {بژیوتان لە ئاسمانە و، ئەوەش كە بەڵێنتان پێ دەدرێ – ئەویش هەر لە ئاسمانە}. بەڵكو (وَمَا تُوعَدُونَ) پەیوەستە بە دوای خۆیەوە بەمجۆرە:

{... وَمَا تُوعَدُونَ، فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ} واتە: ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، سوێند بە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی، هەقە، وەك چۆن قسە دەكەن.

یانی: قسەكردنەكەتان چۆن ڕاست و چەسپاوەو، نكووڵیی لێناكرێ، ئەوەی بەڵێنیشتان پێ دەدرێ، ئاوا هەق و ڕاستە!

**بەسەرهاتێك دەربارەی ئەم ئایەتانە :**

(**الأَصْمَعِي**) لێرەدا، شتێك دەگێڕێتەوە، دەڵێ: كابرایەكی عەرەبیی دەشتەكی جارێك هات، گوتی: ئەرێ، لەوەی خوا دایبەزاندوە، شتێكم فێر ناكەن! منیش ئەو ئایەتانەی سەرەتای سووڕەتی (**الذاریات**)م فێركردن: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾.

ئنجا یەكسەر دوای گوێ بیستبوونی ئایەتەكان: حوشترەكەی سەربڕی و گۆشتەكەی كردە خێرو ڕۆیشت، ئیدی ساڵێك پێچوو، هاتەوە، زۆر كز و لاواز بوو بوو، گوتمان: ئەوە چیت كردوە؟ بۆ وات لێهاتوە؟ گوتی: ئەو ئایەتانەم جێبەجێ كردوون، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾ الذاریات، دوای ئەوەی حوشترەكەی كردبووە خێر، وەك جێبەجێكردنی فەرمانی خوا كە دەبێ ماڵەكەت بدەی، بە سواڵكەر و بێبەشان، ئنجا شەوێش زۆر كەم خەوتبوو، هەتا پێش بەرەبەیان (**سَحَر**) و، ئەو كاتەش هەر داوای لێبووردن (**إستغفار**) ی كردبوو، زۆر بە سەختیی گرتبووی و، تەواو كز و لاواز بوو بوو، ئنجا گوتی: هاتووم ئەمجارەش هەندێكی دیكەش فەرمایشتی خوام بۆ بخوێنی، دەڵێ: منیش هەر تەواوكەر (**تكملة**)ی ئەو ئایەتانەی (**الذاریات**)م بۆ خوێند: ﴿ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الذاریات، ئیدی كە ئەو ئایەتانەم بەسەردا خوێندنەوە:

كابرا یەك چریكەی لێداو، گوتی: ئەوە كێ پەروەردگاری جیهانی تووڕە كردوە، كە دەبێ سوێندی بۆ بخوات، ئنجا بڕوای پێبكات ؟! چریكەیەكی لێدا و، وەفاتی كرد!

بەڵێ: وریاکردنەوە و هۆشداریی پێدانی خەڵك و، ترساندنیشیان، یەکێکە لە بنەماکانی بانگەوازکردنی خەڵك، بۆ لای خوا، کەسی وا هەیە، ڕەنگە سەد جار بۆی باسی بەهەشتێ بکەی، زۆر کاریگەریی نەبێ، بەڵام بەهۆی سزاو جەزرەبەی خواوە، لە دۆزەخداو، پێش دۆزەخیش، لە عالەمی بەرزەخدا، ڕادەچڵەکێ و هۆشیار دەبێتەوە.

یاخود هی وا هەیە، لەبەر سزای خوا، لە قیامەتدا، لە گوناهان ناپرینگێتەوە، بەڵام کە زانی لە دنیاشدا زیانی هەیە، لێی دەپرینگێتەوە! نەفەرم بینیوە، گوتوومە: جگەرە حەڕامە، بەڵام هەر لەسەری بەردەوام بووە، کەچی دوایی کە چووە بۆ لای پزیشك و، گوتوویەتی: تووشی سەرەتانت دەکات، ئەگەر وازی لێنەهێنی، وازی لێهێناوە !

## نۆیەم: جەختکردنەوە لەسەر واقیعی ئێستامان و، کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگا:

هەندێك لە بانگەوازکاران، - وەك دواییش باسی دەکەین - زیاتر لە مێژوودا دەژین، یان مێژوو هەڵدەکۆڵن، بزانن داخۆ چ گرفت و کێشەیەکی تێدا بووە، کاتی خۆی باسکراوە، مشتومڕی لەسەر بووە! دەیهێنن بۆ ئێرە، بەڵام ئێمە کاتێك تەماشای سیرەی پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**) دەکەین، وایاننەکردوە، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، هەر کام لە (**نُوح، هُود، صالِح، لُوط، شُعَيْب**)[1].

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**هود**)دا، دیسان ئەو پێنجە (٥)یان[2].

٣ - لە سووڕەتی (**الشعراء**)یش دا، دیسان ئەو پێنجەیان (٥)[3].

هەر کامێکیان، ئەوەی بۆ کۆمەڵگایەکەی خۆی باسکردوە، کە پێویستیی بووە، **نووح عليه السلام** زیاتر باسی دیکتاتۆریەتیی سیاسیی کردوە، **هوود عليه السلام** لە ڕووی ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە، دواوە، صاڵح **عليه السلام**، دیسان لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و گوزەرانەوە، **لووط عليه السلام** لە ڕووی ڕەوشتییە وە، چونکە گەلەکەی ڕەوشتیان تێکچووە، شوعەیب **عليه السلام** لە ڕووی ئابووریی و هێمنیی و ئاسایشی خەڵك و، ڕێ لە خەڵك نەگرتنەوە، هەر کام لە پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**)، کۆمەڵگایەکەی، چ دەردێکی هەبووە،

---

(١) ئایەتەکانی: ٥٩ - ٩٣.

(٢) ئایەتەکانی: ٢٥ - ٩٥.

(٣) ئایەتەکانی: ١٠٥ - ١٩١.

باسی ئەو دەردەی بۆ کردوون، بۆیە گرفت و کێشەکانی ئێستای ئێمەش، کە جیان لە هی کۆمەڵگایەکانی ڕابردوو، دەبێ قسەو گوتاریشمان جیاواز بێ.

با یەك وێنەتان بۆ بێنمەوە: ئەو زانستەی لە {ئیمان و عەقیدە} دەکۆڵێتەوە، پێی گوتراوە: (**علم التوحید**)، دوایی پێیان گوتوە: (**الفِقْهُ الأَكْبَرَ**)، بەڵام لە سەردەمێکدا، ناوی لێنرا: (**عِلْمُ الكَلام**)، ئایا دەزانن ئەو ناوە لە چییەوە هاتوە؟ کێشەی هەرە گەورە، کە مشتومڕی زۆری لەسەر بووە، ئەوە بووە کە ئایا: (**كلام اللّە**)، قورئان، دروستکراوی خوایە؟ یاخود خوا دروستی نەکردوە، هەر فەرموویەتی؟ کێشەیەکی زۆر لەسەر ئەوە بووەو، ئیمام ئەحمەد، لەسەر ئەوە چەند ئەزیەت درا، ئنجا ئەوە کێشەیەك بوو، کاتی خۆی و، ئیمام ئەحمەد چاکی کرد، دیفاعی کرد، بەڵام، ئێستا ئێمە کێشەمان ئەوە نیە خەڵکێك بڵێ: قورئان مەخلووقە ؟، یان مەخلووق نیە؟ ئێستا کێشەمان ئەوەیە، کە دەڵێن: قورئان، هەر لە خواوە نەهاتوە، بەڵکو هەندێك هەر بڕوایان بە خوا نیە، کێشەمان لەگەڵ ئەوانەدا هەیە! دەبێ بزانین، کێشەکانی ڕۆژگاری ئێمە چین؟ نەخۆشییەکانی ڕۆژگاری خۆمان چین؟ نەك بگەڕێینەوە بۆ مێژوو، هەر لە مێژوودا بژین و، ئاگامان لە واقیعی ئێستامان نەمێنێ، کە بە داخەوە، زۆرێك لەوانەی کە لەسەر تەوژمی ئیسلامیی حیسابن، لە مێژوودا دەژین و، کەم پەیوەستن بە ڕۆژگارو واقیعی ئێستاوە.

## دەیەم و کۆتایی: جەستاندنی پەیام و بەرنامەی خواو، بوونە سەرمەشق بۆ خەڵك:

بەڕێـــــزان !

لێتـان دووبـارە دەکەمـەوە: زمانـی کـردەوە و حـاڵ، باشـترین شـێوازی بانگـەوازە، تەماشـا بکـەن، خـوا **سـبحانە وتعـالی**، بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، چـی دەفەرمـوێ؟ ﴿نٓ ۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ۝١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ۝٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ۝٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ۝٤ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ۝٥ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ۝٦﴾القلـم.

واتـە: (نٓ)، سـوێند بـە قەڵـەم و، بـەوەی، کـە پێـی دەنووسـن، {دێـڕەکان}، تـۆ بەهـۆی چاکـەی پەروەردگارتـەوە، شـێت نـی و، تـۆ پاداشـتێکی نەبـڕاوەت هەیـە و، تـۆ لەسـەر ڕەوشـتێکی مەزنـی، دوایـی تـۆش دەبینـی و ئەوانیـش دەبینـن، کامەتـان شـێتن.

خـوای پـەروەردگار، چەنـد بـە بێباکیـی، وا دەفەرمـوێ! ئـەو شـتانە زۆر جێـی سـەرەنجن و، ئیعجـازی مێژوویین.

هەروەهـا لـە سـووڕەتی (ص)دا، دەفەرمـوێ: ﴿قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ۝٨٦ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ۝٨٧ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ۝٨٨﴾، واتـە: بڵـێ: هیـچ کرێتـان لەسـەری لـێ داواناکـەم و، مـن لـە زۆر لەخۆکـەران و بارگرانکـەران نیـم، ئـەم قوڕئانـە، یادخەرەوەیـە، بـۆ هەمـوو جیهانییـان، دوای ماوەیەکـی دیکـەش، هەواڵەکـەی دەزانـن.

چونکـە خـوا زانیویەتـی، ئیسـلام، چـی لێـدێ و چـۆن دەبـێ! کاتێـك ئـەو ئایەتـە دابەزیـوە، قۆناغـی مەککـە بـووە، پێغەمبـەر ﷺ، چەوسـێنراوەتەوە، هاوەڵـەکان ئـازارو ئەشـکەنجە دراون، کـەس بـە تەمـای سـەری خـۆی نەبـووە، بـەڵام خـوا دەفەرمـوێ: پێیـان بڵـێ: دوای پێچێکـی دیکـە، دوای ماوەیەکـی دیکـە، هەواڵەکـەی دەزانـن، واتـە: ئـەم ئیسـلامە چـۆن دنیـا دادەگـرێ و بڵاودەبێتـەوە !

مەبەستمان ئەوەیە:

خـــوای پـــەروەردگار کـــە باســـی ڕەوشـــتی مەزنـــی پێغەمبـــەر ﷺ دەکات، لـــە بەرانبـــەر بانگەشـە و، پـڕ وپاگەنـدەی کافرەکانـدا، کـە دەیانگـوت: شـێتە و جادووگـەرە و پێغەمبـەر نیـە،

دەفەرموێ: تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە - کە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیی پێداوی - شێت نی و پێغەمبەری، بە بەڵگەی ئەوەی کە لەسەر ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزو مەزنی.

بەڵێ خوشك و برا عەزیزەکانم !

ئێمەش باشترین بەڵگەی ئیسپاتکردنی مسوڵمانەتیی و ڕاست و ساغییمان و، لە هەمان کاتیشدا چاکترین و کاریگەرترین شێوازی بانگەوازیشمان بۆ خەڵك بەرەو ئیسلام، ئەوەیە: ڕەوشتمان بەرزو ئاکارمان پەسند بێ، ئائەوە پێوەرو تەرازووێکە، زۆر ڕاست و دادگەرەو زۆر هەقە، ئایا کێ دەتوانێ هەتا سەر ڕەوشتی بەرز و پەسند بێ، وەڵلاهی تەنیا کەسێك، دڵەکەی پەیوەست بێ بە خواوە، کەسێك دواڕۆژ بەسەر دنیادا هەڵبژێرێ و، دنیای لەلا بچووك بێ و، دواڕۆژی لەلا مەزن بێ، تەنیا بابای وا دەتوانێ تاکو سەر ڕاستگۆ بێ، تاکو سەر ئەمین بێ، تاکو سەر پاك و چاك بێ، تاکو سەر بە ڕەحم بێ، دادگەر بێ... هتد، بەڵام خەڵکی دیکە، بەڕواڵەت، لەبەرچاوی خەڵك شتێك دەکات و، دوایی شتێکی دیکە دەکات !

ئنجا با قسەیەکی دایکمان عائیشە، خوا لێی ڕازی بێ، ببینین، کە دەیکەمە کۆتایی قسەکانم:

کاتێك پرسیاری لێدەکرێ، دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ یەکێك پرسیاری لێ دەکات، گەنجێك دەڵێ: ئایا ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە؟ ئەویش دەڵێ: ڕۆڵە گیان! قورئانێ ناخوێنی؟ دەڵێ: با، دەڵێ: {**كَانَ خُلُقُ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ الْقُرْآن**}[1] واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، قورئان بوو.

یانی: چی؟ یانی: قورئان چی دەفەرموو: پێغەمبەر ﷺ، وایدەکرد.

خوشك و برا بەڕێز و خۆشەویستەکانم!

زمانی کردار، فەصیحترین و گۆیاترین زمانە و، باشترین شێوازە، ئەگەر دەمانەوێ: خەڵك فێری دینداریی بکەین، با بۆخۆمان دیندار (**مُتَدَيِّن**) بین، دەمانەوێ: فێری ڕاستگۆیيان بکەین، با خۆمان ڕاستگۆ بین، دەمانەوێ: فێری زوهد و قەناعەتیان بکەین، دەبێ خۆمان دنیا بەکەمگر و بەقەناعەت بین، دەمانەوێ: فێری میهرەبانییان بکەین، با خۆمان بە ڕەحم و میهرەبان بین، دەمانەوێ: فێری خاکیی بوونیان بکەین، با خۆمان خاکیی بین و ،... هتد.

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٣٩.

ئەگەرنا، با دڵنیابین: نەداری شتێك، ئەوشتەی پێ نابەخشرێ، (**فَاقِدُ الشَّيءِ لاَ يُعْطِيهِ**)و ئاسنی ساردیش بە فوو گەرم نابێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە زۆر ڕازاوە بین، بە ڕەوشتە بەرز و پەسندەکان، بە شێوەیەك کە شایستەی، ئەوە بین، بڵێین: ئێمەش شوێنکەوتووی پێغەمبەرێکین ﷺ، کە لە لووتکەی هەموو ڕەوشتێکی بەرز و ئاکارێکی جوان و پەسندا بووە، کە هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆخۆی، باشترین بەڵگەی ڕاستیی ئایینەکەیەتی، هەر کەسێك تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، ئنجا دەزانێ، کە ئایین و بەرنامەکەی زۆر ڕاستە، چونکە ئەو زاتە لە لووتکەی ڕەوشتی بەرز و ئاکاری پەسەند دایە، کەواتە: دیارە ئایینەکەشی وایە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمەش وا لێبکات، کە بە کردەوەو حاڵمان، مایەی لەلای خەڵك شیرینکردنی ئیسلام و، سەرنجڕاکێشانیان بین، بە لای خواو پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) ﷺ و ڕێبازەکەیدا.

# نێوەڕۆک